ئیزابێل ئەلێندی

# ئێنیس، خۆشەویستی ڕوحەکەم

ڕۆمان

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

**عوبێد مەجید**

ناوی کتێب: ئێنیس، خۆشەویستی ڕوحەکەم - ڕۆمان
نووسینی: ئیزابێل ئەلێندی
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: عوبێد مەجید
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٨٩٤
هەڵەگری: بۆکان نووری
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقیيان
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٩
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٩٣٦ی
سالّی ٢٠٠٩ی دراوەتێ

# خوێندنەوەیەکی کورت

لەو ڕۆمـانـەدا، ئیـزابێل ئـەلێندی بێ ئەوەی زۆر لە خـۆی بکات، توانیـویـەتی تـەکنیـکێکی تـایبـــەت دابهـــێنێ و لـە ڕێگەی پـاڵەوانەکـــەی "ئێنیس" بـە گێـڕانەوەیەکی جوان ئەو تـایبـەتمەندییـە بچەسـپێنێ. ئێنیس بـە هەڵدانەوەی لاپەڕەی یادەوەرییـەکـانـی خـۆی جـارێک بـە نووسین و جـارێک بە قـسـەکـردن هەمـوو ڕووداوەکـانی داگیـرکـردنی شـیلی و بەسـتـانەوەی وەک شـانشـینێک بە وڵاتی ئیـسپـانیـاوە، هـاوشــان لەگەڵ مـێـژووی ڕووداوەکـان بە وردی و درێژی دەگێڕێتەوە.

هەمـوو ئەو ژنانەی ئـەلێندی کـردوونی بە پاڵەوانـی ڕۆمـانەکـەی، خـۆی ئاسـا ژنی ئاسـایین و جـوانیـیـەکـەیان دەگمـەن نینە، وەلێ هـەموویان ژنی بەهـێـز و سـەرنجـڕاکـێش و خـاوەن ئیـرادە و توانادارییـ پڕ لە سـەیروسـەمـەرەنە. بۆ ڕێزلێنان لەو چەند ژنەی شاری بلاسینشیای ئیسپانی کە بەشداری هەڵمەتی دۆزینەوەی جـیـهـانی تـازەیان کـردووە، ئازاترین و بوێرترین ژن کـە "ئێنیس سـواریزم"ە کـردوویـەتی بە پاڵەوانی ڕۆمـانەکـەی. سـەرەڕای ئـەوەش ئەو ژنانە تێیـاندا هـەیە قـسـان لـەگـەڵ مـردووان دەکـات، هـەیانە پێشـبـینی ڕووداوەکـان دەکات یان پشت بە هـەستەوەری شەشەم دەبەستێت.

ئێنیس سـیـوارێزم بە دوای پیـاوەکـەی لە دەریا دەدا، ئەو پیـاوەی خـەون و خـەیاڵی دەوڵەمـەندی و پەیداکردنی زێڕ، مێشکی داگیـر دەکـات و دەپەڕێتـەوە ئەوبەری ئۆقـیـانووسی ئەتڵـەسی، وەلێ لـە پێـرۆ لە شــەڕی ناوەخـۆی هـێـزە ئیسپانییەکان دەکوژرێت.

ئەو کــاتەی ئێنیس لـە دوای گـەڕانێکی زۆر دەگــاتە ئەو ئـەنجـامـــەی کـە مـێردەکـەی کوژراوە، وەک کـەسـێکی خاوەن خـواستێکی بەهێز، ورە بەرنادا و

لەگەڵ لەشکری پیاوەکان و وەک دۆستی سەرکردەکەیان مل دەنێتە دۆزینەوەی بەشەکانی خوارووی ئەو کیشوەرە. ئیتر لە گەشتێکی چەند مانگەدا بە ڕێگەی وشکترین بیابانی سەرزەوی، بە هۆی بەهرەمەندی و ژیری خۆی سوپاکەیان لە قڕبوون ڕزگار دەکات و ئاوی ژێر زەمینیان بۆ دەدۆزێتەوە.

ئەلێندی توانیویەتی بە شێوازێکی پوختە و دروست خوێنەری تێکەڵ بە ڕووداوە دراماتیکییەکانی پرۆسەی داگیرکردنی کیشوەری ئەمریکا بکات و لە ئاستێکی بەرزدا مێژووی پێرۆ و شیلی لەگەڵ ژیان و کەسێتی پاڵەوانەکانی تێکهەڵکێش بکات. زۆر بە وردی شەڕی داگیرکارانەی ئیسپانیای لە دژی خەڵکی ڕەسەنی ئەو کیشوەرەی لێکداوەتەوە و پێمان دەڵێت کە ئەو گەلانە لەگەڵ ئەوەی زیرەکییەکی زگماکانەشیان هەبووە، وەلێ نەیانتوانی تاسەر خۆیان لەبەر تۆپ و ئاگری تفەنگ و چاوچنۆکیی ئیسپانییەکان ڕاگرن.

ژیریی ئەو گەلانەی ئەوێ لەوەدا بوو: وەختێ کە زانییان مرۆڤە ڕیشدارەکان زۆر شەیدای زێڕن، هەستان ئەفسانەی شاری زێڕینیان – ئەلدۆرادۆ – لە خەیاڵی خۆیان داهێنا، ئیسپانییەکانیش زۆر بە ئاسانی باوەڕیان پێ کردن، ئیتر ماوەیەک بەریان بەوان نەما و کەوتنە گەڕان بە دوای دۆزینەوەی ئەو شارە زێڕینە ئەفسانەییە!

ئەلیندی پێمان دەڵێت کە ڕاستە خەڵکی ڕەسەنی دنیای تازە خاوەنی تەکنۆلۆجیا و فەلسەفە و شارستانییەتێکی وەک ئەوروپییەکان نەبوون و خوێندەوارییان نەزانیوە، وەلێ مەزنترین بەهای مرۆڤایەتی کە سەربەستییە لە لای ئەوان هەبوو و بەهیچ شتێکیان نەدەگۆڕییەوە. ئەوانە سەریان لە خەڵکە ڕیشدارەکان سووڕمابوو کە بۆچی ئەوەندە پەرۆشی زێڕ و زیون، تیامابوون کە داخوا ئەو کانزایانە چ سوودێکیان پێ دەبەخشێت! لە کاتێک لەگەڵ هاوخوێنەکانیان ئەوەندە دڵڕەق و بێویژدانن.

بێگومان داینەمۆی ڕووداوەکانی هەر ڕۆمانێک خۆشەویستییە، لێ لەکن ئەلێندی، خۆشەویستی بەلای ژنەوە، خۆشەویستییەکی هەڵگەڕاوە و تۆڵەستێن و مەکربازانەیە.

ئێنیس وەک هاوڕێ و ئەویندارى پێدرۆ دى بالدیبیاى سەرکردە دەچێتە شیلى، بەڵام زۆرى پێ ناچێت شوو بە نێزیکترین هاوڕێى ئەو سەرکردەیە دەکات، بەڵام بۆ؟! لە ڕاستیدا ئەمەیان ڕەفتارێکى تەواو ژنانە بووە، چونکە ئێنیس لە ناچاریدا، بە مەبەستى پاراستنى کەسێتى و خۆبەگەورەزانینى خۆى، وەک پەرچەکردارێک لە دژى بالدیبیا ئەو هەنگاوە داوێ. ئاخر کاتێ پێدرۆ بە هۆى گوشارى ئاینى و یاساى دواکەوتووانەى ئەو سەردەمەى ئیسپانییەکان، دەستبەردارى ئەو هەموو ئەو خۆشەویستى و چاکەیەى ئەم دەبێت کە لەو گەشتەدا لە بەرامبەریدا نواندبووى و پشتى تێ کرد، ئەویش ناچار دەبێ هەڵوێست وەرگرێ و بە شێوەیەکى تر ژیانى خۆى لە خۆشەویستى دانەبڕێت و درێژەى پێ بدات.

ئێنیس بە ئاشکرا دەیسەلمێنێ کە لە یەک کاتدا دوو پیاوى خۆش ویستووە، وەلێ لە ماوەى ژیانى لەگەڵ هەریەکەیان خیانەتى لە هیچیان نەکردووە.

ناوى ئەو ڕۆمانە - ئێنیس خۆشەویستى ڕوحەکەم - لەو دەربڕینە وەرگیراوە کە پێدرۆ دى بالدیبیا لە سەرەمەرگدا دەریبڕیوە و نیشانى داوە کە ئێنیس تاکە ژنێکە لە ناخەوە خۆشى ویستبێت!

# بەشی یەکەم

## ئەوروپا ١٥٠٠-١٥٣٧

من ئێنیس سوارێسم، خەڵکی شاری سانتیاگۆ دی ئیستریمادۆرای تازەم لە شانشینی شیلی، لە ساڵی (١٥٨٠)ی زایینی. زۆر بە وردی لێی دڵنیانیمە کەی لە دایک بوویمە، بەڵام بە قسەی دایکم، لە دوای ئەو برسێتی و تاعوونە ترسێنەرە هاتوومەتە دنیا کە لەگەڵ مردنی شا فیلیپی جوان، ئیسپانیای گرتبووەوە. من بڕواناکەم کە مردنی ئەو شایە هۆکاری بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە بێت، وەک ئەو خەڵکەی دەیانگوت کە لەگەڵ بینینی تەرمەکەی ئەودا بۆ ماوەی چەندان ڕۆژ بۆنی بادەمی تاڵ لە هەوادا بڵاو بووبووەوە؛ بەڵام کێ دەزانێ داخوا ئەو قسانەی ئەوان ڕاستن یان نا.

شاژنە خوانا کە هێشتا گەنج و جوان بوو، بۆ ماوەی دوو ساڵ ئەو دارەبازەیەی لە سەراپای قشتاڵەدا دەگێڕا و ناوە ناوەش سەری هەڵدەداوە بۆ ئەوەی ماچێک لە لێوەکانی مێردەکەی بکات، بەڵکە خوا بکات زیندوو ببێتەوە. بەڵام شای جوانەمەرگ، هەرچەندە بە مەرهەم و ڕۆن چەوریان کردبوو هەتا بۆنی خۆشی لێ بێت، کەچی هەر بۆنی گەنیوی لێ دەهات. ئەو وەختەی من هاتمە دنیایێ، ئەو شاژن بەدبەختە تووشی شێتی بووبوو و لە کۆشکی تۆردیسیاسدا بەدیار تەرمی مێردەکەیەوە دەرێی لەخۆ حەرام کردبوو. ئەمەش بەو مانایە دێت کە لانی کەم من حەفتا ساڵم لە نێوان سینگ و پشتدا هەیە و ڕەنگە بەر لە جەژنەکانی سەری ساڵی زاینی بمرم. بۆم هەیە بڵێم کە ژنە قەرەجێکی سەر لێوارەکانی ڕووباری "خێرتی" پێشبینی مردنی منی کردبوو، بەڵام بێگومان پێشبینییەکەی ئەوها ڕاست نییە وەک ئەوەی ئاسایی لە

کتێبەکاندا دەنووسرێت، چونکێ ئەو شتانەی کە چاپ دەکرێن، هەمیشە وەک ڕاستی چاویان لێ دەکرێت. ژنە قەرەجەکە پێشبینی تەمەنێکی درێژی بۆ کردم، وەک ئەوەی کە هەمیشە لە بارەی دراوەوە دەیڵێن.

ئەوە دڵە هەڵەشەکەی منە کە پێشبینی نزیک بوونەوەی کۆتاییم دەکات. هەمیشە دەمزانی کە بە پیری و ئاساییانە وەک باقی ژنەکانی تری خانەوادەکەمان، لە نێو جێگەی خۆمدا دەمرم، هەر لەبەر ئەوەشە کە لە مەترسییەکاندا هیچ سڵ ناکەمەوە، ئاخر خۆ کەس بەر لە ئەجەلی خۆی ناچێتە دنیایەکەی تر!.

کاتێ لۆقەی ئەو ئەسپە چەمووشانەی کە لە ناو سینەمدا هەستم پێیان دەکرد، لە ئەرزی دەکوتام، کاتالینا بە خووە قشتاڵییە پیرۆییە نەرمونیانەکەی خۆیەوە، ئاوا دڵی دەدامەوە: «تۆ تەنیا بە دەردی پیرێتی دەمریت، ئەی گەورەم».

من لە بیرم کردبوو کە بە زمانی "کیچوایی" چ دەڵێنە ناوی کاتالینا و ئێستاش وەختی ئەوە بەسەرچووە لەو بارەیەوە لێی بپرسم، ئاخر ساڵانێکی زۆرە مردووە و لە حەوشی ماڵەکەمدا شاردوومەتەوە، وەلێ بڕوای تەواوم بە دروستی و وردی پێشبینییەکانی هەیە.

کاتالینا لە شاری کۆسکۆی کۆن، مرواریەکەی وڵاتی بلانکا، لە سەردەمی فرانسیسکۆ بێسارۆ بووە خزمەتکارم. ئەو فرانسیسکۆیە زۆڵە چاونەترسەی کە بەدبێژەکان دەڵێن لە ئیسپانیا بەرازی بەخێو دەکرد، لێرەش بەو هەموو تەماحکاری و خیانەتکارییەوە بووەتە حاکمی وڵاتی پێرۆ. ئەمەیە گاڵتەجاڕی ئەو جیهانە نوێیەی هندییەکان، کە هیچ یاسا و عورفێکی باوی نییە و هەموو شتێکی تێدا تێکەڵ بە ئاژاوەیە: پیاوانی ئاینی و گوناهباران، سپی پێست، ڕەش پێست، ئەسمەر، هندییەکان، دووڕەگەزەکان، نەجیبزادە و خزمەتکار. هەموو کەسێک دەشێ ڕۆژێک بە کۆت و زنجیرەوە خۆی ببینێت و بە شیشی سوورکراوە داغی بکەن، ڕۆژی دواتر لە گۆڕانێکی کتوپڕدا قەدەری بگۆڕێ و ببێتە پیاوێکی شکۆدار. من تاکو ئێستا لەگەڵ ئەو بێ سەروبەرییە

ڕانەهاتوومە، هەرچەندە سوودیشم لێی وەرگرتووە؛ چونکە ئەگەر لە زێدی خۆم بمابامایەوە، ئەوڕۆکە بە هۆی سەرقاڵبوونم بە دوورمان لەبەر تیشکی چراکەمدا دەبوومە پیرێژنێکی کلۆڵ و کوێر. لەوێ لە شەقامی ئەکوێدۆکتۆ هەر بە ئێنیسی بەرگدروو دەمامەوە. وەلێ لێرە، من خاتوو دۆنیا ئێنیس سوارێسم، ژنێکی پایەدار، خێزانی حاکمی خاوەن شکۆ دۆن ڕۆدریگۆ دی کیرۆگای خوالێخۆشبووم، ئەو کەسەی داگیرکەر و دامەزرێنەری شانشینی شیلییە.

هەروەک گوتم تەمەنم بە لانی کەم حەفتا ساڵ دەبێت، بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە تێیدا ژیاوم، وەلێ ڕوح و دڵم کە هەردووکیان تاکو ئێستاش هەر بە ڕۆژگاری گەنجێتییەوە هەڵواسراون، لە بارەی ئەو شەیتانانەوە پرسیارم لێ دەکەن کە جەستەیان پێکاوم. وەختێ لەو ئاوێنە زیوینییە سەیری خۆم دەکەم، کە یەکەمین دیاری ڕۆدریگۆ بوو بە بۆنەی زەماوەندکردنمان پێشکێشی کردبووم، ئەو داپیرە سەر سپییە ناناسمەوە کە سەرنجانم تێ دەگرێت. کێیە ئەو ژنەی وا گاڵتە بە ئێنیسی ڕاستەقینە دەکات؟ لە نێزیکەوە تێی ڕادەمینێم، بەو هیوایەی بەڵکە لە قووڵایی ئاوێنەکە ئەو جوانکیلەیە بەدی بکەم کە ڕۆژانێک خاوەنی دوو کەزی و دوو ئەژنۆی بریندار بوو، یان ئەو کچە گەنجە بێتە بەرچاوم کە لە نێو باخچەی پڕ لە درەختی میوە ڕای دەکرد و بە دزی سەرخۆشی ئەویندارى بوو، یا ئەو ژنە کامڵ و پێگەیشتووە بدۆزمەوە کە بە دڵێکی تژی سۆزەوە لە ئامێزی ڕۆدریگۆ دی کیرۆگا دەنووست. من دڵنیام ئەوانە لەو تەلەسمەی نێو ئاوێنەکەدان، بەڵام داخەکەم کە ناتوانم بیانبینم. من چیتر ناتوانم سواری ئەسپەکەم ببم و تاقەتی لە بەرکردنی تۆڕی زرێ و هەڵگرتنی شمشێرم نییە، نەک لەبەر کەمبوونەوەی حەماسەتم، ئاخر هەمیشە ورە بەرز بووم، بەڵکو بە هۆی ئەو غەدرانەیە کە جەستەم لێمی دەکات. من تاقەتم نەماوە، جومگەکانم ئازارم دەدەن، ئێسقانەکانم وشک هەڵاتوون و چاوەکانیشم کز و لێڵ بوونە. ئەگەر بە هۆی ئەو چاویلکەیە نەبێت کە لە پێرۆ بەڕادانم دابوو، ئەوا نەمدەتوانی ئەو لاپەڕانەی بەردەستیشم بنووسمەوە. من

حەزم دەکرد لە دوایەمین جەنگی لە دژی هندییە مابۆچییەکان هاوڕێیەتی ڕۆدریگۆ بکردایە دەبا خوا لە بارەگای پیرۆزی خۆیەوە ئاگەداری بێت، بەڵام لێنەگەڕا لەگەڵی بچم و بە پێکەنینەوە پێی گوتم: – ئەی ئێنیس، بۆ ئەو جۆرە کارانە زۆر پیربوویت. منیش وەڵامیم دەدایەوە: «هەر بە قەد تۆ پیربوومە». بەڵام من ڕاستم نەدەکرد، چونکە ئەو چەند ساڵێک لە من بچووکتر بوو. ئێمە وامانده‌زانی کە بە یەکتر ناگەینەوە، بەڵام بەبێ فرمێسک ڕشتن ماڵئاواییمان لێک کرد و دڵنیابووین کە لەو دنیایەی تر بەیەک دەگەینەوە. ماوەیەک بوو دەمزانی ڕۆژانی ڕۆدریگۆ بەرەو کۆتابوون دەچێت، هەرچەندە ئەو هەوڵی دەدا ئەو ڕاستییەم لێ بشارێتەوە. هەرگیز نەمدیت ڕۆژێک لەبەر ئازارەکانی بناڵێنی، بەرگەی ئازارەکانی جەستەی خۆی دەگرت و ددانەکانی چیڕ دەکردنەوە، ئارەقی ساردی نێوچەوانی نیشانە بوون بۆ ئازارە بەجۆشەکانی. ئەو ڕۆژەی بۆ خوارووی وڵات ملی نا، تایەکی گەرمی لێ بوو و ڕەنگی لەبەر نەمابوو. دۆمەڵە پڕ لە کێمەکەی لاقی، هەموو داوودەرمان و نزاکانی من نەیانتونی چاکی بکەنەوە. ئاخر ئەو بۆیە ڕۆیشت، تا ئارەزووی خۆی بێنێتە دی و وەک سەربازێکی نێو گۆڕەپانی جەنگ گیانی بەخت بکات! نەک وەک پیرێکی پەککەوتە لە نێو جێگەدا بمرێت. من دەمویست لەوێ لەگەڵیدابم، هەتا لە دواچرکەی دەرچوونی ڕوحی سەری بخەمە سەر ڕانم و بۆ ئەو خۆشەویستییەی کە بە منی بەخشیبوو بە درێژاییی ژیانمان، سوپاسی بکەم.

لە کاتێکدا کە هێمای بۆ ئەو کێڵگانە دەکرد کە بەسەر زنجیرە شاخەکاندا درێژ بووبوونەوە، پێی گوتم: بڕوانە ئێنیس گیان، خواوەند، ئەو موڵکانەی هەر هەموو، لەگەڵ ڕوحی سەدان هندی لە ژێر چاوەدێری ئێمە داناوە. جا هەروەک چۆن ئەرکی سەرشانی منە کە شەڕی وەحشییەکان لە ئەراوکانیا بکەم، ئاواش ئەرکی سەرشانی تۆیە کە پارێزگاری لە موڵکەکانمان و ئەوانەیش بکەیت کە لە ژێر سایەی ئێمەدان.

تاکە هۆکاری ڕۆیشتنی ئەو ئەوەبوو کە نەیدەویست من بەو نەخۆشییە کوشندەیەوە بیبینم و پێی باش بوو لە نێو کۆڕی سوارچاکەکانیدا بێت و لە

پێشـەنگی ئەواندا لەو هـەرێمـە پیرۆزانەدا بـجـەنگێ کە دەکـەوتنە خـوارووی ڕووبـاری پیــۆ ـ پیــۆ کـــە لـەوێ ســوپـای دوژمـنە مـــابـۆچیـــیـــەکـــان لـە ئامـادەباشـیـدابوون. ئەو مـافی خـۆی بوو وەک سـەرکـردەیەک بەو جـۆرە ڕەفتـار بکات، بۆیە منیش وەک ژنێکی ملکەچ و میهرەبان فەرمانەکانی ئەوم قبوڵ کرد کە بێگومـان پێشـتر قەت وانەبووم. لـەسـەر جۆلانەکەی نووستنی خـۆی هەڵیان گرت و بەرەو گۆڕەپانی جەنگ بردیان و لەوێش "مـارتین ڕوەیس دی گامـبوا"ی زاوای لەسـەر پـشـتی ئەسـپـەکەی بەسـتـایەوە، هەروەک چـۆن وایان لە ڕێزدار کـەمـپـیدۆر کـرد ئاوا. ئـەمـەش تـەنیـا بۆ ئەوەبوو کـە بە ئامـادەبوونـی ئەو لەو جـەنگە، دوژمن بترسـێن. ئیـتر بەو جـۆرە لە پێشـەنگی سـوارەکانیـدا ڕووی لە جەنگ کـرد و نەدەترسـا و ناوی منیشـی هـەر لـەسـەر زاری بوو. بەڵام سـەرەڕای ئـەوانـەش، ئاواتـەکــــەی نەهـاتـە دی و لـەو جـــەنگـەش نەکـــوژرا، بـەڵکو بـە نەخـۆشـیـیـەوە گەڕاندیانەوە کنە من. کـە هێنایانەوە زۆر نەخـۆشـبـوو، لەسـەر دارەبازەیەکی ڕووت و سـەرپێی هەڵیـان گـرتبـوو. ژەهری دۆمـەڵەکـەی قـاچی بە هەمـوو جـەسـتـەیدا بڵاو بـووبووەوە. ئەگـەر پیـاویـکی تر بووایە بێگومـان لەبەر ئازاری لەشـی و مـاندوێتی بـەرەی جـەنگ دەینـاڵاند، بەڵام ڕۆدریگۆ زۆر بەهێـز بوو.

لە سـەرەمەرگیدا پێی گوتم: ئەی ئێنیس، لە یەکەم چرکەساتدا کە تۆم بینی، خۆشم ویستی و بۆ تا هـەتایەش هـەر خۆشـم دەوێیت.

هەروەهـا گـوتی کـە ئەم حـەز دەکـات بەبێ هـات و هـاوار بینێژن و بۆ ئارامـی دەروونیــشـی سـی جــاران کـۆنوێژی لـەســەر بکـەن. مـن مـردنم بە چـاوی خـۆم دەدیت کـە خـۆی نـیشـانی ئەو دەدا، وەک ئەو حـەرفـانەی وا لـەسـەر ئـەو کاغـەزە دەیبینم ئەوهـا تـەمـاوی بوو، وەلێ دڵنیابووم کە هـەوە. ئا لەو کاتەدابوو ئیزابێل گـیـان کـە بانگی تـۆم کـرد، هـەتا بۆ جل لەبـەرکـردنی یارمــەتیم بدەی، چـونکە ڕۆدریگـۆ ڕوحـی زۆر گـەورەبـوو و ئاســەواری نەخـۆشـیـیـەکـەی لە بـەرچاوی خـزمـەتکارەکـان دەرنـەدەخـست و لێ نەدەگـەڕا بێجگە لە مـن و لە تۆ کـە کـچی ئەویت، کەسێکی تر قەڵغان و پۆستاڵە چەرمینە پڕ لۆچەکەی لەبەر بکەن. پاش

ئەوە لەسەر قەنەفەکە دامان نیشاند کە خۆی حەزی پێ دەکرد، خودە و شمشێرەکەشمان لەسەر چۆکی دانا، بۆ ئەوەی بە تەواوی شکۆدارییی خۆیەوە بڕوات و نهێنییەکانی کەنیسە وەرگرێت، هەروەک چۆن پێشتریش ئاوا دەژیا. بەڵێ تارماییی مردن لە نێزیکییەوە لە چاوەڕوانی دابوو تا لە ئامادەکاری ئەودا تەواوبووین، ئەو وەختەی لە ئامادەکردنی بووینەوە، مردن بە لە ئامێزگرتنێکی دایکانەوە بە هەردوو دەستی باوەشی پێدا کرد، ئاماژەی بۆ کردم تا لێی نزیک ببمەوە و دوا هەناسەیم بەرکەوێ. منیش بە سەریدا نووشتامەوە دەمیم ماچ کرد، ماچێکی ئەویندارانە. بەڵێ ئەو لەوماڵەدا مرد، لە نێو ئامێزم، لە کاتی عەسرێی ڕۆژێکی گەرمی هاوینێ.

نەمتوانی بۆ وەسیەتەکەی ڕۆدریگۆ بە وەفابم بەوەی کە ماڵئاوییکردنەکەی بەبێ هات و هاوار بەڕێوە بچێت، چونکە لە هەموو پیاوانی شیلی زیاتر ڕێز و خۆشەویستیی هەبوو. شاری سانتیاگۆ خڕیان هەر زوو بە گریانەوە هاتنەدەر، لە شارەکانی تریش چەندان کۆمەڵ و دەستەی خەم و پەژارەدار هاتن. ئاخر چەند ساڵیک بەر لەوە، خەڵکی ئەو شارانە تێکڕا ڕژابوونە سەر شەقامەکان و بە هەڵدانی گوڵ و تەقەی خۆشی، بە بۆنەی دامەزراندنی ڕۆدریگۆ بە حاکمی ئەوێ، ئاهەنگیان گێڕابوو. ئێمە بە ڕێزلێنانێکی شیاوی خۆی لە کەنێسەی خاتوو - پاکیزەی لێبووردەیی - شاردمانەوە کە بە فەرمانی من و ئەو، بۆ بەرزڕاگرتنی ئەو پاکیزە پیرۆزە، دروستمان کردبوو. وەسیەتم کرد کە ماڵ و سامانێکی زۆر بدرێتە قەشەکانی برایانی خێرخواز، بۆ ئەوەی لە ماوەی سێ سەد ساڵ هەموو حەفتان نوێژی تایبەتی بۆ بکەن، هەتا ڕوح و دەروونی مێردەکەم، ڕێزدار ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا، سەربازی ئازا و سەرکردەی بێ هاوتا و ڕزگارکەر و حاکمی شیلی، ئارام ببێتەوە.

وا پێویست دەکات بە پێش ڕووداوەکان نەکەوم، چونکە ئەگەر بەسەرهاتەکانی ژیانی خۆم بە دروستی و گونجاو نەگێڕمەوە، ڕەنگە لە ڕێگەدا خۆم ون بکەم؛ بۆیە پێویستە گێڕانەوەکەم بە پێی زنجیرەی سروشتی ڕووداوەکان بێت، جا با هزر و هۆشیش کەڵەکەیەکی تێکەڵاو و بێ لۆژیک بن.

من شـــەوان لە ســەر مـێــزەکـەی ڕۆدریگۆ دەنووسم، لـەو کـاتانەدا خــۆم بە فـەروەکەی ئەو دادەپۆشم کە لە لوای ئاژەڵی ئەلبەکە دروست کراوە. بەڵستار پاســەوانی ژوورەکـەمـە، بەڵسـتـار نەوەی دووەمی ئەو سـەگـەیە کـە بۆ شـیلی هێنابووم و ماوەی چواردە ساڵی ڕێک لەگەڵم دابوو. بەڵستاری یەکەم لە ساڵی ١٥٥٣ گـیانی لـەدەست دا، واتە هـەمـان ئەو سـاڵەی کە بالدیبیـایان کـوشت، بەڵام چاکبـوو ئەو نەوەیەی بۆ بەجێ هێشتم. توخمی ئەو سـەگانە بە کەلەش گـەورەن و پـەلوپۆیان ئەســتـوورە و تووکـیـان درە. ئەو مـاڵەم، ســەرەڕای ئەو هەمـوو مـافـوور و ڕایەخ و پەردە و مـەخـمـەڵە هەڵواسـراوەکـان و ئاگـردانی خـۆگـەرمکردنەوە، کـە بەردەوام خـزمـەتکارەکـان ڕەژووی تێ دەخـست، بەڵام هەرسـارد بوو. ئیـزابێل گـیـان، زۆر جـاران سـەخـڵـەت دەبووین، چونکە لە گـەرمـان هـەناسـەمـان بۆ نەدەدرا؛ دیارە دەبـێ سـاردی و سـەرمـا لە هـەوادا نـەبووبـێت، بـەڵکو لـە ناخـی مـندابن. مـن دەتـوانم یادەوەری و هـزرەکـــانم بـە مـەرەکـەب و کـاغـەز تۆمـار بکەم. ئەمــەش لە سـایـەی قـەشـە گـۆنزالس دی مـارمـۆلیـخـۆ بوو کـە کـاتێکی زۆری بۆ تەرخـان کردبووم و شـانبـەشـانی بە نەسرانیکردنی وەحشییەکان و یارمـەتیدانی مـەسیحییەکـان، فێری خوێندنی کردم. گۆنزالس ئـەو وەختـە تەنیـا قەشـەیەکی ئاسـایی بوو، وەلێ کۆڵی نەدا و بووە یەکەم مەترانی سـەرتاسـەری شیلی و دەوڵەمەندترین پیاوی ئەو شانشینە کە دوایێ بۆتی دەگێڕمەوە. ئـەو قەشـەیە وەختێ کـە مـرد شـتێکی لەگەڵ خـۆی نەبردە نێو گۆڕەکەی، بەڵام بە کردەوە چاکەکانی شـوێنەوارێکی نایابی بەجێ هێشت کە لـە خـۆشـەویسـتیی خـەڵکەوە وەری گـرتبوو. چونکە مـرۆڤـەکـان لە دواجـاردا هـەر خـاوەنی ئەو شـتـانەنـە کە پێـشکێشـی خـەڵکانی تـری دەکەن، هـەروەک چۆن ڕۆدریگۆش لە پیاوە هـەرە بەخشندەکان بوو.

با لـە ســـەرەتاوە، لـە یەکــەمـین یادەوەرییـــەکــانم دەست پـێ بکـەین. مـن لە بلاســینشــیـا، لە باکـووری ئیـســتـریمادۆرا لە دایک بوویمە، کــە شـارێکی ئیـسـپـانیـایی ســەر سنوورە و خــەڵکەکـەی بە جـەنگاوەری و ئاینپـەروەری ناسـراون. مــاڵی باپیـرەم کــە من تێـیـدا گــەورە بووم، چەنـد هـەنگاوێ لەو

کاتدرائییەیە دووربوو کە لە خۆشەویستییان پێیان دەگوت: کاتدرائییەی کۆن، هەرچەندە مێژووی دروستکردنەکەی بۆ سەدەی چواردە دەگەڕایەوە. من لە ژێر تاوەرە غەریبەکەی کە بە بەردی نەخشێنراو داپۆشراوە، پەروەردە کراوم. من چیتر نە شووره پان و بەرینەکەی کە شار دەپارێزێ و نە مەیدانی گۆڕەپانی گەورە و نە شەقامە تاریکەکانی و نە کۆشکە بەردینەکانی و ڕیڕەوی ژێر تاق و پردەکانی و نە خانووە بچووکەکەی باپیرەم بینییەوە کە هێشتا نەوەکانی خوشکەکەم وا لێی دەژین. باپیرەم پیشەوەری دارتاشی کەلوپەلی نێومالّ بوو و سەر بە کۆمەڵەی - برایانی خاچی ڕاسەقینە - بوو کە ئەوەش شەرەفێکی گەورەتر بوو لە پێگە کۆمەڵایەتییەکەی. بارەگاکەشیان لە کۆنترین دێری شارەکە بوو. ئەو کۆمەڵەی برایانە لە حەفتەی پیرۆزدا نمایشی ئاینیی پێشکێش دەکرد. لەو ڕۆژانەدا باپیرەم سەرپۆشێکی وەنەوشەیی لەسەر دەنا و پشتێنێکی زەردی لە پشت دەکرد و جووتێ پەنجەوانەی سپیشی لە دەست دەکردن و یەکێک بوو لەوانەی کە خاچە پیرۆزەکەی هەڵدەگرت. پەڵەی خوێنی وشک بە عەباکەیەوە دیاربوو، خوێنی جێ قامچی لەخۆدان، بەڵکە هەست بە ئازارەکانی ئەو وەختەی مەسیح بکات کە بۆ لە خاچدانیان دەدا. لە حەفتەی پیرۆزدا دەرگەی ماڵەکان گاڵە دەدرا هەتاکو تیشکی خۆر نەچێتە ژوورێ، خەڵکەکەش بە ڕۆژوو دەبوون و بە چرپە لەگەڵ یەکتری دەدوان؛ هەموو ژیان دەچووە کەشێکی ستایشکارانە و هەناسەی قووڵ و بەخۆداچوونەوە و قوربانیدان. لە ڕۆژێکی هەینی خەماویدا، ئەسۆنسینی خوشکم لە خەو هەڵسا، ئەو کاتە تەمەنی یازدە ساڵان بوو و شوێنەواری برینی مەسیح بە ناولەپەکانییەوە دیاربوو، برینێکی کراوە و ترسناک و چاوە سپییەکانیشی بەرەو ئاسمان وەرگەڕابوون. دایکم بە دوو شەقازللە هۆشی هێنایەوە سەری و بە تەونی جاڵجاڵکە بە سیستەمی گەرمکردنێکی زۆر بە ئاوی بەیبوون، چارەسەری کرد. ئەسۆنسیۆن هەتا برینەکانیشی ساڕێژبوون هەر لە ماڵەوە مایەوە و دایکیشم نەیدەهێشت ئەو ڕووداوە لە دەرەوە باس بکەین، چونکە نەیدەویست ئەم کەنیسە و ئەو کەنیسە بە کچەکەی بکەن. ئەسۆنسیۆن تاکە

کچ نەبوو لەو ناوە ئاوا برینی هەبێت، چونکە هەموو ساڵێک لە حەفتەی پیرۆزدا کچێک لە کچەکان شتێکی وای بەسەردەهات، کە دەتگوت بالۆنە لە عەردی بەرز دەبێتەوە، یان بۆنی گوڵاوی دەردەدا، یان جووتێ باڵی لێ شین دەبوو؛ ئیتر دەبووە نیشانەیەک بۆ حەماسەتی بڕوادارەکان. بە گوێرەی ئەو شتانەی کە من بەبیرم دێت، ئەو کچانە، جگە لە ئەسۆنسیۆن، هەموویان بوونە قەشەژن لە دێرەکان. ئەسۆنسیۆن بە هۆی وریایی دایکم و بێدەنگی خانەوادەکەمان لەو موعجیزەیە چاک بووەوە و پاشان شووی کرد و چەندان منداڵی بوو، یەکێک لەوانە کۆنستانسای کچە خوشکمە کە لەمەودوا لەو چیرۆکە ناوی دێت.

من ئەو کۆبوونەوە ئاینییانەم بە بیردێتەوە، چونکە لە یەکێکیاندا "خوان"م ناسی، ئەو پیاوەی کە قەدەر وای کرد ببێتە مێردی یەکەمم. ئەمە لە ساڵی ١٥٢٦ بوو، ئەو ساڵەی کە ئیمپڕاتۆر کارلۆسی پێنجەم لەگەڵ کچە جوانەکەی پووری خۆی "ئیزابێل" زەماوەندی کرد و بە درێژاییی ژیانی هەر خۆشیویست. هەر لەو ساڵەدابوو کە سوڵتان سلێمان قانوونیی مەزن بە هێزە تورکییەکەیەوە تا ناوەڕاستی ئەورووپای داگیر کرد و هەڕەشەی لە ماڵی مەسیحییان دەکرد. پڕۆپاگەندەکانی ئەو وەختە لە بارەی دڵڕەقی ئیسلامەکان، خەڵکەکەی تۆقاندبوو، وای لێ هات ئێمە خەیاڵمان بۆ ئەوە دەچوو کە ئەو دەستە و تاقمە شەیتانییانە لە دەوری شوورەکانی بلاسینیا ببینین. لەو ساڵەدا خووگرتن بە ئاین و گەرموگوڕی دینداری، بە بارێکی ترسەوە، گەیشتبووە لێوارەکانی شێتبوون.

لە نێو ئاپۆرەی ئەو نمایشە ئاینییەدا دەڕۆیشتم و لەبەر بەرۆژووبوون و دووکەڵی مۆمەکان و بۆنی خوێن و بخوور و دەنگی سرووت و ئاه و ناڵەی ئەوانەی بە قامچی لە خۆیان دەدا، گێژبووبووم. وەک کەسێکی خەواڵوو بە دوای خانەوادەکەمدا دەڕۆیشتم. لە ناو حەشاماتی باوەڕداران و تۆبەکاران، لە هیکرا چاوم کەتە سەر خوان. نەدەبوو نەیبینم، چونکێ باڵای بستێک لە هەموو خەڵکەکە درێژتر بوو و سەری لەو نێوەندەدا بە ئاشکرا دیار بوو.

پشتێنێکی جەنگاوەرانە و پرچێکی بە گروازە و تۆخ و لووتێکی ڕۆمانیانی و هەبوو و بە دوو چاوی لە چەشنی پشیلەی وەڵامی نیگاکانی منی دایەوە. بە دەست ئاماژەم بۆ لای ئەو کرد و بە دایکمم گوت: ئەوە پیاوە کێیە؟ وەڵێ وەڵامی دایکم ئەوەبوو: دەستێکی لە ئانیشکم دا و فەرمانی پێ دام کە چاوەکانم داخەم. من ئەو وەختە دەستگیرانم نەبوو، چونکە باپیرەم بڕیاری دابوو کە مێرد نەکەم و وەک کورێک لە خزمەتی ئەودابم تا ژیانی تەواو دەکات، لە شوێنی ئەو نەوەیەی کە ئەو بە تەمای بوو. ئەوندە پارە و سامانەشی نەبوو کە هەردوو کچە نەوەکەی پێ بە مێرد بدا و خەرجییەکانیان لە ئەستۆ بگرێت. بۆیە بڕیاری دا کە ئەسۆنسیۆن هەلی شووکردنی لە من زۆرترە، چونکە لە من خڕوپڕتر بوو و جوانییەکەی لە لای پیاوان ڕەواجی هەبوو و کەسێکی گوێڕایەڵ بوو؛ بەڵام من بە بەراورد لەگەڵ ئەودا هەر ئێسک و دەمار بووم و وەک هێستریش سەرکێش و چەتوون بووم. من هەروەک دایک و داپیرم وابووم، ئەوانیش لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی ژنایەتی نموونەی باش نەبوون. ئەو کاتە دەیانگوت کە جوانترین شت لە جەستەی من، چاوە تۆخەکان و پرچەکەم بوون کە لە بژی جوانەماینەکەم دەچوو. ئەو جۆرە جوانییەش نیوەی کچانی ئیسپانیای دەگرتەوە. بەڵام ئەگەر ڕاستییەکەی بڵێین من کچێکی دەستڕەنگین بووم، چونکە لە شاری بلاسینشیاو دەوروبەریشی کەسێکی تر نەبوو بە قەد من ئەوها بەرگدروویەکی باش بێت. بەڵێ بەو پیشەیەوە هێشتا تەمەنم هەشت ساڵان بوو، بەشداریم لە خەرجییەکانی خێزانەکەمان دەکرد و بڕێکیشم بۆ ئەو ڕۆژە پاشەکەوت دەکرد کە باپیرم ئامادە نەبوو لە ئەستۆی خۆی بگرێت. من بڕیارم دابوو مێردێک بۆ خۆم پەیدا بکەم، چونکە چارەنووسی ململانێکانی ژیانم لەگەڵ منداڵەکانم لەکن خۆشتر بوو لەو چارەنووسەی کە لەگەڵ باپیرە خەڵەفاوەکەم تووشی دەبووم. لەو ڕۆژەی حەفتەی پیرۆزدا بێ ئەوەی گوێ بدەمە داخوازییەکانی دایکم، ئاوڕێکم لە پیاوە نەناسراوەکە دایەوە و خەندەیەکم هێنایە سەر لێوەکانم. ئیتر بەو جۆرە دڵداریم لەگەڵ خوان دەستی پێ کرد، کە بە ئەسڵ

خەڵکی شاری مەلەگە بوو. لە سەرەتادا باپیرم زۆر بەرهەڵستی کردم و ژیان لە ماڵی ئێمەدا بووە ژیانی نێو شێتخانە؛ لە هەموو لایەک توانج و جوێن و پەلار تێککگرتن بوو، لەگەڵ قایم پێوەدانی دەرگەکان درزێک لە یەکێ لە دیوارەکان دروست بووبوو، خۆ ئەگەر دایکم نەبووایە کە بەردەوام نێوانمانی دەکرد، ڕەنگە لە من و باپیرەم یەکێکمان ئەوی تری لە ناوببردایە. من بەردەوام تەنگەتاوم دەکرد تا ئەو ڕادەیەی کە ناچاربوو لە کەلی شەیتان بێتە خوارێ و ڕازی بێت. نەمدەزانی کە خوان بە کوێی من سەرسامە، وەلێ ئەوەیان گرینگ نەبوو. ئەوەبوو لە پاش یەکترناسین ڕێککەوتین کە لە دوای ساڵێک زەماوەند بکەین. ئەو ماوەیە بۆ ئەو زۆر پێویست بوو بەڵکە کارێک بدۆزێتەوە و بۆ منیش هەتا خەرجییە پێویستەکان ئامادە بکەم.

خوان یەکێک بوو لەو پیاوە ڕووخۆش و بە سیمایانەی کە هیچ ژنێک لە سەرەتای ناسینی نەیدەتوانی دەستەمۆی نەبێت، بەڵام دواتر خۆزگە دەخوازێ بکەوتایە بەختی پیاوێکی تر، چونکە ئەو جۆرە پیاوانە دەبنە سەرچاوەی چەندان نائارامی و ژیانیان لەگەڵدا خۆش نییە. ئەو پیاوە لە فڕوفێڵ و هەر شتێکی تر هەراسان نەدەبوو و هەر تەنیا ئامادەسازی پڕ لە زەوقی نێرانەی ئەو بەسبوو بۆ ورووژاندنی ژنان. لە چواردە ساڵییەوە کە تازە سیمای پیاوانەی لێ دەردەکەوتن، گەنجیکی بەرچاو و سەرنجڕاکێش بوو. ئیتر هەر لەو کاتەوە کەوتە دەستەمۆکردنی ژنان و لەسەر خەرجیی ئەوان دەژیا. هەموو جارێ بە پێکەنینەوە دەیگوت کە ژمارەی ئەو پیاوانە نازانێت چەندن کە ژنەکانیان بە هۆی ئەمەوە شاخیان بۆ دروست کردوون، ناشزانێ ژمارەی ئەو ئاهەنگانە چەندن کە لە مێردە غیرەتدارەکان خۆی دزیوەتەوە و هەڵاتووە. بۆ دڵدانەوەی منیش، لەو کاتەی کە بە تیلەی چاو سەیری خوشکەکەمی دەکرد، دەیگوت: بەڵام ئەوانە هەموو کۆتاییيان هات و وا لەگەڵ تۆدام، هەی ژیانی من. ڕووخۆشی و جوانی ئەو بووبووە مایەی ڕێزگرتنی لە لایەن پیاوەکانیش. مەیخۆر و قومارچییەکی لێهاتوو بوو و لیستێکی بێ کۆتایی لە چیرۆکی پڕ لە بوێری لەبەر بوو. پلانی ئەوەندە ژیرانەی هەبوو زۆر بە ئاسانی پارە و

سامانی چەنگ دەکەوت.

خوان لە پرێکا درکی کرد کە ئاراستەی زەینی رووی لە ئایندەیە و هەمیشە نارەزایە. ئەویش وەک زۆرێک لەو کەسانەی ئەو رۆژگارە، لەسەر چیرۆکی خەیاڵی دەژیا، ئەو شوێنەی کە سامانی زۆر و ژیانی بە ئەتەکێت لە بەردەستی ئەو کەسانەیە کە چاونەترس و ئامادەی گیانبازینە. هەروەها وا خۆی دەهاتە بەرچاو کە ئەم پیاوی کارە مەزنەکانە، هەروەک کریستۆفەر کۆڵۆمبس کە تەنیا سەرمایەکەی ئازایەتی بوو، لە دەریای دا و لە نیوەکەی تری جیهان خۆی دۆزییەوە، یان وەک هێرنان کۆرتیس وەختێ مەکسیکی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی کە بە بەهاترین گەوهەری ئیپراتوریەتی ئیسپانیایە.

هەوڵم دەدا لەو فکرانەی پەشێمانی بکەمەوە و دەمگوت: دەڵێن هەموو شتێکیان لە دیوەکەی تری جیهان دۆزیوەتەوە.

دەیگوت: ئەی ئافرەت، چەند ژنێکی نەزانیت! هێشتا ئەو هەرێمانەی کە دەستیان بەسەردا نەگیراوە زۆرترن لەوانەی کە داگیرکراون. لە پەنەماوە بۆ خواروو هێشتا زەوی وای تێدایە دەستی کەسی پێ نەگەیشتووە و ئەوەندە سەروەت و سامانی تێدایە لە هی "سلێمان"یش پتر.

پرۆژەکانی خوان دەیانترساندم، چونکە دەبوونە مایەی جیابوونەوەمان. سەرەرای ئەوەش من لە باپیرم بیستبوو کە ئەویش لە خەڵکی نێو بارەکانی بیستبوو، گوایە ئەزتیکەکانی مەکسیک بەشەری دەکەنە قوربانی. ریزی ئەو قوربانییانە فەرسەخێک درێژ دەبێت، هەزاران دیلی بەدبەخت چاوەرێی گەیشتنە قادرمەی پەرستگاکان دەکەن کە قەشەکان لەوێن - ئەو قەشە تۆقێنەرانەی قژیان درێژ و تێکئالاوە و جەستەیان بە چینێک خوێنی وشکەوەبوو داپۆشراوە و خوێنی تازە دەپاڵێون - دڵی دیلەکان بە چەقۆی بەردین دەردێن و لاشەکانیشیان بە سەر قادرمەکاندا گلۆر دەکەنەوە، ئیتر لە خوارەوە لەسەر یەکتر کەڵەکە دەبن؛ چەندان کۆمەڵ لە گۆشتی ئەو تەرمانە بۆگەنی بوونە و ئەو شارە لە نێو دەریاچەی خوێندا رۆچووە. داڵە گۆشتخۆرەکانیش کە لە خواردنی گۆشتی بەشەر راهاتوونە، ئەوەندە کێشیان

زیادی کردووە ناتوانن بفڕن. لەشی جرجە گۆشتخۆرەکان هێندەی سەگێکی شوانان گەورە بوونە. هیچ هاووڵاتییەکی ئیسپانی نەبوو ئەو ڕاستییانە نەزانێت، وەلێ ئەوانە هەمووی خوانیان نەدەترساند.

لەو ماوەیەدا کە من لە سبەینێوە تا نیوەی شەوێ خەریکی دوورمان بووم و پارەم بۆ زەماوەندەکەمان پاشەکەوت دەکرد، کەچی خوان لە مەیخانە و گۆڕەپانەکاندا هەم لەگەڵ ژنە ناسک و نازدارەکان و هەم لەگەڵ سۆزانییەکانیش خەریکی ئەوینداری بوو و لەگەڵ خەڵکی ناو بارەکان یاری دەکرد و خەونی بە گەشتی نێو دەریا و ڕووکردنە وڵاتی هندەوە دەبینی. بە لێکدانەوەی خۆی، ئەوێ ئەو شوێنە بوو کە شایەنی لێهاتوویی کەسێکی وەک ئەم بێت. هەندێ جار چەند حەفتەیەک، یا چەند مانگێک خۆی بزر دەکرد پاشان بێ ئەوەی هیچ بیانوویەک بۆ دیارنەبوونەکەی بێنێتەوە، دەگەڕایەوە ماڵێ.

بۆ کوێ دەچوو؟ قەت هیچ شتێکی پێ نەدەگوتم، بەڵام چونکە هەمیشە هەر باسی سەفەری نێو دەریای لە سەر زاری بوو، خەڵکەکە گاڵتەیان پێ دەکرد و پێی پێدەکەنین، بە منیشیان دەگوت: دەستگیرانەکەی وڵاتی هندییان. منیش بە پشوویێکی درێژ و زیاد لە پێویست هەموو ئەو ڕەفتارە بێ سەروبەرانەی ئەوم قبووڵ دەکرد، چونکە ئارەزووی تێرکردنی هەوەسی ژنێتیم کوێری کردبووم و جەستەم وەک پشکۆ گڕی گرتبوو، هەروەک هەموو جارێک لە کاتی ئەوینکاریدا بەسەرم دێت ئاوا. خوان بە پێکەنینی دەخستم و بە گۆرانی و شیعری سووتێنەر چێژی دەدامێ و بە ماچیش دەیلاواندمەوە. هەر ئەوەندە دەستی بەر جەستم بکەوتایە، ئیتر بەس بوو بۆ ئەوەی گریانەکانم بۆ ئاهی وەرگرتنی چێژ و تووڕەییشم بۆ شەهوەت بگۆڕێن. چەند چێژدارە ئەو خۆشەویستی و ئەوینداریيەی کە هەموو شتێکت لە بیر دەباتەوە! یەکەم دەستەملانێی خۆمانم قەت لە یاد ناچێتەوە، لەو وەختانەی کە لە نێو دەوەنەکانی دارستاندا خۆمان دەشاردەوە. وەرزی هاوین بوو، خاکی گەرم و بە پیت بە بۆنی ڕووەکی گار مەست و بۆندار بووبوو. هەردووکمان لە

بلاســینیــســیــا لێک جــیــابووینەوە و لەوێ دەرچووین، بۆ ئەوەی بــواری ئەوە نەدەین قســەوقســەڵۆکمــان لەســەر بکەن. لە ســەنگەرەکان دابەزینە خــوارێ و شــارە شــورەدراوەکــەمــان لە دواوەی خــۆمــان جێ هێشــت، لەســەر ڕووبارەکــە گــەیشــتــینەوە یەکــتــری و دەســتــمــان تێکهــەڵکێشــا و بەڕاکــردن بەرە و ناو دەغڵــودانەکــان چووین، ئاخــر بــە دوای شــوێنێکی دووری لاچــەپ دەگــەڕاین. خــوان گەڵای داری کۆ کردەوە بۆ ئەوەی لانەیەکی پێ دروست بکات. جــبەکــەی لەبەرخــۆی داکەنی تا من لە ســەری دانیشــم، پاشــان لەســەرەخۆ هــەندێ کەشــی ئەویــنداری و چێــژوەرگــرتــنی فــێــر کــردم. ئێــمــە هــەندێک زەیتــون و نان و شووشــەیەک بادەمان لەگەڵ خۆ هەڵگرتبوو و کە لە باپیرەمــی دزیبوو، بە قوم لە دەمی یەکتر دەمــانخــواردەوە. ماچکردن، بادە، پێکەنین، لەگەڵ ئەو گــەرمــییــەی لە زەوییــەوە هــەڵدەســتــا و ئێــمــەی ســەرمــەســت و ئــەویــنداریش لــەولا. بلوز و کراســی ژێرەوەی لەبەرداکەنیم و مــەمکەکانمــی لســتەوە. پێی گــوتم: پێکەییــنە و تامیــان وەک شــەراب شــیرینــە، وەلێ لە بەرچاوی من لە دوو دانــە خــۆخــی ڕەق دەچوون. لــە لســتنــەوەم بەردەوام بوو تــا وام بە خــەیــاڵدا هــات کــە لــە لەزەت و خۆشیدا دەمرم. لە یادمــە کە بەســەر گــەڵاکانەوە لەســەر پشت ڕاکشــابوو وای کــرد منیش بە ڕووتی خــۆم بخــەمــە ســەری، هــەمــوو گیــانم بە ئارەقــە و تەڕایی شــەهــوەت تــەڕ بووبوو، ئاخــر ئەو دەیویســت من خــۆم لە ســەری ڕاگــرم و ڕێتــمی ســەمــاکەمان ڕێک بخــەم. ئیــتر بەو جۆرە هێدی هێدی وەک ئەوەی یاری بکەین، بە بێ ترس و بێ ئازار پەردەی کچێنیم نەما. لە ساتەوەختی دواچێژدا، چاوم بۆ گومــەتــی دارســتــانە ســەوزەکە هەڵبــڕی، کە لە ســەریەوە ئاســمــانی گــەشــی هــاوینە بوو، بەو پەڕی شادییەوە هــاوارێکی درێژم کرد.

من لە دووریی خــوان ســۆزم ســارد دەبووەوە و تووڕەییم تاوی دەســەند و بۆ دەرکــردنی ئــەو لە ژیانی خــۆم پێم دادەگــرت؛ بەڵام وەختــێ بیــانوویەکــی بێ کــەڵکی دەهێنایــەوە و بە دەســتــە شــارەزاکــانی وەک ئەویــنداری‌کی زانا لەگــەڵم دەکەوتە دەستگەمــە، دەســتــەمــۆی دەبوومــەوە. ئیــتــر بەو جــۆرە ســووڕێکــی تری ئەویــنداریمان وەک ئــەوانی پێــشــوو ســـاز دەکــرد: لەخـــشــتـــەبردن، بەڵێن،

خۆدانەدەست، دڵخۆشی ئەوینداری، خەمخواردن و جیابوونەوەیەکی تازە. ساڵی یەکەم بەسەرچوو بێ ئەوەی وادەیەک بۆ زەماوەندەکەمان دیاری بکەین. پاشان ساڵی دووەم و سێیەمیش هەر ئاوا بەسەرچوون. لەو ماوەیەدا ناو و دەنگم زۆر نزم بووبووەوە، چونکە خەڵک دەیانگوت گوایە ئێمە لەو دیو دەرگە داخراوکانەوە کاری نابەجێ دەکەین. ئەمەیان ڕاست بوو، وەلێ قەت کەسێک بەڵگەیەکی سەلمێنەری بەدەستەوە نەبوو، چونکە زۆر ئاگەداری خۆمان بووین. ئەو ژنە قەرەجەی کە خۆی پێشبینی تەمەنێکی درێژی بۆ دەکردم، هەر ئەو نهێنی ڕزگاربوون لە سکپڕی پێ فرۆشتم: بردنە ژوورەوەی پارچەیەک ئیسفەنجی بە خەل تەڕکراو بۆ نێو لەش. من لە ئەسۆنسیۆنی خوشکم و دەستەخوشکەکانم فێر بووبووم کە باشترین ڕێگە بۆ زاڵبوون بە سەر پیاودا ئەوەیە کە خۆتی نەدەیە دەست، بەڵام "ژنە قەدیسی شەهید"یش نەیدەتوانی ئەوە لەگەڵ خوان دی مەلەگە بکات. ئەوە من بووم کە هەلەکانم دەرەخساند بۆ ئەوەی بە تەنیا بین و خەریکی ئەوینداری بین، جا لە هەر شوێنێک بووینایە، نەک تەنیا لە پشت دەرگەکان. ئەو لێزانینێکی دەگمەنی هەبوو، نموونەی وەک ئەوم لە هیچ پیاوێکی تر نەدیت کە لە ماوەی چەند خولەکێکی کەم بە هەر بارێک بووایە ئەو خۆشییەم بداتێ. خوان زیاتر بایەخی بە چێژوەرگرتنی من دەدا لە هی خۆی. نەخشەی جەستەی منی ئەزبەر کردبوو و فێری کردم کە چۆن خۆم بە تەنیا بگەمە ئەو چێژانە. هەمیشە دووبارەی دەکردەوە و دەیگوت: ئەی ئافرەت، سەیرکە چەندە جوانی. من لەگەڵ ئەو ڕایە مەراییکارەی ئەو نەبووم، وەلێ شانازیم بەوە دەکرد کە دەتوانم ئارەزووی جوانترین پیاوی هەرێمی ئێستریمادۆرا بورووژێنم. خۆ ئەگەر باپیرەم بیزانیبایە ئێمە وەک کەروێشک ڕەفتار دەکەین هەتا لە گۆشە تاریکەکانی کەنێسەش، ئەوا هەردووکمانی دەکوشت؛ چونکە ئەو لە بارەی مەسەلانەی پەیوەندییان بە شەرەفەوە هەبوو زۆر توندڕۆبوو. ئەو شەرەفە بە ڕادەیەکی زۆر ڕەوشتی ژنە حەیاگرانەکانی خانەوادەکەمان بوو، لەبەرئەوە وەختی یەکەم هەواڵی من لە زمانی خەڵکەوە بە گوێیە مودارەکانی گەیشت، لێوان لێو بوو لە ڕقی پیرۆز و

هەڕەشـەی لێ کـردم بە زەبری لێـدانی کـوتەک بمنێـرێتـە دۆزەخ و پێی گـوتم: لەککەی شەرەف تەنیا بە خوێن پاک دەبێتەوە. وەلێ ئەو کاتە دایکم کە دەستی لە کـەلەکـەی گـرتبـوو و بەو نیگایەوە تێی ڕوانی کـە کـەڵەگـاشـی لە کـاتی هەڵمـەتبردندا دەخست، بـەر سینگەی لێ گـرت، بۆ ئەوەی نیشـانـی بدات کە باشترین ئامادەکاریم بۆ زەماوەند هەیە، تەنیا پێویستیم بەوەیە کە خوان بێتە ڕایێ و ڕازی بێت. ئیـتـر باپیرەم لە ڕێگەی هاوڕێکانی لە کـۆمـەڵەی "برایانی خاچی ڕاستـەقینە"، کە پیاوی دەستڕۆیشـتوو بوون لە بلاسـینسیا، هەوڵی دا دڵی دەستگیرانەکە ڕاڕایەکەم نەرم بکات و بە پەلە بمگوازێتەوە.

لە ڕۆژێکی سامـاڵی سێشـەممەیەکی مـانگی ئەیلولدا زەماوەندمـان کرد، ئەو ڕۆژە تایبەتبوو بە بازاڕکردن لە گۆڕەپانی گەورە، لەو وەختـەی کە بۆنی گوڵ و مــیــوەجــات و ســەوزەی ناسـک بە هـەمــوو شــاردا بڵاو بووبـووەوە. لە دوای ئاهەنگی زەماوەنـدەکە، خوان منی بردەوە مـەلەگە کە لەوێ لـە ژووریکی بەکرێ گیرسـاینەوە. ئەو ژوورە پەنجەرەکانی بەسـەر شـەقـامـەکەدا دەیڕوانی، هـەوڵم دا بە پەردەی جـوان و تاقـمی ناومـاڵ بیـرازێنمـەوە کە بـاپیرم لە کـارگـەکەی خـۆی دروسـتی دەکـردن. خـوان شـوێنی خـۆی وەک مـێردێک گـرتـەدەست بێ ئەوەی جگە لـە ئاواتە خـەیاڵیـیـەکـانی، هیچ مـوڵکێکی هەبێت، بەڵام حـەمـاسـەتێکی نێــرانەی هـەبوو، هـەرچـەندە ئێـمــە وەک ئـەوەی دوو هـاوســەری کــۆن بـین، یەکـتـرمـان چاک دەنـاسی. هەندێ ڕۆژ چـەندان سـەعـات ڕادەبوورد و ئێـمـەش هـەر خــەریکی زەوق و کــاری ئەویـنداری بووین و کــاتی ئـەوەمــان نەبـوو جلەکانمان لەبەربکەین، بەڵکو هەر لە نێو جێگەدا نانمان دەخـوارد. سەرەڕای ئەو هـەمــوو ســۆزە، زوو تێگـەیشــتم کــە ئەو هـاوســەرگــیـریـیــە، لە ڕووی بەرژەوەندییـەکانمەوە کـارێکی هـەڵە بووە. هیچ شـتـێکی تازەم لە خـوان بەدی نەکـرد، چونکە ئەو لـە ســاڵانی ڕابردوو ســروشــتی ڕاســتــەقـینەی خــۆی پێ ناسـاندبـووم، وەلێ دیتنی کـەموکـووڕییـەکانی ئەو لە دوورەوە زۆر جـیـاوازبوو لەوەی کە لەگەڵی دەژیایت. تاکە لایەنی چاکی مێردەکەم وەک بەبیرم دێت، ئەو غەریزەیە بوو کە دەیتوانی لە نێو نوێندا چێژم بداتێ و ئەو دیمەنـەشی بوو کە

دەتگوت پاڵەوانی کەڵەگاکانە و لە سەرنجدانی ماندوو نەدەبووم.

دایکم رۆژێکیان کە هاتبووە سەردانم ئەوهای ئاگەدارکردمەوە: کچم، ئەو پیاوە زۆر بێ کەڵکە!

– ئەگەر چەند کوڕیکم لێی ببێت، شتەکانی ترم لەکن گرینگ نییە.

دایکم لەسەر ڕایەکەی خۆی پێی داگرت و گوتی: ئەوجا کێ منداڵەکانت بەخێو دەکات؟

منیش لە ڕووی وەستامەوە و گوتم: من خۆم بەخێویان دەکەم. بۆ ئەوەیە کە دەرزی و داوم هەیە.

من لەوە ڕاهاتبووم کە لە خۆرهەڵاتەوە تا ئاوابوونی کار بکەم، بای ئەوەندەشم ناسیاو و کڕیار هەبوون کە بێ کار نەبم. سەرەڕای ئەوەش، کولێرەی بە گۆشت و پیازم دروست دەکرد و لە فڕنییە گشتییەکەدا سوورم دەکردنەوە و سبەینان زوو لە گۆڕەپانە گەورەکە دەمفرۆشتن. بە هۆی پەیداکردنی ئەزموونەوە بە ڕێژەیەکی گونجاوی ئارد و ڕۆن هەویرێکی یەکانگیر و نەرم و تەنکم ساز دەکرد و ئیتر کولێرەکانم ڕەواجێکی باشیان پەیدا کرد؛ ئەوەبوو لە ماوەیەکی کەمدا ئەو داهاتەی لەوەم دەست دەکەوت زۆرتر بوو لە داهاتی بەرگدروونەکەم.

پەیکەرێکی دارینی ژنە پاکیزەی گەورەمان، خاوەنی موعجیزە زۆرەکانم پێشکێشی دایکم کرد، بەڵکە زگەکەم پیرۆز بکات، بەڵام بێگومان دیارە خانمی پاکیزە بە کاروباری گرینگتر سەرقاڵ بووە، چونکە پاڕانەوەکانی منی پشتگوێ خست. دوو ساڵ دەبوو پارچە ئیسفەنجی خەلدارم بەکار نەدەهێنا، وەلێ منداڵێکم بە زگ نەکەوت. ئەو سۆزدارییەی من و خوان لەگەڵ یەکتر دەمانگۆڕییەوە، وردە وردە بۆ نائومێدبوونی هەردووکمان گۆڕا. هەرچەند داواکاریم زیاتر دەبوو و کەمتر لێیم دەبووری، ئەویش زیاتر لێم دوور دەکەوتەوە. دواجار بە دەگمەن نەبێ نەمدەدواند، بەڵام ئەو بە هات و هاوارەوە قسەی لەگەڵ دەکردم، وەلێ نەدەوێرا لێم بدات، چونکە دوایین جار کە ویستی

دەستی لێم بەرز کاتەوە، بە مەقڵییە ئاسنینەکە لە سەریم دا، هەروەک چۆن کاتی خۆی داپیرەم لە باپیرەمی دابوو، پاشان دایکیشم وای لە باوکم کردبوو ئاوا. دەیانگوت باوکم بە لێدانی ئەو مەقڵییە بەجێی هێشتین و هەرگیز جارێکی تر نەمانبینییەوە. خانەوادەکەی من لەم بارەیەوە جیاوازبوو: پیاوەکان لە ژنانیان نەدەدا، بەڵکو تەنیا لە منداڵەکان. ئەو لێدانەی من لە خوان زۆر بە هێز نەبوو، زیاتر لە گەمە دەچوو، بەڵام چونکە مەقڵییەکە گەرم بوو، برینێکی سووتماکی لە ناوچەوانی خوان جێ هێشت. ئەو سووتانە ناشیرینە بۆ پیاوێکی جوانی وەک ئەو مایەی پەژارە بوو، وەلێ ناچاری کرد کە ڕێزم لێ بگرێت. ئەو لێدانە سنوورێکی بۆ هەڕەشەکانی ئەو دانا، وەلێ پێی لێ دەنێم کە نەبووە هۆی باشکردنی پەیوەندییەکانمان؛ چونکە هەر جارێک دەستی بە شوێنە سووتاوەکە دەکەوت، ئاگر لە چاوی دەباری. لە تۆڵەی ئەوەدا لەو چێژانە بێ بەشی کردم کە پێشتر بە میهرەبانی پێمی دەبەخشی. لەو کاتەوە ژیانم گۆڕا حەفتە و مانگەکان بە گرانی بە سەرمدا ڕەت دەبوون وەک ئەوەی بە کاری قورسی لە چەشنی سەوڵ لێدانی کەشتییەکان حوکم درابم ئاوابووم، تەنیا هەر کارکردن و شتێکی تر نا. هەمیشە خەمبار بووم، چونکە نەزۆک و نەدار بووم. خەیاڵبلاوی و قەرزەکانی مێردەکەم بووبوونە ئەرکێکی گرانی سەرشانم، چونکە نەمدەویست لە بەرامبەر خاوەن قەرەزەکان شەرمەزار بم. ئەو شەوە درێژانەی کە ماچمان تێدا دەگۆڕییەوە و ئەو سبەینانەی کە بە تەمبەڵی لە نێو جێگە دەمانەوە، چوون و نەگەڕانەوە؛ زۆر بە کەمی و بێ چێژ جووت دەبووین، هەردەتگوت بەزۆر لاقەم دەکات. من ئەوانەم هەمووی لە پێناوی بەزگکەوتنی کورپەیک قبوڵ دەکرد. ئێستاش وەختێ وام لێ هات کە بتوانم لە سەراپای ژیانی پڕ لە ئارامی پیرێتی خۆم ڕابمێنم، درک دەکەم کە پیرۆزکردنی ڕاستەقینەی "پاکیزە" بۆ من ئەوەیە کە لە منداڵ بێ بەش بم، بۆ ئەوەی قەدەرێکی دەگمەنم بۆ بڕەخسێنێ. ئاخر ئەگەر کوڕم هەبووایە، دەبوو لە دوای ئەوەی خوان دی مەلەگە بە جێی هێشتم، وەک هەر ژنێک هەمیشە کۆت و بەند بکرێم، دەبوو

لەسەر دوورمان و دروستکردنی کولێرەش بەردەوام بوومایە، ئەو کاتەش نەمدەتوانی ئاوا شانشینی شیلی بخەمە ژێر دەستم.

مێردەکەم بەردەوام وەک گەنجێکی پۆشتە تراشی دەکرد و وەک نەجیبزادەیکیش پارەی خەرج دەکرد، چونکە دڵنیابوو کە من هەرچی لە دەستم بێت دەیکەم بۆ ئەوەی قەرزەکانی بدەمەوە. زۆری دەخواردەوە و هاموشۆی شەقامی سۆزانییەکانی دەرکرد، بە جۆرێک وا ڕاهات کە بۆ چەند ڕۆژێک خۆی لەوێ ون بکات و منیش دەبووایە پارە بدەمە هەندێ لە خزمەتکارەکان تا بە دوایدا بگەڕێن. بە جەستەی پڕ لە ئەسپێ دەیانهێنایەوە لام و بە ناچاری پاکم دەکردەوە. چیتر بە سەرسوڕمانەوە سەیری سینگ و جەستەیم نەدەکرد و وام لێ هات ئیرەییم بە ئەسۆنسیۆنی خوشکم دەبرد کە مێردێکی لە چەشنی بەرازە کێوی هەبوو، بەڵام پیاوێکی ئیشکەر و باوکێکی میهرەبان بوو بۆ منداڵەکانی. خوان زۆر بێزار بووبوو و منیش بێ ئومێدتر لەو، بۆیە ڕێم لێی نەگرت وەختێ بڕیاری دا بچێتە وڵاتی هندییان و بە دوای "ئەلدۆرادۆ"دا بگەڕێ، ئەو شارەی ساف لە زێڕ دروست کراوە و منداڵەکانیان بە یاقووت و بەردی زەمرووود یاری دەکەن. لە دوای چەند حەفتەیەک، لە نێوان نیوەشەو و نوێژی بەیانیان، دەستەیەک جل و ئەو پارانەی کە لە پەناگەکەی پشت ئاگردانەکە پاشەکەوتم کردبوون، هەڵی گرت و بێ ئەوەی خواحافیزیم لێ بکات بەڕێکەوت.

دواجار خوان توانی نەخۆشی خەون و خەیاڵەکانی تووشی منیش بکات، هەرچەندە قەت کەسێکم نەبینیبوو بە دەوڵەمەندی لە وڵاتی هندەوە هاتبێتەوە؛ بە پێچەوانەوە هەموویان بە کلۆڵی و نەخۆشی و شێتی دەگەڕانەوە. ئەوانەیش کە سامانێکیان کۆ دەکردەوە لە دەستیان دەچوو و خاوەن مولّکەکانی زەویوزاریش نەیاندەتوانی ئەو مولّکانە لەگەڵ خۆیان بهێننەوە ئیسپانیا. لەگەڵ ئەوەش، ئەو هەموو هۆکارانە لە بەردەم هێزی ڕاکێشانی جیهانی تازەدا دەبوونە هەڵم. ئەدی ئەوە نییە کە گالیسکەکان بە باری ئەو پارچە زێڕانەوە بە شەقامەکاندا تێ دەپەڕن کە لە وڵاتی هندەوە هێنراون؟ من وەک

خــوان باوەڕ ناكــەم كــە شـــارێكی لـە زێڕ دروســـتكراو هـەبێت و ئاوێكی سـیـحـراویـشـی هـەبێ بۆ هـەتـا هەتایە گـەنجت بكاتـەوە و ژنـی ئەمـازۆنی واش هەبێت چێژ بدەنە پیاوان و پاشـان خشڵ و گەوهـەرت بـدەنێ، ئەوجا تـەڵاقیـان بدەی، بەڵام گــومـــان دەكــەم كــە لەوێ شـــتی نرخـــدارتر هەیە: ئەویش سـەربەسـتییـە. ئاخـر هەمـوو كەسێك لە وڵاتی هند خۆی گـەورەی خۆیەتی، پێویست ناكات بۆ هیچ كەس كڕنۆش ببەی و دەتوانی چەند هـەڵەیەک بكەی پاشان لە نوێوە دەست پێ بكەیتـەوە و ببیتە كەسێكی تر و ژیانێكی تر بگریتە بەر. لەوێ كەس شـوورەیی بۆ ماوەیەكی درێژ هـەڵناگرێ، بگرە شـەرمەزارترین كەس بۆی هەیە خۆی باڵا بكاتەوە. خوان هەموو جارێ دەیگوت: جگە لە كڵاوە ڕیشدارەكەم شتێكی ترم لە بان سەری نییە.

چۆن دەتوانم لەســەر ئەو جـەربەزەییـە ســەرزەنشـتی مێـردەكەم بكەم كـە خۆشم ئەگەر پیاو بامایە دەستم پێی دەكرد؟

لە دوای ڕۆیشتنی خوان، بۆ بلاسینشیا گەڕامەوە تا لەگەڵ خێزانی دایک و خوشكەكەم بژیم، چونكە باپیرم لەو ماوەیەدا مردبوو. منیش وەک زۆرێک لە ژنانی ئیسـتـریمادۆرا بوومـە دانەیەكی تر لە "بێـوەژنەكـانی وڵاتی هند". جـا هەروەک وا باو بوو، دەبووایە منیش جلی تازیەباری بپۆشم و بە ڕووپۆشێكی ئەسـتوور ڕووم داپۆشم و واز لە ژیانی ئاسایی كۆمـەڵاتی بێنم و بكەومـە ژێر چاوەدێری خێزان و قەشـە و دەسـەڵات. نوێژەكان، كار، پاشان تەنیایی، ئەمانە ئەو چارەنووسەبوون كە ئایندە بۆی هەڵگرتبووم و چی تر نا. خۆ ئەگەر ژیانی داگیـركاران لە وڵاتی هـند پڕ لە زەحمـەتی بێت، ئەوا هـێشـتـا ژنەكانیـان لە ئیسـپـانیا لە ژیانێكی زۆر ناخـۆشـتـر دەژیان. كاروباری خـۆم سـاز كـرد بۆ ئەوەی خوشكم و زاواكەی لە خشتەبەرم. ئەوان هەردووكیان چەندی لە دایكم دەترسان، ئەوەندەش لە من. لەبەرئەوەی نەیاندەویست ڕووبەڕووم ببنەوە، بۆیە هیچ دەستیان لە ژیانی تایبەتی من وەرنەدەدا. هەرئەوەندەیان گەرەک بوو كە ڕەفتاری ناشـیرین و بێ ئابڕوویی نەكەم. من لەو ماوەیەدا داواكارییـەكانی كڕیارەكـانی جلوبەرگم جێبـەجێ دەكرد و لە مـەیدانی گەورەش كولێرەكانم

دەفرۆشتن و بۆ ئارەزووی دڵیشم لە ئاهەنگە جەماوەرییەکان ئامادە دەبووم. هەروەها بۆ یارمەتیدانی قەشەژنەکان دەچوومە خەستەخانە بۆ خزمەتکردنی نەخۆشەکان و قوربانییەکانی تاعون و پێکراوەکان، چونکە لە منداڵییەوە بووبووە جێگەی بایەخی من و نەشمەدەزانی لە دوارۆژ دەبێتە پیشەیەکی ژیانم، هەروەها بەهرەداریم لە چێشتلێنان و دۆزینەوەی ئاوی ژێر زەویش هەبوو. من وەکو دایکم، بەو بەهرەیەوە هاتوومەتە دنیا کە توانای دیاریکردنی ئەو شوێنانەم هەیە کە ئاوی ژێر زەوییان هەیە. زۆر جار وا پێویست بووە لەگەڵ خاوەن زەوی و جووتیارەکان بچینە لادێکان و ئەو شوێنەیان بۆ دەستنیشان بکەین کە بیرەکەی لێ هەڵکەنن. کارەکە زۆر ئاسانە لقی داریکی زیندوو لە دەست دەگرم و بە هەنگاوی ورد و لە سەرەخۆ لە ئاقارەکەدا دەڕۆم و تا ئەو وەختەی دارەکە هەست بە هەبوونی ئاو دەکات و بۆ زەوی دەنووشتێتەوە، ئا لەوێ پێویستە بیرەکە لێدەن. خەڵک دەڵێن تۆ و دایکت بۆتان هەیە بە هۆی ئەو بەهرەیەوە دەوڵەمەند بن، چونکە هەر بیرێک لە ئیستریمادۆرا خۆی گەنجینەیەکی ڕاستەقینەیە، بەڵام ئێمە هەمیشە بێ بەرامبەر ئەو کارەمان دەکرد؛ چونکە بەهرەداری مرۆڤ لە بەرامبەر کرێدا ون دەبێت و ڕۆژێک دێت ئەو بەهرەیە بۆ ڕزگارکردنی سوپایەکی گەورە سوودی لێ وەربگرم. ماوەی چەندین ساڵە خەبەری مێردەکەم پێ نەگەیشتبوو، جگە لە سێ نامەی کورت کە لە ڤەنزوێلاوە هاتبوو و قەشەی کەنیسەکە بۆی خوێندمەوە و بۆ وەڵامەکەشی یارمەتی دام. لەو نامانەدا خوان دەڵێت کە لە نێو باریکی پڕ لە مەترسیدا ئیشێکی زۆر دەکات، پیسترین و بێ ڕەوشترین پیاو لەوێ هەنە و دەبێ بەردەوام بگەڕێن و چەکەکانیشیان سواربێ. زێڕێکی زۆر هەیە، وەلێ هێشتا خۆی هیچی نەبینیوە و بە ئاواتە بە دەوڵەمەندی بگەڕێتەوە تا کۆشکێکم بۆ دروست بکا و ژیانی شازادانەم بۆ فەراهەم بکات.

لەو کاتانەدا ڕۆژانم بە هێواشی زۆر پەست و خەمبار دەڕۆیشتن، چونکە من هەر ئەوەندەم خەرج دەکرد کە پێی بژیابایین، ئەوی ترم لە چاڵێکدا دەشاردەوە و بە کەسیشم نەدەگوت. من دەمویست بگەمەوە خوان هاریکاری

بکەم، جا بە هەر نرخێک بووایە، ئەمەیان نە بۆ خاتری خۆشەویستی بوو، چونکە ئاسەواری لە دڵم نەمابوو، و نە بە هۆی وەفاداریش بوو، چونکە شایستەی ئەوەش نەبوو، بەڵکو گەڕانبوو بە دوای سەربەستی. ئاخر لەوێ کەسێک نامناسێت و دەتوانم خۆم ڕێبەری خۆم بم.

کوورەی بێ ئارامی جەستەمی دەسووتاند. شەوەکانم چەشنی دۆزەخ بوون و لە نێو جێگەدا بە یادی دەستەملانێی پڕ لە شادیی ئەو ڕۆژگارە کەلەکەم دەگۆڕین کە یەکترمان خۆش دەویست. لە چلەی زستاندا گەرمام دەبوو و ڕقم لە خۆم و هەموو جیهان دەبووەوە چونکە بە ژنی لە دایک بووبووم و بە زیندانیی داوونەریت حوکمدرابووم. بە ڕێنوێنی قەشەژنەکانی خەستەخانە، ئاوی خەشخاشی کولاوم دەخواردەوە، بەڵام کاری تێ نەدەکردم. هەوڵم دەدا نوێژ بکەم، وەک چۆن قەشەکە داوای لێدەکردم، وەلێ نەمدەتوانی بە بێ ئەوەی لە ناو هزری هەڵچووناویدا وێڵ ببم، کۆتایی بە "ئەو باوکەمان کە لە ئاسماندایە" بێنم، چونکە ئەو شەیتانەی هەموو شتێک ئاڵۆزاوی دەکات، منیشی دەورووژاند. دایکم بە هەناسەی قووڵەوە پێی دەگوتم: ئێنیس، کچی خۆم، تۆ پێویستیت بە پیاو هەیە. دەتوانی بە دزی و بە نهێنی بە دڵی خۆت بکەیت.

بەدیهێنانی ئەو مرازە بۆ ژنێکی لە بارودۆخی من، زۆر ئاسان بوو؛ ئاخر وەرگری دانپیانانەکانم کە قەشەیەکی چڵێس و بۆن ناخۆش بوو، لە ژووری دانپیانناندا داوای لێ کردم ئەو گوناهە لەگەڵ ئەو ئەنجام بدەم، لە بەرامبەر لێبووردنێک بە کەمکردنەوەی ماوەی سزاکەم. بەڵام من هەرگیز قبوڵم نەدەکرد؛ چونکە پیرێکی نەفرەتلێکراو بوو. وەختێ کە ئارەزووی جووتبوون هەراسانی دەکردم، دەچوومە سەردانی پیاوەکان، جاجارە هەندێکیانم دەستەمۆ دەکرد و لەگەڵیان جووت دەبووم، بەڵام ئەو دروستبوونانە تەنیا بۆ دامرکانەوەی هەوەسەکانم بوو و هیچ ئایندەیەکی نەبوو. ئاخر من بە تارمایی خوان کۆت کرابووم و نێچیری تەنیایی بووم. ڕاستییەکەی من بێوەژن نەبووم و نەمدەتوانی دووبارە شوو بکەمەوە. دەبووایە هەر چاوەڕێ بم و چی تر نا.

جا ئایا باشتر نییە کە بەر لەوەی پیربم و بمرم ڕووبەڕووی مەترسییەکانی دەریا و زەوی دڕندەکان ببمەوە؟

لە دوای هەوڵدانێکی زۆر کە چەند ساڵێکی خایاند، مۆڵەتی شاهانەم بە دەستهێنا بۆ ئەوەی لە دەریاوە بەرەو وڵاتی هندییەکان بڕۆم. چونکە تاجی شاهانە هاوسەرگیری دەپارێزێ و لە پێناوی ئاوەدانکردنەوەی جیهان بە ژن و مێردی شەرعی و مەسیحی، هەوڵ دەدات ئەندامی خێزانەکان کۆ بکاتەوە، وەلێ لە بڕیارەکانی خۆی پەلە ناکات؛ ئیتر وەک هەمووومان چاک دەیزانین هەموو شتێک لە ئیسپانیا لەسەرخۆیە و دوادەکەوێ. ئەوان مۆڵەتت پێ نادەن، تەنیا بە ژنە مێردارەکان نەبێت تا بگەنەوە مێردەکانیان. بەڵام بۆ ئەوانەیش پێویستە کەسێکی خێزانەکەی خۆی یان کەسێکی ڕێزداری لەگەڵدا بێت. من بۆ بەجێهێنانی ئەو مەرجە، کۆنستانسای کچە خوشکمم لەگەڵ خۆم برد کە تەمەنی پازدە ساڵان بوو. کچێکی شەرمن و نەختێ ئاینپەروەر بوو. بۆیە ئەوم بۆ ئەو سەفەرە هەڵبژارد چونکە لە هەموو ئەندامانی خێزانەکەم لەشی ساغتر بوو. ئاخر کەسە بێ هێزەکان لە جیهانی تازەدا سوودیان نابێت. پرسم پێی نەکرد، بەڵام بڕوام وایە کە هۆی تووڕەبوونەکەی ئەوەبوو کە حەزی بەو سەفەرە نەدەکرد. باوکی بە بەڵێننامەیەکی نووسراو بە مۆری دادنووس کچەکەی بەگەڵم دا کە دەبووایە لەگەڵ گەیشتنم بە مێردەکەم، ڕەوانی ئیسپانیای بکەمەوە و خەرجی ساڵێکی چوونە دێریشی بدەمێ، کە ئەوەش بەڵێنێک بوو نەمتوانی بیگەینمە جێ، نەک لە بەر ناپاکی لەلایەن منەوە، بەڵکو بەهۆی کچەکە خۆی هەروەک پاشان دەیبینین. بۆ ئەوەی ئەوراقی سەفەرەکەم ڕێک بخەم، دەبووایە دوو شایەدم هەبێت تا پاڵپشتم بکەن کە لەو کەسانیم قەدەغە بکرێم و موسڵمان و یەهودیش نیم، بەڵکو لە کۆنەوە مەسیحیم. هەڕەشەم لە قەشەکە کرد بەوەی کە لە بەردەم دادگای کەنێسە داوای لەسەر تۆمار دەکەم و دەڵێم بە دوای شەهوەتەکانی خۆیدا دەگەڕێ. ئیتر بەوجۆرە بڕوانامەیەکی مۆرکراوم لە بارەی ڕەوشتبەرزی خۆمەوە وەرگرت و بەو پارە پاشەکەوتکراوەی کە هەمبوو هەموو پێداویستییەکانی سەفەرم کڕی. ئەو

شتانە بریتیبوون لە لیستێکی درێژ کە ناتوانم لێرە وردەکارییەکانی بخەمە ڕوو، وەلێ هەمووییم لە بیرە، بەڵام ئەوەندە بەسە بڵێم خواردنی سێ مانگم لەگەڵ خۆم هەڵگرتبوو، لە نێوانیدا قەفەسێک مریشک بوو لەگەڵ جلوبەرگ و کەلوپەلی ناو ماڵ بۆ ئەوەی لە کاتی گیرسانەوەم لە وڵاتی هندییاندا سوودیان لێ وەربگرم.

***

پێدرۆ دی بالدیبیا لە خانوویێکی بەردینی گەورە لە شاری کاستوێرا گەورە بووبوو. ئەو خانووە موڵکی نەجیبزادە لادێییەکان بوو کە دواتر تووشی هەژاری و نەداری بووبوون، نزیکەی سێ ڕۆژەڕێ لە خوارووی شاری بلاسینشیاوە دووربوو. بەداخەوەم کە لە کاتی گەنجییەتی یەکتریمان نەدەناسی، لەو وەختەی کە لە دوای گەڕانەوەی لە یەکێ لە هەڵمەتە سەربازییەکانیدا، ئاڵایەکی شکۆداری هەڵگرتبوو و بە ناو شاردا تێ دەپەڕی. دەشێ هەردووکمان لە هەمان ئەو ڕۆژەدا لە ناو شەقامە پێچاوپێچەکانی شاردا ڕۆیشتبین و ئەو پیاوێکی کامڵ بوو بێت و شمشێرەکەی لە کەلەکەیەوە شۆڕ بووبێتەوە و جلی سوارەکانی پاشایانەی نایابی لەبەر کردبێت، بەڵام من هێشتا منداڵ بم و بە پرچی سوورەوە کە ئەو ڕۆژگارە ئاوایان بۆیە دەکرد، پاشان ڕەشهەڵگەڕابێتەوە. یان ڕەنگە لە کەنێسەدا تووشی یەکتر بووبین و لە تەک تەشتی ئاوی پیرۆز دەستی بە دەستەکانم کەوتبێت و لەوانەیە نیگاکانیشمان یەکانگیربووبن، بێئەوەی یەکتریمان ناسیبێت. ئاخر نە ئەوی سەربازی زبر و بە ئەزموونی ناو ناخۆشییەکانی جیهان، نە منی منداڵ و بەرگدروو، پێشبینی ئەوەمان نەکردبوو کە داخوا قەدەر چی بۆ حەشارداوین.

پێدرۆ لەو خێزانە سەربازییانە بوو کە سەروەت و سامانیان نەبوو، بەڵام لە بنەماڵەیەکی نەجیبزادە بوون. سەروەرییەکانیان بۆ ئەو خەباتە دەگەڕایەوە کە بەر لە هاتنە دنیای مەسیح لە دژی سوپای ڕۆمانی ئەنجامیان دابوو و بۆ ماوەی حەفت سەد ساڵیش لە دژی موسڵمانەکان درێژەی هەبوو. ئەو خانەوادەیە بەردەوام بوونە لە بەرهەمهێنانی ئازاترین ئەو پیاوانەی کە لە

جەنگە نەپساوەکانی نێوان پاشاکانی جیهانی مەسیحییەت بەشدارییان کردبوو. باوانی پێدرۆ لە چیاکان هاتبوونە خوارێ و لە شاری ئیستریمادۆرا گیرسابوونەوە. ئەو لەگەڵ گوێگرتنی ئەو چیرۆکانە پێگەییبوو کە دایکی لە بارەی نەبەردییەکانی حەفت براکەی دۆڵی ئیبا "برایانی بالدیبیا"، بۆی دەگێڕایەوە و ئەو جەنگە خوێناوییەی کە لە دژی ئاژەڵە تێکدەرە سامناکەکە کردبوویان. بەڕای دایکە ڕێزدارەکەیان، ئەو بوونەوەرە ئەژدیهایەکی ئاسایی نەبوو – جەستەیەکی لە شێوەی جرج و باڵەکانی لە هی شەمشەمەکوێرە و دوو سەر یان سێیان لە سەری مار دەچوون – نەک وەکو ئەژدیهاکەی قەدیس "جۆرج"، بەڵکو ئاژەڵێکی دەیان ئەوندە گەورەتر و دڕندەترین گیانەوەر بوو. ئەوەندەی شاخ هەبوون کە هەر یەکەیان بەرجەستەی شەڕانگێزی دوژمنێکی ئیسپانیای دەکرد، لە ڕۆمانییەکان و عەرەبەوە بگرە تا ئەو شەڕخوازە فەڕەنساییانەی کە لەم دواییە جەسارەتیان کرد مافەکانی پاشامان زەوت بکەن. «بێنە بەرچاوی خۆت کوڕەکەم، داوایان لێ دەکردین بە فەڕەنسی بدوێین!»، دایکە چەندان جار لە کاتی گێڕانەوەی چیرۆکەکەی ئاوای بە کوڕەکەی دەگوت. برایانی بالدیبیا یەک لە دوای یەک بە گورزی ئەو ئاگرە بەردەبوونەوە و دەسووتان کە ئەژدیهاکە بە دەمی تێی دەگرتن، یان بە ڕنۆکەکانی شیتاڵ شیتاڵی دەکردن کە لە هی پڵنگ دەچوون. ئەو کاتەی کە ئەو برایانە شەشیان لە ناوچوون و دیارکەوت کە جەنگەکەیان دۆڕاندووە، برا بچووکەکەیان کە هێشتا بە پێوە دەجەنگا، لقی دارێکی ئەستووری بڕی و سەری دارەکەی وەک نووکی ڕم تیژ تاشی و لە لالغاوەی ڕاکرد. ئەژدیهاکە لە بەر ژان و ئازار، کلکە ئەستوور و ترسناکەکەی لە زەوی دا و ئەرزەکەی شەق کرد و گێژەلووکەیەکی لە تۆز و غوبار دروست کرد کە لەگەڵ با گەیشتبووە باکووری ئەفریقا. ئا لەو کاتەدا کاکی پاڵەوان شمشێرەکەی بە هەردوو دەستی گرت و لە دڵی ئەژدیهاکەی ڕاکرد و ئیدی بەم کارە ئیسپانیای لە دەستی ڕزگار کرد. ئا لەو گەنجەوە، ئازای نێو ئازاکان، پێدرۆ لە ڕەچەڵەکی ڕاستەوخۆی دایکییەوە پەیدا بووە. تاکە بەڵگەش لەسەر ئەمە، ئەو دوو

دەستکەوتەیە: ئەو شمشێرەیە کە تاکو ئێستاش نەوە لە دوای نەوەی ئەو خانەوادەیە بە میرات بۆیان ماوەتەوە، دروشمی ئەو پارچە چەکەشە کە وێنەی دوو ماری لەسەرە و لە ناو کێلگەیەکی زێڕیندا قەمپاریان لە لقە دارێک گرتووە. ئاخر دروشمی ئەو خانەوادەیە ئەوەبوو: نەترسان لە مردن، زیاتر ژیانت پێ دەبەخشێت.

بە هەبوونی ئەو جۆرە باو و باپیرانە، زۆر سروشتی بوو کە پێدرۆ بە پیر بانگەوازی چەکدا بچێت لە کاتێک کە لە هەرەتی گەنجێتی دایە. دایکی هەموو ئەو پارەیەی کە مابوو لە پێناوی ئامادەسازی بۆ ئەو ئەرکە خەرجی کرد: بەرگێکی لە زرێ و قەڵغانێکی دروست، چەکی سوارچاکان و چەکهەڵگرێک لەگەڵ دوو ئەسپ. بەڵام شمشێرە ئەفسانەییەکەی نەوەی بالدیبیا، ئەوا ئاسنێکی ژەنگاوی بوو و لە کوتەکێک قورستر بوو، جگە لە بەها مێژووییەکەی هیچ نرخێکی نەبوو، بۆیە شمشێرێکی تری بۆ کڕی کە شلک و سووک بوو و لە باشترین پۆڵای تەڵەیتەڵی دروست کرابوو. پێدرۆ، ئا بەو شمشێرە شانبەشانی سوپای ئیسپانیا، لە ژێر ئاڵای کارلۆسی پێنجەم، دەجەنگێ و دوورترین شانشین لە جیهانی تازە داگیر دەکات، پاشان کە دەشمرێ و هەمان ئەو شمشێرەی لە دەستدایە کە شکاوە و خوێنی لێ دەچۆڕێ.

پێدرۆ دی بالدیبیا، ئەو لاوەی کە لە نێو کتێب و لە ژێر چاوەدێری دایکی پێگەیبوو، بە حەماسەتی کەسێک دەچووە جەنگ کە جگە لە سەربڕینی بەرازەکان لە گۆڕەپانی قەسابخانەکان بەولاوە، هیچ دیمەنێکی ترسناکی نەدیبوو. ئەو پاکییەی ئەو تەنیا ماوەیەکی کورتی خایاند، وەک ئەو ئاڵا نوێیەی کە دروشمی خێزانەکەیانی هەڵگرتبوو و پاشان لە یەکەمین شەڕدا پارچە پارچە بوو.

لە ناو سوپای ئیسپانیادا نەجیبزادەیەکی تر هەبوو ناوی "فرانسیسکۆ دی ئەگێری" بوو، لە ماوەیەکی کورتدا دەبێتە هاوڕێیەکی نزیکی پێدرۆ. فرانسیسکۆ بەقەد کۆڵنەدەرییەکەی پێدرۆ لەخۆبایی و بە هاتوهاوار بوو،

بەڵام هەردووکیان ناوبانگیان بە ئازایەتی دەرکردبوو. خانەوادەکەی فرانسیسکۆ بە ئەسڵ خەڵکی هەرێمی باسک بوون، بەڵام لە تالاڤێرا دی لارینا جێنیش بووبوون لە نێزیک تەڵەیتەڵە. هەر لە سەرەتاوە ئەو لاوە ئامادەی گیانبازی بوو؛ خۆی دەهاوێشتە ناو شتی خەتەرناک چونکە بڕوای وابوو کە ئەو خاچە زێڕینەی دایکی دەیپارێزێ کە لە ملی خۆی کردبوو. لە هەمان ئەو زنجیرەیەی ملی، دەفرێکی بچووکی پێوە کردبوو کە چەند داوەمووی قژی کچێکی جوانی تیدابوو. هەر لە منداڵییەوە ئەو کچەی زۆر خۆش دەویست چونکە ئامۆزای خۆی بوو. فرانسیسکۆ سوێندی خواردبوو کە هەر ڕەبەن بمێنێتەوە مادام ناتوانێ زەماوەند لەگەڵ ئەو کچە بکات، وەلێ ئەمە لەو هەوڵانەی نەدەخست کە دەست لەگەڵ ژنانی تر تێکەڵ بکا و گڕی خۆی پێیان دامرکێنێ. ئەو گەنجێکی باڵابەرز و پۆشتە بوو، پێکەنینێکی بە قاقا و دەنگێکی خۆشی هەبوو کە لە بارەکان دەبووە مایەی وروژاندنی حەماسەت و سەرنجڕاکێشانی ژنان بە شێوەیەک کەسیان خۆیان بۆ نەدەگیرا. پێدرۆ بەردەوام بە ئاگای دەهێنایەوە و داوای لێی دەکرد کە ئاگەداری خۆی بێت، چونکە پەتای فەڕەنسییەکان ڕەحم نە بە کەسێکی موسڵمان یان یەهوودی یاخۆ مەسیحی ناکات. بەڵام ئەو بڕوای بە خاچەکەی دایکی هەبوو، ئاخر ئەگەر ئەو خاچە سەلماندبێتی کە ئەمی لە شەڕ پاراستووە، ئەوا بێگومان لە کارە خراپەکانیش دەیپارێزێ. ئەگێریی نەرمونیان و هەواداری ژنان لە ناو کۆمەڵ، لە مەیدانی جەنگدا دەبووە دڕندەیەکی تووش، بە پێچەوانەی بالدیبیا کە لە ڕووبەڕووبوونەوەی بارە ترسناکەکان، هێمن و جوامێری پێوە دیاربوو. ئەو دوو لاوە خوێندن و نووسینیان بە چاکی دەزانی و لە زۆربەی نەجیبزادەکان ڕۆشنبیرتر بوون. پێدرۆ لەسەر دەستی قەشەیەک کە مامی دایکی بوو، بە وردی زانست فێر بووبوو. لە وەختی منداڵی لەگەڵی ژیابوو و زۆر جاران بە دەنگێکی نزم دەیگوت لە ڕاستیدا ئەو قەشەیە باوکییەتی. وەلێ قەت نەدەوێرا لەو بارەیەوە پرسیاری لێی بکات، چونکە ئەو پرسیارە دەبووە سووکایەتیکردن بە دایکی. ئەگێری و بالدیبیا هەردووکیان لەساڵی ١٥٠٠ لە

دایک بووبوون، هەمان ئەو ساڵەی کە ئیمپڕاتۆر کارلۆسی پێنجەم، پاشای ئیسپانیا و ئەڵمانیا و نەمسا و فلاند و دوورگەکانی هندی ڕۆژئاوا و بەشێک لە ئەفریقا و زۆر شوێنی تری دنیا، هاتبووە دنیا. ئەو دوو گەنجە باوەڕیان بە جادووگەری نەبوو، بەڵام شانازییان بەوە دەکرد کە لەگەڵ پاشا لە ژێر سایەی یەک ئەستێرە پێوەستن و هەموو ژیانی خۆیان بۆ ئەو جۆرە نەبەردییانە تەرخان کردووە کە شا ئەنجامی داون. هەردووکیان باوەڕیان وابوو کە هیچ ئامانجێک لە ژیاندا لەوە باشتر نییە کە مرۆڤ لە ژێر ڕێبەرایەتی ئەو سەرکردە بە جەسارەتە سەرباز بێت. ئەوان بە باڵای بەرز و بتەو و بە ئازایەتی و لێهاتوویی پاشا، وەک سوارچاک و شەڕوانێک و بە ژیرییەکەی وەک کەسێکی بە ستراتیژ لە وەختی شەڕ و لە کاتی ئاشتەواییشدا وەک پیاوی زانست، سەرسام بووبوون. پێدرۆ و فرانسیسکۆ خۆیان بە بەختەوەر دەزانی کە هەردووکیان کاسۆلیکن، پێیان وابوو کە ئەوە دەبێتە مایەی پاراستنی ڕوحیان. چونکە ئیسپانیاییشن ئەوا لە سەرووی هەموو مرۆڤە نەماوەکاندا دەبن. ئەوان دوو خانەدانی ئیسپانیایین، گەورەی سەرتاسەری دنیا و بەهێزتر لە ئیپڕاتۆریەتی کۆنی ڕۆمانی کە خواوەند بۆ دۆزینەوە و ئاوەدانکردنەوە و پشتگرتن و دامەزراندنی دوورترین گۆشەی زەوی، تایبەتمەندی کردبوو. ئەو وەختەی کە بۆ جەنگ دەرچوون لە فلاند و پاشان هێرشەکەی سەر ئیتاڵیا، تەمەنیان بیست ساڵ بوو، لەوەێ درکیان کرد کە توندوتیژی لە شەڕدا جوامێرییە و باشتر وایە مروڤ لە باری ڕۆحییەوە ئامادەساز بێت، چونکە چارەنووس هاوڕێیەکی هەمیشەییە.

ئەو دوو ئەفسەرە لە ژێر فەرمانی سەربازێکی لێهاتوو خزمەتیان دەکرد کە ناوی مەرکیز بێسکارا بوو. دەشێ دیمەنە نیمچە ژنانییەکەی ئەو پیاوە فێڵاوی بوو بێت؛ قەڵغانە زێڕینییەکەی و باڵاپۆشە حەریرییەکەی کردەوە کە بە مرواری چنرابوو کە پێی دەچووە مەیدانی جەنگ، ئاخر سەربازێک لە مەیداندایە کە ژیرییەکەی دەگمەنە و هەزار و یەک جار ئەمەی بۆ دنیا سەلماندووە.

لە ساڵی ١٥٢٤ ، لە کاتی شەڕی نێوان فەڕەنسا و ئیسپانیا بۆ دەست بەسەرداگرتنی ئیتاڵیا، مەرکیز و دوو هەزار لە باشترین سەربازانی ئیسپانی بە شێوەیەکی سەیر بزر بوون، تەمتومانی زستانە قووتی دان. خەبەر وا بڵاو بووەوە کە ئەوانە لە سوپای ئیسپانیا جیابوونەوە و هەڵاتوون و چەندان بەندە گۆرانییان بەسەردا هەڵدەگوتن کە بە خائین و ترسنۆک تاوانباریان دەکردن، کەچی ڕاستییەکەی لە قەڵایەکدا خۆیان حەشاردابوو و بەو پەڕی نهێنییەوە ئامادەسازبوون. ئەو وەختە مانگی تەشرینی دووەم بوو، سەرما و سۆڵ ڕوحی سەربازە بەدبەختەکانی دەبەستا کە لە چۆڵەوانی چادریان هەڵدابوو. نەیاندەزانی بۆ بە سەرخۆشی و نائارامیی لەوێیان دەهێڵنەوە و لە بەرچی بۆ شەڕی دژی فەڕەنسییەکان نایانبەن. مەرکیز بێسکارا پەلەی نەبوو، ئاخر ئەو وەک ڕاوکەرێکی شارەزا سەبری دەگرت و چاوەڕێی هەلێکی گونجاوی دەکرد. دواجار، لە پاش بەسەربردنی چەند حەفتەیەک هێمای دایە ئەفسەرەکانی بۆ ئەوەی دەستبەکار بن. پێدرۆ دی بالدیبیا فەرمانی دایە هێزەکەی خۆی کە زرێکانیان لەسەر جلە خورییەکانی ژێرەوەیان لە بەر بکەن. ئەمە ئەرکێکی زەحمەت بوو، چونکە تەنیا دەستت بە ئاسنی زرێیە تەزیوەکان بکەوتایە، پەنجەت پێوەی دەنووسا . پاشان چەرچەفی سپی بە سەریاندا دابەش کرد تا خۆیانی پێ بپێچن. ئا بەو جۆرە وەک تارماییی سپی بە بێدەنگی بەڕێکەوتن و بە درێژاییی شەوێ دەڕۆیشتن و لەسەرمانیش دەلەرزین، تا کاتی تاریک و ڕوونی بەیانی گەیشتنە نزیک قەڵای دوژمن. پاسەوانی نێو تاوێرەکان هەستیان بە جولە دەکرد لە سەر بەفرەکە، بەڵام وا زەنیان برد کە ئەوە سێبەری دارە لەگەڵ تەوژمی با دەجولێتەوە. ئیسپانییەکانیان نەبینی کە چۆن بە شەپۆلی سپی و لە سەر زەوی سپی لە سەر زگ دەخشن تا دواین چرکە، ئەو وەختەی هێرشبەرەکان وەک برووسکە لە پڕێکا بەسەریان دادان. ئەو سەرکەوتنە گەورەیە، مەرکیز بێسکارای کردە ناودارترین سەرکردەی سەربازی لە سەردەمی خۆی.

لە دوای ساڵێک لەو شەڕە، ئەگیری و بالدیبیا لە جەنگی شاری بافیا

بەشدارییان کرد، ئەو شارە جوانەی کە سەد کۆشک و تاوەری هەبوو، ئەو شەڕەی کە فەرەنسییەکانیش تێیدا شکستیان خوارد و پاشاکەیان کە بە نائومێدییەوە دەجەنگا و سەربازیکی دەستەکەی پێدرۆ دی بالدیبیا بە دیلی گرتی، بەجۆرێک لەسەر پشتی ئەسپەکەی بەریدابووەوە و نەشیدەزانی ئەو کەسە کێیە، ئەگەر بالدیبیا لە وەختێکی گونجاودا لێی بە ئاگا نەبووایە، چیوای نەمابوو سەری پاشا پەلبدا و بەم کارەی ڕێڕەوی مێژووش بگۆڕێ. لە گۆڕەپانی جەنگدا زێتر لە دە هەزار کوژراو کەوتبوونە ئەو گۆڕە و هەوای ئەو ناوە بۆ ماوەی چەند حەفتەیەک پڕ لە ڕەوەی مێش و مەگەز بووبوو و زەویش لە جرج جمەی دەهات. دەڵێن ئێستاش کەلەرم و قەڕنابیت لەو هەرێمانەدا دەڕسکێن و لە ژێر گەڵاکانیشیاندا پارچە ئێسک هەنە.

بالدیبیا تێگەیشت کە چەکی دەستی سوارچاکەکان یەکەم جار هۆکاری یەکلاکەرەوەی سەرکەوتن نەبووە، بەڵکو دوو چەکی تازەی تر هەبوون: یەکەمیان تفەنگی ناواخن ئاڵۆز، بەڵام دوورهاوێژبوون، لەگەڵ تۆپە برۆنزییەکان کە لە تۆپە ئاسنە قورسەکان سووکتر بوون و بەکارهێنانیشیان ئاسانبوو. دووەمیان بەشداریکردنی هەزاران بەکرێگیراوی سویسری و ئەڵمانی کە بە توندوتیژی ناسرابوون، ئەوانەی بالدیبیا گاڵتەی پێ دەکردن، چونکە لە دیدی ئەودا، شەڕ وەک هەر شتێکی ترە، کێشەی شەرەف بوو. جەنگی شاری بافیا وای لە پێدرۆ کرد کە لە گرینگی ستراتیج و چەکی نوێ ڕابمێنێ و دەیگوت: ئازایی سەرشێتانەی پیاوانی وەک فرانسیسکۆ ئەگێری بەس نییە، چونکە جەنگ زانستێکە، پێویستی بە لێکۆڵینەوە و لۆجیک هەیە.

***

لە دوای جەنگی بافیا، پێدرۆ بالدیبیا گەڕایەوەماڵەکەی لە کاستوێرس، بە هۆی ئەو تیرەی لە سمتیان دابوو بێتاقەت و شەلە بووبوو. لەوێ بە ڕۆنی قرچاوە چارەسەریان دەکرد، وەلێ برینەکەی لەگەڵ کەمترین جولە سەرلەنوێ دەمی دەکردەوە. ئێستا لەو تەمەنە دایە کە هاوسەرگیری بکات، بۆ ئەوەی ناوی بە نەمری بمێنێ سەرپەرشتی زەویوزارەکانی بکات کە بە هۆی لەوێ

نەبوونی و کەمتەرخەمی ئەو بووبوونە بەیارێکی ڕووت، هەر وەک چۆن دایکی بەردەوام لێی دووبارە دەکردەوە. جا باشترین کار ئەوەیە کە دەستگیرانێکی وا هەڵبژێرێ کە سامانێکی زۆری هەبێت، چونکە کێڵگەکانی بنەماڵە نەدارەکەی بالدیبیا زۆر پێویستییان پێ هەبوو. چەند کچێک بۆ ئەو مەبەستە دەستنیشان کرابوون، هەندێکیان لەلایەن خانەوادەکەی خۆیان و هەندێکیش لە لایەن قەشەکە، هەمووشیان لە خێزانی خانەدان و دەوڵەمەندبوون و بە تەمابوو لە ماوەی چاکبوونەوەی برینەکەی لە نزیکەوە بیانناسێت. وەلێ نەخشەکە چۆنیان دارشتبوو ئەوها نەچووە سەر، چونکە ڕۆژێکیان پێدرۆ لە کاتی هاتنە دەرێیان لە نوێژکردن، لە بەرچاوی خەڵک، مارینا ئۆرتیس دی گایتی بینی، کە تەنیا لەو شوێنە دەکرا بەیەک بگەن. مارینا تەمەنی سێزدە ساڵان بوو و تا ئەو کاتەش هەر تەنوورەی منداڵانەیان لەبەری دەکرد. مارینا لەگەڵ ژنە کارەکەرەکەی خۆیان بوو و سەیوانێکی لە سەری هەڵدابوو، هەرچەندە ئەو ڕۆژە ئاسمان هەور بوو. ئاخر تروسکەیەک چییە لە تیشکی خۆر ڕاستەوخۆ بە پێستە ڕوونەکەی ئەو کچە ڕەنگ پەڕیوە نەکەوتبوو. ڕوخساری لە هی فریشتان دەچوو و ڕەنگی پرچی زەردێکی بریقەدار بوو و بە دوودڵی هەنگاوی دەهاوێشت وەک ئەو کەسەی لە ژێرەوە چەند شۆرتێکی لەبەر کردبێت ئاوا. ئەو کچە دیمەنێکی بێ گوناهی هەبوو. پێدرۆ لەگەڵ دیتنی کچە، یەکسەر مەرامەکانی خۆی بۆ چاککردنی کێڵگەکەی لە بیر کرد. ئەو لە ژمێریاریدا پیاوێکی نەزان نەبوو؛ وەلێ جوانی کچەکە یەکسەر تەفرەی دا. لەگەڵ ئەوەی کە کچە نەداربوو و سامانەکەی زۆر لە خەسڵەتەکانی تری کەمتر بوو، بەڵام پێدرۆ هەرکە زانی بێ دەستگیرانە، بە پەلە لەگەڵی کەوتە چاوبازی. بنەماڵەی ئۆرتیس بەتەمای هاوسەرێکی هەبووە بوون بۆ کچەکەیان، بەڵام نەیانتوانی داواکاری سوارچاکێکی ناودار و ئازا و بە ئەزموونی وەک پێدرۆ بالدیبیا قبوڵ نەکەن، تاکە مەرجیان ئەوەبوو کچەکە چواردە ساڵ تەواو کات ئەوجا بیگوازێتەوە. لەو ماوەیەدا مارینا بە ترسی کەروێشکەوە چووە ژێر چاودێری دەستگیرانەکەی، وەلێ کاروباری خۆی و

ساز کرد بۆ ئەوەی پێدرۆ بزانێت کە ئەمیش ئامادەیە بۆ ڕۆژانی داهاتوو تا زەماوەند بکەن. پێدرۆ لە هەڕەتی نێرێتیدا بوو، بەژنوبالآیەکی بتەو و سینگێکی بەهێز و لێهاتووییەکی چاک و ڕوخسارێکی جوامێرانەی هەبوو: لووتێکی قیت و چەناگەیەکی درێژ و دووچاوی شین و دەربڕی هەبوو. ئەو وەختە پرچی بۆ دواوە دادەهێنا و لە پشت ملییەوە دەیبەستی. ڕوومەتەکانی تاشراو و سمێڵێکی ڕەش و ڕدێنێکی تەسک کە بە درێژاییی ژیانی پێی دەناسرایەوە. بەرگی پۆشتەی دەپۆشی و بە جولەی مانادار شتی هەڵدەبژارد، بە هێمنی دەدوا و وای لە خەڵک دەکرد ڕێزی بۆ دانێن. بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا دڵباز و هەستناسک بوو. مارینا بە سەرسوڕمانەوە لەو هۆکارەی دەپرسی کە بوونەتە مایەی بایەخپێدانی ئەو پیاوە ڕوح گەورە و جوامێرە بەم. ساڵی دواتر زەماوەندیان کرد، ئەو کاتەی کچە تازە کەوتبووە بێنوێژی و خۆی ناسی، ئیتر لە کێڵگە و گوندە سادەکەی خانەوادەی بالدیبیا جێنشین بوون.

مارینا بە نیازێکی پاکەوە چووە دنیای هاوسەرگیری، وەلێ هێشتا زۆر منداڵ بوو و ئەو مێردە روح گەورەیە و ئەو ئارەزوومەندەی خوێندنەوەی کتێب دەیترساند. هیچ شتێکی هاوبەشیان نەبوو قسەی لەسەر بکەن. زۆر بە دڵ و هزرێکی شپرزەوە کتێبە پێشنیازکراوەکانی لەلایەن مێردەکەی وەردەگرت تا بیانخوێنێتەوە، بە بێ ئەوەی بوێرێ لە بەردەمی دانپیابنێت کە هەرئەوەتە دەزانێ دوو ڕستەی یەکەم بخوێنێتەوە و ئیمزای ناوی خۆی بە خەتێکی رووشاو بکات. ئەو لە ژیانی خۆی لە تێکەڵکاری و باری ئاڵۆزی جیهان پارێزراو بوو و حەزیشی دەکرد هەر ئاوا بژیێت؛ وتەکانی مێردەکەی لە بارەی سیاسەت و جوگرافیا دەیترساندن. هیچ شارەزاییەکی لە خستنە ئەستۆی کاروبارەکانی ناوماڵ نەبوو و کارەکەرەکانیش قەت گوێیان بە فەرمانەکانی ئەو نەدەدا وەختێ بە دەنگە منداڵکارانەکەی بانگی دەکردن، بۆیە بە خەسووی دەگوت کە فەرمانیان پێ بکات و بە خۆشی وەک منداڵێک چاوی لێ دەکرا. بە یارمەتیدانی ژنە گەورەکانی خێزانەکەیان، ئامادەیی خۆی بۆ فێربوونی ئەرکە هەراسانکەرەکانی ماڵەوە نیشان دا، بەڵام کەسێکی نەبوو لە بارەی ژیانی

هاوسەرگیرییەوە پرسیاری لێ بکات، کە زۆر لە ئامادەکردنی چێشت و ڕاگرتنی حسێب گرینگتر بوو.

ئەو وەختەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ پێدرۆ تەنیا لە چوارچێوەی سەردان کە بە چاودێری هەڵسوڕێنەری ماڵەکەیان ئەنجام دەدران، یان نامە نەرم و پڕ لە ڕێزەکانی بوو، مارینا زۆر بەختەوەر دەژیا، وەلێ ئەو کاتەی لەگەڵ مێردەکەی چووە نێو جێگە، ئەو خۆشییانە هەمووی بوونە هەڵم. ئاخر ئەو هیچ زانیارییەکی لە بارەی ڕووداوەکانی شەوی یەکەمی بووکێنی نەبوو؛ کەسێکی نەبوو بۆ ئەو ئەرکە کتوپڕە ئامادە و ئامۆژگاری بکات. لە ناو سەندووقی کەلوپەلەکانی چەند کراسێکی تەنکی نووستنی لە پەمۆ دروستکراوی هەبوو کە تا سەر گۆزینگی درێژبوون و لە لای مل و مەچەکیان بە قەیتانی کرێم نەخشێنرابوون، لە پێشەوەیان کەلێنێکی کراوەی لە شێوەی خاچیان بۆ دروست کرابوو. بە بیریدا نەهاتبوو بپرسێت داخوا ئەو کەلێنە کراوەیەی پێشەوە بۆ چ مەبەستێکە و کەسیش تێی نەگەیاندبوو کە لەوێوە ئەندامی نێرینەی گەرمی مێردەگەی پێی دەگات. ئەو پێشتر قەت ئەو ئەندامەی بە ڕووتی نەبینیبوو و هەروای دەزانی کە جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیا و لە پرچ و ڕووخسار و نبرەی دەنگیاندایە. کاتێ لە تاریکاییدا هەستی بە هەناسەی پێدرۆ کرد وا بە دەستە گەورەکانیشی لە قەدی کراسەکەی بە دوای کەلێنە لێوار جوان و چنراوەکەیدا دەگەڕێ، بە هێزی هێستریێک پاڵی دا و بە بازدان بە ناو ڕێڕەوی ماڵە بەردینەکەدا بە لووره لوور هەڵات. مارینا هەرچەندە نییەتپاک بوو، بەڵام پێدرۆ ئەو عاشقە وریایە نەبوو، ئاخر ئەزموونەکانی ئەو تەنیا جووتبوونێکی سەرپێی بوون لەگەڵ ئەو ژنانەی کە لە دوای گفتوگۆکردن ئەو خزمەتەیان پێشکێشی دەکرد. بەڵام لەمەودوا پێویستی بە سەبرێکی گەورە هەبوو، چونکە هاوسەرەکەی هێشتا منداڵە و تازە وا خەریکە جەستەی پێ دەگات و نابێ ناچاری بکات. هەوڵی دا وردە وردە لێی بچێتە پێش، بەڵام نەفامییەکەی مارینا کە لە سەرەتادا سەرنجی ئەوی بۆ خۆی ڕاکێشابوو، لە پڕێکا لێی بووە کۆسپێک کە نەدەکرا بەسەریدا

بپەڕێتەوە. شەوانیان بۆ پێدرۆ بووبووە مایەی بێ ئومێدی و بۆ ماریناش بووبووە ئازار چەشتن. لە کاتی ڕۆژیشدا هیچیان جەسارەتی ئەوەیان نەدەکرد باسی ئەو بابەتە بکەن. پێدرۆ خۆی بۆ خوێندن و بە دواداچوونی ئیشوکاری زەوی و کێڵگەکەی تەرخان کرد، لە کاتێکدا لە شەڕوانی و سوارچاکیش تاقەتی چووبوو. لە ناخی خۆیدا خۆی ئامادە دەکرد و دەگەڕایەوە. وەختێ کە بانگەوازی گیانبازی پێشی پێ نەدەگیرا، سەرلەنوێ چووەوە ژێر فەرمانی ئیمپراتۆر کارلۆسی پێنجەم، بەو هیوایەی لە ڕووی سەربازییەوە خەونە نهێنییەکەی بێتەجێ کە ئەویش گەیشتن بوو بە نەبەردییەکانی مەرکیز بێسکارا.

***

لە مانگی شوباتی ساڵی ١٥٢٧ ، هێزەکانی ئیسپانیا لە ژێر فەرمانی سەرکردەی گشتی "دی بۆربۆن" لە بەرامبەر شوورەکانی ڕۆما وەستان. پازدە دەستە لە بەکرێگیراوەکانی سویسرەیی و ئەڵمانییەکان پاڵپشتی ئیسپانییەکانیان دەکرد و چاوەڕێی هەلێک بوون تا بچنە ناو شاری قەیسەرەکان و سکی برسییان تێر بکەن کە چەند مانگێکیان بەبێ مووچە بەڕێ کردبوو. کۆمەڵی سەربازە برسییەکان و ئەوانەی ڕێک نەدەخران، ئامادەسازبوون بۆ بەتاڵانبردنی گەنجینەکانی ڕۆما و ڤاتیکان. بەڵام ئەوانە هەموویان تەڵەکەباز و بەکرێگیراو نەبوون؛ ئاخر لە نێو سەربازە ئیسپانییەکان دوو ئەفسەری بە دیسپلین هەبوون: پێدرۆ دی بالدیبیا و فرانسیسکۆ دی ئەگێری، ئەوان لە دوای دوو ساڵ لە لێکدابڕانیان بە یەکگەیشتنەوە. پاش ئەوەی وەک دوو برا دەستەملانێی یەکتر بوون، هەر یەکەیان باسی ژیانی ئەو دوو ساڵەی ڕابردووی بۆ ئەویدی کرد. بالدیبیا مەدالیایێکی پێشکێشی هاوڕێکەی کرد کە وێنەیەکی ماریناى بە دەستی وێنەکێشێکی پۆرتوگالی لە سەر دروست کرابوو. ئەو وێنەکێشە لە یەهوودییەوە خۆی کردبووە نەسرانی و توانیبووی دادگاکانی پشکنین لەخشتە ببات. بالدیبیا گوتی: تاکو ئێستا منداڵمان نەبووە، چونکە مارینا

هێشتا زۆر منداڵە، وەلێ بۆ ئەو مەبەستە ماوەیەکی زۆرمان لە پێشدایە، ئەگەر خوا حەز بکات.

- وا چاکترە بڵێیت: ئەگەر پێش ئەوە نەکوژرێین! - ئاوا هاوڕێکەی بە ئاگا هێنایەوە.

پاشان فرانسیسکۆ باسی خۆی بۆ پێدرۆ کرد کە هەروا لەسەر خۆشەویستییە ئەفلاتۆنی و نهێنییەکەی خۆی بۆ کچە مامەکەی ماوە کە چۆن باوکی ئاگەدار کردووەتەوە کە ئەگەر پێداگری بکەن تا شوو بە پیاوێکی تر بکات، ئەوا دەبێتە قەشەژن. بالدیبیا ئەم هەڵوێستەی کچەی بە خراپ نەدەبینی، چونکە زۆر لە ژنە نەجیبزادەکان وای دەبینن کە چوونە دێر لەگەڵ دەستەیەک کارەکەر، لەگەڵ سامان و ئەو ژیانە خۆشەی کە لێی ڕاهاتوون، زۆر چاکترە لەوەی بەزۆر هاوسەرگیرییان بەسەردا بسەپێنن.

فرانسیسکۆ بە بایەخەوە گوتی: هاوڕێ گیان، ئەو شتە سەبارەت بە کچە مامەکەم، دەبێتە مایەی داخێکی گەورە، چونکە کچە جحێڵێکی لە جوانی و زیندوویی ئەودا، لە پێناوی خۆشویستی و دایکایەتی خەڵقبووە و پێویستە تا لە ژیاندابێت کفنی قەشایەتی لەبەر نەکات. وەلێ تۆ لەلایەکی تر هەقت بەدەستە، چونکە من پێم خۆشە ببێتە قەشەژن نەک ببێتە هاوسەری پیاوێکی تر. من ناتوانم ڕێگە بەوە بدەم، ئێمە پێویستە هەردووکمان پێکەوە سنوورێک بۆ ژیانی خۆمان دانێین.

بالدیبیا لێی پرسی: ئێوە بەو هەڵوێستەتان حوکمی خۆتان بە کوورەی دۆزەخ دەدەن؟ من دڵنیام کە کچە مامەکەت دێرەکە هەڵدەبژێرێت، ئەدی تۆ؟ چ پرۆژەیەکت بۆ ئاینده هەیە؟

فرانسیسکۆ پێکەنی و لە کاتێکدا کە دەستی بە خاچ و پاکەتە بچووکەکەی ملی دادەهێنا، گوتی: تا توانام هەبێت لە بەشداریکردنی جەنگ بەردەوام دەبم. شەوانیش سەردانی کچە مامەکەم دەکەم وەک قەشەژنێک لە ژوورەکەی خۆی.

لە سەردەمی پاپا کلێمەنتی حەوتەمدا، قایمکارییەکانی دەوری ڕۆما لە بارێکی خراپدا بوو. ئەو پاپایە لە بواری فێڵە سیاسییەکان کارامەتر بوو نەک لە ستراتیجە سەربازییەکان. هەرکە هێزەکانی دوژمن لە نێو تەمتومانێکی چڕ لە پردەکانی شار نێزیک بوونەوە، پاپای گەورە بە نێو تۆنێلێکی نهێنیدا لە ڤاتیکانەوە بۆ قەلای سان ئەنجیلۆ هەلات کە چەندان تۆپی لێ دامەزرابوو. سێ هەزار کەسی لەگەڵدابوو، یەکێک لەوانە پەیکەرتاش و زێڕینگەری بەناوبانگ بێنفینۆتۆ سیللینی بوو کە بە بەهرە هونەرییەکەیەوە زۆرتر ناسرابوو بە قەدەر سروشتە سامناکەکەی. پاپا ڕێگەی پێدا لە جیاتی ئەم بڕیاری سەربازی بدا، دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت کە ئەم خۆشی لە بەردەم هونەرمەندەکە لە ترسان دەلەرزێ.

لە هێرشی یەکەم بۆ سەر ڕۆما، سەرکردەی گشتی هێزەکانی ئیسپانیا گوللەیەکی مەرگهێن بە یەکێ لە چاوەکانی کەوت. بێتفینۆتۆ سیللینی لافی ئەوەی لێ دەدا کە ئەم ئەو فیشەکەی تێ گرتووە، هەرچەندە لە ڕاستیدا لەو شوێنە نێزیک نەبوو؛ بەڵام کێ دەیتوانی بڵێت وا نییە؟ پێش ئەوەی سەرکردەکان بتوانن نیزام بسەپێنن، ئەو هێزەی کە سەرکردەکەیان لە دەستدابوو و کەسیش نەبوو کۆنترۆڵی بکات، بە ئاگر و ئاسن ئەو شارە بێ پشتوپەنایەیان دەکوتا و بە چەند سەعاتێک دەستیان بەسەرداگرت. لە هەشت ڕۆژی یەکەمیندا قەسابخانەیەکی زۆر خوێناویان ئەنجامدا، بە جۆرێک خوێن لە شەقاوەکان دەڕۆیشت و لە نێو بەردە کۆنەکان دەمەیی. زێتر لە چل و پێنج هەزار کەس لە شارەکە هەلاتن، خەڵکە تۆقیوەکانی کە مابوونەوەش ملیان بۆ ترسی ئەو دۆزەخە کەچ کردبوو.

داگیرکەرە سەرکەوتووەکانی ئەو شەڕە کەنێسە و دێر و کۆشک و ماڵەکانیان گشت سووتاند. خەڵکیان بە کۆمەڵ دەکوشت، بە شێت و نەخۆشەکانی نێو ژێرزەمینەکان و ئاژەڵەکانیشەوە. پیاوەکانیان ئازار دەدا تا ناچاریان بکەن شتە شاردراوەکانیان بدەنە دەست؛ هەر منداڵ و ژنێکیان بدیبایە بە زۆر لاقەیان دەکردن؛ هەموو منداڵە شیرخۆر و پیرە

پەککەوتەکانیان کوشت. تالانکاری وەک ئاهەنگی گاڵتەجاڕی بۆ ماوەی چەند حەفتەیەک کۆتایی نەهات. سەربازە سەرخۆشەکانی خوێن و بادە، شاکارە هونەری و شوێنەوارە ئاینییەکانیان تەخت دەکرد و سەری پەیکەر و مرۆڤەکانیان وەک یەک پەلدەدا. ئەوەندەی پێیان دەکرا شتی دزراویان لە توورەگەکانیان هەڵدەگرت و ئەوەی تریشیان وردوخاش دەکرد. دیواربەندەکانی کەنیسەی بەناوبانگی سیستین ڕزگاریان بوو، چونکە تەرمی سەرکردەی گشتی بەربۆنی لەوێ هەڵگیرابوو. هەزاران لاشە بەسەر ئاوی ڕووباری تیبێر کەوتبوو و بۆنی لاشە تێکچووەکان هەوایان بۆگەنی کردبوو. سەگ و داڵە گۆشتخۆرەکان لە لاشە کەوتووەکان دەئالان و دەیانخواردن.: برسێتی و نەخۆشیوانیان خەڵکی ڕۆمای بەدبەخت و جەللادەکانیشیان پێکەوە لە ناو ببەن.

لەو ڕۆژە ناخۆشانەدا هەردوو هاوڕێیە بەوەفاکەی جەنگ هاتنە ناو شار. پێدرۆ بالدیبیا بە تووڕەیی شمشێرەکەی لە دەست گرتبوو و بە ناو کوچە و کۆڵانەکانی شاری ڕۆما دەگەڕا و هەوڵی دەدا ئەو تالان و کوشتارییە ڕاگرێت و هەندێک دیسپلین بگەڕێنێتەوە ناو سەربازەکان، بەڵام بێ سوود بوو، بەکرێگیراوەکان سەرکردە و یاسایان نەدەناسی و ئامادەبوون هەرکەسێکیش ڕێگەیان پێ بگرێت، بیکوژن. بە ڕێککەوت بالدیبیا لە بەردەمی یەکێک لە دێرەکان بوو ئەو وەختەی کە دوازدە بەکرێگیراوی ئەڵمانی هەڵیان کوتایە سەر دێرەکە. قەشەژنی دێرەکە چاک دەیانزانی کە هیچ ژنێک لە بەردەستی ئەوانە ڕزگاری نابێ کە لاقەی نەکەن. ئەو ژنانە لە پەناگەیەک لە دەوری خاچێک کۆبوونەوە و لە نێو بازنەی ئەوانیشدا ئەو کچە جحێڵانە بوون کە تازە بووبوونە قەشەژن. دەستی یەکتریان گرتبوو و سەریشیان نەوی کردبوو و بە زمان تێکئالاوەوە نوێژیان دابەستا. لە دوورەوە وەک کۆتر دیاربوون. لەبەر خوا دەپاڕانەوە کە لە شوورەیی پیسبوون ڕزگاریان بکات و بەزەیی پێیاندا بێتەوە و بە پەلە گیانیان بکێشێ.

پێدرۆ بالدیبیا شمشێرەکەی بە دەستی ڕاستە دەهەژاند و بە دەستی

چەپەشی خەنجەرەکەی لە دەست گرتبوو و قیژاندی: بۆ دواوە! ئەوەی دەیەوێ لەو دەرگەیە بچێتە ژوورەوە پێویستە رووبەرووی من بوەستێتەوە.

کۆمەڵێک لە بەکرێگیراوەکان لە ناکاودا وەستان، ڕەنگە بیریان لەوە کردبێتەوە کە ئایا شتێک هەیە ئەوە بێنێ کە رووبەرووی ئەو ئەفسەرە ئیسپانییە ڕژد و بە هەڵویستە ببنەوە، یان وا باشترە بچنە ماڵەکانی ئەو دەوروبەرە. وەلێ هەندێکی تر لەوان هێرشیان کرد. بالدیبیا تاکە سەربازێک بوو کە پارێزگاری لە هاوسەنگی خۆی کردبوو، لە بەرژەوەندی دابوو بەرگری بکات و توانی بە چوار لێدانی کوشندە، چوار ئەڵمانی لە جەنگەکە بخاتە دەرەوە؛ بەڵام ئەوانی تر دوودڵی بەریدان و بەرەو رووی چوون. هەرچەندە ئەڵمانییەکان بە هۆی مەستییەوە هۆشیان لە سەرخۆ نەبوو ، وەلێ لە بالدیبیا ناچاپووکتر نەبوون و خێرا دەورەیان گرت. ئەگەر لەو ئانەدا فرانسیسکۆ دی ئەگێری دەرنەکەوتبایە و نەچووبایە پاڵ هاورێکەی، ڕەنگە ئەمە دواین ڕۆژ دەبوو لە ژیانی ئەفسەری ئیستریمادۆری.

ئەو باسکییە تۆقێنەر و بەقەڵافەتە کە دەموچاوی لە تووڕییان سوورهەڵگەڕابوو و وەک کوتەک شمشێرەکەی ڕادەوەشاند و گوتی: بۆ من وەرنە پێش کوڕی قەحپەینە!

ئەو قسە توندانە سەرنجی چەند ئیسپانییەکی ڕاکێشا کە لەو دەمە بەوێدا ڕەت دەبوون و دیتیان هاونیشتمانەکانیان لە بارێکی ناهەمواردانە، ئیتر خێرا خێرا لە بەردەم دێرەکە پەلاماریاندان. لە دوای نیو سەعات شەڕکردن ئەڵمانەکان پاشەکشێیان کرد و چەند برینداریکیان لە سەر شەقامەکە لە دوای خۆیان بەجێ هێشت کە خوێنیان لە بەر دەڕۆیی، پاشان هەردوو ئەفسەرەکەش توانییان دەرگەکانی دێرەکە چاک قایم بکەن.

سەرۆکی دێرەکە کە ژنێک بوو، داوای لە قەشەژنە خۆڕاگرەکان کرد هەتا ئەوانەی لە ژووریّ لە ترسان بووراینەوە، بیانگوازنەوە و ئەوانی تریش خۆیان بخەنە ژێر فەرمانی فراناسیسکۆ دی ئەگێری کە پێشنیازی بۆ کردن بۆ بەرگریکردن لە دێرەکە خۆیان ڕێک بخەن و شوورەکەی قایم و بتەو بکەنەوە.

ئەگێری قەشەژنەکانی وریا کردەوە و گوتی: هیچ کەسێک لە ڕۆما ژیانی لە ئەمان نییە. ئەوا ئێستا بەکرێگیراوەکان ڕۆیشتن، بەڵام بێگومان دەگەڕێنەوە، جا وا چاکترە کە دێنەوە ئەو وەختە بە ئامادەسازی بۆ شەڕ بتانبینن.

بالدیبیا کە تێڕوانینی نیازخراپانەی هاوڕێکەی لە بەرچاو بوو لەو کاتەی بیری دەکردەوە کە خۆی بە تەنیا لە نێو بیست کچی تازەهاتووی پاکیزە و کۆمەڵێک قەشەژنی کامڵ دایە کە ئەوانیش هێشتا تەڕ و سەرنجڕاکێشن، ڕووی تێیان کرد و گوتی: من دەچم تفەنگتان بۆ پەیدا دەکەم، با فراسیسکۆش فێری بەکارهێنانی چەکەکانتان بکات.

لە دوای تێپەڕبوونی شەست ڕۆژ، دواجار ئەو تاڵانکارییە ترسناکە لە ڕۆما وەستا و کۆتایی بەو ماوەی سەردەمی بوژانەوەی پاپایەتی لە ئیتاڵیا هات و لە مێژووشدا وەک لەکەیەکی ناشیرین لە ژیانی کارلۆسی پێنجەم دەمینێتەوە، هەرچەندە زۆریش لە ڕۆماوە دوور بوو.

پاپای ڕێزدار توانی لە پەناگاکەی خۆی لە قەڵای سان ئەنجیلۆ دەربچێت، بەڵام دەستبەسەریان کرد و لە لایەن زیندانە ئاساییەکان مامەڵەیەکی زۆر خراپی لەگەڵ دەکرا، بە جۆرێک مۆری پاپاییەکەیان لێی دارنی و بە پشتە پێ لە دواوەڕا لێیان دا تا لە ناو ئاپۆرەی پێکەنینی سەربازەکان زگاوزگ کەوتە سەر زەوی.

دەکرێ بێنفینۆتۆ سیللینی بە چەندان کەموکووڕی تاوانبار بکرێت، بەڵام لەو کەسانە نەبوو کە کاری چاکەی لەبیر بچێتەوە. بۆیە ئەو کاتەی سەرۆکی دێرەکە خەبەری بۆ نارد کە چۆن ئەو ئەفسەرە گەنجە کۆمەڵگە ئایینییەکەی ئەمی ڕزگار کردووە و چەند حەفتەیەک بۆ بەرگریکردن لەوێ ماوەتەوە. پاش چەند سەعاتێک فرانسیسکۆی لەگەڵ خۆی برد و گەڕاوە کۆشک و سیللینی لە یەکێ هۆڵەکانی ڤاتیکان لە ناو دار و پەردوو و ئەو کەلوپەلانە پێشوازی لێ کرد کە هێرشبەرەکان تێکوپێکیان دابوو. ئەو دوو پیاوە چەند گفتوگۆیەکی جوان و بە پێزیان لەگەڵ یەکتر کرد. پاشان سیللینی ڕاست و ڕەوان بە فرانسیسکۆی گوت: پێم بڵێ ئەی گەورە پیاو، لە بەرامبەر ئەو چاکەیە چیت

گەرەکە؟

فرانسیسکۆ ڕەنگی سوورهەڵگەڕا و دەستی بۆ دەسکی شمشێرەکەی برد و هاواری کرد: سووکایەتیت پێ کردم!

ژنەی سەرۆکی دێرەکە چووە نێوانیان تا بە گرانایی دەسەڵاتی خۆی بیانوەستێنێ، و بە ئیشارەتێکی گاڵتەئامێزانە لێکیانی دوور خستەوە، ئاخر ئەو کاتەی نەبوو گوێ لە خۆهەڵکێشانیان بگرێت. ئەو ژنە لە خانەوادەی جنۆیین ئەندریا دۆریایە کە سەرکردەی دەستەی سەربازانە و هەر لە بنچینەدا کەسێکی دەوڵەمەند و نەجیبزادەیە و لەسەر فەرمان پێدان ڕاهاتووە. ڕووی لە فرانسیسکۆ کرد و گوتی: توخوا بەسە! داوات لێ دەکەم لەو ڕەفتارە نابەجێیە بمانبووریت کە هیچ مەبەستێکی لە پشت نەبووە. ئێمە لە بارێکی ئاڵۆزدا دەژین، خوێنێکی زۆر ڕۆییوە و کردەوەی زۆر ترسناک ئەنجام دراون، هیچ سەیر نییە کە خوو و ڕەوشتی چاک وەلانرێ و بەدکاری جێگەی بگرێتەوە. بەڕێز سیللینی دەزانێ کە تۆ لە پێناوی پاداشت بەرگریت لە دیرەکەمان نەکردووە، بەڵکو بۆ مەرامی دڵی خۆت بووە. دوا شت کە بەڕێز سیللینی ئارەزووی کردووە سووکایەتی بووە بە تۆ، جا بۆ ئێمە زۆر شتێکی چاکە ئەگەر نیشانەیەکمان وەک هێمای ڕێز و سوپاس لێ قبوڵ بکەیت...

گەورەی قەشەژنەکان هێمایەکی بۆ پەیکەرتاش کرد تا چاوەڕێ بێت، پاشان دەستی ئەگێری گرت و بۆ لایەکەی تری هۆڵەکەی برد. سیللینی گوێی لە چرپەی دەنگیان بوو کە بۆ ماوەیەکی درێژ قسەیان دەکرد. وەختێ کە چیوای نەمابوو سەبری نەمێنێ، هەردووکیان گەڕانەوە کنی و دایکە گەورە ئارەزووی ئەفسەری لاوی خستە بەردەمی. لەو کاتەدا ئارەقەی شەرمەزاری دەردەدا و چاوەکانیشی دەیانڕوانییە سەر لمۆزی پۆستاڵەکەی.

ئا بەو جۆرە بێنفینۆتۆ سیللینی ئیجازەی لە پاپا کلێمەنتی حەوتەم وەرگرت تا فرانسیسکۆ زەماوەند لەگەڵ کچە مامەکەی بکات. ئیتر لاوە باسکییەکە لە خۆشیان بە پەلە ڕۆیشت تا ئەو خەبەرە بداتە هاوڕێکەی پێدرۆ دی بالدیبیا. چاوەکانی پڕ لە ئەشک بوون و دەنگی دەلەرزی، باوەڕی نەدەکرد ئەو کارە

سەیرە ڕوو بدات.

بالدیبیا بۆی دووبارە کردەوە: ئەی فرانسیسکۆ، من نازانم داخوا هەواڵێکی باشە یان نا. ئاخر تۆ ئارەزووت وایە، وەک چۆن ئیمپراتۆری مەزنمان حەزی لە کۆکردنەوەی جۆرەکانی سەعاتە، ئاوا ژنان کۆکەیتەوە. من ناتوانم تۆی وەک مێردێک بێنمە بەرچاوم.

– کچە مامەکەم تاکە ژنێکە خۆشم بوێت! بەڵام ئەوانی تر بۆ من ئەوا بوونەوەری بێ ڕوخسارن. ئەوان تەنیا ئەو ساتە بوونیان هەیە وەختێ ئەو ئارەزووانەم تێر دەکەن کە خواوەند لە جەستەمدا دای ناوە.

– شەیتانیش ئارەزووی جۆراجۆر لە ناخمان دەچێنێ، بەڵام خوا ڕەوشتی بەرزمان دەداتێ بۆ ئەوەی بەسەر خۆماندا زاڵ بین، و هەر ئەوەشە کە لە ئاژەڵ جیامان دەکاتەوە.

ئەگێری بە گاڵتەجارییەوە گوتی: ئەی پێدرۆ، تۆ ساڵانێکی درێژە سەربازیت، کەچی هێشتا بڕوات وایە کە ئێمە لەگەڵ ئاژەڵ جیاوازین...

– ئەوە گومانی تێدا نییە. قەدەری مرۆڤەکان وایە بگاتە سەرووی ئاژەڵایەتی و دەتوانێ بە پێی جوانترین نموونە ژیانی خۆی ڕێک بخات و ڕوحی خۆی ئاسوودە بکات.

– پێدرۆ تۆ دەمترسێنیت، تۆ وەک قەشەیەک دەدوێی. ئەگەر نەمزانیبایە لەلایەن ئازایەتی چ جۆرە پیاوێکی، ڕەنگە وام زەن بکردایە کە تۆ ئەو غەریزە بنەڕەتییانەت نییە کە پیاوان دەجولێنێ.

– من بێ ئەو غەریزانە نیم، دووبارەی دەکەمەوە؛ وەلێ لێ ناگەڕێم ئەوان ڕەفتارەکانم ئاراستە بکەن.

– من بە ڕادەیەی تۆ نەجیبزادە نیم، وەلێ خۆشەویستییەکی پاکم بۆ کچە مامەکەم هەڵگرتووە.

بالدیبیا بە زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزەوە گوتی: ئێستا کێشەیەکی گەورەت تووش دەبێت لە کاتێک کە نییەتت وایە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کچە بکەیت

کە کردووتە بە نموونەیەکی بەرز. ئاخر چۆن دەتوانی ئەو خۆشەویستییە لەگەڵ رەفتارە شەهوانییەکانت بگونجێنی؟

فرانسیسکۆ کە وەختبوو لە پێکەنینان بمرێت، وەڵامی دایەوە: ئەی پێدرۆ، هیچ کێشەیەک دروست نابێ. کچە مامەکەم لە قەسابخانەکەی وەک قەدیسەیەک بە ماچباران دێنمە خوارێ و بە سۆزێکی زۆرەوە بەندی دەکەم.

– ئەدی لەبارەی وەفاداری چۆن؟

– کچە مامەکەم دەستەبەری ئەوە دەکات کە لە هاوسەرگیریمان وەفاداری بەردەوام بێت، بەڵام من ناتوانم واز لە ژنان بێنم، هەروەک چۆن ناتوانم واز لە بادە و شمشێریش بێنم.

فرانسیسکۆ بە پەلە گەڕایەوە ئیسپانیا بۆ ئەوەی بەر لە پەشیمانبوونەوەی پاپای مەزن زەماوەندەکەی بکات. گومانی تێدا نییە کە توانی نێوانی هەستەوەرە ئەفلاتۆنییەکانی کچە مامەکەی و هەستە سەرسەختەکەی خۆی بگونجێنێ. کچەش بێ ئەوەی تۆزە شەرمێک بکات، بە پیل ئارەزووەکانی ئەودا چوو، چونکە هەڵچوونی ئەو ژن و مێردە بووە شتێکی ئەفسانەیی. هەروەها دەگێڕنەوە کە دراوسێکانیان لە سەر شەقامەکەی بەردەرگەی خانەوادەی ئەگێری کۆدەبوونەوە، هەتا لە هاتوهاواری سەروەختی جووتبوونی ئەوان چێژ وەربگرن و گرەو لەسەر ژمارەی ئەو هێرشە ئەوینداریانە بکەن کە ئەو شەوە بووک و زاوا ئەنجامیان دەدا.

***

لە دوای جەنگ و خوێن و باروود و قورچلپاوێکی زۆر، پێدرۆ بالدیبیا، لە پاش بڵاوبوونەوەی ناودەنگی هەڵمەتە سەربازییەکانی، بە ئەزموونێکی فرەوان و توورەگەی پڕ لە زێڕ گەڕایەوە زێدی خۆی و بیری لە بوژانەوەی میراتە نەدارەکەی دەکردەوە. مارینا ش لە چاوەڕێی ئەودابوو وەک ژنێکی تەواو ڕەفتاری منداڵکارانەی بە دوای خۆیدا جێ هێشت و تەمەنی گەیشتبووە حەڤدە ساڵ. جوانییە جاویدانییەکەی کە لێی ڕادەمای وەک شاکارێکی

هونەری خۆی نیشـان دەدا. دیمەنێکی کـەمـتـەرخـەمـانەی هەبوو دەتگوت لە خـەوێدا دەڕوات، یان وا هـەست بکات کـە ژیانی دەبێـتـە چاوەڕوانیـیـەکی تا هەتایی. شەوی یەکـەمی پێکەوە بوونیان هـەردووکیان وەک دوو مـرۆڤی ئامێری هەمان جولە و ڕەفتاری جارانیان دووبارە کردەوە و لە هەمـان باری بێدەنگی. لە تاریکی ژوورەکەدا بە بێ شـادمانی جەسـتەیان جووتبوو؛ کابرا نەیدەویست بیترسێنێ و ژنەش دەترسـا بکەوێتە گوناهکاری؛ ئەویان ئارەزووی ئەوینداری دەکات و ئەمـیش حـەز دەکات زوو سـبـەینە دابێت. بە ڕۆژیش هـەریـەکـەیان بە ڕۆڵی تایبـەتـی خـۆی هەڵدەسـتـا، لە هەمـان شـوێن دەژیان و بێ ئەوەی جەسـتـەیان بەر یەکـتـر بکەوێ. مـارینا بە کـەمێک سـۆز و قسـەی خـۆشـەوە پێشـوازی لە مـێردەکـەی کـرد کـە لە جیـاتی خـەڵەتاندن بووە هۆی دڵتـوندی مـێـردەکەی. پێدرۆ پێویسـتی بـەو هـەمـوو چاوەدێرییـە نەبوو، بەڵکو نەختـێ ئـەوینداری گـــەرەک بوو، وەلـێ نەدەوێرا داوای ئەوەی لـێ بکات، چونکە وای دادەنا کـە کاری ئەوینداری لە ژنێکی بەڕێز و ئاینپـەروەری وەک هاوسـەرەکەی ناوەشـێـتـەوە. هـەسـتی دەکـرد کـە لەلایەن مـاریناوە چاوەدێری دەکـرێت و زیندانیی پەیوەندییـەکی نادیاری هەستێکە کە نازانێ چۆن لەگەڵی بێتە وەڵام. نیگا پڕ لە نزاکانی ژنە کە لە ناو ماڵ بـە دوایدا دەگەڕا و خـەمە بێدەنگەکـانی لە کاتی مـاڵئاواییکردن و ڕوخساری پەشـیمانانەی لە کاتی پێشوازیکردنی لە پاش سـەفەرێکی کورت، سـەخڵـەتی دەکردن. مارینا لە بەرچاوی ئەمدا وا خۆی دەردەخـــست کـە نـەدەبوو دەســتی پێی بکەوێ، بەڵکو دەبووایە هـەر دوور بە دووری لەو کـاتەی کـە خـەریکی بەرگـدوورینە و لە هزر و سـەلاواتەکـانی خـۆی ڕاچووە و وەک ژنە نوێژکـەری کـەتەدرائییـە بە نوورێکی زێڕین شـەوق دەداتەوە و لە پەنجـەرەکـەوە دێتـە ژوورێ، ئەمـیش بە تێـڕوانـین چێـژی لێ وەرگـرێت. سـەبارەت بە پێدرۆ، بەیەکگەیشـتنی پشت پەردە ئەسـتوورەکەی سـاڵەهایە لە تەک ئەو سـیـسـەمـەیە کـە چەندان نەوە و لە بنەمـاڵەی بـالدیبـیـا بـە کـاریان هێناوە، جـوانی و دڵکێشـیـیـەکـەی جارانی نـەمابوو، چونکە مـارینا کـراسی تایبـەت بە نووسـتنی لەبـەر نەدەکرد و بـەڵکو جلێکی بێ نموودی دەپۆشی کـە

زەوقی پیاوی دەپووکاندەوە. پێدرۆ داوای لێی دەکرد کە بۆ ئەو مەسەلانە پرسی ژنەکانی تر بکات، وەلێ مارینا نەیدەتوانی لەو بابەتە لەگەڵ هیچ کەسێک بدوێ. لەدوای هەردەستملانێیەک چەند سەعاتێک نوێژی دەکرد و لەسەر ئەو ئەرزە بەردینە دەچەمایەوە کە جاروبار تەوژمی با گەسگی دەدا، ڕەق و وشک و کەساس دەمایەوە، چونکە نەیدەتوانی مێردەکەی ڕازی بکات. بەڵام بە نهێنی لە لای خۆیەوە چێژی لەو ڕەفتارانەی وەردەگرت، چونکە لەگەڵ ژنانی ئاسایی جیابوو و لە پیرۆزکردنیشی لەلایەن خواوەندەوە نێزیک دەبووەوە. پێدرۆ بۆی ڕوون دەکردەوە کە هیچ گوناهێک لە ئارەزووهەڵسانی نێوان ژن و مێرددا نییە، چونکە ئامانجی جووتبوونەکە دروستکردنی منداڵە، وەلێ مارینا وەختی دەستی پێدرۆی بەردەکەوت، نێو ئێسقانیشی دەیبەستا. خۆ گاڵتە نەبوو کە قەشەی دانپیانانەکەی چەندان جار لە ترسی دۆزەخ و ڕووتبوونەوەی جەستەی بۆ دووبارە دەکردەوە. هەر لەو وەختەوەی کە پێدرۆ ئەمی ناسی جگە لە ڕوخسار و دەستەکانی و جاروباریش پێیەکانی، شوێنێکی تری لە جەستەی نەدەبینی. پێدرۆ ئارەزووی دەکرد بەزۆر جلەکانی لەبەر هەڵماڵێ، بەڵام کاتێ کە لێی نێزیک دەبووەوە، بە هۆی ئەو ترسەی کە لە گلێنەی چاوەکانییەوە بەدەردەکەوتن، ئەمیش لە شوێنی خۆی سارد دەبووەوە؛ ئەو ترسە لەگەڵ نیگا شیرینەکانی ڕۆژێی وەختێ بە جلی ئاساییەوە بوون، زۆر لێکدژ بوون. مارینا نە حەزی بە ئەوینداری و نە بە دیاردەکانی ژیانی هاوبەش دەکرد، هەروەها قەت ڕوخسار و حەماسەتی خۆی نەدەگۆڕی. ئەو وەک مەڕێکی هێمن وابوو. ئەو هەموو نەفامییانەی ئەو تووڕەیی پێدرۆیان دەوروژاند، هەرچەندە پێی وابوو سیمایەکی ژنانەی هەیە. پێدرۆ لە هەست و هۆشی ژنەکەی نەدەگەیشت. ئەو کاتەی پەردەی کچێنی نەهێشت، هێشتا منداڵ بوو، دەیویست لەو حاڵەتە پاکی و بێگوناهییە بیهێڵێتەوە کە لە سەرتادا ئەمیان لە خشتە بردبوو، بەڵام ئێستا جگە لەوەی کە دەبێ لێی هەڵگەڕێتەوە و بەگژیدا بچێت، ئارەزووی شتێکی تر ناکات.

بالدیبیا بە هۆی ئازاییەکەی و تواناداریەکانی وەک ڕێبەرێک، زۆر بە

خێرایی گەیشتە پلەی سەرکردە، وەلێ قەت شانازی بە ڕابردووی خۆی نەدەکرد، هەرچەندە ڕۆژانێکی گەشی لەو بوارەدا هەبوو. لە دوای تالانکردنی ڕۆما، چەند کابووسێکی ناڕەحەت ئازاریان دەدا، ژنێکی گەنجی لێ دیاردەکەوت کە منداڵەکانی لە باوەش گرتووە و ئامادەیە لە سەر پردێک خۆی فڕێداتە ناو ڕووبارە خوێناوییەکە. پێدرۆ سنووری بێ بەهایی مرۆڤەکان و ناخە تاریکەکانی ڕوحی پێ دەزانی و دەشیزانی ئەو پیاوانەی کە تووشی توندوتیژییەکانی جەنگ بوونە، ڕەنگە ڕەفتاری قێزەون و تۆقێنەریش ئەنجام بدەن و هەستی نەدەکرد کە بە خۆی لە خەڵکانی تر جیاوازە. ئەو پێی لە گوناهەکانی خۆی دەنا و قەشەش هەمیشە بە تۆبەکردنێکی بچووک دەیبووری، چونکە ئەو هەڵانەی کە بە ناوی ئیسپانیا و کەنیسە دەکران بە گوناه حسێب نە دەکران. ئایا نایبینی کە چۆن ملکەچی فەرمانی سەرۆکەکانییەتی؟

Ego te absolve omnibus sensures et peccatis; in nominee Patri; et Filii; et Spiritus Sancti Amen

– واتە من بە ناوی باوک و کوڕ و ڕوحی پیرۆزەوە لە هەموو گوناه و تاوانەکانت دەبوورم، ئامین!.

پێدرۆ وای بیر دەکردەوە کە کەسێک نییە لە پێناوی ڕزگاربوون، حەماسەتی کوشت و کوشتاری ئەزموون کردبێ. ئەو تامی توندوتیژی کردبوو کە ئەوەش پاڵنەرێکی نهێنییە لە هەموو سەربازێک، چونکە ناکرێ بە جۆرێکی تر بجەنگێی. ئاخر ئەو دەنگ و هاتوهاوارەی کە سەربازەکان بەیەکەوە لە کاتی هێرشکردن لە ناخیان دەردەچوو شانبەشانی بێ پەرواییان لە بەرامبەر ئازار و ترس، وای لێیان دەکرد کە هەست زیندوویی خۆیان بکەن. ئەو چێژە سەختەی کە لە ڕووچوونی شمشێر بە ناو جەستە و ئەو هێزە شەیتانییەی کە مرۆڤێکی تر لە ژیان دادەبڕێت لەگەڵ ئەم شەیداییە بۆ خوێنڕشتن، ڕاهاتن و خووپێوەگرتنێکی بە هێز و خۆسەپێن بوو. شەڕ لە ژێر بیانووی ئەرک ئەنجام دەدرا و پاشان بە هۆی وروژاندن ئەو کارەی لێ

دەکەویتەوە. هیچ شتێک بەمە بەراورد ناکرێت، هەتا ئەو کەسەش کە پێی وایە پیاوێکی لە خواترسە و دەتوانێ دان بەخۆیدا بگرێت، هەرکە غەریزەی کوشتاری بە ناخیدا بەرەڵابوو، ئیتر زۆر لە غەریزەی ژیان بەهێتر دەبێت. ئاخر پیاو لە کاتی خواردن و جووتبوون و کوشتاردا لە هەموو شتێک دادەبڕێت، هەر وەک چۆن فرانسیسکۆی هاوڕێشی وا دەبینی.

تاکە ڕێگە بۆ ڕزگاربوونی ڕوحی ئەو، دوورکەوتنەوەیەتی لە فریودانی شمشێر. لەو وەختەی لە بەرامبەر قەسابخانە گەورەکەی کەتەدرائییە بە سەر چۆکی خۆیدا چەمابووەوە، سوێندی خوارد کە ئەو ژیانەی ماویەتی هەمووی بۆ کاری چاکە و خزمەتی کەنیسە و ئیسپانیا تەرخان بکات، هیچی تر کاری نابەجێ نەکات و بە پێی سەرەتایەکی ئەخلاقی بتەو ژیانی خۆی ڕێک بخات. لە هەندێ بۆنەدا چیوای نەدەما گیانی لەدەست بدات، بەڵام خوا بواری پێ دەدایەوە کە درێژە بە ژیانی بدات، تا لە گوناهەکانی ببوورێت. شمشێرە تەڵەیتەڵییەکەی لە تەک شمشێری باوانە کۆنەکانی هەڵواسی و بڕیاری دا هۆشی ئارام کاتەوە.

سەرکردە بووە دراوسێیەکی نەرمونیان کە بایەخی بە کاروبارە گشتییەکان و ماڵات و کشتوکاڵ و وشکەساڵی و سەرما و شەختە و کێشەکانی خەڵک و ڕقەکانیان و خوێندنەوە و یاری کاغەزێن و نوێژەکان دەدا. لەبەرئەوەی یاسای نووسراوە و مافەکانی خوێندبوو، خەڵکەکە لە بابەتە یاساییەکان پرسیان پێی دەکرد و گەلێ جاریش دەسەڵاتی دادوەریش ڕێزیان بۆ ئامۆژگارییەکانی ئەم دادەنا. گەورەترین چێژی لە کتێب وەردەگرت، بەتایبەتی هەواڵەکانی گەشت و گەڕان و نەخشەی جوگرافی وڵاتان کە بە وردی دەیخوێندنەوە. لە بواری شیعریشدا چامەی "ڕێزدار کەمپیادۆر"ی ئەزبەر کردبوو و بە هەواڵە خەیاڵییەکانی سۆلینۆ و گەشتە ئەندێشەییەکانی جۆن ماندیفێڵ شەیدا بووبوو، بەڵام زیاتر حەزی بە خوێندنەوەی هەواڵەکانی جیهانی تازە دەکرد کە لە ئیسپانیا بڵاو دەکرانەوە. نەبەردییەکانی کریستۆفەر کۆڵۆمبس و فێرناندۆ ماجەلان و ئەمریکۆ ڤیسپۆچی و هێرنان کۆرتیس و ئەوانی تر خەویان

دەزراند و نەیاندەهێشت شەوان بنوێت؛ لەسەر پشتی تەختە خەوەکەی کە لە برۆکار دروست کرابوو، چاوەکانی دەچەسپاند و زیندە خەونی بە دۆزینەوەی شوێنی تازە لەسەر زەوی و داگیرکردنی و دروستکردنی شار و گەیاندنی خاچ بۆ خاکی وەحشییەکان لە پێناوی پیرۆزیی خوا و نەخشاندنی ناوی خۆی بە ئاگر و ئاسن لە مێژوودا، دەبینی. لەو وەختانەدا ژنەکەی جلی نوێژکردنی بە داوی زێڕ دەدووری و بەردەوام سەڵەواتی لێ دەدا. هەرچەندە پێدرۆ لە حەفتەی چەند کەرەتێک لە کەلێنە ئابڕووبەرەکەی کراسی نووستنی ماریا لەگەڵی جووت دەبوو، وەلێ نەیتوانی ئەو منداڵانە بخاتەوە کە ئارەزووی دەکردن. ئیتر بەو جۆرە ساڵانێکی بێزارکەر لە خەوی قووڵی گەرمای هاوینان و خۆکورشکردنەوەی زستانان بە سەرچوون... ئیستریمادۆرا خۆی دڵڕەقییەکی بەردەوامە.

***

لە پاش چەندان ساڵ، ئەو کاتەی پێدرۆ دی بالدیبیا، لە تەک ژنەکەی لە ماڵە بێدەنگەکەی خۆی لە کاستوێرا ملی بۆ پیریەتی کەچ کردبوو بێ ئەوەی هیچ شکۆدارییەکی تازە بخاتە سەر ژیانی خۆی، گەڕیدەیەک چووە سەردانی کە نامەیەکی لە فرانسیسکۆوە پێ بوو. ئەو کابرایە ناوی خێرۆنیمۆ ئەڵدێرێتی بوو لە دانیشتووانی شاری ئۆڵمیدۆ بوو. ڕوخسارێکی نەرم و پرچێکی بە گروازە و بۆری ڕەنگ هەنگوێنی و دوو چاوی بریسکەدار و سمێڵێکی تورکیانەی هەبوو کە هەردوو لای بۆ سەرەوە بەرز کردبوونەوە. بالدیبیا مێواندارییەکی ڕێزدارانەی کرد، وەک هەر ئیسپانیاییەکی جوامێر، بردییەوە ماڵەکەی خۆی کە هیچ نیشانەیەکی شکۆداری و خۆشگوزەرانی پێوە دیار نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە خانە گشتییەکانی حەوانەوە گونجاوتر و پڕ لە ئەمانتر بوو. وەختی زستانێ بوو، مارینا فەرمانی دا لە هۆڵە سەرەکییەکە سۆبە دارینەکە داگیرسێن، وەلێ ئاگری دارەکە، نە هەواکەی گەرم دادەهێنا و نە بڕی بە تاریکییەکەش دەدا. لەو ژوورە ڕووت و بێ کەلوپەلەدا کە هیچ شتێکی جوانکاری تێدا نەبوو، ئەو ژن و مێردە ژیانیان تێدا بە سەر دەبرد.

لەولای مێردەکە خەریکی خوێندنەوە دەبوو، ژنەش لە گڵ دەرزی و دوورمان بوو، لەولاتر شوێنی نانخواردنیان بوو و لەم لایەش نوێژەکانیان دادەبەستا. مارینا بادەیەکی تام توونی دەستکردی خۆیان و هەندێ سجوق و پەنیر و نانی لە پێش دانان و گەڕایەوە گۆشەکەی خۆی تا دوورمانەکەی بکات، ئەوانیش هەردووکیان کەوتنە گفتوگۆ.

خیرۆنیمۆ بە ئەرکی بەسەربازکردنی پیاوەکان هەڵدەستا تا بیاننێرێتە ولاتی هندییەکان. جا بۆ ئەوەی سەرنجیان ڕاکێشێت، لە باڕ و گۆڕەپانەکان ملوانکەیەکی زێڕی دەنکە گەورەکانی دەخستنە بەرچاوی پیاوەکان کە بە داوێکی زیوی قایمەوە کرابوون. ئەو نامەیەی کە لە فرانسیسکۆوە بۆ پێدرۆ هاتبوو، ناوەڕۆکەکەی لە بارەی جیهانی تازە بوو. خیرۆنیمۆ بە حەماسەتەوە باسی توانادارییە خەیاڵییەکانی ئەو کیشوەرەی بۆ خانەخوێیەکەی دەکرد کە بەردەوام ئەو ڕۆژانە قسە و باسی ئەو جیهانە تازەیە لەسەر زاران بوو و گوتی: هیچ بوارێک بۆ دەستخستنی شاکاری نەبەردانە لە ئەوروپای گەندەڵ و پیر و پارچە پارچەبووی نێو پیلانی سیاسی و تەڵەکەبازی کۆشکەکان و بانگەوازە بێ بنەماکانی وێنەی ئەو لۆسەرییانە نەماوە کە مەسیحییەتیان بەش بەش کرد. دیسان دووبارەی کردەوە کە ئایندە لەو دیوی ئۆقیانووسدایە و لە ولاتی هند یان ئەمریکا زۆر شت هەنە بە دەستیان بێنی. ئەمریکا ئەو ناوەیە کە نەخشەکێشی ئەڵمانی بە مەبەستی ڕێزلێنان لە ئەمریکۆ ڤیسبۆچی لەو ولاتەی نا، ئەو گەشتیارە فلۆرەنساییەی کە مافی ئەوەی نەبوو ئەو شەرەفەی بدرێتێ، چونکە دۆزەرەوەی ئەو ولاتانە، کریستۆفەر کۆڵۆمبسە.

بە پێی ڕای ئەڵدێرێتی، دەبوو ناوی ئەو ولاتانە کریستۆڤالینا، یان کۆڵۆمبسیا بووایە. هەروەها گوتی تازە ناوەکەی لێنراوە و ئەمە ئێستا کێشەیەک نییە. ئەو شتەی کە جیهانی تازە لە هەموو شتێک زۆرتر پێویستی پێی هەیە، خانەدانە بەجەرگ و ئازاکانە، بە دەستێک شمشێریان لە دەست بێ و بە دەستەکەی تریش خاچ هەڵگرن و ئامادەسازبن بۆ کاری دۆزینەوە و دەستبەسەرداگرتن. کەس ناتوانێ بزانێت کە دارستانە سەوزەکانی ئەو

هەرێمانە چەندە فرەوانن و ڕووباری کریستاڵی چەندە زۆرن و دەریاچە هێمنەکانی چەندە قووڵن و چەند کانگەی زێڕ و زیوی دەوڵەمەندی تێدایە. نەک تەنیا خەونبینین بە گەنجینەکان، بەڵکو خەونبینین بە پایەداری، ژیانێک بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە، شەڕی وەحشییە دڕندەکان و دەستخستنی قەدەرێکی بەرز و کارکردن بە بەخششەکانی خواوەند بە دامەزراندنی نەوەیەکی حوکمڕانی. ئەوانە هەمووی و زۆری تریش کە دەشێ لە سنووری تازەی ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیا بەدەستبێن. ئاخر ئەوێ باڵندەی وای لێیە کە پەڕەکانی دەڵێی بە گەوهەر ڕازاوەتەوە، ژنە ڕووتەکانیشیان پێستیان لە ڕەنگی هەنگوێنە و بە ئاسانی ڕام دەبن... هەروەها گوتی: بمبوورە ئەی خاتوو مارینا کە ئەو قسانە دەکەم، ئەوە تەنیا ڕێگەیەکە بۆ ئاخاوتن، زمانی قشتاڵی لە باریدا نییە وەسفی ئەو شتە زۆرانەی پێ بکەیت کە لەو وڵاتەدا هەیە، مرواریەکانی بەقەد هێلکەی کەو دەبێت... هەر زێڕە و لە درەختەکان بەردەبێتەوە، بە جۆرێک هەموو سەربازێک بۆی هەیە ببێتە خاوەن موڵک و زەویوزارێکی ئەوەندە زۆر بەقەد هەموو ڕووبەری ئیسپانیا... لە هەمووی گرینگتر ئەوەیە کە چەندان گەل و نەتەوە لەوێ چاوەڕێی پەیامی خوای تاک و تەنیا و ڕاستەقینە و شارستانییەتی پڕ لە شکۆداری و خێرخوازانەی قشتاڵییەکان دەکەن.

هەروەها گوتی کە فرانسیسکۆ ئەگێری هاوڕێیان بەتەمایە لە دەریا بدا و تێنووی ئەو جەربەزەییانەیە و ئامادەیە ژنە خۆشەویستەکەی و هەر پێنج منداڵەکەی بەجێ بێڵێ کە لە ساڵانی ڕابردوو خوا پێی داون.

بالدیبیا لێی پرسی: ئایا پێت وایە بۆ پیاوی وەک ئێمە لەو جیهانە نوێیە هەلی لەبار هەبێت؟ ئاخر ئەوە پەنجا و سێ ساڵ بە سەر گەشتەکەی کۆلۆمبس بۆ ئەوێ تێپەڕیوە و بیست و شەش ساڵیشە کۆرتیس مەکسیکی داگیر کردووە...

ئەڵدێرێتی لەسەر ڕایەکانی خۆی پێی داگرت و گوتی: هەروەها بیست و شەش ساڵە فێرناندۆ ماجەلان گەشتەکەی خۆی بە دەوری جیهاندا کردووە.

هەروەک دەبینی زەوی لە فرەوانبوون دایە و هەلەکان کۆتاییان نایەت. ئاخر خۆ تەنیا جیهانی نویٚ پرۆژەی دۆزینەوە نییە، بەڵکو ئەفریقا و هندستان و دوورگەکانی فلیپین و شوێنی تریش هەنە.

هەروەها ئەوەشی بۆ دووبارە کردەوە کە لە سەراپای ئیسپانیا باسی لێوە دەکرێت: داگیرکردنی پێرۆ و گەنجینە زۆرەکانی. دوو ساڵ بەرلەوە، دوو سەربازی نەناسراو، فرانسیسکۆ بێسارۆ و دیێگۆ ماگرۆ کۆبوونەوە و بڕیاریان دا ڕوو لە وڵاتی پێرۆ بکەن. بۆ ئەو مەبەستە لە دوو گەشتی بەدوای یەکدا بەرەنگاری هەموو مەترسییەکانی دەریا و وشکایی بوونەوە: بە کەشتییەکەیان لە پەنەماوە بەڕێکەوتن و بە لێوارەکانی کەناری ئۆقیانووسی هێمندا بەبیٚ بەکارهێنانی نەخشە بەرەو خواروو ملیان نا. لە هەندیٚ خێڵە هندییەکان گوێبیستی ئەوە بوون کە شوێنی وا هەیە کە ئامێری خواردن و کشتوکاڵی نەخشێنراو بە بەردی زەمرووود بەکار دێن و ڕووبارەکانی ئاوی زیویان پێدا دەڕوات و گەلای دارەکانیشی لە زێڕی زیندووە. بەڵام چونکە نەیاندەزانی بەتەواوی بۆ کوی دەڕۆن، دەبووایە ڕاوەستن و دابەزنە سەر وشکایی تا ئەو هەرێمانە ببین کە هێشتا ئەوروپاییەکان پێیان نەناوەتە سەری. لە ڕێگەدا زۆر لە قشتاڵییەکان مردن و هەندێکیش بە ساغی مانەوە بە ناچاری مار و خشۆکی بچووکیان دەخوارد.

لە گەشتی سێیەمینیاندا کە دیێگۆ ماگرۆیان لەگەڵ نەبوو، چونکە سەربازی ئامادە دەکرد و توانی سەروەت و سامانی کەشتییەکی تر بخاتە ژێر دەستی خۆی. بەڵام بێسارۆ و هاوڕێکانی دواجار توانیان بگەنە زەوییەکانی ئینکا. ئیسپانییەکان لە کەشتییەکەیان دابەزین و چوونە سەر زەوییە پاک و خاوەن دۆڵە بە پیتەکان و چیایە بەرزەکان، کە ڕووەکی ئەویٚ زۆر لە کژوگیا ژەهراوییەکانی باکوور جیاوازبوو. ئەوان شەست و دوو سوارچاک بوون، بە ڕاکێشانی ئامێرە جەنگییەکانیانەوە و سەد و شەش سەربازی پیادەشیان لەگەڵدا بوو. بە قەڵغانە قورسەکانیانەوە دەرچوون و خاچێکیشیان لە پێشەوە بەرز کردبووەوە. تفەنگەکانیان سوار و شمشێرەکانیشیان لە کالان

هەڵکێشابوو. خەڵکانێک لێیان هاتنەدەر کە ڕەنگیان لە داری وشک دەچوو و بەرگی ڕەنگاوڕەنگ و نایابیان لەبەردابوو. بە زمانێکی شیرین دەدوان کە پیتەکانی دەنگدار بوون و ترسبار دەکەوتنە بەرچاوان، چونکە پێشتر قەت ئەو بەشەرە ڕیشدارانەیان نەدیتبوو، نیوەیان ئاژەڵە و نیوەکەی تر بەشەر. ڕەنگە ئەو سەرسامبوونە لە هەردوولا وەک یەک بوویێت، چونکە گەشتیارەکانیش پێشبینی شارستانییەتێکی وایان نەدەکرد. کارە ئەندازەیییەکان و بیناسازییەکان و جۆرەکانی قوماش و خشڵ سەرسامی کردبوون. لەو وەختەدا ئینکا ئەتاوالبا شای ئیمپراتۆریەتەکە لە ناو ئاوی گەرماوە شفابەخشە گەرمەکان بوو کە بۆ کەیفی خۆی، وێنەی خۆشگوزەرانی سلێمانی مەزن ئاسا لەوێ چادرگەی هەڵدابوو و هەزاران تۆبەکار هاوڕێی بوون. یەکێ لە سەرکردە سەربازییەکانی بێسارۆ گەیشتە لایان تا داوای گفتوگۆ و دانووسانی لێ بکات. ئینکا بە خۆی و پیاوەکانی دەوروبەری لە چادرێکی سپیدا پێشوازییان لێی کرد کە بە جۆرەها گوڵ و داری بەردار دەورە درابوو و هەمووی لە مەرکانەی کانزایی بەهادار چاندرابوون. لە نێوان حەوزە گەرمەکاندا سەدان کچی پاکیزە و چەندان کۆمەڵی منداڵ یارییان دەکرد. ئەتاوالبا لە پشت پەردە خۆی حەشاردابوو، چونکە کەس بۆی نەبوو سەیری ڕوخساری ئەم بکات، بەڵام مەرەقی ئاشنابوون بە شتی تازە لە پرۆتۆکۆڵ لەلای گرینگتربوو، بۆیە بڕیاری دا کە پەردەکە لادەن تا ئەو نامۆیە ڕیشدارە لە نزیکەوە ببینێت. سەرکردە ئیسپانییەکە خۆی لە بەرامبەر شایەکی گەنج و ئاکار جوان بینییەوە کە لەسەر کورسییەکی ساف لە زێڕ و لە ژێر چەترێک دانیشتووە کە لە پەڕی بەبەغا دروستکراوە. هەرچەندە بارودۆخەکە زۆر سەیروسەمەرە بوو، لەگەڵ ئەوەش تروسکە نیگایەکی پڕ لە سۆز لە چاوی هەردووکیانەوە، لە نێوان سەربازە ئیسپانیاییەکە و شازادەی کیچوایی شکۆدار دەردەچوو. ئەتاوالبا داوەتێکی خواردنی لەو قاپ و لەگەنانە بۆ میوانەکانی ساز کرد کە لە زێڕ و زیو دروستکرابوون و بە بەردی زەمروود و جەمشەت نەخشێنرابوون. ئەفسەرە ئیسپانییەکە داوەتنامەکەی بێسارۆی

بە ئینکا ڕاگەیاند، بەڵام هەستیشی بە نیگەرانی کرد، چونکە دەیزانی کە ئەو داوەتە تەڵەیەکە بۆ بەدیلکردنی ئەتاوالبا، هەروەک چۆن ئەوە ڕەفتاری ستراتیژی گشت سەرکردە داگیرکەرەکانە لەو حاڵەتانە. چەند سەعاتێک بەس بوو بۆ ئەوەی فێر بێت کە چۆن ڕێز لە خەڵکی ڕەسەنی ئەوێ بگرێت، ئاخر ئەوان نەک هەر وەحشی و دڕندە نەبوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆر لە زۆربەی گەلانی ئەوروپا پێشکەوتووتر بوون. بە سەرسوڕمانەوە زانی کە گەلی ئینکا زانیارییان لە فەلەکناسی پێشکەوتووە و ڕۆژژمێرێکیان داناوە؛ سەرژمێری تەواوی دانیشتووانی ئیمپڕتۆرییە فرەوانەکەی خۆیان هەیە و بە ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی و سەربازیی تۆکمە کاروباریان بەڕێوە دەبەن. بەڵام خوێندن و نووسینیان نییە و چەکەکانیان زۆر سەرەتایین، جگە لە جۆرێکی تایبەت لە مەڕی قاچ درێژ کە پێی دەڵێن(لاما)، نە گالیسکە و نە مالات بۆ بارهەڵگرتن و سواربوون بەکار ناهێنن. ئەوان خۆر دەپەرستن کە تەنیا لە حاڵەتی کارەساتباردا پێویستی بە قوربانیی بەشەر هەیە، وەک نەخۆشکەوتنی ئینکا یان ماڵوێرانییەکانی شەڕ. ئەو وەختە پێویستە بە پێشکێشکردنی کچی پاکیزە یان منداڵ وەک قوربانی، تا تووڕەییەکەی ئارام ببێتەوە.

دوای ئەوەی بە بەڵێنی دۆستایەتی ساختە لە خشتەیان برد، ئینکا و دەست و پێوەندە فرەوانەکەی بە بێ چەک چوونە شاری کاخامەرکا، کە لەوێ بێسارۆ کەمینی بۆ دانابوونەوە. گەشتی پاشا لەسەر تەختەهەڵگرێکی لە زێڕ دروستکراو بوو، پیاوە نزیک و لایەنگرەکانی هەڵیان گرتبوو؛ و خەڵکێکی یەکجار زۆر لە پاکیزە شۆخەکان بە دوایدا دەڕۆیشتن. پاش ئەوەی ئیسپانییەکان هەزاران کەسیان لە حاشییە و لایەنگرانی پاشا کوشت، لەوانەی کە هەوڵیان دەدا بە جەستەی خۆیان پارێزگاری لێ بکەن، ئەتاوالبا بە دیلی گیرا.

بالدیبیا لێی پرسی: جگە لە گەنجینەکانی وڵاتی پێرۆ قسەیەکی تر نەبوو. ڤایرۆسی ئەو هەواڵە وەک نەخۆشی گرانەتا بە ئیسپانیادا بڵاو بووەوە. پێم

بلّێ، ئایا ئەوەی دەیگێڕنەوە ڕاستە؟

– ئەوە ڕاستە ئەگەرچی بە درۆش دەچێت.

لە بەرامبەر ئازادکردنی خۆی، ئینکا پێشنیازی بۆ بێسارۆ کرد کە ژوورێکی بۆ پڕ لە زێڕ بکات، درێژییەکەی بیست و دوو پێ و پانییەکەی حەڤدە پێ و بەرزیشی نۆ پێ بێت.

– ئەو بڕە زێڕە هەرگیز پەیدا ناکرێت!

– ئەوە گەورەترین بەخشش بوو لە مێژوو. ئەو بڕە زێڕە هەمووی لەسەر شێوەی ملوانکە و پەیکەر و پەرداخ هێنرابوون، بەڵام هەمووی تواندرابووەوە و لە چەندان قاڵب داڕێژرابوونەوە، بە مۆری شاهانەی ئیسپانیاش مۆرکرابوون. ئەتاوالبا لە بەخشینی ئەو سامانە، کە ڕەعیەتەکەی لە هەموو کونجێکی ئیمپڕاتۆرییەتەکەیان وەک مێروستان کۆیان کردبووەوە، هیچ سوودێکی پێنەگەیشت؛ ئاخر پاش ئەوەی بێسارۆ بۆ ماوەی نۆ مانگ دەستبەسەری کرد، بڕیاری دا بە زیندوێتی بیسووتێنن. لە دوا چرکەدا لە بەرامبەر ڕازیبوونی ئینکا بە هاتنە سەر دینی مەسیحی، حوکمەکەی بۆ سێدارە سووک کرد.

ئەڵدێرێتی بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی باسەکەی بەردەوام بوو: بێسارۆ بڕوای وابوو کە هۆکاری بەجێی بۆ ئەو حوکمە بە دەستەوەیە. دەیگوت ئەو دیلە لە زیندانەوە خەڵکی بۆ یاخیبوون هان داوە. جا بە گوێرەی قسەی سیخوڕەکان، دوو سەد هەزار کەس لە ڕۆڵەکانی کیچوا کە لە کیتۆوە هاتبوون و سی هەزار کەسی کاریبیش لەوانەی گۆشتی بەشەر دەخۆن، ئامادەبوون هێرش بکەنە سەر ئیسپانیاییەکان لە کاخامرکا، بەڵام مردنی ئینکا وای لێ کردن بگەڕێنەوە. وەلێ پاشان دەرکەوت کە ڕاستییەکەی ئەو سوپایە هەر لە بناغەدا نەبووە.

پێدرۆ دی بالدیبیا گوتی: بەهەرحاڵ زۆر زەحمەتە ڕوون بکرێتەوە کە چۆن دەستەیەک لە ئیسپانییەکان توانیویانە شارستانییەتێکی ئەوها پێشکەوتوو لە ناو ببەن، کە تۆ وەسفی دەکەیت. ئاخر ئێمە باسی سەرزەمینەک دەکەین کە لە ئەوروپاش فرەوانترە.

– ئیمپراتۆرییەتێکی زۆر پان و بەرین بوو، بەڵام لاواز و ساوا بوو. ئەو کاتەی بێسارۆ گەیشتە ئەوێ، هێشتا سەدەیەک بە سەر دامەزراندنیدا تێ نەپەڕیبوو، سەرەڕای ئەوەش میللەتەکەی ئینکا لە سستیدا دەژیان و نەیانتوانی ڕووبەڕووی ئازایەتی و چەک و ئەسپەکانی ئێمە ببنەوە.

– بڕوام وایە بێسارۆ پەیمانی لەگەڵ دوژمنەکانی ئینکا بەستبێت، هەروەک چۆن هێرنان کۆرتیسیش لە مەکسیک وای کرد.

– بەڵێ. ئەو کاتە شەڕی براکوژی لە نێوان ئەتاوالبا و هۆسکاری برای هەبوو، بێسارۆش سوودی لەمە وەرگرت، پاشان دیێگۆ ماگرۆش بە هەمان شێوە کە دوای ماوەیەکی کەم گەیشتبووە پێرۆ.

ئەلدێرێتی ڕوونی کردەوە کە بە بێ زانیاری دەسەڵات هیچ وەرەقەیەک لە ئیمپراتۆریەتی پێرۆ لە شوێنی خۆی نەدەجولا، هەموو خەڵکەکە کۆیلە بوون و ئینکاش بە بەشێک لەو داهاتەی کە لە ڕەعیەتەوە دەستی دەکەوت، خۆراک و پارێزگاری بۆ هێتیم و بێوەژن و نەخۆش و پیر و پەککەوتەکان دابین دەکرد و هەندێک پارە و خۆراک و پێویستیشی بۆ ڕۆژی تەنگانە دادەنا، وەلێ لەگەڵ ئەو کارە عاقڵانەیەشدا کە لە ئیسپانیا نەبوو. میللەتەکە ڕقیان لە شا و دەوروبەرەکەی دەبووەوە، چونکە لە ژێر زوڵمی کۆیلایەتی دەست و پێوەندە سەربازی و ئاینییەکان دەژیان. بۆ خەڵکەکە جیاوازی نەبوو کە لە ژێر دەسەڵاتی ئینکا بژین یان ئیسپانییەکان، بۆیە هیچ بەرگرییەکی داگیرکەرەکانیان نەکرد.

بە هەرحاڵ مردنی ئەتاوالبا بووە هۆی سەرکەوتنی بێسارۆ؛ هەر لە دوای لە ناوبردنی سەری ئیمپراتۆرییەکە، هەمووی بە سەر یەکدا ڕووخا.

ئەڵدێرێتی دیسان گوتی: ئەو دوو پیاوە، بێسارۆ و ماگرۆ، هیچ نەبوون تەنیا بەرهەمی زینان. ئەوان هەردووکیان نەزان و بێ سامانن، ئەو خەسڵەتانەش باشترین نموونەن کە مرۆڤ لە جیهانی تازە پێی دەگات. ئاخر ئەوانە نەک هەر لەوێ دەوڵەمەندبوون، بەڵکو ئیمپرتۆرەکەشمان بە ڕێزلێنان و نازناوی باڵا دای پۆشین.

بالدیبیا وەڵامی دایەوە: قسەکان هەمووی لە سەر پایەداری و سامانە، کەس باسی کاری سەرکەوتوو ناکات: زێڕ، مرواری، زەمرووود، زەوی و ئەو گەلانەی ژێردەست دەخرێن، وەلێ کەس باسی مەترسییەکان ناکات.

– تۆ ڕاست دەفەرمووی. چونکە مەترسییەکان سنووردار نین. داگیرکردنی ئەو زەوییە نەگەچراوانەش پێویستی بە پیاوی زۆر هەژار و نەدار هەیە.

بالدیبیا ڕەنگی سوورهەڵگەڕا. ئایا ئەو لاوە لە حەژمەت نەدارییە کە وا دەڵێ؟ بەڵام کە هزری خۆی کارا کرد، زەینی دایێ دیتی میوانەکەی مافی خۆیەتی کە وا بیر دەکاتەوە، چونکە ئەم خۆیشی ئەو شتانەی بە خەیاڵ دادێت؛ ڕۆژگارێکی درێژە ئازایەتی خۆی تاقی نەکردووەتەوە. ئەوا جیهان بە هەنگاوی مەزن بەرەو پێش دەچێت، بەخت و قەدەری ئەمیش وایە کە لە سەردەمێکی درەوشاوە لە دایک بووە کە نهێنییەکانی کەونی تێدا دەدۆزرێتەوە: کارەکە بەوەندە نەوەستا کە زانرا زەوی خڕە، بەڵکو بەڵگە هەیە کە بە دەوری خۆریشدا دەسووڕێتەوە، نەک بە پێچەوانە. کە ئەو هەموو شتە ڕوو دەدەن و دەبێ ئەم چی بکات؟ مەڕ و بزنەکان بژمێرێ و بەڕوو و زەیتوون کۆ بکاتەوە! جارێکی تر بالدیبیا لە لە ناخەوە پەست بوو. لە مالات و کێلانی زەوی و یاری کاغەزێن لەگەڵ دراوسێکانی و نوێژکردن و سەلەوات و خوێندنەوەی چەندبارەی کتێبەکانی – کە گشتی لە لایەن دادگاکانی پشکنین قەدەغەبوون – وەڕس بووبوو و لە دەستەملانەی نابەدڵی چەندان ساڵەی لەگەڵ ژنەکەشی بێزار بووبوو. ئا ئەوەیە قەدەر کە خۆی لە گەنجێکی پڕ لە ورە بەرجەستە کردووە و جارێکی تر لە دەرگەی دەداتەوە، هەروەک لە ڕۆژگاری جەنگەکانی لۆمباردیا و فلاند و یافیا و میلان و ڕۆما کردی.

– کەی بۆ وڵاتی هندییەکان لە دەریا دەدەن؟

– هەر ئەمساڵ، ئەگەر خوا پشتیوانمان بێت.

– دەتوانن منیش لەگەڵ خۆتان حسێب بکەن.

پێدرۆ دی بالدیبیا ئەمەی بە دەگێکی نزم گوت، تا مارینا گوێی لێ نەبێت، نیگای چاوەکانیشی لە سەر شمشێرەکەی بوو کە لە کەرخی سۆبەکە بە دیوارەوە هەڵواسرابوو.

***

لە ساڵی ١٥٣٧ ماڵئاواییم لە خانەوادەکەم کرد کە بۆ بینینی نەدەگەڕامەوە و لەگەڵ کچە خوشکەکەم کۆنستانسا بۆ شاری سیڤیلیای جوان و بۆنخۆش بە گوڵی پرتەقاڵ و یاسەمین، سەفەرم کرد. لەوێوە بە ڕووباری دۆڵی گەورەدا ڕۆیشتین و گەیشتینە بەندەری شاری قادش کە بە کۆڵانە شۆستەدار و کۆشکە مۆریسکییەکانییەوە پڕ لە هاتوهاوار بوو. سواری کەشتییەکەی کاپتن مانوێل مارتن بووین کە سێ چارۆگەی هەبوو و کێشەکەشی دوو سەد و چل تەن بوو، گران و لەسەرەخۆ، بەڵام جێگەی ئەمان بوو. کۆمەڵێک لە پیاوەکان بارەکەیان باردەکردە سەر کەشتییەکە: چەندان بەرمیلی ئاوی خواردنەوە، بیرە و شەراب و ڕۆن و چەندان گونیە ئارد و گۆشتی وشککراوە و باڵندەی زیندوو و مانگایەک و دوو بەراز، تا لەو گەشتە بەکاری ببەن، جگە لە ژمارەیەک ئەسپ کە لە جیهانی تازەدا بە قیمەتی زێڕ دەفرۆشرا. خۆم لە کەلوپەلەکانم دڵنیا کردەوە و لەو قەمەرە هەڵگیرابوون کە کاپتنەکە بەتایبەت بۆ منی تەرخان کردبوو. یەکەم شتێک لە دوای گیرسانەوەمان لە کەشتییەکە لەگەڵ کچە خوشکەکەم ڕێکخستنی شوێنی نوێژ بوو لە جێگە بچووکەکەمان، بۆ ژنە ڕێزدارمان پاکیزەی فریادڕەس.

کاپتن مانوێل مارتین ویستی تێ بگات، پرسی: ئەی دۆنیا ئینیس، تۆ زۆر ئازای کە دەوێری ئەو گەشتە بکەیت. مێردەکەت لە کوێ چاوەڕێت دەکات؟

– مامۆستای بەڕێز، ڕاستییەکەی ئەوەیان نازانم.

– چۆن؟ ئەدی لە گرانادای نوێ چاوەڕێت ناکات؟

– بەم دواییە نامەیەکی لە شوێنێک بۆم ڕەوان کردووە پێی دەڵێن کۆرۆ، لە ڤەنزوێلا، بەڵام ئەوەیان دەمێکە، ڕەنگە لەوێش نەمابێت.

- وڵاتی هند لە هەموو وشکاییەکانی تری جیهان کە ئێمە لێی شارەزاین، فرەوانترە، ئاسان نییە مێردەکەت بدۆزیتەوە.

- هەر بە دوایدا دەگەڕێم تا دەیدۆزمەوە.

- جا خوشکی بەڕێز، چۆن ئەمەت پێ دەکرێت؟

- هەر وەک وا باوە، بە پرسیارکردن...

- داوای بەختێکی باشت بۆ دەکەم. ئەوە یەکەم جارە لە گەشتەکانم ژنم لەگەڵدا بێت. داوا لە تۆ و کچە خوشکەکەشت دەکەم کە زۆر وریای خۆتان بن.

- مەبەستت چییە؟

- ئێوە هەردووکتان گەنجن و دیمەنتان بەرچاو و سەرنجڕاکێشە. بێگومان تۆش دەزانی کە مەبەستم چییە. ئاخر لە دوای حەفتەیەک لە ناو دەریا، دەریاوانەکان حەزیان بۆ ژن دەچێت، جا هەبوونی دوو ژن لەسەر کەشتییەکە زیاتر دەیانوروژێنێ. پاشان دەریاوانەکان بڕوایان وایە کە هەبوونی ژن ڕەشەبا و نەکبەتییان بۆ دێنێت، بۆیە پێم چاکە لە پێناوی ئێوە و دڵنیایی خۆم کە لە پیاوەکانم نزیک نەکەونەوە و هاموشۆیان نەکەن.

گارسیای کاپتن باڵای کورت و ناوشان پان و قاچی کورت بوو، لووتیکی قیت و چاوێکی لە چەشنی گیانداری کرتێنەری هەبوو. پێستی بە هۆی خوێی دەریا و با، وەک چەرم غارابوو. ئەو هەر بە منداڵێ، هێشتا تەمەنی سێزدە ساڵان بوو کە چووە دەریاوانی. دەیتوانی ئەو چەند ساڵە بە پەنجەی دەست بژمێرێت کە لە سەر وشکایی ژیابوو. دیمەنێکی شپرزەی هەبوو بە جۆرێک لەگەڵ ڕەفتاری جوامێرانە و ڕوحە سووکەکەی نەدەوەشایەوە، هەر وەک لە دواییدا دەیبینین کە چۆن لە چرکەساتێکی زۆر نالەباردا، بە تاو بە هانام هات.

داخی گرانم کە ئەو وەختە من خوێندەواریم نەبوو تا تێبینییەکانم تۆمار بکەم. لەگەڵ ئەوەی من وام زەن نەدەبرد کە ژیانی من شایەنی گێڕانەوە بێت، بەڵام پێویست بوو هەموو وردەکارییەکانی ئەو سەفەرە تۆمار بکرێت، چونکە

خـەڵكانێكـی كـەم لـە بەرینایی ئۆقـیـانووسـی سـوێر دەپەڕنەوە، ئـەو ئاوە ڕەنگ خۆڵەمێشییەی ژیانێكی ئارام بەسـەر دەبات، ڕووبەرێكی تا بڵێی فرەوان و ترسـناكی هـەیە، كـەف و ڕەشـەبا، و تەنیـایـی. لەو چیـرۆكـەی كـە لـە پاش سـاڵانێكی درێژی ڕووداوەكـان دەینووسـمـەوە، هەوڵ دەدەم بە قـەدەر توانا بە ئەمانەتەوە ڕاسـتییـەكان دەربخەم، وەلێ هزریش هـەمیشـە خەیاڵبلاوی خۆی هەیە؛ ئاخـر ئـەویش بەرهـەمی ئەو ژیانەیە كـە بـەسـەری دەبەین و ئارەزووی دەكـەین و خـەیاڵی لەسـەر هـەڵدەنێین. هێـڵی نێـوان ڕاسـتـیـی و خـەیاڵ زۆر باریكە، بۆ تەمەنێكی وەک منیش گرینگ نییە چونكە هەموو شتێک لە خۆیەوە دەڕوات. ئاخر بیری مرۆڤیش مۆركی لەخۆباییبوون و بەخۆنازینی پێوەیە. ئێستا مردن وا لەسـەر كورسییەكەی نزیک مێزەكەم دانیشتووە، چاوەڕێیە، وەلێ بەخۆنازین هێشتا بوارم دەداتێ، كە ئەو وەختانـەی مێوانم دێت، نەک هەر تەنیا كەمێک گۆناكانم سووركەم، بەڵكو چیرۆكەكانیشم بنووسمـەوە. جا ئایا هیچ شتێک هەیە لە نووسینەوەی ژیاننامەی خۆت، بەخۆنازینی پتر تێدا بێت؟

من پێشتر ئۆقیانووسم نەبینیبوو؛ وام دەزانی ڕووبارێكی زۆر بەرینە، بەڵام قەت وێنام نەدەكرد كە ناتوانی كەنارەكانی ئەوبەر ببینیت. باگۆی هیچ كەسم نەدەدایەوە، بەڵكە نەزانین و ترسـەكـەم بشـارمـەوە كـە لەگـەڵ بەڕێكەوتنی كەشتییەكە بۆ ناو ئاوی مەزن و جۆلانەكردنی، ئێسقانمی تەزاند. ئێمە حەوت گەشتیار بووین و جگە لە كۆنستانسا كـە گەدەی بەهێزبوو، گشتمان هەستمان بە سەرەسوورە كرد. ئەوەندە قەلبم تێكچوو بە جۆرێک لە كاپتنەكە پاڕامـەوە كـە ڕۆژی دواتر بەلەمێكم بۆ پەیدا بكات و بە سـەوڵ لێـدان بۆ ئیسپانیا بگەڕێمەوە. بە دەنگێكی بەرز لە قاقای دا و ناچاری كردم نیو لتر شەرابی ڕۆمی بخۆمەوە ئیتر بۆ ماوەی سی سەعات بردمیە دنیایەكی تر، پاشـان دووبارە زیندوو بوومـەوە، وەلێ بە جـەسـتـەیەكی داهێـزراوەوە سـەوز هەڵگەڕابووم؛ تەنیا ئەو كاتە توانیم هەندێک شۆربا بخۆم كە كچە خوشكە نەرمونیانەكەم كەوچک لە دوای كەوچک لە دەمی دەكردم. ئێمە وشكاییمان بە

جێ هێشتبوو و لە ناو ئاوێکی تاریک و ئاسمانێکی بێ کۆتایی و لە مەزنترین دابڕاندا دەڕۆیشتین. نەمدەتوانی وێنای ئەوە بکەم کە چۆن کەشتیوانەکە لە نێو ئەو دیمەنە هەمیشە لێکچوانەدا بە هۆی بەکارهێنانی ئەسترلابەکەی و ئەستێرەکانی کلاوەی ئاسمان، ئاوا ڕێ دەگرێ و ئاراستەی خۆی ون ناکات. ئەو بۆی دووبارە دەکردمەوە کە دڵنیابم، چونکی زۆر جاری تر ئەو گەشتانەی ئەنجام داوە و ڕێگەکەش بۆ ئیسپانی و پرتوگاڵییەکان تەواو زانراو بوو کە دەیان ساڵە هاتوچۆی پێدا دەکەن و هەتا ئینگلیزە نەفرەتلێکراوەکانیش هەر ئەو ڕێگەیەیان دەگرتە بەر. وەلێ هەر وەک بۆی ڕوون کردمەوە، بەڵگەنامەکانی ڕێگەی دەریاوانی لە تەنگەی ماجەلان یان کەنارەکانی ئۆقیانووسی ئارام شتێکی ترە، چونکە لە هەموو گەنجینەکانی جیهان بە بەهاترن.

من هەرگیز لەگەڵ جولەی شەپۆلەکان و تەقەتەقی تەختە دارەکان و جیڕەی ئاسن و ڕاوەشاندنی بەردەوامی چارۆگەکان کە با ڕای دەهەژاندن، ڕانەدەهاتم. شەوان زۆر کەم خەو دەچووە چاوەکانم و بە ڕۆژیش تەنگەبەری شوێنەکەمان ئارامی لەبەر دەبڕیم، سەرەڕای ئەوانەش چاوە  پڕ لە هەوەس و ئارەزووەکانی پیاوەکان لە منیان دەڕوانی. دەبووایە منیش بە دەوری خۆم ئاگردانەکەم بەکار هێنابایە و مەنجەڵی چێشتم بخستبایە سەری، هەندێ جاریش بە تەنیا بۆ تەوالێتەکە بچوومایە کە بریتیبوو لە سەندووقێک، کونێکی هەبوو ڕاستەوخۆ لە ژێرەوە بۆ سەر ئاوی دەریا. وەلێ کۆنستانسا هیچ کێشەیەکی نەبوو، بەڵکو زۆر دڵخۆشیش بوو. لە دوای مانگێک لە گەشتەکەمان، خواردنمان بەرە بەرە کەم دەبووەوە، ئاوەکەشمان بۆگەنی بووبوو و بە پێی بەرنامە دابەش دەکرا. مریشکەکانم هێنایە شوێنەکەی خۆمان، چونکە پیاوەکان هێلکەکانیان دەدزین. ڕۆژێ دوو جارانم دەبردنە دەرێ تا هەوا لێیان بدا بە پەتێک لە یەکێ لە پێیەکانیان دەمبەستنەوە.

جارێکیان ناچاربووم مەقڵییە ئاسنینەکە بۆ پارێزگاری خۆم بەکار بێنم، ئەو وەختەی یەکێ لە دەریاوانەکان کە لە هەموان منجڕتر بوو، ناوی سبستیان ڕۆمێرۆ بوو. ئەو ناوەم قەت لەبیر ناچێتەوە، چونکە ئێمە لە شوێنی

خۆپاککردنەوە پێک دەگەیشتینەوە. لەگەڵ زەحمەتییەکانی سەر کەشتییەکە، ئەو پیاوە بچووکترین هەلی دەقۆزییەوە بۆ ئەوەی بە بیانووی جولانەوەی سروشتی شەپۆلەکان خۆی بە سەرمدا بدات. من چەند جاریک وریام کردەوە تا وازم لێ بێنێ، وەلێ ئەو زیاتر بەوە دەورووژا. لە یەکێ لە شەوەکان من بە تەنیا لە شوێنە بەرتەسکەکەی ژێر پردی کەشتییەکە بووم کە بۆ مەتبەخ تایبەت کرابوو، لە پڕێکا ئەو پیاوەم لێ پەیدا بوو. بەر لەوەی بتوانێ بە خۆیەوە بەندم بکات، هەستم بە هەناسە بۆگەنەکەی کرد لە سەر ملم. ڕووم وەرگێڕا، بێ ئەوەی زیاتر بیری لێ بکەمەوە، بە مەقلّییەکەی دەستم لە سەریم دا، هەر وەک چۆن پێش چەند ساڵێک وام لە خوان دی ماڵەگەی کلۆڵ کرد وەختێ کە ویستی لێم بدات، ئاوا. سەری سبستیان لە هی خوان نەرمتر بوو، بەربووەوە سەر ئەرزەکە و قاچەکانی لێک کردنەوە و بۆ ماوەی چەند خولەکێک بووڕایەوە، منیش لەو وەختە بە دوای پارچە پەڕۆیەکدا دەگەڕام تا برینەکەی بپێچمەوە. بەوە چاکبوو خوێنێکی زۆری لە بەر نەڕۆیی، وەلێ دواتر ڕوخساری کرایەوە و ڕەنگی وەک باینجانی لێ هات. یارمەتیم دا بۆ ئەوەی ڕاستبێتەوە. لە نێوان خۆمان وا ڕێککەوتین کە بڵێین سەری بە ئەستووندە دارینەکان کەوتووە، چونکە بۆ هەردووکمان گونجاو نەبوو ئەوانی تر ڕاستییەکەی بزانن.

. . . . . .

لە نێو گەشتیارەکاندا هەواڵگر و وێنەکێشێکی تێدابوو ناوی دانێل بیلالکاسار بوو کە لە لایەن تاجی پاشایەتییەوە ڕەوان کرابوو تا بە ئەرکی نەخشەکێشان و تۆمارکردنی ئەو شتانە هەڵسێت کە دەیانبینێت. تەمەنی لە سەرووی سی ساڵ دەبوو، لاواز و بە تاقەت دیاربوو. دەموچاوێکی چوارگۆشە و پێستێکی ڕەنگ زەردی خەمباری هەبوو. بەردەوام لە پێشەوەی کەشتییەکەوە بۆ دواوەی لە هاتوچۆدابوو و تا ماسوولکەکانی خاو ببنەوە. قژی لە پشتەوە دەبەست و پارچە زێڕێکی لە شێوەی مانگی یەک شەوە لە گوێی چەپەی دەکرد. تەنیا جارێک یەکێ لە دەریاوانەکان گاڵتەی پێ کردبوو،

بەڵام بە لێدانی مستێک لە لووتی خستبوویە سەر زەوی، ئیتر جارێکی تر کەس نەیوێرا بە لایدا بچنەوە. بیلالکاسار کە هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە دەستی بە گەشت و گەڕان کردبوو، هەموو کەنارە دوورەکانی ئاسیا و ئەفریقا شارەزابوو. لە بۆنەیەکدا بۆی گێڕاینەوە کە بە دیلی کەوتووەتە دەستی "باربارۆجا" جەردەی ناوداری تورک و وەک کۆیلە لە جەزائیر فرۆشراوە. پاشان لە دوای دوو ساڵ توانیویەتی ڕابکات و لەو ماوەیەدا گەلێک ئازار و مەینەتی بینیوە. هەموو کاتێ دەفتەرێکی ئەستووری لە بن هەنگڵی بوو و بە قوماشێکی چرووپر دەیپێچا و بە خەتێکی زۆر ورد لە چەشنی مێروولە، بیروبۆچوونەکانی خۆی تێدا دەنووسی. بە وێنەکێشانی دەریاوانە ماندووەکان کاتی بەسەر دەبرد، بەڵام زیاتر و بە شێوەیەکی تایبەت وێنەی کچە خوشکەکەمی دەکێشا. کۆنستانسا بۆ ئامادەسازی خۆی تا زوو بچێتە دێر، بەرگی ئەو قەشەژنانەی لەبەر دەکرد کە تازە لە دێر وەردەگیران. ئەو بەرگەی لە کراسێکی دڕ دروست کردبوو کە خۆی دووریبووی، سەریشی بە سێگۆشەیەک لە هەمان قوماش دادەپۆشی و نەیدەهێشت تاڵە مووێکیشی دیار بێت، نیوەی نیوچەوانی دادەپۆشی و لە ژێر چەناگەی گرێی دەدا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەرگە ناشیرینە، باڵا لێهاتووەکەی و دوو چاوە جوانە ڕەش و بریسکەدارەکەی نەدەشاردەوە کە دەتگوت دەنکە زەیتوونن. بیلالکاسار یەکەم جار توانی پێی بسەلمێنێ کە دانیشێت بۆ ئەوەی وێنەی بکێشێت، پاشان پێی سەلماند کە چەفیەکە لە سەری بکاتەوە و دواجاریش بڕوای پێ هێنا کە کەزییە پیرێژنانییەکەی بکاتەوە و بواری شنەی با بدات هەتا یاری بە پەرچەمی بکات. بەڵگەنامە ڕەسمییە مۆرکراوەکان لە بارەی پاکی خوێنی خانەوادەکەمان هەر چی بڵێن، من بڕوام وایە کە خوێنێکی زۆری موسڵمانان لە دەمارەکانی ئێمە دەسووڕێتەوە. کۆنستانسا جگە لە پاکییەکەی، وەک یەکێ لەو بەختەوەرانە دیارە کە لەسەر بەرماڵەکانی عوسمانی دەردەکەون.

ئەو ڕۆژە داهات کە لە برسان بناڵێنین. ئەوکاتە کولێرەکانی خۆمم بەبیرهاتەوە. چێشتلێنەرەکەمان کە ڕەشپێستێکی باکووری ئەفریقا بوو، تێم

گەیاند کە هەندێک ئارد و ڕۆن و کەمێک گۆشتی وشککراوەم بداتێ. منیش بەر لەوەی بیکوڵێنم، لە ئاوی دەریام هەڵێنا. ئەو خۆراکە تایبەتییەی خۆشم کە مابووەوە لە زەیتوون و کشمیش و هەندێ هێلکەی سپیکراو، هەموویم پارچە پارچە ورد کرد بۆ ئەوەی بە سەر هەمووان دابەش بێت، لەگەڵ هەندێ بەهارات. هەوڵم دا هەندێ پیازیش پەیدا بکەم، لەو جۆرەی کە لە بلاسینشیا زۆرە، بەڵام داخەکەم لە کۆگاکەی کەشتییەکە تاکە سەلکێکیش نەمابوو. ئەوانەم هەمووی کردە قیمە و تێکەڵ بە هەویرەکەم کرد و بە مەقلییەکە کولێرەم دروست کرد، چونکە فڕنیمان نەبوو. کولێرەکانم سەرکەوتنێکی باشیان بەدەستهێنا و هەموویان لە ڕۆژانی دواتر بە بەشێک لە خۆراکی خۆیان بەشدارییان دەکرد بۆ دروستکردنی قیمەکە. ئیتر بە نیسک و نۆک و ماسی و مریشک و سجوق و پەنیر و گۆشتی هەشتپێ و ماسی قرش کولێرەم دروست دەکردن. بەم کارە ڕێز و پێزانینی دەریاوان و گەشتیارەکانم بەدەستهێنا، بە تایبەتی لە دوای ڕەشەبا بەهێزەکە وەختێ بە چارەسەرکردنی بریندار و گرتنەوەی ئێسکی شکاوی دەریاوانەکان هەڵسام، وەک ئەوەی لە خەستەخانەی قەشەژنەکان دەمکرد لە بلاسینشیا. ئەوە تاکە ڕووداوێکە کە وا پێویست دەکات بیگێڕمەوە لە دوای ئەوەی توانیمان لە دەست ئەو جەردە فەڕەنساییانە قووتاربین کە چاوەدێری کەشتییەکانی ئیسپانیایان دەکرد. ئەو جەردانە ئەگەر بیانتوانیبایە بگەنە ئێمە، - هەروەک کاپتن مانوێل مارتین ڕوونی کردەوە - ئەوا تووشی کارەساتێکی مەترسیدار دەبووین، چونکە ئەوان چەکی باشیان هەبوو. ئەو کاتەی کە زانیمان هەڕەشەمان لەسەر هەیە، من و کچە خوشکەکەم لە بەرامبەر پەیکەری ژنەگەورەی پاکیزەمان کڕنۆشمان برد و بە سۆزی باوەڕداری خۆمان لێی پاڕاینەوە کە ڕزگارمان بکات. ئەوەبوو موعجیزەیەک ڕووی دا، تەمێکی چڕ و سەراپاگیر ئێمەی لەوان بزر کرد. دانێڵ بیلالکاسار گوتی: ئەو تەمە بەر لە نوێژکردن و پاڕانەوەی ئێوە هەبووە، هەر ئەوەیە ئێمە ئاراستەکەمان بۆ لای تەمەکە بووە.

بیلالکاسار پیاوێکی زۆر بڕوادار نەبوو، وەلێ زۆر ئاوەدان بوو و هەموو

جارێ بە قسەی خۆش بە پێکەنینی دەهێناین. دەیگوت: لەوێ مرۆڤی یاخیبوو و بەشەری چوارپێ بە سەری سەگانییەوە نابینن، بەڵکو بوونەوەری سەرەتایی و شەڕانگێز دەبینن بە تایبەتی لە نێو قشتاڵییەکان. دڵنیای کردینەوە کە خەڵکی جیهانی نوێ هەموویان دڕندە نینە؛ ئۆزتیک و مایا ئینکا لە ئێمە پێشکەوتووترن. ئەوان لانی کەم گەرماو دەکەن و ئەسپێیان لە لەشیدا نییە. هەروەها گوتی: ئەوە تەنیا چاوچنۆکییە نەک شتێکی تر. ئەو ڕۆژەی پێی ئیسپانیایی کەوتە سەر زەوی جیهانی نوێ، ئەو کولتوورانەش کۆتاییان هات. خەڵکی ڕەسەنی ئەوێ سەرەتا زۆر بە خۆشییەوە پێشوازییان لێ کردین. لەخۆڕازیبوونیان بە سەر وریابوونیاندا زاڵ بووبوو. وەختێ کە زانیان ئەو مرۆڤە نامۆیە ڕیشدارانە کە لە دەریاوە هاتوونە زۆر شەیدای زێڕن، ئەو کانزا نەرم و بێ سوودەی کە زۆریان لێی هەیە، پڕ بە چەنگی خۆیان پێشکێشیان دەکردن. لەگەڵ ئەوش ئەوەندەی نەبرد ئارەزووی چاوچنۆک و ناحەزانەی ئێمەیان بۆ ئاشکرا بوو کە بە هیچ شتێک تێر نابین و زۆر سووک و چرووکین. ئاخر چۆن نا! سەربازەکانمان پڕیان دەدایە ژنەکان و دەچوونە ماڵەکان هەرچی ئارەزوویان بکردایە بە بێ ڕەزامەندی ئەوان دەیانبرد و هەر یەکێک لەوان پێشیان پێ بگرتانایە بە شمشێرەکەیان دەیانکوشت. دەیانگوت ئەو زەویانە هی پاشاکەی ئێمەیە کە لە دیوەکەی تری ئۆقیانووس دەژێت. دەیانویست خەڵکەکەی ئەوێ ئەو دوو پارچە دارە بپەرستن کە لە شێوەی خاچ لێکیان قایم کردبوو.

من لە دوای ئەو قسانەی ئەو ویستم وریای بکەمەوە و گوتم: بەڕێز بیلالکاسار، ئاگەدار بە ئەو قسانەی تۆیان گوێ لێ نەبێت! دەنا بە خیانەتکاری ئیمپڕاتۆریەتت دادەنێن ها.

– من تەنیا ڕاستییەکان دەڵێم. تۆش ئەی خوشکی بەڕێز دەبینی کە داگیرکەرەکان چ جۆرە خەڵکێکن، شەرم و حەیایان نییە. وەک سواڵکەر دێن و وەک دز و جەردە ڕەفتار دەکەن، سەرەڕای ئەوانەش خۆیان پێ مەزن و پایەدارە.

ئەو سێ مانگە لە گەشتی پەڕینەوەی دەریا زۆر درێژ بوو، هەر دەتگوت سێ ساڵە بەڕێوەین، وەلێ لەوەیان سوودم لێی وەرگرت کە چێژی تامی سەربەستیم دەکرد. ئەوێ جگە لە کۆنستانسای شەرمن، کەسێکی تری لە خانەوادەکەی منی لێ نەبوو، نە دراوسێ و قەشەشی لێ نەبوو تا چاوەدێریم بکەن، ناچاریش نەبووم حسێبی خەرجییەکانم بدەمە کەسێک. خۆم لە ڕەشپۆشی بێوەژنایەتی و ئەو جلانەی کە جەستەیان دەگوشیم، داماڵی. بیلالکاساریش کچە خوشکەکەمی ڕازی کرد کە بەرگی قەشەژنی داکەنێ و یەکێک لە کراسەکانی من بپۆشێت.

ڕۆژە درێژەکان وا دیاربوو کۆتاییان نایێ، شەوانیش لەوان درێژتر. پیسی و بەرتەنگی جێگەکەمان، کەمبوونەوە و خراپی خۆراک، نالەباری دەروونی پیاوەکان، ئەوانە هەمووی بەشدارییان لەو پاککەرەوەیە دەکرد کە گەشتی پەڕینەوە وێنای دەکرد. بەڵام بە هەرحاڵ، لە مارە گەورەکانی دەریا کە دەیانتوانی بە کەشتییەکەوە قووتمان بدەن و لە سەمەندەڵەکانی ئاو و پەرییەکانی دەریا، ئەوانەی دەبوونە مایەی شێتی دەریاوانەکان، لە ڕوحی غەرقبووەکان و کەشتییە تارماییەکان و ئاگرە درۆزنەکان، ڕزگاربووین. ئێمە دەریاوانەکانمان لەو مەترسییانە و هی تریش وریا دەکردەوە کە لە قووڵایی دەریادا هەنە، وەلێ بیلالکاسار دەیگوت من قەت شتێکم لەوانە نەدیوە.

لە ڕۆژی شەممەیەکی مانگی ئاب بۆ سەر وشکایی دابەزین. ئاوی ڕەش و قووڵی ئۆقیانووس بووە شینێکی ئاسمانی سپی و سوێ. بەلەمەکەمان تا کەنارە بە لە شەپۆلاوییەکە هەڵگرت کە شەپۆلە گەڕاوەکان دەیان لستەوە. دەریاوانەکان پێیان ڕاگەیاندین کە هەردووکمان بە کۆڵ هەڵگرن؛ وەلێ ئێمە، من و کۆنستانسا، خۆمان هەڵکرد و بە ناو ئاوەکەدا ڕۆیشتین، پێمان باشتربوو قاچمان بە ڕووتی ببینن نەک وەک فەردە ئارد لەسەر پشتی پیاوەکان هەڵگیرێین. من هەرگز خەیاڵم بۆ ئەوە نەدەچوو کە ئاوی دەریا گەرم بێت، چونکە لەسەر پشتی کەشتییەکەوە وام دەزانی زۆر ساردە.

گوندەکە لە چەند قوڵغێک پێک هاتبوو کە لە قەمیش دروست کرابوون،

ساپیتەکانی لە گەڵای دارخورما بوون و تاکە شەقامەکەشی هەمووی قوڕ و چڵپاو بوو. هیچ کەنیسەیەکی لێ نەبوو، بەڵکو خاچێکی دارینی هەبوو لەسەر بەردێک بە لای دەریاوە قایم کرابوو، کە هێمای بۆماڵی خوا دەکرد. دانیشتووانی ئەو شوێنە لەبیرکراوە ژمارەیان کەمە و تێکەڵەیەکن لە دەریاوانە ڕێبوارەکان و زنجی و پێست ئەسمەرەکان لەگەڵ ئەو هندییانەی کە بۆ یەکەم جار بینیمن، خەڵکێکی هەژاری نیمچە ڕووت و کڵۆڵ. سروشتێکی پڕ لە دارودرەختی سەوز و گەرم گەمارۆی دابووین. شێی ناو هەوا هەموو شتێکی تەڕ دەکرد، تەنانەت هزریش؛ تیشکی خۆر بێبەزییانە دەیپێکاین. جلپۆشین تەنگە نەفەسی دەکردین و یەخەمان بۆ فێنکایی دەکردەوە، مەچەک و گۆرەوی و پێڵاوەکانیشمان داکەناند.

هەر زوو پێکەوتم کە خوان دی مەلەگە لەوێ نییە. تاکە کەسێک کە ئەوی لە یاد مابوو، باوکە گریگۆریۆ بوو. ئەو پیاوە قەشەیەکی دۆمەنیکانی بەدبەخت بوو، نەخۆشی مەلاریا ئەو گەنجەی کردبووە پیرێکی بە ساڵاچوو، ئاخر هێشتا تەمەنی لە چلی ئاوانەکردبوو کەچی بە حەفتا ساڵی دەچوو. نزیکەی بیست ساڵ لە ناو جەنگەڵەکان بە ئەرکی بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیح هەڵسابوو. لە کاتی گەڕان و سووڕانیدا دوو جاران مێردەکەی منی بینیبوو. دڵنیای کردم کە خوان وەک زۆربەی ئیسپانییەکان تووشی نەخۆشی بەدواگەڕانی شاری زێڕینی ئەفسانەیی بووە.

پێی گوتم: ئەو پیاوە یەکێکی باڵابەرز و بەسەر و سیمایە، حەزی لە قومار و بادەیە و خۆش مەجلیسە. دەبێ ئەو کەسە مێردەکەی تۆ بێت.

هەروەها قەشەکە گوتی: شاری زێڕین "ئێلدۆرادۆ"، هندییەکان خۆیان دایان هێناوە تا لەو غەریبانە ڕزگاربن کە لە هەوڵدانیان بۆ دۆزینەوەی زێڕ خەریکە دەمرن.

باوکە گریگۆریۆ قوڵغێکی پێشکێش کردین، ئیتر لەوێ گیرساینەوە، لەو کاتەدا دەریاوانەکان بە شەرابێکی بەهێز خۆیان مەست دەکرد و بە زۆر ژنە هندییەکانیان ڕادەکێشایە ناو دارستانە چڕەکەی چواردەوری گوندەکە.

هەرچەندە لە ناو دەریا بەردەوام ماسی قرشمان بە دواوەبوو، بەڵام بیلالکاسار هەموو جارێ بۆ ماوەی چەند سەعاتێک لە ئاوە سافەکەی دەریا خۆی پاک دەکردەوە. ئەو وەختەی لەسەر وشکایی بە ناچاری کراسەکەی داکەنی، کە سەیری پشتیمان کرد شوێنەواری قامچی پێوە دیار بوو، وەلێ پێی نەدەگوتین بۆ وای بەسەرهاتووە، کەسیش لە خۆی ڕانەدەدیت ئەو پرسیارەی لێ بکات. لە ماوەی گەشتەکەماندا بۆمان ئاشکرابوو کە ئەو پیاوە فێرە خۆشۆرێنێکی نائاسایی بووە، ئەوەش بەو مانایە دێت کە گەلانێکی زۆری بینیوە ئاوا خۆ دەشۆن. ڕۆژێکیان داوای لە کۆنستانسا کرد کە بە جلەکانییەوە لەگەڵی بچێتە ناو دەریا، بەڵام من لێنەگەڕام؛ ئاخر بەڵێنم بە دایک و باوکی دابوو کە بە سەلامەتی بینێرمەوە، نەک بە زامی کەڵبەکانی ماسی قرشەوە.

کە خۆر ئاوابوو، هندییەکان ئاگرێکی گەورەیان بە داری تەڕ هەڵکرد بۆ ئەوەی بەرگری لەو پێشولانە بکەن کە گوندەکەیان داگیر کرد. دووکەڵ چاومانی کوێر دەکرد، چیوای نەمابوو هەناسەمان بگیرێ. خراپتر لەوەش، ڕەوەی زیندەوەرەکان بوو، چونکە وەختێ لە ئاگرەکە دوور دەکەوتینەوە هێرشیان بۆ دەهێناین و هەراسانیان دەکردین. بۆ نانی ئێوارە، گۆشتی دانتا، یاخۆ تابیر کە ئاژەڵێکە بە بەراز دەچێت، لەگەڵ پەتاتەی تەڕمان خوارد. خواردنەکەمان تامێکی غەریبی هەبوو، بەڵام ئەو نانەی ئێوارەمان لە دوای سێ مانگ لە خواردنی ماسی و کولێرە، وەک خواردنێکی شاهانە دیاربوو. بۆ یەکەم جار تامی شەرابێکی کەفدارم کرد کە لە کاکاو دروست دەکرا، هەرچەندە بەهاراتیشم تێ کرد، وەلێ هەر نەختێ تاڵ بوو. بە پێی قسەکانی باوکە گریگۆریۆ، ئەزتیک و باقی هندییەکانی تریش، ناوکە کاکاویان بەکار دەهێنا، وەک چۆن ئێمە پارە بەکار دێنین ئاوا، واتە ئەو ناوکە لە کنەوان زۆر بەنرخ بوو.

ئەو ئێوارەیەمان بە گوێگرتن لە بەسەرهاتەکانی قەشەکە ڕابوارد، کە چەند جارێک چووبووە ناو جەنگەڵکان و خەڵکی کردووەتە نەسرانی. هەروەها

ئاشکرای کرد کە ئەمیش بە گەنجێتی بە دوای خەونە ترسناکەکەی شاری زێڕین کەوتووە. لە ڕووباری ئۆرینکۆی داوە، کە هەندێ جار وەک دەریاچە ئارامە و لە هەندێ بەشیشدا زۆر بە ورشە و تووڕەیە. باسی تاڤگە گەورەکانی دەکرد کە لە نێو هەورەکان پەیدا دەبێت و لە خوارەوەش لە شێوەی پەلکەزێڕینەیەکی کەفاوی دەتەقێتەوە. هەروەها لە بارەی تۆنێلە سەوزاییەکانی نێو دارستان و تاریکایی سەوزی جاویدانی دەدوا کە تیشکی خۆریان پێ ناکەوێ. گوتی لەوێ گوڵی وا هەیە کە گۆشتخۆرە و بۆنی تەرمی لێ دێت، هەندێکیش هەستیار و بۆنخۆشن بەڵام دڕکاوین. لە درێژەی قسەکانیدا گوتی باڵندەی وای لێیە کە پەڕەکانیان قەشەنگ و ڕەنگاوڕەنگن و چەندان گەلە مەیموونی لێیە کە دەموچاویان لە هی بەشەر دەچێت و لە نێو گەڵا چڕەکانەوە چاوەدێری بوونەوەرە نامۆکان دەکەن.

منیش بۆ خۆشکردنی قسەکانی گوتم: سەبارەت بە ئێمە کە لە ئیستریمادۆرای ناشیرین و وشک هاتووین کە جگە لە بەرد و گڵ شتێکی تری لێ نییە، ئەوا هەرگیز ناتوانین وێنای ئەو بەهەشتە بکەین.

– ئەی دۆنیا ئێنیس، ئەوە تەنیا لە دیمەندا وەک بەهەشتە، دەنا لەو جیهانە گەرم و زۆنگاوی  و پڕ لە چاوچنۆکییەی کە خشۆک و زیندەوەری ژەهراوی داگیریان کردووە، هەموو شتێک خێرا بۆگەنی دەبێت، بەتایبەتی ڕوحی مرۆڤەکان. ئەو جەنگەڵانە پیاوەکان دەکەنە گێل و خوێنڕێژ.

دانێل بیلالکاسار لەگەڵ ئەوەی بە گەرمی و بە پەلە قسەکانی قەشەی لە دەفتەرەکەی تۆمار دەکرد، چونکە بیری لەوە دەکردەوە لە ڕێگەدا لە ڕووباری ئۆرینۆکۆوە دەست بە گەڕان بکات، وەڵامی دایەوە و گوتی: ئەی باوکی بەڕێز، ئەوانەی تەنیا بەدوای چاوچنۆکیدا دەگەڕێن، پێشتریش هەر پیس و گەندەخۆر بوونە، هەمووو ئەوەیش کە جەنگەڵەکان دەیکەن،  ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی پیاوەکان ئاشکرا دەکەن.

***

ئەمە شەوی یەکەم بوو لە سەر وشکایی، کاپتن مانوێل مارتن و هەندێک لە

دەریاوانەکانی چوونە ناو کەشتییەکە بخەون، بە قسەی خۆیان، تا ئاگەداری بارەکەی بن، بەڵام پێم وابوو لە ترسی ماری دارستان و زیندەوەرە ژەهراوییەکان چووبوونە ئەوێ. هەندێکیش لە پیاوە بێزارەکان پێیان باشتربوو خۆیان لە ناو قەمەرە بەرتەنگەکانی کەشتییەکە گیرنەکەن هەر لە گوندەکە پشوو بدەن. کۆنستانسای هیلاک و ماندوو زوو خەوی هات و لە ناو جۆلانە تایبەتەکەی خۆی لە ژێر کوللەیەکی قوماشی ناشیرین نووست؛ وەلێ من خۆم ئامادە کرد بۆ ئەو ساتانەی کە خەوم دەزڕێ. شەوانی ئەوێ زۆر تاریکە و پڕە لە شتی شاراوە و نهێنی، شەوێکی بە هاتوهاوار و پێشووڵە و ترسناک بوو. وام بە خەیاڵدا دەهات کە بەو بوونەوەرانە گەمارۆ دراوم کە باوکە گریگۆریۆ باسی دەکردن: زیندەوەری گەورە، جۆرە ماریک لە دوورەوە پێتەوە دەدەن، دڕندەی نەزانراو. سەرەڕای ئەوانەیش، من زیاتر لە شەڕانگێزی پیاوە سەرخۆشەکان دەترسام. نەدەوێرام چاوەکانم بنووقێنم.

زیاتر لە دوو سێ سەعاتی بەسەردا ڕابرد، ئەو کاتەی خەریکبوو بۆرژێم، گوێم لە خشپەی یەکێک بوو لە دەوری کوخەکەمان دەسووڕایەوە. سەرەتا وام زانی ئاژەڵە، بەڵام بەبیرم هاتەوە کە سبستیان ڕۆمێرۆ لەسەر وشکایی ماوەتەوە و زانیم کە لە دووری دەسەڵاتی کاپتن مانوێل مارتن، ڕەنگە ئەو پیاوە مەترسییەکم بۆ دروست بکات. بە هەڵەدا نەچووبووم. هیچ دوور نەبوو سبستیان ڕۆمێرۆ بە مەبەستی خۆی بگەیشتبایە ئەگەر بەخەبەر نەبوومایە. وەلێ لە بەدبەختی ئەو بە کێردێکی مۆریسکییەوە لە چاوەڕێیدا بووم. کێردێکی بچووک و نووکتیژی وەک دەرزی، لە قادش کڕیبووم. تاکە سەرچاوەی ڕووناکی لە ناو کوخەکە، ترووسکایی پەنگری ناو ئەو ئاگردانەبوو کە گۆشتی دانتایان لە سەری سوور کردبووەوە. تەنیا کەلێنێک لە جیاتی دەرگە لە دەرەوەی جیا دەکردینەوە و چاوی منیش لەو تاریکییە ڕانەهاتبوون. ڕۆمێرۆ لە سەر چەنگان هاتە ژوورەوە و وەک سەگ بۆنی دەوروبەری دەکرد. لەو جۆلانەیە نێزیک بووەوە کە دەبووایە لەگەڵ کۆنستانسا لە سەری بنووم. دەستی خۆی بەرز کردەوە تا کوللەکە لابدات، وەلێ وەختێ

هەستی بە نووکی کێردەکە کرد لە پشت گوێیەوە لەسەر ملیەتی، وەک بەرد لە جێی خۆی نەجولا.

بۆ ئەوەی حەیامان نەچێت، بە کپی پێم گوت: هەی ناکەس، دیارە تۆ بە ئاسانی تێ ناگەی!

بە منجە منج و تووڕەییەوە گوتی: یاخوا شەیتان بۆ خۆی بتباتەوە هەی سۆزانی! ئەوە سێ مانگە بە من ڕادەبوێری، ئێستاش وا خۆت نیشان دەدەی کە ئەوەی من دەمەوێ تۆ ناتەوێ.

کۆنستانسا بە ترسەوە بە ئاگاهات، هاتوهاوارەکەی سەرنجی باوکە گریگۆریۆ و دانێل بیلالکاسار و ئەوانی تری ڕاکێشا کە لە نێزیکی ئێمەوە نووستبوون. یەکێکیان مۆمێکی داگیرساند و بە هەموویان بە زۆر ڕۆمێرۆیان بردە دەرەوە. باوکە گریگۆریۆ فەرمانی دا لە دارێک بیبەستنەوە تا سەرخۆشییەکەی بەری دەدات. ماوەیەکی زۆر بە هاوارکردنەوە گەفی دەکرد و جوێنی دەدا، تا لە ئاکامدا هەرەسی هێنا و وەختی بەیانی کە تەواو هیلاک و شەکەت بوو ئەوجا خەڵکەکە توانییان بنوون.

لە پاش چەند ڕۆژێک لەو ڕووداوە، لە دوای پەیداکردنی ئاوی خواردنەوە و میوەی مەداری و گۆشتی خوێکراو، کەشتییەکەی کاپتن مانۆیا مارتن بۆ بەندەری کارتاخینا هەڵی گرتین. ئەو بەندەرە لەو کاتەدا زۆر گرینگ بوو، چونکە لەوێوە گەنجینەکانی جیهانی تازە بۆ ئیسپانیا باردەکرا. ئاوەکانی دەریای کاریبی وەک ئاوی نافوورەی کۆشکی موسڵمانەکان شین و ساف بوو. هەوا بۆنی گوڵ و بەروبوومی میوەجات و بادەی لێ دەهات. ئەو شوورانەی کە بە بەرد و گەچ و خوێنی گا دروستکرابوون، لە بەر تیشکی خۆر تریسکەی دەدایەوە. سەدان کەس لە خەڵکی ڕەسەنی ئەوێ بە ڕووتی کۆت و زنجیر کرابوون و بەردی گەورەیان هەڵدەگرت و قامچی چاودێری کرێکارەکانیش وریای دەکردنەوە. ئەو شوورە بتەوە، کەشتیگەلی جەردە ئیسپانیایی و دوژمنەکانی تری ئیمپڕاتۆرییەت دەیانپاراست. لە ناو دەریایەکەدا چەند کەشتییەک لەسەر ئاوەکان جۆلانەیان بوو و لە کەنداوەکە لەنگەریان گرتبوو،

هەندێکیان جەنگی بوون و هەندێکیش بازرگانی. یەکێک لەوانە کەشتی بازرگانیی کۆیلەکان بوو کە لە ئەفریقاوە باریان دەکردن تا لە بازاڕی کۆیلەکان بە مزایەدە بیانفرۆشن. ئەو کەشتییە بەو بۆنە ناخۆشە لەوانی تر جیا دەکرایەوە کە لە کڵۆڵی و خراپەکاری مرۆڤەکانەوە دەهات. شاری کارتاخینا بە بەراورد لەگەڵ شارە کۆنەکانی ئیسپانیا هەر لە گوندێکی ئاسایی دەچوو، بەڵام کەنیسەی هەبوو و شەقامەکانی بە جوانی نەخشە کێشرابوون و دیواری ماڵەکان گەچکاری کرابوون و بینایە ڕەسمییەکان توند و تۆڵ بوون، لە سەربانەکانیاندا ڕەبیەیان لەسەر دروست کرابوو کە لە ناویدا تۆپیان بە ئاراستەی کەنداوەکە لێ دامەراندبوو. دانیشتووانەکەی لە ڕەگەزی هەمەجۆر بوون. ژنە سەفوور و بوێرەکانیان بە لای منەوە زۆر جوان بوون، بەتایبەتی ئەوانەی دووڕەگەزەکان. بڕیارم دا ماوەیەک لەوێ بمێنمەوە، چونکە زانیم مێردەکەم پێش لە ساڵ و شتێک بەر لەو وەختە لەوێ ژیاوە و لە بری قەرزی مەبلەغێک پارە لە یەکێ لە کۆگاکانی ئەوێ، بەستەیەک جلی بە بارمتە داناوە هەتا ئەگەر گەڕایەوە بیانداتەوە.

لە تاکە میوانخانەکەی کارتاخینا جێگەی ژنی بێ پیاویان نەدەکردەوە، وەلێ کاپتن مانوێل مارتین کە خەڵکێکی زۆری دەناسی، توانی خانووێکمان بۆ بەکرێ بگرێت. خانووەکە لە ژوورێکی گەورەی نیمچە چۆڵ پێک هاتبوو و دەرگەکەی ڕاستەوخۆ دەڕوانییە شەقامەکە. پەنجەرەیەکی تەسکی هەبوو، لە لایەکیدا چوارپایەک و مێز و کورسییەکی لێ دانرابوو، ئیتر من و کچە خوشکەکەم شتومەکەکانی خۆمانمان لێی دانا. لەبەرئەوەی پارەکەمان بەرەو تەواوبوون دەچوو، زوو ڕام گەیاند کە بەرگدروومە و بە دوای فڕنییەکدا گەڕام تا کولێرە دروست بکەم.

هێشتا لەو خانووە تەواو نەگیرسابووینەوە، دیتمان دانیێل بیلالکاسار بۆ سەردانمان هاتووە. ژوورەکەمان بە کەلوپەلی پێچراوە و بەربڵاو پڕبووبووەوە، بۆیە لەسەر چوارپاکە دانیشت و کڵاوەکەشی بە دەستییەوە بوو. ئێمە جگە لە ئاو شتێکی ترمان نەبوو پێشکێشی بکەین. دوو پەرداخ ئاوی لەسەر یەک

خواردەوە. بەردەوام ئارەقەی دەکرد. ماوەیەک بێدەنگ دانیشت و بە بایەخەوە لە ئەرزە بتەوەکەی ژێر پای ڕادەما، لە کاتێک ئێمە لەو نیگەرانتر چاوەڕێ بووین. دواجار گوتی: دۆنیا ئێنیس، من بۆ ئەوە هاتووم کە بەڕێزەوە داوای دەستی کچە خوشکەکەت بکەم.

لەگەڵ ئەو داوایە کتوپڕە سەرم سووڕما، ئاخر قەت تێبینی ئەوەم نەکردبوو کە چیرۆکی خۆشەویستی لە نێوانیاندا هەبێت. لە بیری خۆمدا گوتم ڕەنگە ئەو گەرمایە بووبێتە هۆی تێکچوونی عەقڵی بیلالکاسار، وەلێ ڕوخساری تێکشێواوی کۆنستانسا ناچاری کردم بەخۆمدا بچمەوە. بە ترسەوە هاوارم کرد: تەمەنی ئەو منداڵە تەنیا پازدە ساڵە.

- گەورەم، لێرە کچان بە گچکەیی شوو دەکەن.

- ئاخر کۆنستانسا خەرجی مێردکردنی نییە.

- ئەوە گرینگ نییە، چونکە من قەت لەگەڵ ئەو ڕێسایە نەبوویمە. هەتا ئەگەر کۆنستانسا بە قەد شاژنێکیش سامانی هەبێت من لێی وەرناگرم.

- کچە خوشکی من دەیەوێ ببێتە قەشەژن!

بیلالکاسار بە منجە منجەوە گوتی: ئەوە پێشتر بوو گەورەم، ئێستا نایەوێ ببێتە قەشەژن.

کۆنستانسا بە دەنگێکی ڕوون و ئاشکرا پاڵپشتی قسەکانی ئەوی کرد. بەڵام من بۆیانم ڕوون کردەوە کە دەسەڵاتی بەشوودانی ئەوم نییە، بەتایبەتی بۆ کەسێکی جەربەزەی نەناسراو، پیاوێک کە شوێنێکی نییە لێی بژیێت و ژیانی خۆی بە تۆمارکردنی شتی بێ سەروبەر لە دەفتەرەکەی خەریک دەکا و تەمەنیشی دوو بەقەد تەمەنی کچە بێت. ئاخر چۆنی بەخێو دەکات؟ ئایا دەیەوێ لەگەڵ خۆی بیباتە کەنارەکانی ڕووباری ئۆرینۆکۆ تا وێنەی ئەو گیاندارانە بکێشێت کە گۆشتی بەشەر دەخۆن؟

کۆنستانسا کە لە شەرمان ڕەنگی سوورهەڵگەڕابوو، قسەکانی پێ بڕیم و گوتی: تازە کارلەکار ترازاوە و ناکرێ بەرهەڵستیمان بکەیت، چونکە ئێمە لە

بەرامبەر خوا زەماوەندمان کردووە، هەرچەندە لە بەرامبەر یاسای مرۆڤەکان هێشتا نەمانکردووە.

ئەو کاتە من تێگەیشتم کە وەختێک لە ناو کەشتییەکە شەوان کولێرەم دروست دەکرد، ئەوان لە نێو جێگەی بیلالکاساردا هەرچی پێیان خۆشبووە کردوویانە. دەستم بەرز کردەوە تا دوو زللەی لەجێ لە بناگوێی کۆنستانسا بدەم، وەلێ توند باسکی گرتم. ڕۆژی دواتر لە کەنێسەی کارتاخینا بە ئامادەبوونی من و کاپتن مانوێل مارتن، وەک دوو شایەد، هاوسەرگیرییان بەست. ئیتر لە میوانخانەکە نیشتەجێ بوون و کەوتنە خۆئامادەکردن بۆ سەفەری جەنگەڵەکان، کە من پێشتر لەو خەمەدابووم.

***

شەوی یەکەمی بە تەنیابوونم لە ژوورەکەم، کارەساتێک ڕووی دا، ڕەنگە بمتوانیبایە پێشی لێ بگرم ئەگەر زیاتر وریابامایە. لەگەڵ ئەوەی بە هۆی نرخگرانی مۆم ، نەمدەتوانی خۆم تووشی ئەو بەزمە نەکەم، وەلێ شەوان لە ترسی سیسرکە کە بە تاریکی دەهاتنە دەر، یەکێکیانم بە داگیرساوی دەهێشتەوە. لەسەر چوارپایە تەسکەکەم لێی ڕاکشابووم و تەنیا کراسێکی نووستنی تەنکم لەبەردابوو، لەگەرمان خەوم لێ نەدەکەوت و هەر بیرم لە لای کچە خوشکەکەم بوو، وەختێک دەنگی لێدانی دەرگەکەم ترساندمی. لە پشت دەرگەکە بەرچیغێک هەبوو کە لە ژوورێوە دەکرایە ڕکە و دەرگەکەم پێی قایم دەکرد، بەڵام من لەبیرم کردبوو وا بکەم. بە لەقەیەک دەرگەکە کەوتە سەر ئەرزی و سبستیان ڕۆمێرۆ لەسەر کۆسپەی دەرگەکە بەدیار کەوت. توانیم هەستمەوە، وەلێ خۆی بەسەرم دادا و لە سەر چوارپاکە پاڵی خستم و جوێنی پێ دام. بە قاچ و ڕنۆکی نینۆکەکانم ویستم بەرگری لە خۆم بکەم، بەڵام بە لێدانێکی بەهێز گێژی کردم و چەند چرکەیەک هەناسەم بڕا و چاوم تاریک بوو. وەختێ کە هۆشم هاتەوە بە تەواوی بەسەرمدا زاڵ بووبوو و هەموو گرانایی خۆی خستبووە سەرم و بە لیکاو دەموچاومی پیس کردبوو و هەر جوێنیشی دەدا . هەستم بە هەناسە ناخۆشەکەی و بە پەنجە بەهێزەکانیشی

کرد کە لە جەستەمی ڕادەکرد. بە چۆکەکانی هەوڵی دەدا قاچەکانم لێک بکاتەوە، ئەندامە ڕەپەکەشی لە زگم ڕادەچوو. ئێشی لێدانەکە و ترس هۆشیان شێواندبووم. هاوارم کرد، وەلێ بە دەستێک دەمی گرتم و نەیهێشت هەوا هەڵکێشم، بە دەستەکەی تریشی کراس و بێجامەکەمی دەهێنایە خوارێ، کە ئەوەش کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە منیش بە تاقەت بووم و وەک دەڵەک جەستەم گرموڵە دەکرد و خۆم لە بنی دەدزییەوە. بەڵام ئەوجارە بە زللەیەکی بەهێز بێدەگی کردم و ویستی بە هەردوو دەستی جلەکانم بدڕێنێ. ئەو ساتە درکم کرد کە بە بەکارهێنانی هێز ناتوانم لە دەستی ڕزگار بم. چەند ساتێک بیرم کردەوە کە وا چاکترە خۆمی بۆ شلکەم، بەڵکە زوو تەواو بێت و وازم لێ بێنێت، وەلێ ڕقهەڵسانم کوێری کردم و بڕواشم وا نەبوو کە ئەوها زوو بێ کێشە وازم لێ بێنێت. ئاخر دوورنییە بمکوژێت تا تۆڵەی لێ نەکەمەوە. دەمم پڕی خوێن بووبوو، وەلێ پێم گوت کە چیتر لێم نەدات و دەتوانین پێکەوە چێژ وەرگرین و پەلەکردنی ناوێ و من ئامادەم هەموو ئارەزووەکانی تێر بکەم. هەموو وردەکارییەکانی ئەو شەوەم لە بیر نییە، وا زەندەبەم لەگەڵ بۆڵە بۆڵ و جوێندان دەستم بە سەریدا دەهێنا و دەملاواندەوە. ئەمەیان لە نێو جێگە لە خوان فێر بووبووم. ئەو ڕەفتارەی من دیاربوو نەختێ ئارامی کردەوە، چونکە لە سەرم لاکەوت و بە پێوە کەوتە داکەنانی شەرواڵەکەی کە تا سەرچۆکانی لوولی خواردبوو. لە ژێر سەرینەکەم چەقۆیەکەم دەستدایێ و بە دەستی ڕاستەم بە لا تەنیشتی خۆم گرتبووم و نەمدەهێشت ببینێت. کە ڕۆمێرۆ دیسان سەرلەنوێ خۆی خستەوە سەرم، لێی گەڕام ئۆقرە بگرێت و بە هەردوو قاچە بەرزەوەبووەکانم ناوقەدیم گوشی و بە دەستی چەپەشم دەستم لە ملی کرد. هاوارێکی ڕەزامەندانەی لە دەم دەرچوو و وای زانی منیش دواجار دەمەوێ هاوبەشیی چێژ و ئارەزووەکانی دەکەم و خۆی ئامادە کرد هەلی خۆی بقۆزێتەوە. لەو کاتەدا بە قاچەکانم تەواو چەسپم کردبوو، چەقۆیەکەم بەرز کردەوە و بە دیقەت ئەو شوێنەکەم نیشان کرد کە گەورەترین ئازاری پێ بگات. بە هەموو تاقەتی خۆم

چەقۆیەکەم تا بن دەسکی لە پشتی چەقاند. چەقۆ لێدان لە پشتی پیاوێکی ئەوها بتەو ئاسان نییە کە لەم بارەدا بێت، بەڵام ترس یارمەتی دام. یان ژیانی من یا هی ئەو. ترسام لە شوێنی پێکانی هەڵەم کردبێت، چونکە لەو ئانەدا سبستیان ڕۆمێرۆ، وەک ئەوەی هەستی پێ نەکردبێ، هیچ کاردانەوەیەکی پێوە دیارنەبوو، بەڵام ئەوەندەی نەبرد لە ناخڕا هاوارێکی خنکێنراوی لێ بەرز بووەوە و گلۆربووەوە نێو شتومەکە کەڵەکەبووەکەی سەر ئەرزی. هەوڵی دا ڕاستبێتەوە، وەلێ بە ڕووخسارێکی وڕەوە یەکسەر ترس دای گرت و کەوتەوە سەرچۆک. بە نائومێدییەوە دەستی بۆ پشتی برد بەڵکە بتوانێ چەقۆیەکە دەربێنێ. ئەو ئەزموونەی لەسەر جەستەی مرۆڤ پەیدام کردبوو لە خەستەخانەی قەشەژنەکان، زۆر بە کەڵکم هات، چونکە لێدانەکە مەرگهێن بوو. ئەو پیاوە هێشتا هەوڵی دەدا، وەلێ من لەسەر چوارپاکە دانیشتبووم و بە ترسێکەوە چاوەدێریم دەکرد کە لە هی ئەو کەمتر نەبوو، لەگەڵ ئەوەش ئامادەبووم ئەگەر هاوار بکات، بە هەر جۆرێک بێت بێدەنگی بکەم. نەیقیژاند، ئاوێکی ناجۆری تێکەڵ بە کەفێکی پەمەیی بە لێویدا هاتە خوارێ. لە دوای ماوەیەک کە بۆ من زۆر دوورودرێژ بوو، ڕاچڵەکی وەک ئەوەی نەقورچەیەکیان لێی گرتبێت، پاشان خوێن ڕشایەوە و ئیتر بوورایەوە. زۆرم چاوەڕێ کرد تا ساردبوومەوە و توانیم بیر بکەمەوە؛ ئەوجا دڵنیابووم کە چیتر ناجولێ و لەبەر ڕووناکی کزی تاکە چراکەم دیتم خوێنی لەبەر ڕۆیشتووە و ئەرزەکە مژیویەتی.

ئەو شەوەم تا سبەینێ لە تەک جەستەی سبستیان ڕۆمێرۆ بەسەربرد، یەکەم جار لە پاکیزەی گەورە پاڕامەوە کە لەو تاوانە سامناکە بمبەخشێت، پاشان پلانم داڕشت کە چۆن لە ئاکامەکانی ئەو تاوانە خۆم ڕزگار بکەم. من یاساکانی ئەو شارەم نەدەزانی، بەڵام ئەگەر وەک یاسای بلاسنشیا بێت، ئەوا دەبێ بچمە کونجی زیندان تا ئەو وەختەی کە بە بەڵگە دەیسەلمێنم کە بۆ بەرگری لەخۆکردن کوشتوومە، کە ئەوەش کارێکی زۆر زەحمەتە، چونکە گومانی دادوەرەکان هەمیشە لەسەر ژنەکانە. دڵی خۆم بە خەیاڵ نەدەدایەوە:

ئاخر ئێمەین کە تاوان و گوناهەکانی پیاوان هەڵدەگرین. دادگا چاوەڕێی چی لە ژنێکی گەنج و تەنیا دەکات؟ ڕەنگە بڵێن ژنەکە دەریاوانە بێ تاوانەکەی داوەت کردووە پاشان کوشتوویەتی تا دزی لێ بکات. کاتی بەیانی، تەرمەکەم بە بەتانییەک داپۆشی و دوایێ جلەکانم لەبەر کرد و بەرەو بەندەرەکە ڕۆیشتم کە هێشتا کەشتییەکەی کاپتن مانوێل مارتین لەوێ لەنگەری گرتووە. مامۆستا تا کۆتایی گوێی لە چیرۆکەکەم گرت، بێ ئەوەی قسەم پێ ببڕێت مژی لە جگەرەکەی دەدا و سەری خۆی دەخوراند.

وەختێ لە قسەکانم بوومەوە، گوتی: ئەی دۆنیا ئێنیس، دیارە وا پێویست دەکات بەرپرسیارێتی ئەو کێشەیە بگرمە ئەستۆی خۆم.

لەگەڵ دەریاوانێکی باوەڕپێکراوی خۆی بەپەلە چوونە ماڵە بێنازەکەی من، بە پارچەیەک قوماشی چارۆگەی کەشتییەکە تەرمەکەیان پێچایەوە پێکەوە هەڵیان گرت. هەرگیز نەمزانی بۆ کوێیان برد و چیان لێی کرد؛ وا خەیاڵ دەکەم تەرمەکەیان لە بەردێکی قورس قایم کردبێ و فڕێیان دابێتە ئاوی دەریا، کە لەوێ ماسییەکان دەیخۆن و ئاسەواری نامینێ.

مانوێل مارتین پێشنیازی کرد کە تا زووە کارتاخینا بەجێ بێڵم، چونکە ئەو جۆرە نهێنییە بۆ هەمیشە بزر نابێ. ئیتر بەو جۆرە لە دوای چەند ڕۆژێکی کەم بە ناچاری ماڵئاواییم لە کچە خوشکەکەم کرد و لەگەڵ دوو گەشتیاری تر بەرەو پەنەما ڕۆیشتین. چەند هندییەک کەلوپەلەکانی ئێمەیان هەڵگرت و بە نێو شاخ و دارستان و ڕووبارەکان بە پێشمان کەوتن.

زینی پەنەما پشتێنەیەکە لە خاک، کە هەردوو ئۆقیانووسی ئەورووپایی و خواروو کە پێی دەڵێن ئۆقیانووسی ئارام، لە یەکتر جیا دەکاتەوە. پانی ئەو زینە لە بیست فەرسەخ کەمترە، بەڵام شاخەکانی سەخت و هەزار بە هەزارینە و دارستانەکانی چڕن و ئاوەکانی بەگوڕ و تیژن، زۆنگاوەکانی بۆگەنن و هەواکەی تژی بۆنی پیس و تووشی گرانەتات دەکەن. لەوێ هندی یاخیبوو و کیسەڵ و ماری وشکانی و ئاوی هەیە، بەڵام دیمەنە سروشتییەکان دڵڕفێنن و باڵندەکانی تا بڵێ جوانن. بە درێژایی ڕێگە قاووقیژی

مـەیموونەکـان دەهات، ئەوانـە جـۆرە گـیـادارێکی چاپووک و وریان، بەسـەر ئێمەدا بازیان دەدا بۆ ئەوەی خۆراکمـان لێ بڕفێنن. جەنگەڵەکان تا بڵێی چڕ و سـەوز و سـێـبـەردار بوون. هەردوو هـاوڕێکەم چەکـەکـانـیـان بە سـواری لە دەست گـرتـبـوو و چاویان لـەسـەر ئەو هندییـانە هەڵنەدەگـرت کـە لـە هەمـوو کاتێکی بێ ئاگایی دەیانتـوانی زەفەرمـان پێ ببەن، هەروەک بابە گریگۆریۆش لەوە وریای کردبووینـەوە. هەروەها ئاگەداری دڕندەیی تیمساحـەکانیش بووین کە نێچـرەکانیان دەبردە قووڵایی ڕووبـارەکان. مەترسی لە مێرووله سوورەکان کە بە هەزاران دانە ڕێچکەیان دەبەست و لە کونەکانی لەش دەچوونە ژوورێ و بۆ ماوەی چەند خولەکێک دەیانخواردی، هەروەها مـەترسی لە بۆقەکان کە بە لیکاوی ژەهراوییان لە دوورەوە کوێریان دەکردی، هەر نەدەبڕایەوە.

هەوڵم دا بیر لەو شـتـانە نەکـەمـەوە، چونکە ترس لە بیری خـۆم نەبردبایەوە ڕەنگە لە پەلوپۆی بخـسـتبـام. ئاخـر لێرە، هەروەک دانێیل بلالکاسـار دەیگوت، نابێ خەم لە کارەساتێک بخۆی کە هێشتا ڕووی نەداوە.

بە سواری بەلەمێک بەشی یەکەمی گەشتـەکەمان دەستی پێ کرد کە هەشت کـەس لە خـەڵکی ئەوێ سـەوڵیـان لێ دەدا. زۆر دڵـخـۆش بووم کـە کـچـە خـوشکەکـەمم لـەگـەڵ نیـیـە، چونکە سـەوڵ لێـدەرەکـان تـەواو ڕووت بوون. ڕاستییەکەی منیش هەرچەندە دیمەنی سروشتی جوان و سەرنجڕاکێش گەلێ زۆر بوون، بەڵام چاوم هـەر لەسـەر ئەو شـوێنەی جـەسـتـەیان بوو کـە دەبووایە سەیری نەکەم. دوا بڕگەی سەفەرەکەمان بە سواری هێستر ئەنجام دا. لەسەر دوا لووتکەی شـاخـەکان دەریـامـان بە ڕەنـگی فـەیرۆز و چواردەوری هەوراوی شاری پەنەماشمان بینی کە لە ناو هەڵمێکی گەرمدا خنکابوو.

## بەشی دووەم

ئەمریکا ١٥٣٧ -١٥٤٠

پێدرۆ دی بالدیبیا ئەو کاتەی کە لەگەڵ خێرۆنیمۆ دی ئەلدێرێتی گەیشتنە ڤەنزوێلا، یا ڤینیسیای بچووک، تەمەنی سی و پێنج ساڵ بوو. یەکەمین تاقمی دۆزەرەوەکان، وەختێ کە زۆنگاوەکان و کەناڵەکانی ئاو و قوڵغە بە ئەستووندە وەستاوەکانی سەر ئاویان بینیبوو بە گاڵتە ئەو ناوەیان لێ نا. پێدرۆ، مارینا ئۆرتیس دی گایتی ناسک و نازداری لە ئیسپانیا بەجێ هێشتبوو و بەڵێنی پێ دابوو کە بە دەوڵەمەندییەوە بگەڕێتەوە کنی یان بە زووترین کات بە دوایدا بنێرێت - دڵدانەوەیەکی لاواز بۆ کچە گەنجێکی جێهێڵراو -. هەموو سامانی خۆی خەرج کردبوو و سەرەڕای ئەوە هەندێکیشی قەرز کردبوو، تابتوانێ خەرجی سەفەرەکەی پێ دابێن بکات. وەک هەر کەسێکی تر کە ملی ئەو ڕێیە دەگرن بۆ جیهانی تازە، موڵک و شەرەف و ژینی خۆی بۆ ئەو ئەرکە تەرخان کردبوو، هەرچەندە ئەو زەوییانەی کە داگیر دەکرێن و پێنجیەکی ئەو سامانەی کە چەنگی دەکەوێ - ئەگەر هەبوو - بۆ تاجی شاهانەی ئیسپانیایە. بە پێی ئەو قسانەی کە بیلالکاسار دەیکردن، ملنان بۆ ئەو جەربەزەییە بە ڕێگەپێدانی پاشا، پێی دەڵێن کردنەوە یان دەستبەسەرداگرتن، بەڵام بێ مۆڵەتی شاهانە دەبێتە کردەوەیەکی پەلاماردەرانە.

کەنارەکانی دەریای کاریبی بە ئاو و لە بریقەدارەکانی و دارخورما باڵا بەرزەکانی، پێشوازییەکی هێمن و فێڵبازانەیان لەو دوو گەنجە کرد، چونکە هەرکە چوونە ناو سەوزاییە چڕەکەی، یەکسەر جەنگەڵە دێوەزمەییەکان

گەمارۆی دان. ئەوان دەبووایە بە هۆی داسی مەچیتی ڕێگەی خۆیان بکەنەوە. گەرما و هەوای شێدار تووشی سەرەسوڕەی دەکردن و مێشوولە و جۆرە درندەیەکی کەڵبەدار هێرشیان بۆ دەهێنان کە قەت نەیان بینیبوون. بە ناو زەوییە زۆنگاوییەکاندا دەڕۆیشتن و تا ئەستووراییی ڕانیان لە مادەیەکی شل و بۆگەن دەچووە خوارێ، جەستەیان قورس، پەککەوتە، زێرووی نالەباریش خۆیان بە پێستیانەوە دەنووساندن و خوێنیان دەمژین. لە ترسی تیری ژەهراوی هندییەکان، کە بەردەوام بە بێدەنگی و بزر لە نێو سەوزاییەکەوە بە دوایاندابوون، نەدەبوو زریکانیان داکەنن.

ئەڵدێرێتی وریای کردنەوە: نابێ بە زیندوێتی بکەوینە دەستی درندەکان!

هەروەها باسی فرانسیسکۆ بێسارۆی کرد کە لە یەکەم هێرشیدا بۆ خوارووی ئەو کیشوەرە، لەگەڵ کۆمەڵێک لە پیاوەکانی چووبووە ناو گوندێکی چۆڵ، کە هێشتا ئاگردانەکانیان هەر دەسووتان. کاتێ ئیسپانییە برسییەکان سەرقاپەی مەنجەڵەکانیان لادا و چێشتەکەی ناویان بینی: هەمووی سەرک و دەست و هەناوی بەشەر بوو.

پێدرۆ بالدیبیا وای دەزانی کە ئەم باش لە پرۆسەی دۆزینەوەی ئەمریکا و هێرشە سەربازییەکانی ئاگەدارە، بۆ ڕوونکردنەوە گوتی: ئەمەیان لە ڕۆژئاوا ڕووی دابوو، لەو کاتەی کە بێسارۆ بە دوای پێرۆدا دەگەڕا.

خێرۆخیمۆ زیاتر پێی داگرت: ئەو هندییە کارییبییانەی کە لەو هەرێمانەدا دەژین، ئەوانیش لەوانەن کە گۆشتی بەشەر دەخۆن.

هەرگیز نەدەکرا بە نێو ئەو سەوزاییە چڕەی ئەو جیهانە سەرەتاییەی کە بەر لە دروستبوونەوە هەیە، ڕێ بکەیت، سەرلێشێواوی و خولخواردنەوەیەکی دۆزەخییانە، بێ کات و بێ مێژوو. ئەگەر کەمێک لە ڕووبارەکە دوورکەونەوە، بۆ هەتا هەتایە دارستان قووتیان دەدات، هەر وەک ئەمە لە پیاوێک ڕووی دا کە بە دوای دایکیدا چووبووە نێو دارستانێک هەر بانگی کردبوو، پاشان بە هۆی دڵتوندی و ترس شێت بووبوو. بە بێدەنگی دەچوونە پێش، تەنیایی باری گران کردبوون. ئاوەکان پڕبوون لە ماسی پیرانیای کەڵبەدار، هەرکە بۆنی

خـــوێنیـــان بکردایە بە ڕەوە بۆی دەچوون و بە چەند خـولەکـێک بەســـەر نێچرەکەیاندا زاڵ دەبوون و ئێسکێکی ڕووت و سپی و پاکیان دەهێشتـەوە، وەک بەڵگەیەک بۆ هەبوونی خـاوەنەکـەی. لەو سـروشـتـە هـوڕێناوییـەدا هیچ شتێک نییە بیخۆیت. ئەوەندەی نەبرد کە خۆراکیان نەما و برسێتی دەستی پێ کرد. هەندێ جار دەیانتوانی مەیموونێک ڕاوبکەن و گۆشتەکەی بە خاوی بخۆن، وەلێ لە قامەتە مرۆییەکەی و بۆنە گەنیوەکەی بێزار بووبوون، چونکە لە ناو هەوایە تێر شێیەکەی نێو ئەو جەنگەڵە جاویدانییە، ئاگر دانەدەگیرسا. ئەو کـاتەی بەری دارێکی نەناسـراویان خـوارد، هەمـوویـان نەخـۆشـکەوتن و چەند ڕۆژێک نەیانتوانی بڕۆن، هەر دەرشـانەوە و زگیـان دەئاوسا و ددانیـان دەکەوت و سکیان دەچوو، ئیتر تووشی گرانەتا بووبوون. یەکێکیان لە دەم و لە چاوی خـوێنـی دەدەڵاند و مرد، یەکێکی تر لە نێو قوڕ و زەنەک نقوم بووبوو، سێیەمینیش ماری ئەنکۆندا تێکوپێکی شکاند، کە مارێکی یەکجار گەورەیە: ئەسـتـوورییـەکـەی بەقـەد ڕانی پیاوێکە و درێژییـەکـەی بەقـەد پێنج ڕم دەبێت. هەواکە هـەڵمـێکی گـەرم و بۆگـەن و شـێـداری هەبوو، هەر دەتگوت هـەناسـەی ئەژدیهایە. سـەربازەکان دووبارەیان دەکـردەوە:" ئێرە وڵاتی شـەیتـانە". دەبێ ئەمە هەر وابێت، چونکە تووڕەیی دادەگیرسا و هەموو چرکەیەک بەگژی یەکدا دەهاتن. ســەرکـردەکــان زۆر بـە زەحــمــەت دەیانتــوانی هـەندێ دیســپـلـین بگەڕێننەوە ڕیزی ســەربازەکــان و ناچاریان بکەن بۆ پێـشــەوە بڕۆن. تاکــە خەونێک کە پاڵی دەدان بۆ ڕۆیشتن: شاری زێڕین بوو.

هەرچەند زێتـر دەچوونـە پێش، پێدرۆ بـالدیبـیـا باوەڕی بە پرۆژەکـەیان لە کورتس کـەم دەبووەوە و زیاتر بێ ئومـێد دەبوو. ئـەوە ئەو خـەونە نەبوو کـە لە مـاڵە بێـزارکـەرەکـەی لە ئیـسـتـریمادۆرا خـەونی پێـوە دەبینی. ئەو کـە هات ئامـادەبوو لە جـەنگی پڕ لە قارەمـانێتـی ڕووبەڕووی دڕندەکان ببـێتـەوە و لە پێناوی پایەداری خواوەند و پاشـاکەیان، شوێنە دوورەکان  داگیر بکات، بەڵام نەدەهاتە بەر زەینی کە ئەو شمـشێرەی لە شـەڕەکانی فلاند و ئیتـالیا پاڵپشتی بوو، دەبێ لێــرە لـە جــەنگی دژی ســروشت بـەکــاری بێنێت. چاوچنۆکی و

بێویژدانی هاوڕێکانی بێزاری کردبوون، ئاخر جگە لە خێرۆنیمۆ کە چەند جارێک سەلماندی کەسێکی جوامێرە، تاکە سەربازێکی بە ڕەوشت و نموونەیی تێدا نەبوو، هەموویان گەمژە و لە خراپترین جۆر بوون، بێویژدان و شەڕانگێز. ئەوەندەی پێنەچوو سەرکردەش بووە یەکێک لە دڵڕەقە بێ بەزەییەکان؛ هندییەکانی وەک کۆیلە دەدزی و بازرگانی پێوە دەکردن، پێنجیەکی دەستکەوتەکانیشی نەدەدایە تاجی شاهانە. ئێمە بەو هەڵەشەیی و بێ هیواییە بۆ کوێ دەچین کە دواجار کەسێکمان ناتوانێت زێڕەکەی لەگەڵ خۆی بباتە ژێر گڵ؟ بالدیبیا ئاوای بیر دەکردەوە، لەگەڵ ئەوەش لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو، چونکە هەرگیز نەدەکرا بگەڕێتەوە. ئەو جەربەزەییە بێ سەروبەرە چەند مانگێکی خایاند، تا لە دواییدا پێدرۆ دی بالدیبیا و خێرۆنیمۆ دی ئەلدێرێتی توانیان خۆیان لەو کۆمەڵە بەدخووە جیا بکەنەوە و لە ڕێگەی دەریاوە بەرەو شاری سانتۆ دۆمەنیکۆ بڕۆن لە دوورگەی ئیسپانیولا. لەوێ ئەو هێزەیان هاتەوەبەر کە لەو سەفەرە لە دەستیان دابوو. پێدرۆ ئەو هەلەی قۆستەوە و هەندێک لەو سامانەی بۆ مارینا ڕەوان کرد کە پاشەکەوتی کردبوو، وەک چۆن هەمیشە دواتریش تا مردنی هەر وای کرد. لەو ڕۆژانەدا خەبەر گەیشتە ئەو دوورگەیە کە فرانسیسکۆ بێسارۆ پێویستی بە یارمەتی هەیە لە پێرۆ. ئاخر هاوڕێیە هاوبەشەکەی لە داگیرکاری، دیێگۆ ماگرۆ، بۆ شوێنە هەرە دوورەکانی خوارووی کیشوەرەکە چووبوو، بە نیازی دەستبەسەراگرتنی زەوییە عاسێکانی شیلی. ئەو دوو هاوڕێیە لە دەروون و سروشتیانەوە لێک جیاواز بوون: یەکەمیان، دەروون تاریک، بێ بڕوا، ئیرەیی بەر، وەلێ زۆر ئازا بوو. دووەمیان، ڕووخۆش، بەوەفا، سەخی، هیچ حەزی بە کۆکردنەوەی سامان نەدەکرد، ئەوەی بە دەستی دەکەوت هەمووی دابەش دەکرد. ئەو دوو پیاوە کە بەو ئەندازەیە لێک جیاوازبوون، دەبووایە نێوانیان بە دوژمنکاری کۆتایی بێت، هەرچەندە لە بەردەم شوێنی تایبەت بە قوربانیدان سوێندی وەفادارییان بۆ یەکتر خواردبوو و پارچە نانی قوربانیشیان پێکەوە لەت کردبوو.

ئیمپڕاتۆریەتی ئینکا لە ڕووبەرێکی بەرتەسک دابوو و جێگەی هەردووکیانی لێ نەدەبووەوە، بۆیە بێسارۆ لە پێرۆ مایەوە و بووە حاکم و هەڵگری نیشانەی سوارچاکانی سانتیاگۆ؛ بۆ ئەو مەبەستە برایە تووش و دڕەکانی یارمەتییان دەدا. بەڵام ماگرۆ لە ساڵی ١٥٣٥ بە سەرکردایەتی سوپایەک کە لە پێنج سەد قشتاڵی و دە هەزار هندی لە خەڵکی هەرێمی "یاناکۆناس" پێک هاتبوو، بەرەو وڵاتی شیلی بەڕێکەوت کە کەسێک پێشتر نەچووبووە ئەوێ و لە ناوی نەگەڕابوو. ئەو ناوە بە زمانی هندییەکانی ئیمارا، واتە «ئەو شوێنەی کە زەوی لەوێ کۆتایی دێت.» جا لە پێناوی دابینکردنی خەرجییەکانی ئەو سەفەرە بڕێکی زۆری لە سامانەکەی خەرج کرد، کە زیاتربوو لەو بڕەی وەک قوربانی دایە ئینکا ئەتاوالبا.

هەرکە ماگرۆ لەگەڵ پیاوە ئازاکانی بەرەو شیلی بەڕێکەوت، بێسارۆ خۆی لە بەرامبەر یاخیبوونێکی سەرتاسەری بینییەوە. ئاخر لە دوای دابەشبوونی هێزەکانی "پێراکۆچا"، کە ئیسپانییەکان وایان پێ دەگوت، دانیشتووانی ڕەسەنی پێرۆ لە دژی داگیرکەران، دەستیان دایە چەک. لەبەرئەوەی کۆمەکی خێرایان نەدەگەیشتە دەست، داگیرکاری ئیمپڕاتۆریەتی ئینکا تووشی بارێکی ترسناک ببووبوو. هەروەها ژیانی ئەو ئیسپانیانەش کەوتە مەترسی کە ناچاربوون لە دژی هێزێکی زۆرتر لە خۆیان بکەونە شەڕ. بانگەوازی بە تەنگەوەهاتن کە لەلایەن فانسیسکۆ بێسارۆوە ڕاگەیانرا، گەیشتە دوورگەی ئیسپانیۆلا و بالدیبیا لەوێ گوێبیستی بانگەوازەکە بوو و بێ دوودڵی بڕیاری دا بە پەلە بگاتە پێرۆ.

تەنیا ناوهێنانی ئەو زەویانە - پێرۆ - سەروەت و سامانێکی زۆر و شارستانییەتێکی پێشکەوتووی بە بیر پێدرۆ بالدیبیا دەهێنایەوە کە ئەلدێرێتی هاوڕێی بە بەسەروەناوە باسی دەکرد. ڕاستییەکەی ئەو بە لێکدانەوە بیری دەکردەوە و گوێی لە شتەکان دەگرت، جا با هەموو ئەو شتانەش شایەنی گرینگیپێدان نەبوونایە. دەزانی کە ئینکا "پاشاکان"، زۆر دڵڕەقن، و بە دڕندەیی فەرمانڕەوایی خەڵک دەکەن. لە دوای هەر جەنگێک

هەرچی دیل و دەستبەسەرە دەیکوژن، ئەگەر بە تەواوی لە ئیمپراتۆریەتەکەیان نەتوێتەوە. لە بەرامبەر هەر جۆرە نارازیبوونێک ئامادەنە گوندێک بە کامڵی بگوازنەوە دووری هەزاران فەرسەخ. ناشیرینترین پەند بە سەر دوژمنەکانیان دێن و بە ژن و منداڵەکانیشیانەوە. ئینکا "پاشا"، کە خوشکەکانی دەکاتە هاوسەری خۆی تا پاکیی خوێنی شاهانە بپارێزێ، هەر لە خۆیدا بەرجەستەی خوایەتی و ڕوحی ئیمپراتۆریەت و ڕابردوو و ئێستا و ئایندە دەکات. دەڵێن ئەتاوالبا هەزاران کچی پاکیزەی لە حەرەمسارەکەی هەبوو، سەرەڕای کۆمەڵێکی لە ژماردن نەهاتوو کۆیلەی هەبوون بە ئازاردانی زیندانییەکان کاتیان بەسەر دەبرد. ئەو پاشایە عادەتی وابوو وەزیرەکانی بە دەستی خۆی سەردەبڕی. ئەو گەلەی کە نە ڕوخسار و نە دەنگی هەبوو، بە ملکەچی دەژیا؛ چارەنووسیان وابوو لە منداڵییەوە تا مردن لە بەرژەوەندی چینی پیران – هاوڕێی بادەنۆشی، قەشە، ئەفسەری سەربازی – کاریان دەکرد، کە ئەوانە لە ژیانێکی پڕ لە کەیف و سەفای وەک بابلییەکان دەژیان، بەڵام مرۆڤی ئاسایی و خێزانەکانیان بە بەرهەمی ئەو پارچە زەویانە زگیان تێر دەکرد کە بۆیان تایبەت کرابوو و هی خۆیشیان نەبوو. ئیسپانییەکان دەیانگێڕایەوە کە هندییەکی زۆر بە نێربازییەوە خەریکبوون کە ئەو تاوانە لە ئیسپانیادا حوکمەکەی مردن بوو، هەرچەندە ئینکا قەدەغەی کردبوو. باشترین بەڵگە بۆ شەهوانییەتی ئەو خەڵکە ئەو پەیکەرە گۆزە ئیرۆتیکیانەبوو کە جەربەزەکان لە بارەکان پیشانیان دەدا بۆ ئەوەی هاموشۆکارانیان بورووژێنن، لەوانەی کە ئارەزوویان بوو کە دەشێ بەو ڕێگەیەش چێژ وەربگرن. هەروەها دەیانگوت کە دایکان بەر لەوەی کچەکانیان بدەنە پیاوان بە پەنجەی خۆیان پەردەی کچێنییان دەدڕاندن.

بالدیبیا دیتی کە هیچ شتێک نییە لە حەزلێبوونی خەڵک بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان لە پێرۆ کەم بکاتەوە؛ بەڵام ئەوەیان بۆ ئەم هاندەر نەبوو، بەڵکو بەجێگەیاندی ئەرکی جەنگ لە تەک خەڵکی زێدی خۆی و گەیشتن بە شکۆداری هاندەری ئەم بوو کە تا ئەو کاتەش بەدەستی نەهێنابوو. ئا لەمەدا

پێدرۆ لەگەڵ شەڕوانەکانی تر جیاواز بوو لە هەڵمەتی سەربەرزی، کە ئەوان بۆ بریقەی زێڕ شەیدا بووبوون. ئەوەیان چەند جارێک بەخۆی بۆمی دووبارە دەکردەوە و منیش بڕوام پێی دەکرد، چونکە ئەو ڕەفتارە لەگەڵ گشت بڕیارەکانی تری ژیانی ئەو دەگونجا. هەر بەهۆی بڕوابوون بە نموونەیی خۆی بوو کە پاش چەند ساڵێک لەوە وازی لە ژیانی پڕ لە ئارامیی و سامانەکەی خۆی هێنا کە بەم دواییە دەستی کەوتبوون، بۆ ئەوەی هەوڵ بدات شیلی داگیر بکات. ئەوەش ئەو ئەرکە پیرۆزە بوو کە دیێگۆ ماگرۆ نەیتوانیبوو جێبەجێی بکات. سەربەرزی و تەنیا سەربەرزی، ئەمەبوو کە چارەنووسی ئەوی ئاراستە دەکرد.

کەسێک نەبوو بەقەدەر من پێدرۆی خۆش بووێت و کەسیش لە من باشتر نەیدەناسی، بۆیە مافی خۆمە لە بارەی نەبەردییەکانی ئەو بدوێم، هەروەک چۆن پێویستە هێما بۆ کەموکووڕییەکانیشی بکەم کە ئەوەندە بچووک نەبوون. ڕاستە ئەو خیانەتی لە من کرد و لەگەڵ مندا کەسێکی ترسنۆک دەرچوو، وەلێ ئێمەی ژنان چی بکەین! ئاخر ڕاستگۆترین پیاو و ئازاترینیشیان هەمیشە نائومێدمان دەکەن. دواجار دەتوانم دڵنیاتان بکەمەوە کە پێدرۆ دی بالدیبیا لە هەموو پیاوان ڕاستتر و دروستتر و ئازاتر بوو، لەوانەی هاتبوونە جیهانی تازە.

***

بالدیبیا بەرەو خاکی پەنەما ڕۆیشت، لەوێ بە ڕێگەی دەریاوە لە ساڵی ١٥٣٧ لەگەڵ چوار سەد سەرباز ڕووی لە پێرۆ کرد. گەشتەکەی نێزیکەی دوو مانگی خایاند. ئەو کاتەی گەیشتە ئەوێ شۆڕشی هندییە یاخیبووەکان دامرکابووەوە. ئەمەش لە سایەی بە هانا هاتنی دیێگۆ ماگرۆ بوو کە لە کاتێکی گونجاودا بە پەلە لە شیلییەوە گەیشتبووە یارمەتی فرانسیسکۆ بێسارۆ. ماگرۆ چەندان لووتکەی بەفرینی بڕیبوو کە بۆ خواروو چووبوو، دەردەسەرییەکی یەکجار زۆری دیتبوو کە گەڕایەوەش لە نێو گەرمترین بیابانی سەر ئەو هەسارەیە وێران بووبوو. لە هەڵمەتەکەی بۆ سەر شیلی

گەیشتبووە ڕووباری پیو - پیو، ئەوە هەمان ئەو ڕووبارەیە کە پێش حەفتا ساڵ سوپای ئینکا گەیشتە کەنارەکانی پاشان گەڕایەوە؛ ئەو وەختەی هەوڵی دەدا دەسەڵاتی خۆی لە خاکی هندییەکانی خواروو، ڕۆڵەکانی مابۆچی بسەپێنێ، وەلێ بێ سوود بوو. ئەوەبوو ئەو گەلە جەنگاوەرە بە گژ سوپاکەی ئینکادا چووبوونەوە، هەروەک چۆن لە دواییدا بەرەنگاری هێزەکانی ماگرۆش بوونەوە.

مابۆ - چی، واتە (خەڵکی - زەوی)، هەرخۆیان ئەو ناوەیان لەخۆ نابوو، هەرچەندە هەموو کەس ئێستا پێیان دەڵێن ئەراوکانییەکان، کە ئەوە ناوێک بوو ئەلۆنسۆ دی ئێرسییا ئی زۆنیگای شاعیر لێی نابوون، وەلێ نازانم لە کوێی هێنابوو، ڕەنگە ناوی شوێنێک بێ پێی بڵێن ئەراوکۆ. من تا دەمرم هەر بە مابۆچی - ئەو وشەیە بە زمانی ئیسپانی ناکرێتە کۆ - ناویان دێنم، چونکێ ئەوان خۆیان وا بە خۆیان دەڵێن و هیچ بە ڕاستیشی نازانم لە پێناوی ئاسان هاتنی کێش و سەروا ناوەکەیان بگۆڕم: ئەرۆکانی، قشتاڵی، مەسیحی، برایەتی، ئیتر بەو جۆرە بە درێژی سێ سەد چوارینە شیعر. ئەڵونسۆ هێشتا منداڵبوو وەختێ کە ئێمەی ئیسپانییە یەکەمەکان لەسەر ئەو خاکە دەجەنگاین؛ ئەو لە ماوەیەکی کەم لە دوای داگیرکردنی شیلی هاتە ئەوێ، وەلێ شیعرەکانی ئەو داستانانە بۆ چەندان سەدە دەگێڕنەوە. ئەو کاتەی ئێمەی دامەزرێنەری شیلی تۆزقاڵێک ئێسکمان نامێنێت، خەڵک لە نێو کتێبی ئەو شاعیرە گەنجە ئێمەیان بیر دەکەوێتەوە، هەچەندە هەندێ جار بۆ واقیع و ڕووداوەکان بە وەفا نییە، چونکە واڕاهاتووە کە لە پێناوی پارێزگاری لە سەروای شیعرەکانی قوربانی بە ڕاستییەکان بدات، سەرەڕای ئەوەش مافی خۆمانمان پێ نادات و دەترسم ئەوانەی پێی سەرسامن، لە بارەی شەڕی ئەراوکانی بگەنە لێکدانەوەی نەختێ هەڵە. ئاخر ئەو شاعیرە، ئیسپانییەکان بە دڵڕەقی و چاوچنۆکی لە ڕادەبەدەر بۆ دەوڵەمەندی تاوانبار دەکات، لە کاتێک بە هندییە مابۆچییەکاندا هەڵدەڵێت و بە ئازایەتی و خانەدانی و سوارچاکی و دادپەروەری و هەتا نەرمونیانی لەگەڵ ژنەکانیان،

وەسفیان دەکات. وا دەزانم من لە ئەلۆنسۆ چاکتریان دەناسم، چونکە ئەوە چل ساڵە لێرە بەرگری لەو شتە دەکەم کە لە شیلی کردوومانە، لە کاتێک ئەو شاعیرە لە مانگێک زیاتر لێرە نەبووە. من ڕێزم بۆ مابۆچی و ئازایەتی و خۆشەویستیی ئەوان بۆ خاک هەیە، بەڵام دەتوانم دووبارەی بکەمەوە کە لە ناسکی و شیرینی ژیان نموونەی ئەوەندە چاک نەبوون. ئاخر ئەو خۆشەیستییە ڕۆمانسییەی ئەلۆنسۆ دەیداتە پاڵ ئەوان، ئەوە لە ناویان شتێکی زۆر دەگمەنە، چونکە هەر پیاوێک لەوان چەند ژنێکی هەیە و وەک مالاتی ئیش و شیردەر و بەخێوکەری منداڵ مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن. ئەوانەمان لەو ژنە ئیسپانیانەوە زانیوە کە لەلایەن ئەوانەوە ڕفێنرابوون. ئەو سووکایەتی پێکردنەی کە بە دیلی پێیان دەکرا، هەندێ جار وای لەو ژنە کلۆڵانە دەکرد کە لەبەر هەستکردن بە شەرم و ئابڕووچوون، نەگەڕێنەوە لای خانەوادەکانیان. من پێی لێ دەنێم کە بە ڕاستی ئیسپانییەکانیش مامەڵەیان لەگەڵ ژنە هندییە کرێکار و کارەکەرەکانی ماڵەوە، باشتر نەبوو. هندییە مابۆچییەکان لە زۆر لای ترەوە لە ئێمە باشتربوون، بۆ نموونە ئەوان چاوچنۆکییان نەدەزانی. گرینگیان بە زێڕ و زەوی و نازناو و ڕێزلێنانی سەرکەشانە نەدەدا؛ جگە لە ئاسمان ساپیتەیەکی تریان نەبوو و لە جیاتی ڕایەخیش قەوزەیان ڕادەخست و بە سەربەستی بە ناو دارستاندا دەڕۆیشتن و لەگەڵ با هەستیان دەفڕی و بە تاو خۆیان دەخستە سەر پشتی ئەو ئەسپانەی لە ئێمەیان دزیبوو. هەروەها جوامێرییەکی تریان دەخەمە پاڵ کە ئەوان خاوەنی قسەی خۆیانن و ئەو بەڵێنانەیان نەدەشکاند کە بە ئێمەیان دەدا، بەڵکو ئەوە ئێمەین کە شەرت و پەیمانمان لەکن نییە. هەروەها ئەوان لە کاتی جەنگیشدا پشت بە هێرشی کتوپڕ و لە ناکاو دەبەستن، وەلێ زوڵم ناکەن و لە کاتی ئاشتەواییشدا ڕێزی پەیمانەکانی شەڕوەستان دەگرن. بەر لە هاتنی ئێمە ئەشکەنجەدان لە نەریتی ئەواندا نەبوو و ڕێزیان لە دیلی جەنگ دەگرت و خراپترین سزادانیش لە کنەوان، دوورخستنەوە بوو لە خێزان و خێڵ، کە ئەمە بە لای ئەوانەوە لە مردن ناخۆشتر بوو. بەڵام سزای تاوانە

گەورەکـان، مـردن بوو بە بە ڕێگەیەکی خێرا. تـاوانبـارەکە دەبووایـە بە خـۆی گـۆڕ بۆ خـۆی هـەڵکەنی و دار و بـەردی بخـاتـە ناوی و ناوی ئەو بـوونەوارەش بڵـێت کـە دەیەوێ بۆ دنیـایەکـە تـر لەگـەڵیـدابن و پاشـان بە تـۆبز لێـدانێکی کوشندەیان لە کەللەی سـەری دەدا.

هێـزی ئەو بـەیتـە شـعـرانەی ئەڵۆنسـۆ سـەرسـامم دەکـەن کـە مـێـژوو دەخولقێنێت و بە گڕ لەبیرچوونەوەدا دەچێت و بەسـەریدا سـەردەکەوێت. ئەو وشـانەی سـەروایان نییـە، وەک ئەوانەی من دەیانووسم، ئەوا هـێـزی شـعـریان نییـە، وەلێ پێویسـتـە لەسـەرم ڕووداوەکان بگێڕمـەوە تا ئەو دەردەسـەرییانە بخـەمـە ڕوو کـە ئێـمـەی ژنان لە شیلی بەسـەرمـان هـاتووە، کە مێژوونووس و هەواڵدەرەکان هەرچەند ژیر و لێهاتووش بن، هـەمیشـە پشتگوێیان دەخەن.

ئیزابیل گیـان، لانی کەم پێویسـتـە تۆ هەموو ڕاستییـەکان بزانیت، چونکە تۆ کـچی دڵی منی، جـا بـا لـە خـوێنیـشـم نەبیت. بڕوام وایە تۆ لە مـەیدانەکـان پەیکەرم بۆ دروست دەکـەی و چەندان شـار و شـەقـام نـاوی من هـەڵدەگـرن، هـەروەک هـەندێکیشیان ناوی پێدرۆ دی بالدیبیا و پاڵەوانەکانی دی هـەڵدەگرن، بەڵام لـەبیـرکـردنی مـاندووبوونـی سـەدان لەو ژنانە دەشـاردرێتـەوە کــە گوندەکانیان دروسـت دەکرد لەو وەختەی پیاوەکانیان خـەریکی جەنگبوون. من دەربەدەر بـووم و دوور ڕۆیشـتـم. دوایـێ دەگـەڕێمـەوە سـەر ئەو بابـەتەی کـە دەمگێڕایەوە، چونکە کاتم نەماوە و هەستیش دەکەم دڵم ماندووە.

دیێگۆ مـاگرۆ، بە هـۆی بەرهـەڵسـتی هندییـە مـابۆچییـەکـان کە نەدەبەزین و گوشـار سـەربـازەکـانی خـۆی - پاش ئەوەی کـەمـی زێڕ بێ هیـوای کردن - و هەواڵە خراپەکانی یاخیبوونی هندییەکان لە پێرۆ، وازی لە داگیرکردنی شیلی هێنا. بڕیاری دا بگەڕێتەوە تا یارمـەتی فـرانسیسکۆ بێسـارۆ بـدات بەڵکە بە سـەر یاخـیـبـووەکـاندا سـەرکـەن. ئەوەبوو بە هـەردووکیـان توانییـان بە تەواوی هێزەکـانی دوژمن تێک بشـکێنن. ئیـتـر ئیـمـپـڕاتۆریەتی ئینکا کە برسـێتی و توندوتیـژی و بەرەڵایی بـە سـەریدا هـەڵی کرد، ملی کـەچ کـرد و سـەری نەوی کـرد. لەگەڵ ئـەوەش فرانسـیسکۆ بێسـارۆ، لە جیـاتی ئەوەی سوپـاسی مـاگـرۆ

بكات، لە خۆی و پیاوەکانی هەڵگەڕایەوە تا شاری کۆسکۆی لە ژێردەست دەربێنێ. ئەو شارە لەو دابەشکردنەی کە ئیپراتۆر کارلۆسی پێنجەم لە زەوییەکان کردی، کەوتبووە نسیبی ئەو. ئەو زەویانە زۆر فرەوان نەبوون و سەروەتێکی گەورەیان لێ نەبوو تا چاوچنۆکی برایانی بێسارۆ تێر بکەن؛ ئەوان زێتریان دەخواست، دەیانویست دەست بەسەر هەموو شتێکدا بگرن. کار گەیشتە ئەوەی بێسارۆ و ماگرۆ چەک لە ڕووی یەکتر بەرز بکەنەوە بەگژ یەکدا بچن. لە ئەبانکای بەرەنگاری یەکتری بوونەوە و لە شەڕێکی کورتخایەندا هێزەکەی بێسارۆ شکستی خوارد. ماگرۆ وەک پیشەی جوامێرانەی هەمیشەیی خۆی، زۆر بە بەزەییانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دیلەکان دەکرد، هەتا لەگەڵ براکانی بێسارۆش کە دوژمنی سەرسەختی ئەو بوون. زۆر لەو سەربازە تێکشکاوانە بەو ڕفتارەی ماگرۆ سەرسام بووبوون و چوونە ڕیزی سوپاکەی ئەو، لە کاتێدا هەندێک لە ئەفسەرە دڵسۆزەکانی داوایان لێی کرد براکانی بێسارۆ لە سێدارە بدات و سەرکەوتنەکەی خۆی بۆ دەستبەسەراگرتنی پێرۆ بقۆزێتەوە. ماگرۆ گوێی بەو ئامۆژگارییانە نەدا و ئاشتبوونەوەی لەگەڵ هاوبەشەکەی هەڵبژارد، هەر چەندە دوژمنایەتی ئەمیشی کردبوو.

***

پێدرۆ بالدیبیا هەر لەو ڕۆژانەدا گەیشتبووە شاری پاشاکان و خۆی خستە ژێر فەرمانی فرانسیسکۆ بێسارۆ کە بە دوایدا ڕەوان کردبوو. ئەو پیاوە چونکە زۆر پابەندی یاسابوو، هیچ گفتوگۆیەکی لە بارەی دەسەڵاتی حاکم و نیازەکانی نەکرد؛ چونکە حاکم خۆی نوێنەری پاشا کارلۆسی پێنجەمە، ئەمەش بەسە بۆ ئەم. لەگەڵ ئەوەش، بالدیبیا دوا ئارەزووی ئەوەبوو تا شەڕی هندییە یاخیبووەکان بکات، قەت لە بیری ئەوەدا نەبوو کە ناچار دەبێ شەڕی ئیسپانییەکانیش بکات. هەوڵی دا نێوانی بێسارۆ و ماگرۆ بکات و پێکیان بێنێتەوە، سەروەختێک وای دەزانی چیوای نەماوە ئەو ئەرکە بەجێ بێنێ. ئاگای لەوە نەبوو کە بێسارۆ لە سەرڕا شتێک دەڵێ و لە ژێرەوەش نەخشە بۆ

شـتـی تر دادەڕێژێ. ئەو کـاتـەی حـاکم بە گـوتاری برایانـە و خـۆشـەویسـتـی سوودی لە کات وەردەگرت، پلانی دادەنا کە چۆن بە سەر مـاگرۆدا زاڵ بێت و بیـری لە هیچ شـتـێکی تر نەدەکـردەوە، تـەنیـا دەسـەڵاتی تاکـڕەوی خـۆی و دەستبەسەراگرتنی شاری کۆسکۆ نەبێت. ئیرەیی بە خەسڵەتەکانی مـاگرۆ و گەشبینییە هەمیشەییەکەی دەبرد. هـەروەها پێشتریش ئیرەیی بەوە دەبرد کە چۆن سـەربازەکانی لە فـەرمانەکانی دەرناچن، چونکە دەیزانـی کە ئەم بـەخۆی لەکن سەربازەکانی خۆشەویست نییە.

لە دوای زیاتر لە سـاڵێک لە پـەلامـاردان و پـەیمانشکێنی و خـیـانەتکردن، هەردوو هێـزی دوژمنکار لە لاس سالیناس ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە لە نزیک شاری کۆسکۆ. بێسارۆ بە خۆی سەرکردایەتی سوپاکەی نەکرد، بەڵکو هەموو هێزەکەی خستە ژێر فەرمانی پێدرۆ دی بالدیبیا کە خەسڵەتە سەربازییەکانی بۆ هـەمـووان زانراو بوو. بەسـەرکـردەی بەرەی جـەنگی دانا، چونکە پێشـتـر لە ئیـتـالیا لە ژێر فـەرمـاندەی مـەرکـیـز بێسکارا بە شـداری شـەڕی کـردبوو و ئەزموونێکی زۆری لە شەڕی دژی ئەوروپییەکان هەبوو. ئاخر شەڕکردن لەگەڵ هندییە چەک خراپ و بێ سـەروبەرەکان، زۆر لە شەڕی ئیسپانییە بە دیسپلین و ڕیزبەندەکان جیاوازە. برایەکەی خۆی - ئێرناندۆ بێسارۆ - ی بە نوێنەری خۆی ڕەوان کرد کە بە هۆی دڵرەقی و لەخۆباییبوونی زۆر بێزراو بوو. دەمەوێ ئەوە زۆر ڕوون بێت، بـۆ ئەوەی پێدرۆ بالـدیبیـا بەو کارە نامـرۆڤانانە ناو بەد نەکرێت کە لەو ڕۆژانـەدا ئەنجام دران. من بەڵگەی یـەکلاکـەرەوەم لەو بارەیەوە هەیە، ئاخـر لە سـەرم پێویست بوو کە چارەسـەری ئـەو بەدبەختـانە بکەم کە چەند مـانگێک لە دوای جـەنگەکەش برینەکانیـان چاک نەدەبووەوە. لایەنگرانی بێسـارۆ تۆپیان هـەبوو و لە ژمارەش دوو سـەد سەربازیان لە هێزەکەی مـاگرۆ زێتـر هەبوو. چـەکەکـانیـان باش بـوو و تفـەنگی تازە و فـیـشـەکی بەکـاری لە چەشـنی کـەللای ئاسنیـان هـەڵگرتبـوو کـە لەگـەڵ کـەوتنەوە دەبوونە وردە ساچمەی تیژ. ورەیان بەرز و جـەستەیان حـەساوە بوو، بەڵام ڕکابەرەکانیـان تازە لە کارەسـاتی گەورەکانـی کە لە شیلی تووشیـان هاتبـوو و کوژاندنەوەی

یاخیبوونی هندییەکانی پێرۆ هاتبوونەوە.

هەردوو سوپاکە لە بەیانییەکی ڕەنگ پەمەیی لە دۆڵی لاس سالیناس گەیشتنە یەکتر لەو کاتەدا هندییەکانی کیچوا لە بەرزاییەکاندا سەیری دیمەنی چێژبەخشی بیراکۆچا - ئیسپانییەکان - یان دەکرد کە چۆن وەک دڕندەی کەڵبەدار تێکبەربوونە و یەکتری دەکوژن. ئەوان سەریان لە کەشی ئەو جەنگاوەرە ڕیشدارانە و چەکەکانیان دەرنەدەچوو. یەکەم جار لە چەند ڕیزێکی ڕێکوپێک دەوەستن، بە زرێ بریقەدار و ئەسپە چووستەکانیانەوە ئاوا جوان دیارن، پاشان لەسەر چۆکێکیان دەچەمێنەوە، بەڵام هەندێکی تر بەرگی ڕەشیان پۆشیوە بە بەکارهێنانی خاچی بچووک و بەرداخی چەرمین، کەشی سیحری دەنوێنن. پاشان پارچە نانی بچووک دەخۆن و نیشانەی خاچ دەکێشن و پیرۆزبایی لێک دەکەن و لە دوورەوە سڵاو دەگۆڕنەوە. لە دوای بەسەرچوونی دوو سەعات لە سەماکردن بۆ شەڕی یەکتر ئامادەساز دەبن. هەموو ئەمانە بە پێی بەرنامە و بە گەرموگوڕی ئەنجام دەدرێن. بۆ ماوەی چەند سەعاتێک بە یەکدا هەڵدەشاخێن و یەک بە یەک بە جەستەی یەکترەوە دەنووسێن و هەمان هاواریان لێ هەڵدەستێ: «بژی پاشا و ئیسپانیا!» «سانتیاگۆی پاک و پیرۆز بۆ پێشەوە!». لە نێو گێرەشێوی و ئەو تۆز و غوبارەی لە ناڵی ئەسپەکان و چەکمەی پیاوەکان هەڵدەستێت، ناتوانرێ هەردوو بەرە لێک جیا بکرێنەوە، چونکە بەرگی هەموویان لە ڕەنگی قووڕە. لەو کاتەدا هندییەکان چەپڵە لێ دەدەن و گرەو لەگەڵە یەکتر دەکەن، بادەی چیچا دەخۆنەوە، پاشان هەست بە گەرما و ماندوویێتی دەکەن، چونکە شەڕەکە درێژە دەکێشێ.

بەرەبەری خۆرئاوا، لایەنگرانی بێسارۆ بە هۆی لێهاتوویی سەربازی سەرکردەکەیان، پێدرۆ دی بالدیبیا، پاڵەوانی ئەو ڕۆژە، سەرکەوتن. وەلێ ئێرناندۆ بێسارۆ خۆی دوا بڕیاری دەرکرد: بۆ سەربڕین!. سەربازەکانی بە ڕقێکی تازەوە کە خۆشیان دواتر نەیاندەتوانی هۆکارەکەی لێک بدەنەوە، هەر وەک چۆن تۆمارکارانی هەواڵیش نەیانتوانی هەڵی سەنگێنن، هەڵیان کوتایە

سەریان و سەدانیان لەوانە لە خوێن گەوزاند کە هاونیشتمانی خۆیان بوون و زۆربەیان لە هەڵمەتی دۆزینەوەی پێرۆ و داگیرکردنی، برای خۆیان بوون. دەچوونە سەر بریندارەکانی سوپای ماگرۆ و تەواویان دەکردن، پاشان بە ئاگر و ئاسن چوونە ناو شاری کۆسکۆ، کە لەوێ بە زۆر هەڵیان دەکوتایە سەر ژنەکان، جا چ ئیسپانی بوونایە یان هندی و زنجی. دەستیان بە تالانکاری و ڕاوەڕووت و تێکدان کرد. زۆر بە دڕندەیی دۆڕاوەکانیان لە ناو برد، وەک ئەوەی کە سوپای ئینکا دەیکرد ئاوا. بەڵام ئەمە تەنیا قسەیە، چونکە ئەوانە قەت ڕێزلێنانیان نەدەزانی، ئەوەندە بەسە بڵێین کە یەکێ لە کارە باوەکانی سوپای ئینکا لە ئەشکەنجەدان ئەوە بوو: تاوانبارەکەیان لە پێیەوە هەڵدەواسی و بە ڕیخۆڵەی خۆی ملیان دەپێچا. یان لە کاتێک کە هێشتا زیندوو بوون، پێستیان لە جەستەیان دادەکەلاند و دەیانکردنە تەپڵ، بەڵام ئیسپانییەکان لەو ڕۆژە هێشتا نەگەیشتبوونە ئەو سنوورە، چونکە هەروەک یەکێ لە ڕزگاربووەکان پێی گوتم، ئەوان زۆر بەپەلە بوون. ژمارەیەکیش لە سەربازانی ماگرۆ بە دەستی هاونیشتمانەکانی خۆیان نەکوژران، بەڵکو ئەو هندییانەی لە دوای جەنگەکە لە شاخەکان هاتبوونە خوارێ و بە هاتوهاوارەوە چوونە سەریان و لە ناویان بردن، چونکە ئەوجارە قوربانییەکان لە خۆیان نەبوون. لەگەڵ ئەتککردنی جەستەی کوژراوەکان ئاهەنگیان دەگێڕا و بە بەرد و سیکارد ورد و لەت لەتیان دەکردن.

بەڵام سەبارەت بە بالدیبیا کە لە تەمەنی بیستساڵییەوە لە زۆر بەرەی جۆراوجۆر لە جەنگدا بووە، ئەمە پڕ لە شەرمەزاریترین کاری سەربازی ئەو بوو. زۆر جاران لە نێو باوەشی من بە هاوارکردنەوە بە ئاگا دەهات، ئاخر ئەو کابووسانە ئازاریان دەدا کە لە شێوەی هاورێ سەربڕاوەکانی دەهاتنە بەرچاوی، وەک چۆن لە دوای وێرانکردنی ڕۆماش ئاوای بەسەر هاتبوو: دایکان لەگەڵ کچەکانیان خۆیان دەکوشت تا نەکەونە بەردەست سەربازەکان.

***

دیێگۆ ماگرۆ بەدیل گیرا کە ئەو کاتە تەمەنی شەست و یەک ساڵ بوو. بە

هۆی نەخۆشی و هەڵمەتەکەی بۆ سەر شیلی زۆر لاواز بووبوو. لە دوای بەدیلگیرانی گەلێک سووکایەتی پێک ڕا و دەستیان کرد بە دادگاییکردنی ماوەی دوو مانگی خایاند، وەلێ هیچ بواریان پێی نەدا داکۆکی لە خۆی بکات. ئەو وەختەی کە زانی حوکمەکەی بە مردن دەرچووە، داوای کرد کە سەرکردەی مەیدانیی دژبەرەکەی، پێدرۆ دی بالدیبیا، شایەدی دوا ئارەزووی بێت؛ چونکە کەسی لەو لێهاتووتری شک نەدەبینی کە بڕوای پێ بکات. دیێگۆ سەرەڕای نەخۆشی و شەڕە زۆرەکانی، هێشتا لە دیمەندا ڕێکوپێک دیاربوو. بە سەرپێچێکی ڕەش ئەو چاوەی بەستبووەوە کە لە شەڕی دڕندەکان بەر لە دۆزینەوەی وڵاتی پێرۆ لە دەستی دابوو. هەر لەو شەڕەدا بە خۆی تیرەکەی بە چاوەکەیەوە هێنابووە دەرێ و لە شەڕەکەش بەردەوام بووبوو. تەورێکی بەردینی تیژیش سێ پەنجەی لە دەستی ڕاستی پەلدابوو، ئەو کاتە بە دەستی چەپەی شمشێرەکەی گرتبووە دەست و بەو حاڵەشەوە، بە تای چاوێک کە هەموو گیانی خوێن بوو، هەر شەڕی کردبوو تا هەندێک لە هاوڕێکانی گەیشتنە فریادی. پاشان بە ئاسنی سوورکراوە و ڕۆنی قرچاوە برینەکانیان بۆ تیمار و داخ کردبوو، کە ئەمەش بووە هۆی ناشیرینبوونی ڕووخساری، وەلێ زەردەخەنە سەرنجڕاکێشەکەی و ئاکارە نەرمونیانەکەی هەر مابوو.

ئێرناندۆ بێسارۆ فەرمانی دا و گوتی: با لە بەرچاوی هەموو ئەو خەڵکە ئەشکەنجە بدرێت! ئەوە شایەنی سزایەکی نموونەییە!.

بالدیبیا ئامۆژگاری ئێرناندۆی کرد: ئەی خاوەن شکۆ، من هاوبەشی ئەشکەنجەدانی ناکەم، چونکە سەربازەکان پێیان قبوڵ ناکرێت. شەڕی نێوان براکان زۆر دڵڕەقانە بوو، چیتر خوێ بە برینەکاندا ناکەم.

ئێرناندۆ وەڵامی دایەوە: ماگرۆ بە زینا لە دایک بووە و هەر بە کوڕی زیناش دەمرێت.

پێدرۆ دی بالدیبیا بە بیری نەهێنایەوە کە برایانی بێسارۆ ڕەچەڵەکیان لە دیێگۆ باشتر نییە. ئاخر فرانسیسکۆ بێسارۆش کوڕێکی ناشەرعییە و زانست و زانیاری فێرنەبووە و بە منداڵی دایکی بەرەڵای کردبوو. هەردووکیان

کوڕە هەژار و نەبووە بوون بەر لەوەی قەدەر ڕێگەیان بخاتە پێرۆ و لە سلێمان پاشاش دەوڵەمەندتریان بکات.

بالدیبیا پێی داگرت و گوتی: دۆن دیێگۆ ماگرۆ هەردوو نازناوی ڕابەر و حاکمی تەڵەیتەڵەی نوێی لێیە. پاشان چ پاساوێک دەخەیتە بەردەم ئیمپراتۆرەکەمان؟ ئەی خاوەن شکۆ، من دووبارەی دەکەمەوە و لەگەڵ هەموو ڕێزێکم بۆتان، وروژاندنی سەربازەکان کارێکی گونجاو نییە، چونکە ورەیان زۆر لە هەڵچووندایە. دیێگۆ ماگرۆش سەربازێکە قسەی لێ نایێ.

ئێرناندۆ بێسارۆ هاواری لێ هەستا و گوتی: ماگرۆ لە شیلی لەسەر دەستی دەستەیەک لە درندەی ڕووتوقووت بە دۆڕاوی گەڕاوەتەوە!

- نا ئەی خاوەن شکۆ، بۆ ڕزگارکردنی - مەرکیزی حاکم - ی برای جەنابتان لە شیلی گەڕایەوە.

ئێرناندۆ بێسارۆ درکی کرد کە پێدرۆ دی بالدیبیا لەسەر حەقە، وەلێ لە سروشتی ئەودا نەبوو لە قسەکانی خۆی پەشیمان بێتەوە، لە لێبووردنی دوژمنانی. بۆیە بڕیاری دا کە دیێگۆ ماگرۆی لە مەیدانی کۆسکۆ سەر ببڕن.

لە ڕۆژانی پێش لە جێبەجێکردنی حوکمی لە سێدارەدان، بالدیبیا کاتێکی زۆری بە تەنیا لەگەڵ ماگرۆ لە زیندانە وەڕسکەر و پیسەکەی بەسەربرد کە دوا شوێنی گیرسانەوەی بوو. ئەو لەبەر نەبەردییەکانی وەک سەربازێک و لەبەر ناوودەنگە جوامێرانەکەی ڕێزی لێی دەگرت، هەرچەندە زانیاریشی لەسەر هەڵە و خاڵە لاوازەکانی هەبوو. ماگرۆ لە زینداندا باسی ژیانی ئەو هەژدە مانگەی خۆی بۆ گێڕایەوە کە لە شیلی بە گەڕان و سووڕان بەسەری بردبوو و سەرنجی بالدیبیای بۆ ئەو پرۆژەی داگیرکردنە ڕاکێشا کە نەیتوانیبوو جێبەجێی بکات. باسی ئەو گەشتە ترسناکەی نێو زنجیرە چیایە بەرزەکانی بۆ گێڕایەوە کە چۆن لەوێ هەڵۆی کوندۆر بە بازنەی نەوی بەسەریاندا سووڕایەوە و چاوەدێرییان کردوون بەڵکە ئەگەر داهێزرێن و پەکیان بکەوێ، بکەونە سەریان و ئێسقانەکانیان لە گۆشت پاک بکەنەوە. هەر

تەنیا سەرماوسۆڵ زیاتر لە دوو هەزار هندی لێ کوشتبوون کە یارمەتی ئەوانیان دەدا. ئەو هندییانە پێیان دەگوتن - یانۆکۆنا بانگکراوەکان -. هەروەها دوو سەد زنجی و نێزیکەی پەنجا ئیسپانی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ئەسپ و سەگ لەو شوێنە لە سەرمان ڕەقبووبوونەوە. لەوێ تەنانەت ئەسپێش نەبوو، مێشوولەش وەک دەنکە تۆو لە جلەکانیان بەردەبوونەوە. جگە لە قەوزەی بەرد، هیچ ڕووەکێک لەوێ شین نابێت و تەنیا بەرد و با و بەفر و تەنیایی لێیە.

- ئەی دۆن پێدرۆ، سەرسووڕمانەکە ئەوەندە گەورەبوو بە جۆرێک گۆشتی ئاژەڵە بەستڵەکەکانمان بە خاوی دەجوی و میزی هێسترمان دەخواردەوە. بە ڕۆژ ناچار دەبووین تان لە خۆمان بدەین بەڵکە بڕۆین نەوەک بەفر دامان پۆشێ و ترسیش پەکمان بخات. بە شەویش ئاژەڵەکامان لە باوەش دەکرد و دەنووستین. کە سبەینەش دادەهات هندییە مردووەکانمان دەژمارد و لەسەر ڕۆحی ئەوان ئەو ڕستەیەمان دەگوتەوە: «باوکمان ئەوەی لە ئاسماندایە»، چونکە کاتمان نەبوو زێتر بڵێین. جەستەکان چۆن لە شوێنی خۆیان ڕەق دەبوونەوە هەر ئاوا دەمانەوە، وەک چەند نیشانەیەکی بەردی بەستوو دەبوونە ڕێ نیشاندەری گەشتیارە سەرگەردانەکانی ئایندە.

هەروەها گوتی کە زرێی قشتاڵییەکان دەیبەست و گوشاری دەخستە سەر جەستەیان، وەختێکیش کە پێڵاو یان پەنجەکێشەکانیان دادەکەنی پەنجەیان بەبێ ئازار لەگەڵی لێ دەبووەوە. ڕوونیشی کردەوە کە نەدەبوو هیچ بێ عەقڵێک بیر لە گەڕانەوە بە هەمان ڕێگەدا بکردایەوە، لەبەرئەوە بە باشی زانی لە گەڕانەوەیدا ڕێی بیابان بگرێتەبەر؛ خەیاڵیشی بۆ ئەوە نەدەچوو کە ئەو گەشتەشی پڕ لە مەترسی دەبێت. بالدیبیاش لەگەڵ ئەو قسانەی ئەو بیری کردەوە: ئای لەو ماندووبوون و چەرمەسەرییانەی کە ئەرکی داگیرکاری لە مەسیحییەک دەیخوازێ!

ماگرۆ لە گێڕانەوەکەی بەردەوام بوو: گەرمی بیابان لە قرچەی ڕۆژدا بە کوورەی ئاگر دەچێت و تیشکی بەهێز و چڕی خۆر پیاو و ئەسپەکانیش

تووشی شێتبوون دەکات و وایان لێ دەکات تارماییی درەخت و گۆمە ئاوی شیرین ببینن. هەرکە خۆریش ئاوابوو لە هیکرا پلەی گەرمی دادەبەزێ و "کامانچاکا" دروست دەبێت. کامانچاکا خوناوێکە ساردییەکەی لە هی ئەو بەفرانە کەمتر نەبوو کە لەسەر لووتکەی زنجیرە شاخەکان ئازاری دەداین. ئێمە ئاوێکی زۆرمان لە بەرمیل و جەوەندەی لە پێست دروستکراو لەگەڵ خۆ هەڵگرتبوو، وەلێ زۆری نەبرد ئاومان پێ نەما. تینوێتی ژمارەیەکی زۆری لە هندییەکان کوشت و ئیسپانییەکانیشی کەساس کردبوو.

بالدیبیا لەسەر قسەکانی ئەو گوتی: ئەی دیێگۆ، ئەوە ڕاست وەک ئەو گەشتە وایە بەرەو دۆزەخ بیکەیت.

– دەقاودەق وایە ئەی دۆن پێدرۆ، وەلێ بۆتی دووبارە دەکەمەوە کە من جارێکی تریش ئەگەر ژیان بوارم پێ بدات هەوڵ دەدەم بەرەو ئەوێ بچمەوە.

– باشە کە کۆسپ و تەگەرەی مەترسیدار ئەوەندە زۆرن و پاداشتەکەشی شتێکی وا نییە بۆ دەچیتەوە؟

– چونکە وەختێ کە لە زنجیرە چیاکان و بیابانەکان قووتاربووی کە شیلی لە زەوییەکانی تر دادەبڕن، یەکسەر زورگە نەرمانەکان و دارستانە بۆنخۆش و دۆڵە بە پیتەکان و ڕووبارە بە ئاوەکان و کەشوهەوایەکی ئەوەندە سازگار دەبینی کە لە ئیسپانیا و شوێنەکانی تر نموونەی نییە. کاک پێدرۆ، شیلی بەهەشتی سەر دنیایە، ئێمە لەسەرمان پێویستە لەوێ شارەکانمان دروست بکەین و پێشکەوین.

بالدیبیا لێی پرسی: ئەدی لە بارەی هندییەکانی ئەوێ چی دەڵێی؟

– لە سەرەتا خەڵکانێکی ڕووخۆشمان بینی، پێیان دەگوتن – برۆماوکا – کە ئەوانیش ڕەگەزێکن لە مابۆچی دەچن، بەڵام لە خێڵی ترن. وەلێ دواتر بە ڕووماندا هەڵگەڕانەوە. ئەوانە لەگەڵ هندییەکانی پێرۆ و ئەکوادۆر تێکەڵن کە ئەوانیش هەر لە قەڵەمڕەوی ئیمپڕاتۆریەتی ئینکان کە دەسەڵاتی تەنیا هەتا سەر کەنارەکانی ڕووباری پیۆ - پیۆ فرەوان کردووە. ئێمە لەگەڵ هەندێ لە

کۆراکا یاخۆ سەرکردە خۆجێییەکانی ئینکا لەوێ تێککەیشتنمان هەبوو، بەڵام نەمانتوانی بەرەو خواروو ڕێ بکەین، چونکە مابۆچییەکانی ئەوێ لە شەڕکردن زۆر ئەزموونداڕن. ئاخر پێدرۆی بەڕێز، چۆن پێتان بڵێم کە من قەت لە هیچ هەڵمەتێک و شەڕێکی ترسبارمدا، دوژمنی لەو دڕندانە، ئازاتر و بە هەیبەتترم نەبینیوە کە چەکی دەستیان تەنیا دار و بەرد بوو.

– مادام توانیویانە نەیەڵن بەرەو خواروو پێشڕەوی بکەن، دیارە کە زۆر ئازا و نەبەردن، چجای ئەوەی لە بەرامبەر ناودارێکی وەک ئێوە...

– مابۆچییەکان جگە لە شەڕ و سەربەستی، شتێکی تر نازانن. ئەوان پاشایان نییە هەموان لە یەک پایەدانە و تەنیا لە کاتی جەنگ ملکەچی گەورەکانیان دەبن. سەربەستی، سەربەستی، تەنیا هەر سەربەستی. ئەوە گرینگترین شتە لە دیدی ئەوان، بۆیە نەمانتوانی دەستەمۆیان بکەین و بیانخەینە ژێر دەستمان، هەر وەک چۆن پێشتریش ئینکاش نەیتوانیبوو. لە ناویاندا ژنان هەموو کارێک دەکەن، پیاویشیان هیچ شتێک ناکەن تەنیا ئامادەی جەنگن.

لە سبەینەی ڕۆژێکی پایزی ١٥٣٨ حوکمی لە سێدارەدان بە سەر دیێگۆ ماگرۆ جێبەجێ کرا. بێسارۆ لە دواچرکەدا حوکمەکەی گۆڕی، چونکە دەترسا ئەگەر لە بەرچاوی خەڵک سەری ببڕن لەلایەن سەربازەکانەوە کاردانەوەیەکی خراپی هەبێت. ئەوەبوو جەللادەکە لە زیندانەکەی خۆی بە پەتێک لە سەرەخۆ خنکاندیان و پاشان لاشەکەیان بردە گۆڕەپانی کۆسکۆ و لەوێ سەریان لە جەستەکەی کردەوە، وەلێ نەوێران بە قولابی سێدارەکەوە نیشانی بدەن، وەک چۆن بڕیاربوو. لەو کاتەدا ئێرناندۆ بێسارۆ تێبینی گەورەیی کارەکەی خۆی کرد و بیری لە کاردانەوەی ئیمپراتۆر کارلۆسی پێنجەم کردەوە، بۆیە بڕیاری دا بە شکۆداری تەرمەکەی بنێژن و هەر خۆی بە جلی تازیەبارییەوە سەرۆکایەتی کاروباری بەڕێکردن و شاردنەوەکەی کرد. لە دوای چەند ساڵێک برایانی بێسارۆ باجی تاوانەکەیان دا، وەلێ ئەوە چیرۆکێکی ترە.

***

ناچارم لە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانە درێژدادڕی بکەم، چونکە پێداگریی پێدرۆ لە دوورکەوتنەوەی لە وڵاتی پێرۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئەو وەختە تەڵەکەبازی و گەندەڵی پارچە پارچەی کردبوو. هەروەها ئەو هۆکارەکانەش دیار دەخات کە وایان لە پێدرۆ کرد ڕوو لە شیلی بکات، ئەو خاکەی هێشتا بێگوناحی و پاکی تێدا سەقامگیرە. ئەمە ئەو ئەرکە گرینگە بوو کە من لەگەڵ ئەودا پێکەوە خستمانە ئەستۆی خۆمان.

جەنگەکەی لاس سالیناس و مردنی دیێگۆ ماگرۆ چەند مانگێک پێش گەشتەکەی من بۆ کۆسکۆ ڕوویان دابوو. من ئەو وەختە لە چاوەڕێی هەواڵی مێردەکەم لە پەنەما بووم - ئاخر چەند کەسێک پێیان گوتبووم کە خوان دی مەلەگەیان بینیوە -. ئەوانەی دەچوونەوە ئیسپانیا و ئەوانەیش کە لەوێوە دەهاتن لە بەندەرەکەی ئەو شارەدا بەیەک دەگەیشتن. گەشتیارێکی زۆر بەوێدا تێ دەپەڕین: - سەربازەکان، فەرمانبەرانی تاج، هەواڵدەرەکان، قەشەکان، زاناکان، جەربەزەکانی دۆزینەوەی خاکی تازە و کۆکردنەوەی سامان، ڕێگرەکان - ئەوانە گشتیان لە گەرمای ترۆپیکاڵی لە سەفەردابوون. من بۆ هەرچوارلا نامەم لەگەڵ ڕەوان دەکردن، وەلێ هەر ڕۆژان بەسەردەچوون و وەڵامێکم لە مێردەکەمەوە پێ نەگەیشت. هەر لەو کاتەدا بژێوی خۆم لەو پیشانە پەیدا دەکرد کە دەمزانین: بەرگدروو، چێشتلێنان، ئێسقان گرتنەوە و چارەسەرکردنی برینداران، بەڵام نەمدەتوانی هیچ شتێک بۆ ئەو کەسانە بکەم کە تووشی نەخۆشی تاعون و گرانەتا و خوێنمەیین و پەتای فەڕەنسی و پێوەدانی زیندەوەرە ژەهراوییەکان دەبوون کە لەوێ زۆرن و چارەسەریان نییە. هەروها من وەک دایک و داپیرەم تەندروستیم وەک داری بەڕوو باش بوو، ئەمەش یارمەتی دەدام کە لە ناوچە ترۆپیکاڵەکان بتوانم بژیم بێ ئەوەی تووشی نەخۆشی ببم. توانیم بە زیندوێتی بمێنمەوە و هیچ کێشەیەکی تەندروستیشم نەبێت، جا چ لە بیابانە سووتێنەرەکان بێت، یاخۆ لە نێو لافاوەکانی زستانان کە نەخۆشی پەسیو بتەوترین پیاوی دەکوشت، یان لە کاتی بڵاوبوونەوەی کۆلێرا و خوریکە دەبووایە چاوەدێری تووشبووانی ئەو

نەخۆشییانە بکەم و قوربانییەکان بشارمەوە.

ڕۆژێکیان لە کاتێک کە لەگەڵ دەریاوانێکی یەکێ لە کەشتییە چارۆگدارەکان کە لە بەندەرەکە لەنگەری گرتبوو، گفتوگۆمان دەکرد، زانیم کە خوان ماوەیەکی زۆرە چووەتەوە پێرۆ، وەک چۆن خەڵکانی تریش کە گوێبیستی ئەو سەروەت و سامانە بووبوون کە دیێگۆ و بێسارۆ دەستیان کەوتبوو، یەکسەر ڕوویان لەوێ کردبوو. پێداویستییەکانم کۆکردەوە و چی پارە و پوولم هەبوو هێنامە دەر و لەگەڵ کۆمەڵێک قەشەی دۆمەنیکانی بەرەو خواروو بە دەریادا ڕۆیشتم، چونکە نەمتوانی مۆڵەت وەرگرم کە بە تەنیا ئەو گەشتە بکەم. وا بزانم ئەو قەشانە لە دیوانی دادگاکانی پشکنینەوە هاتبوون. وەلێ قەت پرسیاری ئەوەم لێ نەدەکردن، چونکە ئەو کاتە تەنیا بە ناوهێنانی دادگاکانی پشکنین ترسم لێ دەنیشت و ئێستاش هەر لێیان دەترسم. ئاخر قەت ئەوەم لە بیر ناچێت کە تازە تەمەنم هەشت نۆ ساڵان بوو دیتم بە زیندوێتی ئاگریان لەوانە بەردەدا کە شتی تازەیان لە ئاینی مەسیحی داهێنابوو لە بلاسینشیا. ئەو جلانەم پۆشی کە دیمەنی ژنێکی حەسرەتبار نیشان دەدەن بۆ ئەوەی یارمەتیم بدەن تا بگەمە پێرۆ. قەشەکان کە منیان بەو شێوەیە دیت سەرسام بوون کە بۆ مێردەکەم ئاوا وەفادارم بە ڕادەیەک ئامادەبوون بە هەموو دنیادا بمگێڕن تا مێردەکەم بدۆزمەوە کە نەشمدەزانی لە کامە شوێن دەژی. ڕاستییەکەی گەڕانی من لەبەر وەفاداری نەبوو، بەڵکو ئارەزووم دەکرد لەو بارە گوماناوییە دەربچم کە خوان بۆی جێ هێشتبووم. من چەند ساڵێکی درێژبوو ئەوم خۆش نەدەویست و وام لێ هاتبوو ڕوخساریم بەبیر نەدەهاتەوە و دەترسام وەختێ تووشی دەبم نەیناسمەوە. جگە لەوەش نەمدەویست لە پەنەما بمینێمەوە و بکەومە بەر ئارەزوو و هەوەسی ئەو سەربازانەی بەوێدا ڕادەبرن، گەرەکیشم بوو لە ئاو و هەوا شێدارەکەی خۆم بپارێزم.

ئەو گەشتەمان لەسەر کەشتییەکدا کە بە کەیفی بایەکە لە ناو دەریا جۆلانەی دەرکرد، نێزیکەی شەش حەفتەی خایاند. لەو ماوەیەدا دەیان

کـەشـتـی ئیـسـپـانی ڕیگەی دەریایی بۆ پێـرۆ لـە چوون و هاتندا بوون، بەڵام بەڵگەنامــەکــانی ڕێگەی دەریایی تـەواو نەکــرابوون، بۆیـە دەبووایە کــاپتنی کەشتییەکان تێبینییەکانی خۆیان لەسەر ڕەنگی ئاو و هەور هەتا بچووکترین ڕووداوی کەنارەکان تۆمار بکەن کە دەیان بینن. ئیتر ئەو زانیارییانە دەبوونە بەڵگەنامەیەک تا کـەشـتـیـارەکانی تر سـوودی لێ وەرگـرن. لە بەخـتی ئێمـە وەخـتـێ بەڕێکەوتـین دەریا شـەپۆلاوی و تەمـاوی بوو و ڕەشــەبا هەڵی کـرد و دەریاوانەکــانیش شــەڕ و قـڕەیان بوو، چەندان گـرفـتـی تریش هـەبوون کـە پێویست ناکات بیانڵێم و درێژەی بدەمێ. ئەوەندە بەسە بڵێم کە دەریاوانەکان هەمــوو سـبــەینەیەک نوێژیـان دادەبەسـتــا و ئێـمـەشـیــان ناچار دەکـرد بۆ ئارمکردنەوەی دەریا و مـەیلی پیاوەکـان بۆ شـەڕ و دەمەقاڵی، هەمـوو ئێـواران سـەلەوات لێ بدەین. گەشتیـارەکان هەمـوویان پیاوی مەترسیـدار دیاربوون و ڕۆیشـتـنیش لە ژێر ڕەحـمــەتی ئەو ئاوە بەرفـرەوانە و لە نـاو کـەشـتـیـیـەکی داڕزاودا دەیانترسـاندم کە دوور لە بەدەنگەوەهاتنی مرۆڤـەکان بە گژ خـوا و سـروشـتدا دەچووەوە. گەمارۆدانی خۆم لەلایەن هندییە دڕندەکان پێ بـاشـتـر بوو کـە زۆر جاران بەسـەرم دەهات، لەوەی جـارێکی تر سـواری کـەشـتی بم، بۆیە هەرگیز بیرم لە گەڕانەوە بۆ ئیسپانیا نەدەکردەوە، هەتا لەو کاتانەش کە خەڵکە ڕەسەنەکەی ئەوێ ناچاریان کردین شـارەکان چۆڵ بکەیـن و وەک جرج ڕاکـەین. ئاخـر من هـەمـیـشــە دەمـزانـی کـە ئێـسـقــانم لە وڵاتی هـندییــان دەشاردرێتەوە.

لە پانـتـایـیـی دەریا دیسـان کەوتمـەوە نێو گـەمـارۆی پیـاوەکـان، هـەرچەندە قـەشـەکان هەمیشـە چاوەدێرییان دەکردم. هەستم دەکرد وەک ڕەوە سەگێکی هار بە دوامدا دەگەڕێن و مرخم لێ خۆش دەکەن. ئایا دەبێ بۆنی مێیینەیەکی هەوەسبـازم لێ بێت؟ لە شوێنەکەی خۆم بە ئاوی دەریا دەشـۆری و لەو حەزەی ناخیـشـم دەترســام کـە نەمـدەویـست بە دویدا بچم، چونکە لەوانەبـوو بەرۆکم بگرێتـەوە. خـەونم بە گـورگی برسـیـیـەوە دەبینی کـە زمـانیـان دەرێنابوو و کەڵبـەکانیشیـان خوێنی لێ دەچۆڕا و ئامادەسـازبوون پێکڕا بە یەکەوە لە ناوم

ببەن. ئەو گورگانە هەندێ جار ڕووخسارییان لە هی سبستیان ڕۆمێرۆ دەچوو. شەوانم بە بێداری بەڕێ دەکرد و خۆم لە شوێنەکەم مات دەکرد و خەریکی داو و دوورمان و نوێژکردن دەبووم. لە ترسی ئامادەیی بەردەوامی پیاوەکان لە تاریکیدا، نەدەوێرام بێمە دەرێ و لەبەر هەوای شەوانە نەختێک دەمارگرژییەکەم خاوکەمەوە. ڕاستە من لەو هەڕەشانە دەترسام، وەلێ دڵیشم بۆی دەچوو و شەیدای دەکردم. ئاخر ئارەزووەکانم بۆشاییەکی سامناک بوون لە ژێر پێمدا دەکرانەوە و هانیان دەدام بازبدەمە ناوی و لە قووڵاییەکانیدا خۆم ون بکەم. دەمزانی بەزمی ئالوودەبوون و ئازارەکانی چییە، چونکە لە ساڵانی یەکەممان لەگەڵ خوان دی مەلەگە تێیدا ژیابووم. مێردەکەم زۆر کەموکووڕی هەبوو، وەلێ دەتوانم بڵێم ئەویندارێکی چێژبەخش بوو و قەت لە زەوق نەدەکەوت. هەر لەبەر ئەوەشبوو جار دوا جار لە کەموکووڕییەکانیم دەبووری. ئەو کاتەی کە هیچ ڕێز و خۆشەویستیشم بۆی نەدەما، هەر ئارەزووی ئەوم دەکرد. جا بۆ ئەوەی خۆم لە کەشە تەفرەدەرەکانی خۆشەویستی بپارێزم، هەر خۆم بە خۆمم دەگوت کەسێکی ترم دەستناکەوێ بتوانێ وەک خوان چێژم بداتێ. من دەمزانی کە دەبێ خۆم لەو نەخۆشییانە بپارێزم کە پیاوەکان هەڵیان گرتووە و ئاسەوارەکانیشیم بینیبوو؛ هەرچەندە من تەندروستیم باشە و هیچ بەڵایەکم نییە، وەلێ بە قەد لە شەیتان ترسانم لەو نەخۆشییانە تۆقیبووم، ئاخر تەنیا بەرکەوتنێکی جەستە بەسبوو بۆ ئەوەی درمە فەرەنسییەکە میکرۆبەکەیت تووشت بکات. جگە لەوەش، ڕەنگە منداڵم بەزگ بکەوێ، چونکە ئیسفەنجی بەخەل تەڕکراو بۆ خۆپاراستن ڕێگەیەکی لە سەدا سەد دڵنیاکەر نییە بۆ ئەوەی منداڵت بەزگ نەکەوێ. من زۆر لە ژنە پاکیزەی گەورەمان پاڕایمەوە تا کوڕێکم بەزگ بخات و لەوانە لە وەختێکی نالەبار ئەو خێرەم پێ بکات، چونکە موعجیزەکان هەمیشە لە کاتی خۆیان نایەن.

ئەو هۆکارە پزیشکییانە چەند ساڵێک لە بەپاکی مانەوەم لە کاتی بێچارەییدا، سوودم لێیان وەرگرتووە، کە دڵم فێر بووبوو تێیدا بە کپی بژیت،

وەلێ جەستەم لە داواکردنی نەدەکەوت. هەوای جیهانی تازە، گەرم و هەست وروژێنەرە و هەموو شتێکی تێدا زەقتر دیارە: ڕەنگەکان، بۆنەکان، تامەکان، هەتا گوڵیش بە بۆنە کاریگەرەکەی و بەرە گەرم و لینجەکەی، هەموو شتێک لێرە بۆ هەوەسبازی دەتورووژێن. لە کارتاخینا و پاشانیش لە پەنەما، گومانم لەو بیروباوەڕانە بۆ پەیدابوو کە کۆڵەگەی ژیانی من بوون لە ئیسپانیا. ئەوا گەنجیم بەسەردەچێ و ژیانم لە تەواوبوون دایە... کێیە ئەو کەسەی کارە چاکەکانی منی بە لاوە گرینگە؟ کێیە ئەو کەسەی دواتر لێپێچانەوەم لەگەڵ دەکات؟ هەروەها گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە دەبێ خواش لە وڵاتی هند بەخشندەتر بێت وەک لە ئیسترێمادۆرا. ئەگەر لەو خراپەکارییانە دەبوورێت کە بە ناوی ئەوەوە لە دژی هەزاران خەڵکی ڕەسەنی ئێرە دەکرێت، ئەوا پێویستە لەگەڵ بێهێزیی ژنێکی نائۆمێدیش بەخشندە بێت.

***

کاتێ بە ساغی و سەلامەتی گەیشتینە بەندەری کاییاو هەستم بە خۆشییەکی بێپایان کرد، و چیوای نەمابوو ببوورێمەوە، وەلێ توانیم لە کەشتییەکە دابەزم. هیچ شتێک لەوە ناخۆشتر نییە کە لە ناو کەشتییەکی نێو پانتاییی ئاوی ڕەش و فرەوانی ئۆقیانووسێکی بێکۆتایی بەند بکرێی. لەو ساڵانەدا وشەی بەندەر بۆ کاییاو مایەی ئومێدبوو، ئێستاش دەڵێن گرنکترین بەندەرە لە سەر ئۆقیانووسی ئارام و هەر لەوێوە ئەو گەنجینانە بۆ ئیسپانیا دەڕوات کە لە نرخ نایەن، وەلێ ئەو کاتە تەنیا لەنگەرێکی بێبایەخ بوو. لە کاییاوەوە لەگەڵ قەشەکان چوومە شاری پاشاکان کە ئەوڕۆکە ناوی بۆ لیما گۆڕاوە و ناوێکی زۆر خۆش نییە. من هەر بە ناوەکەی یەکەم ناوی دێنم. ئەو شارەی کە فرانسیسکۆ بێسارۆ بە پەلە دروستی کرد، بەردەوام لە بەرچاوم تەماوییە؛ وەختێکیش کە تیشکی خۆر بە نێو هەوای شێداردا تێ دەپەڕێت دیمەنێکی جاویدانی پێ دەبەخشێت، وەک تابلۆ تەماوییەکانی دانیێل بلالکاسار. لەوێ بە گەلێک بە دوای مێردەکەمدا گەڕام، پاش چەند ڕۆژێکی کەم سەربازێکم دۆزییەوە کە خوان دی مەلەگەی دەناسی. پێی گوتم: خانمی

بەڕێز، زۆر درەنگ گەیشتییە جێ، مێردەکەت لە شەڕی لاس سالیناس کوژراوە.

منیش بۆیم ڕوون کردەوە: خۆ خوان سەرباز نەبوو.

– لێرە هیچ پیشەی تر نییە، هەتا قەشەکان خۆشیان شمشێر هەڵدەکێشن.

ئەو سەربازە قامەتێکی نارێک و ریشێکی گڤی درێژی هەبوو دەگەیشتە ناوەڕاستی سینگی، جلەکانی دڕاو و چڵکن بوون، ددانی لە دەمدا نەمابوو و هەڵسوکەوتەکانیشی سەرخۆشانە بوو. سوێندی خوارد کە برادەری مێردەکەم بووە، وەلێ بڕوام پێی نەکرد، چونکە یەکەم جار گوتی خوان سەربازی پیادە بوو، لە یاری قومارردا بە بن قەرز کەوتبوو. بەهۆی ڕاهاتنیشی لە سەر ژن و بادە لەڕولاواز بووبوو. پاشان لە پەنای ریش و عەباکەی دەستی بە چەنەبازی کرد بەڵکە ترس بمگرێت، ئیتر خۆی هاوێشتە سەرم و ویستی لە باوەشم بکات. کاتێک کە بەرپەچیم دایەوە داوای لێ کردم لە بەرامبەر هەندێ پارەی زێڕ خۆمی بخەمە خزمەت.

لەبەرئەوەی من لە دوورەوە گەیشتبوومەجێ – لە ئیستیمادۆراوە بۆ مەملەکەتی ئەتاوالبای کۆن – بڕیارم دا کە پێم دەکرێ دوا هەوڵی خۆم بدەم. خۆم بەگەڵ کاروانێک دا کە خۆراک و مێگەلێک مالاتی لاما و ئەلبەکەی بۆ کۆسکۆ دەگواستەوە. کۆمەڵێک سەرباز بە سەرکردایەتی کەسێک پاسەوانی دەکردین کە ناوی ئەفسەر نۆنێس بوو. گەنجێکی جوان و ڕەبەن بوو. ئەو کوڕە بەخۆی دەنازی و وادیاربوو بە تێرکردنی ئارەزووەکانی ڕاهاتبوو. کاروانەکە سەرەڕای سەربازەکان، دوو قەشە و دادنووسێک و وردبینێکی ژمێریاری و پزیشکێکی ئەڵمانی لەگەڵدابوو. هەموویان سواری ئەسپ و هێستر بووبوون یاخۆ بە تەختەڕەو بە سەر شانی هندییەکانەوە سەفەریان دەکرد. من تاکە ژنێکی ئیسپانیایی بووم لەگەڵیان، بەلام هەندێ ژنە هندی کیچوا بە منداڵەکانیانەوە لەگەڵ ڕەتڵی حەماڵەکان بوون و خواردنیان بۆ مێردەکانیان هەڵگرتبوو. پۆشاکیان لە خوری ڕەنگاوڕەنگ دروست کرابوو و

دیمەنێکی جوانی پێ دەبەخشین، وەلێ لە ڕاستیدا ڕووخساریان گرژ و ڕقاوی بوو وەک هەموو ئەوانەی بە هێز ناچاری ملکەچی دەکرێن ئاوا. ئەو ژنانە بالآیان کورت بوو و کولْمەیان بەرز و چاویان بچووک و گۆشەدرێژ بوو و ددانیان بە هۆی گەلآی کۆکاوە ڕەش بووبوو چونکێ دەیانجوی تا هێزی دانبەخۆداگرتنیان بێتەبەر. منداڵەکان جوان و ژیکەڵە دیاربوون و هەندێکیش لە ژنەکان سەرنجڕاکێش بوون، هەرچەندە قەت پێ نەدەکەنین. بۆ ماوەی چەند فەرسەخێک لەگەڵمان بوون، تا نۆنێس فەرمانی پێدان بگەڕێنەوە ماڵەکانیان؛ ئەو وەختە یەک بە دوای یەک دەستی منداڵەکانیان دەگرت و دەڕۆیشتن. ئەو پیاوانەی بارگەیان هەڵگرتبوو زۆر بەهێزبوون. هەرچەندە پێخواس بوون و وەک مالآت باریان گران بوو، وەلێ لەگەڵ ئەوەی ئێمە بە سەر پشتی ولآخەکانیشەوە بووین، هەر ئەوان زێتر بەرگەی نالەبارییەکانی ئاووهەوا و ماندوێتیی سەفەرەکەیان دەگرت. ئەوان توانایان هەبوو چەندان سەعات لە ڕێدا بن و ڕێتمی ڕۆیشتنەکەشیان قەت تێک نەچێت. کڕ و بێدەنگ، خەیاڵ بلآو، دەتگوت لە خەوێدا دەڕۆن. بە زمانێکی قشتاڵی سادە و ئاوازدار و بە نبرەی پرسیار قسەیان دەکرد. جگە لە دوو سەگەکەی ئەفسەر نۆنێسی هەڵگری ئالآ، هیچ شتێک نەیدەورووژاندن، ئاخر سەگەکان لەسەر پیاوکوشتن ڕاهێنرابوون.

نۆنێس هەر لە یەکەم ڕۆژەوە لە دەورم دەگەڕا و بە درێژاییی گەشتەکە نەیهێشت ئیستراحەت بکەم. بە وریایی هەوڵم دا لە شوێنی خۆی بیوەستێنم و بە بیریم دەهێنایەوە کە من ژنێکی بە ماڵ و مێردم، چونکە دوژمنایەتیکردنی ئەو بۆ من باش نەبوو؛ وەلێ لەگەڵ پێشڕەوی کاروانەکە لەسەر ڕەفتارە ناشیرینەکانی بەردەوام بوو. ئەو شانازی بەخۆوە دەکرد گوایە لە خانەدانەکانە، بەلآم من بە هۆی هەڵسوکەوتەکانی پێیم بڕوا نەدەکرد. سەروەتێکی چاکی کۆ کردبووەوە و سی دۆستی ئەویندارى لە ژنە هندییەکان هەبوو کە بە درێژاییی ڕێگەی نێوان شاری پاشایان و کوسکۆ دابەشی کردبوون و وای باس دەکردن کە گشتیان سەرچاوەی چێژن بۆ ئەم. ئەو کارە

لە گوندەکەی خۆی لە ئیسپانیا مایەی شورەیی و شەرمەزاری بوو، وەلێ لە جیهانی تازە شتێکی سروشتی بوو، ئاخر پیاوە ئیسپانییەکان ژنە هندی و زنجییەکانیان بە کەیفی خۆیان دەبرد. زۆربەی ئەو ژنانەش لە دوای زۆرلێکردنیان بەرەلایان دەکردن و هەندێکیشیان هەر لە خزمەتی خۆیان دەهێشتنەوە. بە دەگمەن نەبێت بایەخیان بەو مندالانە نەدەدا کە لەو ژنانە دەکەوتنەوە، ئیتر بەو چەشنە ئەو زەوییانەیان پڕ دەکرد لە مندالّی دوورەگەزی قینهەلگر. نۆنێس پێشنیازی بۆ کردم کە ئامادەیە دەست لە هەموو دۆستەکانی هەلّگرێت ئەگەر من قبولّی بکەم، هیچ گومانیشی نەبوو لەوەی هەروەختێ لە مردنی مێردەکەم دلّنیا بووم، پێی ڕازی دەبم، کە بەڕای ئەو مردنەکەی مسۆگەربوو. ئەو ئەفسەرە ئالاهەلّگر و لەخۆڕازییە تا ڕادەیەکی زۆر کەموکوڕییەکانی بە هی خوان دی مەلەگە دەچوون و تاکە خەسلّەتێکی جوامێرانەی پێوە دیار نەبوو تا وام لێ بکات خۆشم بوێت، منیش لەوانە نەبووم دوو جار ساتمە لە یەک بەرد بکەم.

لەو ماوەیەدا، ژمارەی ئەو ژنە ئیسپانیانەی لە پێرۆ بوون لە ژمارەی پەنجەکانی دەست تێپەڕی نەدەکرد، نەشمزانیوە یەکێکیان وەک من بە تەنیا هاتبێتە ئەوێ. ئەو ژنانە گشتیان هاوسەر و کچی سەربازەکان بوون کە لە سەر فەرمانی تاج، بە مەبەستی یەکگرتنەوەی خێزانەکان و دروستکردنی کۆمەلّگەیەکی شەرعی و ڕێزدار، بۆ ولاتە داگیرکراوەکان ڕەوان کرابوون. ئەو ژنانە لە پشت دەرگەی مالّەکانیان بە تەنیایی و بە بێزاری ژیانیان بەڕێ دەکرد، هەرچەندە دەولّەمەند و خۆشگوزەران بوون و دەیان ژنە هندییان لە بەردەستدابوو کە خزمەتی خۆیانی پێ بکەن. هەر لەو بارەیەوە پێیان گوتم کە ژنە ئیسپانییەکان لە پێرۆ بە دەستی خۆیان پاشەلّی خۆیان پاک ناکەنەوە، بەلّکو کارەکەرەکان ئەو ئەرکە دەگرنە ئەستۆی خۆیان. جا لەبەرئەوەی پیاوەکانی کاروانەکەمان لەوە ڕانەهاتبوون کە ژنێکی ئیسپانی بێ خاوەن ببینن، هەولّیان دەدا کە بە ڕێزێکی زۆرەوە ڕەفتارم لەگەلّ بکەن، وەک ئەوەی من کەسێکی خانەدان بم و لە نەوەیەکی ناودارەوە بم، نەک بەرگدروویەکی

نەدار. لەو گەشتە درێژ و لەسەرەخۆیە بۆ کۆسکۆ، هەموو پێویستییەکیان بۆم فەراهەم دەکرد و خواردنی خۆیان لەگەڵ بەش دەکردم، چادر و وڵاخی سواربوونیان لەگەڵ دەگۆڕیمەوە و پێڵاو و بەتانییان پێشکێش دەکردم کە لە لوای فیکۆنیا دروستکرابوون و باشترین چنراوی جیهان بوو. لە بەرامبەر ئەو هەموو چاکەیەدا هیچیان لێ داوا نەدەکردم تەنیا گەرەکیان بوو لە کاتی ئێواران کە هەوارگیر دەبینەوە و سۆزیان هەڵدەستێ، هەندێک گۆرانییان بۆ بڵێم و باسی ئیسپانیایان بۆ بکەم. بە هۆی ئەو یارمەتییانەی ئەوان توانیم کاروباری خۆم ڕێک بخەم، چونکە هەموو شتێک لەوێ دەیان قات لە هی ئیسپانیا گرانتربوون. هەر زوو تاکە "مەرابتی"یەکم پێ نەما و بێ پارە مامەوە. لە پێرۆ زێڕ ئەوەندە زۆر بوو خەڵک گاڵتەی بە زیو دەکرد. وەلێ دەگمەنبوونی هەندێ کەرەسەی بنچینەیی وەک ناڵی ئەسپ و مەرەکەبی نووسین نرخیان یەکجار زۆر بەرز بووبووەوە. ددانێکی کلۆرم بۆ گەشتیارێک دەرهێنا - کە ئەوە کارێکی خێرا و ئاسانە -، لە بەرامبەر ئەوە ملوانکەیەکی زەمرووودی دامێ کە هەر بۆ مەتران باش بوو، ئەوڕۆکە تاجی پەیکەری گەورەژنی پاکیزەمانی ڕازاندووەتەوە، چونکە بەردی گرانبەها لە شیلی نییە.

لە دوای چەند ڕۆژ ڕۆیشتن بە ڕێگاکانی وڵاتی ئینکا بە نێو پێدەشت و شاخە وشکەکان، بە پەڕینەوە لەو خەرەند و هەڵدێرانەی کە دەڕواننە سەر بنی دۆڵە قووڵەکان بەهۆی ئەو پردانەی کە بە پەتی لە ڕووەک دروستکراو هەڵواسرابوون و پەڕینەوە لە ئاوی چۆم و زۆنگاوە سوێرەکان و هەوراز و نشێوبوونەوە گەیشتینە کۆتاییی گەشتەکەمان، ئەو کاتە ئەفسەر نۆنێس هەر لە سەر پشتی ئەسپەکەیەوە بە ڕمەکەی هێمای بۆ شاری کۆسکۆ کرد.

***

لە ژیانمدا قەت شتێکم بە قەد مەزنی شاری کۆسکۆ نەدیوە، ناوکی ئیمپراتۆریەتی ئینکا و ئەو شوێنە پیرۆزەیە کە لەوێوە مرۆڤەکان لەگەڵ خوا دەدوێن. ڕەنگە مەدرید یان ڕۆما یان هەندێ لە شارەکانی ئیسلام کە بە جوانیی ناویان دەرکردووە، شایەنی ئەوەبن لەگەڵ شاری کۆسکۆ بەراوورد

بکرێن، بەڵام من شارەزاییم بەو شارانەدا نییە. ئاخر سەرباری ئەو زیان و وێرانییەی کە بەسەر ئەو شارەدا هاتووە، هێشتا گەوهەرێکی سپی درەوشاوەیە لە ژێر ئاسمانێکی ئەرخەوانی. هەناسەم سواربوو، و بە درێژایی چەند ڕۆژێک بە هەناسەتەنگییەوە بە ناویدا گەڕام، نەک لەبەر بەرزی شوێنی شارەکە و سووکی هەواکەی، هەروەک پێشتر وریایان کردبوومەوە، بەڵکو لەبەر قەشەنگیی پەرستگە و قەڵا و کۆشکەکانی. دەڵێن لە کاتی گەیشتنی ئیسپانییە یەکەمینەکان کۆشکی وای هەبووە بە پارچەی زێڕ داپۆشرابوون، وەلێ ئێستا دیوارەکانی ڕووتن. لە لای باکووری شارەکە بینای "ساکسایهوامان" وەستاوە کە لە قەڵای پیرۆز بە هەرسێ ڕیزی شووره بەرز و خوارەکانی و پەرستگەی خۆر و شەقام و تاوەر و ڕێڕەو و پەیژە و تەلار و گومبەتەکانی و چەندان ژووری تر پێک هاتووە کە لەوێ پەنجا یاخۆ شەست هەزار کەس بە خۆشگوزەرانییەوە لێی دەژیان. ناوەکەی بەمانای "هەڵۆی جێنشین" دێت کە وەک هەڵۆیەکە پاسەوانی لە شاری کۆسکۆ دەکات. ئەو بینایەیە لە گابەردی گەورەی داتاشراو دروست کراوە کە بە شێوەیەکی ڕێک بەردەکان بەبێ بەکارهێنانی گەچ یان شتێکی تر چەسپ کراون. بەردەکان ئەوەندە بە وردی و دیقەت لێک تێپەڕ کراون و شانیان یەکخراوە بە جۆرێک مووس بە بەینەکانیانەوە ناچێت. ئەو بەردە گەورە و زلانەیان بەبێ ئامێری کانزایی چۆن بڕیوەتەوە؟ چۆن بە بێ گالیسکە و ئەسپ لە دووری چەندان فەرسەخ ئەو بەردانەیان گواستووەتەوە؟ من دەمپرسی کە چۆن کۆمەڵێک لە سەربازانی ئیسپانیا توانیان ئەو ئیمپڕاتۆریەتە داگیر بکەن کە توانای دروستکردنی ئەو شتە مەزن و سەرسامانەی هەبووە. ئاخر هەرچەند ناکۆکی نێوان ئینکادا توند بوویێت و هەزاران هندیش لێیان هەڵگەڕابنەوە و یارمەتی ئیسپانییەکانیان دابێت، بەڵام ئەو داستانەی کە بەدیهات هێشتا لە بەرچاوم تا ئەوڕۆکەش بۆم لێک نادرێتەوە. قشتاڵییەکان بە دڵخۆشییەوە دەیانگوت: «سەرەڕای باروود و ئاسن، خواش لەگەڵ ئێمە بوو!»، چونکە خەڵکەکەی ئەوێ شەڕی بەرگرییان بە بەرد دەکرد. هەروەها دەیانگوت: «وەختێ ئێمەیان بینی

لە دەریاوە بە ساختمانی زەبەلاحی باڵدارەوە دەگەینە لایان وایان زانی ئێمە خواین». وەلێ من وا دەزانم ئیسپانییەکان خۆیان ئەو هەواڵی هاتنی خوایان بڵاو کردووەتەوە و دواجاریش هندییەکان بڕوایان کردووە.

بە سەرسامییەوە بە شەقامەکانی کۆسکۆدا دەگەڕام و دیقەتم دەدایە کۆمەڵانی خەڵک. ئەو ڕوخسارە برۆنزییانەی کە زەردەخەنە ناناسن و لە چاوەکانم ناڕوانن. هەوڵم دەدا ژیانی ئەوان، هی بەر لە هاتنی ئێمە، بێنمە بەرخەیاڵم، ئەو کاتەی چەندان خێزانی کامڵ بە جلوبەرگی جوان و ڕەنگین و قەشەکان بە بەرسینگەی زێڕ و پاشاکەشیان - ئینکا - بە باری گرانی خشڵ و گەوهەرەوە لەسەر تەختەیەکی زێڕین هەڵگیرابوو کە بە پەڕی باڵندەی ئەفسانەیی ڕازێنرابووەوە و مۆزیکژەن و جەنگاوەرانیشی لە تەکیەوەبوون، لەگەڵ هەزاران ژن و کچە پاکیزەی خۆر، بەو شەقامانەدا دەڕۆیشتن. ئەو کولتوورە ئاڵۆزە سەرەڕای ڕەفتاری داگیرکەران، هێشتا لە بارودۆخی خۆیەتی، بەڵام وەک جاران ناکەوێتە بەرچاو. ئاخر ئینکا لەسەر کورسی پاشایەتی دادەنرێ و فرانسیسکۆ بێسارۆش وەک زیندانییەکی نەختێ بەڕێز چاوی لێ دەکات. من قەت نەمدیوە، چونکە نەچوومەتە ناو حەرەمسەرایە ژێردەستکراوەکەی. لە شەقامەکانیشدا خەڵک زۆر و بێدەنگن. لە بەرامبەر هەر ڕیشدارێک سەدان هاوولاتی کۆسە هەیە. ئیسپانییە لەخۆبایی و بە هاتوهاوارەکان لە ڕەهەندێکی تر دەژیان، وەک ئەوەی خەڵکەکەی ئەوێ نەبینراوبن و تەنیا سێبەرێک بن لە کۆڵانە بەردینە تەسکەکان. خەڵکە ڕەسەنەکەی ئەوێ بواریان بە نامۆکان دەدا کە ژێردەستی ئەوانبوون، بەڵام داوونەریت و باوەڕداری و پێگەی خۆیان دەپاراست، بەو هیوایەی بە سەبر و تێپەڕبوونی ڕۆژگار لە دەست ڕیشدارەکان ڕزگاریان بێت. ئەوان لە توانایان نەبوو وێنای ئەوە بکەن کە تا هەتایە هەر بە کۆیلەیی دەمێننەوە.

لەو کاتەدا ئەو توندوتیژییەی نێوان براکان کە لە سەردەمی دیێگۆ ماگرۆ ڕووی دابوو و ئیسپانییەکانی دابەش کردبوو، نەختێ ئارام بووبووەوە. ژیان لە کۆسکۆ لەسەرەخۆ و بە هەنگاوی ورد دەگەڕایەوە، چونکە خەڵکەکە ڕقێکی

زۆر لە دڵ و دەروونیـــان کـەڵەکـە بووبوو و زەمـینـەی تەقـینـەوەی هەسـتـەکـان هێـشـتـا ئاسـان و لەباربوو. سـەربازەکـان هەروا بە هـۆی شـەڕی ناوەحـۆوە لەسـەر کـوورەی ئـاگـربوون و وڵات تووشـی هەژاری بـووبوو و بێ سـەروبەری هەمـوو شـوێنێکە گـرتبـووەوە، هندییـەکـان خـرابوونە ژێر بێگاری. ئیمپراتۆرەکەمان، کارلۆسی پێنجەم، لە نمایشێکی شاهانەدا فەرمانی دا کە ڕێز لە خەڵکە ڕەسەنەکە بگیرێ و بکرێنە نەسرانی و بە سـۆز و کاری چاکە پەروەردە بکرێن، وەلێ ئەوەی پەیڕەو دەکرا پێـچـەوانەی ئەمـە بوو. ئاخـر ئەو پاشـایە کـە قـەت پێی نەناوەتە سـەر خـاکی جـیـهـانی تازە، کـەچی لـە هۆڵی کۆشکە تاریک و کۆنەکان لە دووری هەزاران فەرسەخ لەو گەلانەی کە دەیەوێ فـەرمـانڕەواییـیـان بکات، یاسـا پڕ لە حـیکمـەتـەکانی دەردەکات، بێ ئەوەی ڕەچاوی چاوچنۆکی بێ پایانی مـرۆڤـەکـان بکات. تـەنیـا کـەمـینەیەک لە ئیسپانییەکان ڕێزیان لەو یاسـایانە دەگرت و لە هەمـووشیان کەمتر مـەرکیز فرانسـیسکۆ بێسارۆ بوو. هەتا نەدارترین قشتاڵیش لەوێ خزمەتکاری هندی هەبـوو، لە کـاتێک دەوڵەمـەندەکـان بە سـەدانیـان هەبـوو، چونکە زەوی و کانگاکان بەبێ ئەو کارگەرانەی ئیشی تێدا دەکەن هیچ ناهێنن. هندییەکان لە ژێر قـامـچی سـەرکـارەکـان ملیـان کـەچ دەکـرد، کـە خـۆزگەی مـردنێکی ئاساییيان بۆ خێزانەکانیان دەخواست تا پاشان خۆیشیان بکوشتایە.

بە گفتوگۆکردنم لەگەڵ سەربازەکان توانیم پارچەکانی چیرۆکی خوانی مێردم کۆ بکەمـەوە، لە مردنەکەی دڵنیابووم. مێردەکەم وەختێ کە دەگاتە پێرۆ لە دارسـتـانە گەرمـەکانی باکـوور هەتا مـاندوو و شـەکـەت دەبێ هەر بە دوای شاری زێڕدا دەگەڕێ، پاشان دەچێتە ڕیزی سوپاکەی فرانسیسکۆ بێسارۆ. ئەو نەدەخێوایە کاری سەربازی، بەڵام توانیـبووی لە شـەڕی ڕووبەڕووبوونەوە لەگـەڵ هندییـەکـان خـۆی بپـارێزێت و هەندێ زێڕیـشـی دەسـتکەوتبـوو کـە ئەو وەختـە لەوێ زۆربوو، وەلێ هەمـووی لە پێشـبڕکێی گرەوکردن لە دەسـتدابوو. پارەیەکی زۆر قەرزاری ژمارەیەک لە هاوڕێکانی بوو و کە بڕێکی هی ئێرناندۆ بێسـارۆی برای حـاکم بوو کـە بە هۆی ئەو قـەرزارییـەوە بووبووە پاشکۆی و

چەند تاوانێکیشی لەسەر داوای ئەو ئەنجام دابوو.

***

مێردەکەی من لە شەڕی لاس سالیناس لە ڕیزی سەرکەوتووەکان بەشداری کردبوو و ئەرکێکی زۆر سەیریان لەو شەڕە پێی سپاردبوو کە دوا ئەرکی بووە لە ژیانی. ئێرناندۆ بێسارۆ فەرمانی پێ دابوو کە جلەکانیان بگۆڕنەوە، ئیتر بەو جۆرە کاتێک کە خوان بەدلەی تەیلەسانی ڕەنگ پرتەقاڵی پۆشیبوو لەگەڵ باشترین زرێ و کڵاوەی زیوینی لەسەرنابوو کە قامکێک پەڕاموچەی بە سەرەوە بوو، ئەو عەبای دەمقەسیشی خستبووە سەرشانی کە سەرکردەی بەرز پێیەوە دەناسرا؛ لە هەمان کاتدا سەرکردە جلی سەربازێکی ئاسایی لەبەر کردبوو و تێکەڵی سەربازە پیادەکان بووبوو. ڕەنگە ئێرناندۆ بێسارۆ لەبەر بەرزی باڵاکەی مێردەکەمی هەڵبژاردبێت، چونکە ئەو لەگەڵ خوان بەقەد یەکتر کەڵەگەت بوون. لەوانەیە بیری بۆ ئەوە چووبێت کە دوژمنەکانی لەو شەڕە بیکوژن، هەر ئەوهاش ڕووی دا. جلە سەیر و بە بەهاکان سەرنجی ئەفسەرەکانی ماگرۆیان ڕاکێشا کە بە شمشێرەکانیانەوە پێشڕەوییان کردبوو و خوان دی مەلەگەی بەدبەختیان کوشت، وایان دەزانی کە حاکم خۆیەتی. ئیتر بەو فێڵە ئێرناندۆ لە مردن ڕزگاری بوو، بەڵام ناوەکەی بۆ تا هەتایە بە لەککەی ڕیسوایی و ناوزڕانەوە پیس بوو. بە نووکە قەڵەمێک نەبەردییە سەربازییەکانی پێشووی هەموو سڕانەوە و نەیتوانی ناودەنگە لە دەستچووەکەی بگێڕێتەوە؛ ئەو فێڵە بێ شوورەییە هەموو ئیسپانییەکانی شەرمەزار کرد بە دۆست و دوژمنەکانەوە و هەرگیز لێیان نەدەبووری.

پیلانێکی بێدەنگی بە پەلەیان بۆ پاراستنی ئەو بێسارۆیە دارشت کە هەموو لێی دەترسان، بەڵام ئەو بێ ئابڕووییەی کە لە کاتی جەنگدا ئەنجامی دابوو وردە وردە بە چرپە لە بارِ و حەڵقەکانی بەدگۆیان بڵاو دەبووەوە. کەسێک نەما نەیزانێ و قسەی لەسەر نەکات، بەو جۆرە منیش توانیم وردەکارییەکانی ئەو ڕووداوە پێ بکەوم، وەلێ تەرمی مێردەکەمم نەدۆزییەوە. لەو کاتەوە گومانانەکان ئازارم دەدەن کە خوان لەسەر داوونەریتی مەسیحییانە

نەشاردراوەتەوە، ڕوحەکەی سەرگەردانە و بە دوای ئۆقرەگرتندا دەگەڕێ. ئیتر خوان دی مەلەگە لە گەشتە درێژەکەم بۆ شیلی بە دوامدا هات و لە دروستکردنی شاری سانتیاگۆ هاوڕێیەتی کردم و لە کوشتنی سەرکردە هندییەکان پاڵپشتی کردم، ئەو کاتەی لە تووڕەییان و لە خۆشەویستییان بە هۆی بالدیبیاوە گریام، گاڵتەی پێ دەکردم. هەتا ئەمڕۆکەش، لە دوای زێتر لە چل ساڵ، هێشتا ماوە ماوە خۆیم نیشان دەدات، هەرچەندە ئێستا چاوەکانم خیانەتم لێ دەکەن و لە نێوان ئەو و تارماییەکان وێنەکانم لێ تێکەڵ دەبێت. لە سانتیاگۆ ماڵێکی گەورە و فرەوانم هەیە، زەوییەکی زۆری لە لای شەقامەکە بەرەوە هەیە، بە حەوش و تەویلە و باخچە گەورەکەیەوە. دیوارە لە قوڕ دروستکراوەکانی زۆر پان و ئەستوورن و سایپتەکانی بەرزن بە کاریتەی داربەڕوو سەری گیراوەتەوە. چەندان پەناگەی تێدایە کە دەشێ ڕوحە وێڵەکان یاخۆ شەیتانەکان یا مردوو خۆیانی لێ حەشار بدەن، ئەمەی دوایی داهۆڵێکی دەمامکدراو نییە بە دوو قەپێلکی بۆشی چاوەوە، هەروەک قەشەکان بۆ ترساندنی ئێمە دەیڵێن، بەڵکو ئەوە ژنێکی بە قەڵافەتی قەڵەوی سینە گەورەی باڵفرەوانی لە چەشنی دایکە فریشتەیە. من لەو ماڵە گەورەیەدا بزر دەبم. خەوم دەزڕێ و دەستە گەرمەکانی ڕۆدریگۆ لەسەر زگی خۆم هەست پێ دەکەم. شەوانیش، وەختێ کارەکەرەکانم دەچنەوە و جگە لە پاسەوانەکانی دەرەوە و بەردەستەکانم کە بە نۆبەت دەمێنن و شەونخونی دەکێشن نەبادا پێویستیم پێیان هەبێت، چرایەک لە دەست دەگرم و ژوورە گەورەکان دەپشکنم کە دیوارەکانیان بە گەچ سپی کراوە و سایپتەکانیشیان شینن. تابلۆ خوارەکان ڕاست دەکەمەوە و گوڵی ناو گوڵدانەکان ڕێک دەخەم، پاشان سەیرێکی باڵندەکانی نێو قەفەسەکانیش دەکەم. ڕاستییەکەی من بە دوای ڕاوکردنی مردندا دەگەڕێم. هەندێ جار زۆر لێی نزیک دەبوومەوە، بە جۆرێک دەمتوانی بۆنی بکەم کە لە بۆنی جلوبەرگێک دەچێت تازە شۆرابێت، وەلێ ئەو گاڵتەباز و مەکرۆیە، ناتوانم بیگرم و لە دەستم ڕادەکا و لە نێو کۆمەڵی ئەو ڕوحانە خۆی بزر دەکات کە لە ماڵەکەمدا دەژین. لە ناو ئەو ڕوحانەدا

یەکێکیان هی خوانی بەدبەختە کە تا زەوییە دوورەکانیش بە تەقەتەقی ئێسقانە نەشاردراوەکانییەوە هەر بە دوامەوەیە.

هەموو ئاسەوارێکی مێردی یەکەمم لە کۆسکۆدا ونبوون. بێگومان جەستە پۆشراوەکەی بە جلە نایابەکانی ئێرناندۆ بێسارۆ یەکەم لاشە بووە کە سەربازە سەرکەوتووەکان لە دوای جەنگ بەرزیان کردووەتەوە، بەر لەوەی هندییەکان لە شاخەکان دابەزن و لە جەستەی هەڵدڕ هەڵدڕکراوی دۆڕاوەکان بخۆن. گومانیشی تێدا نییە کە سەربازەکان هەر هۆیەکیان لەخۆ زانیوە وەختێ کە بینویانە ئەو لاشەیەی ژێر زرێ و کڵاوە زیوینەکە خاوەنی ڕاستەقینەیان نییە، بەڵکو ئەوە سەربازێکی نەناسراوە. وا دەزانم ئەوانیش بە نائومێدییەوە ملیان بۆ ئەو فەرمانە کەچ کرد تا ئەو نهێنییە بشارنەوە، چونکە دوا شتێک کە ئیسپانیایی دەیبەخشێت ترسنۆکییە، بەڵام ئەمەیان بە باشترین شێوە ئەنجام دا، بەجۆرێک هەموو شوێنپێیەک کە مێردەکەمی پێدا دەڕۆیشت لەو دنیایە، بە تەواوی ڕەشیان کردەوە.

کاتێ دەنگوباسی ئەوە بڵاو بووەوە کە ژنەکەی خوان دی مەلەگە دەگەڕێ و پرسیار دەکات، حاکم فرانسیسکۆ بێسارۆ بە خۆی حەزی کرد بمناسێت. کۆشکێکی لە شاری پاشاکان دروست کردبوو و لەوێوە بە لووتبەرزی و زوڵم و دەستێکی ئاسنین دەسەڵاتی بەسەر ئیمپراتۆریەکەدا سەپاندبوو، وەلێ ئەو ڕۆژە بە سەردان هاتبووە شاری کۆسکۆ. لە هۆڵێکدا پێشوازی لێ کردم کە بە مافووری پێرۆیی فەرش کرابوو. ئەو مافوورانە لە خوری گرانبەها دروست کرابوون، کەلوپەلەکانی ناو هۆڵەکەش بە نەخشی هەڵکەندراو ڕازێنرابووەوە. سەرپۆشی مێزە سەرەکییەکە و قاچی کورسییەکان و پەرداخ و دۆلکەی ئاو و چرادانەکان و هەمووی لە زیوی ساف دروست کرابوون، چونکە لە پێرۆ زیو لە ئاسن پترە. ژمارەیەک لە دەستوپێوەندەکانی بێسارۆ لە گۆشەیەک دانیشتبوون کە وەک هەڵۆی هەڵکورماو تاریک هەڵگەڕابوون و بە چرپە لەگەڵ یەکتری دەدوان و بایەخداری خۆیان نیشان دەدا. بالدیبیا جلێکی قەدیفەی ڕەش و جبەیەکی لە قەدەر جەستەی خۆی لەبەردابوو و ملپێچێکی سپی و

زنجیرێکی بتەوی زێڕ بە سەر سینگیدا شۆڕ بووبووەوە، ئاوزێنەی پێڵاوەکەی لە زێڕ بوو، عەباکەی سەر شانیشی لە تووکی سمۆرە بوو. پێدرۆ تەمەنی لە سەرووی شەست ساڵییەوە بوو، لووتبەرز و لەخۆڕازی، پێستی لەشی کە نەختێ بەلای سەوزی دەشکایەوە و ڕیشێکی ماش و برنج و دوو چاوی قووڵی هەبوون کە بە گومانەوە لە شتی دەڕوانی و نبرەی دەنگیشی ناخۆش بوو. بە کورتی سەرەخۆشیی مردنی مێردەکەمی لێ کردم، بێ ئەوەی ناوی بهێنێت. پاشان یەکسەر بە جولەیەکی چاوەڕواننەکراو کیسەیەک پارەی دامێ بۆ ئەوەی پێی بژیم و گوتی: تا ئەو کاتەی دەتوانی بگەڕێیتەوە ئیسپانیا.

لەو ساتەدا بڕیارێکی کتوپڕم دا کە هەرگیز لێی پەشیمان نابمەوە. پێم گوت: لەگەڵ ڕێزم ئەی خاوەن شکۆ، من بیر لە گەڕانەوە بۆ ئیسپانیا ناکەمەوە.

شوێنەواری نائومێدییەکی خێرا و ترسناک لە ڕوخساری حاکم بەدیار کەوت. لە پەنجەرەکە نزیک بووەوە و ماوەیەک بێدەنگ بوو، لەو شارە ڕادەما کە لە ژێر پێیەکانی بوو. بیرم کردەوە کە ڕەنگە منی لە بیرکردبێت و بەرەو دەرگەکە کشامەوە، وەلێ لە هیکرا ئاوڕی دایەوە و سەرلەنوێ بەرەو کنم هات و گوتی: ئەرێ خانم ناوت چی بوو کە پێت گوتم؟

– ئێنیس سوارێس، لە خزمتتدایە گەورەم حاکمی بەڕێزمان.

– چۆن بژێوی خۆت دابین دەکەیت؟

– بە شەرەفەوە ئەی خاوەن شکۆ.

– بە بێدەنگبوونیش کە وا ئومێد دەکەم، چونکە لێرە بێدەنگی پەسندە، بەتایبەتی بۆ ژنان. شارەوانیش خانووێکت دەدەنێ. ئیتر بەیانیت باش و داوای بەختێکی چاکت بۆ دەکەم.

ئەمە هەموو شتێک بوو. تێگەیشتم کە ئەگەر بمەوێ لە کۆسکۆ بمێنێمەوە، واچاکترە واز لەو پرسیارانە بێنم. خوان دی مەلەگە مردووە و گەیشتووەتە هەقی خۆی و منیش بوومەتە ژنێکی سەربەست. دەتوانم بڵێم ژیانی من لەو

ڕۆژەوە دەستی پێ کرد؛ ساڵانی ڕابردووی ژیانم ڕاهێنانێک بوو بۆ ڕۆژانی داهاتووم.

جا ئیزابێل گیان، تکات لێ دەکەم تۆزێ ئارام بگریت، لەمەودوا دەبینی کە چۆن ئەو چیرۆکە تێکشێواوە دەگاتە ئەو چرکەیەی کە چارەنووسم لەگەڵ چارەنووسی پێدرۆ بالدیبیا دەگەنە یەکتری و ئەو داستانە دەست پێ دەکات کە ئارەزوومە بۆتی بگێڕمەوە. پێش ئەوە ژیانی من ژیانی بەرگدروویەکی بێ کەڵک بوو لە بلاسینشیا، وەک سەدان و سەدان ئەو کرێکارە ژنانەی کە پێش من هاتوونە و دوای منیش دێن. من لەگەڵ بالدیبیا ژیانێکی پڕ لە خۆشەویستی ئەفسانەیی ژیام و شانشینێکم لەگەڵی داگیر کرد. لەگەڵ ئەوەی باوکتم تا سنووری پەرستن خۆش دەویست و سی ساڵ لەگەڵی ژیام، وەلێ ئەوەی پێویستە بگێڕدرێتەوە ژیانی منە لە پێناو داگیرکردنی شیلی، ئەو ئەرکە گرینگەی کە لەگەڵ پێدرۆ بالدیبیا جێبەجێم کرد.

***

لە شاری کۆسکۆ لەو خانووە گیرسامەوە کە شارەوانی بە فەرمانی حاکم فرانسیسکۆ بێسارۆ پێشکێشی کردم. خانووێکی بچووک و کۆن بوو، بەڵام بۆ گوزەرانی خۆش بوو. لە سێ ژوور و حەوشەیەک پێک هاتبوو و کەوتبووە ناوەندی شاری. هەمیشە بۆنی ئەو گوڵە هەنگوێنەی لێ دەهات کە بە دیوارەکانیدا هەڵگەڕابوو. سێ ژنە هندییان بۆ خزمەتکردنم دانابوو کە دووانیان کچ بوون و سێیەمیشیان گەورەتر بوو و ناوێکی مەسیحییانەی لە خۆ نابوو کە کاتالینایە و دواتر بووە نزیکترین هاوڕێم. خۆم ئامادەساز کرد تا دەست بە پیشەکەی خۆم بکەمەوە وەک بەرگدروو کە ئەوە پیشەیەکە ئیسپانییەکان زۆر پەرۆشینە، چونکە تاکو ئێستاش لە ناچاریدا زۆر لە خۆیان دەکەن، هەر ئەو جلە قورسانە دەپۆشن کە لەگەڵ خۆیان لە ئیسپانیاوە هێنابوویان. هەروەها چارەسەری سەربازە نەخۆش و بریندارەکانی شەڕم دەکرد کە زۆربەیان لە شەڕی لاس سالیناس پێکرابوون. ئەو پزیشکە ئەڵمانییەی کە لە کاروانەکە لەگەڵ من لە شاری پاشاکانەوە بۆ کۆسکۆ

سەفەری کردبوو، زۆر جاران بانگی دەکردم بۆ ئەوەی لە حاڵەتە خەتەرەکان یارمەتی بدەم. هەموو جارێ لەگەڵ کاتالینا دەچووم، چونکە ئەویش شارەزایییەکی تەواوی لە دەرمان و هونەری سیحربازی هەبوو. کاتالینا و پزیشکەکە ڕکابەرییان لە نێواندا هەبوو کە هەمیشە بە زەرەری نەخۆشە بەدبەختەکان تەواو دەبوو. کاتالینا قەت گرینگی بە فێربوونی هیچ شتێک لە بارەی تێکەڵە چوارییەکەی دەرمان نەدەدا کە باری جەستەی لە ڕووی تەندروستییەوە دیاری دەکرد، پزیشکەکەش لە لای خۆیەوە گاڵتەی بە سیحر و خورافە دەکرد هەرچەندە هەندێ جار بۆ نەخۆشەکان بە کەڵکیش بوون. ناخۆشترین کاری من لەگەڵ ئەوان، بڕینەوەی ئەندامی جەستە بوو کە بێزاری دەکردم، وەلێ دەبوو بیکەم، چونکە وەختێ گۆشتی بریندارەکە پیس و بۆگەنی دەبوو، جگە لە بڕینەوە هیچ ڕێگەچارەی تر نەبوو بۆ ڕزگارکردنی، لەگەڵ ئەوەش بەشێکی کەمیان بەخت یاوەریان بوو و لە دوای نەشتەرگەرییەکە دەژیان.

هیچ شتێک لە بارەی ژیانی کاتالینا بەر لە هاتنی ئیسپانییەکان بۆ پێرۆ نازانم؛ ئەو قەت باسی ڕابردووی خۆی نەدەکرد، سەرەڕای ئەوەش گوماناوی و نادیاربوو. باڵای کورت و چوارشانەبوو، پێستی لە ڕەنگی بندق وابوو، دوو کەزی ئەستووری هەبوون و بە تیلمە قوماشێکی ڕەنگدار گرێی دەدان و بەسەر پشتی بەری دەدانەوە. دوو چاوی ڕەشی خەڵۆزی هەبوون و بۆنی دووکەڵیان لێ دەهات. کاتالینا بۆی هەبوو لە یەک کاتدا لە چەند جێگایەک بێت و لە چرکەیەکیشدا لە بەرچاوت ون بێت. زمانی قشتاڵی فێربوو و لەگەڵ داوونەریتی ئێمە ڕاهات، وای نیشان دەدا کە بە ژیانی خۆی لەگەڵ من زۆر ڕازییە و دوو ساڵ دوای ئەوە پێداگری کرد هەتا لەگەڵم بێتە شیلی. بە زمانە ئاوازدارەکەی خۆی لێم دەپاڕایەوە: گەورەم توخوا منیش لەگەڵ خۆت ببە.

بۆ ئەوەی لە گیروگرفت دوور بکەوێتەوە، هاتە سەر دینی مەسیحی، بەڵام باوەڕەکانی خۆی وەلا نەنا: هەروەک چۆن نوێژی دەرد و سەڵەواتی لێ دەدا و مۆمی بۆ ژنەگەورەی پاکیزەمان دادەگیرساند، ئاوا سەڵەواتی بۆ خۆریش

دەخــوێند. ئەو هاوڕێیــە ژیر و بەوەفــایە فـێــری بەکــارهێنانی ڕووەکــە پزیشکییەکان و شێوازەکانی چارەسەرکردنی کردم کە لە پێرۆ کاری پێ دەکرا و لە هی ئیسپانیا جیاوازبوو. ئەو ژنە میهرەبانە دووبارەی دەکردەوە کە ڕوحە شەڕنگێزەکان و شەیتانەکان هۆکاری دەرد و نەخۆشییەکانن کە لە کونەکانی جەستەوە دەچنە ژوورێ و لە زگدا خۆیان دەشارنەوە. لەگەڵ پزیشکەکانی ئینکا کاری کردبوو و بە ئاسانی کەللەسەری نەخۆشیان کون دەکرد تا ژانەسەر و شێتییەکەی ئارام بکەنەوە. ئەو شێوازە لە ئەڵمانیاش پێڕەو دەکرا، بەڵام تاکە ئیسپانییەکیش نەبوو ئامادە بێت خۆی بداتە دەست ئەو جۆرە چارەسەرکردنە. هەروەها کاتالینا وەک پزیشکە تایبەتمەندەکان دەیزانی خوێنی نەخۆش دەربێنێ و لە پێدانی دەرمانی ڕەوانی شارەزابوو بۆ ئەوەی باری ئازاری ژانەزگ و لەش قورسییان سووک بکات، وەلێ گاڵتەی بەو دەرمانانە دەهات کە پزیشکە ئەڵمانییەکە دروستی دەکردن. هەموو جارێ بە زەردەخەنە و دیارکەوتنی ددانە بە کۆکا ڕەشبووەکانی پێی دەگوت: گەورەم، ئەوە سوودی نییە تەنیا دەکوژێ.

ئیتر وای لێ هات پزیشکەکە بە گومانەوە دەیڕوانییە سوودی ئەو دەرمانە ناسراوانە کە ڕەنجێکی زۆری دابوو بۆ ئامادەکردنیان لە وڵاتەکەی خۆی.

کاتالینا ژەهرە کاریگەرەکان و خواردنەوە چالاکبەخشەکان و ئەو گیایانەشی دەناسی کە وزەیەکی سوودبەخش دەدەنە جەستە، یا ئەوانەی دەتخەوێنن یان خوێن بەربوون ڕادەگرن یان ئازاری جەستە سووک دەکەن. ئەو پێشتر سحربازبوو، دەیتوانی لەگەڵ مردوو قسان بکا و ئایندەش ببینێ؛ هەندێ جار تێکەڵەیەکی لە ئاوی ئەو گیایانە دەخواردەوە و دەچووە دنیایەکی تر کە لەوێ گوێبیستی ئامۆژگاری فریشتەکان دەبوو. ئەو بەو ناوانە ناوی نەدەهێنان، بەڵکو بە بوونەوەری نورانیی باڵدار وەسفی دەکردن و کە توانایان هەیە بە ئاگری تیشکی چاویان بێ هۆشت بکەن؛ ئەو بوونەوەرانە ناشێ فریشتە بن. ئێمە لەسەر ئەوە ڕاهاتبووین کە باسی ئەو شتانە لەگەڵ کەسانی تر نەکەین، چونکە بە سحرباز و هاوکاری شەیتان تاوانباریان دەکردین.

خۆشیش نییە کە مرۆڤ لە یەکێ لە زیندانەکانی دادگاکانی پشکنین خۆی ببینێتەوە؛ چونکە لەسەر کاری لەوەش سادەتر خەڵکانێکی بەدبەخت خرانە نێو کوورەی ئاگر. کارەکانی کاتالینا هەموو کاتێک ئەنجامێکی چاکی نەدەدایە دەست، کە ئەمە شتێکی سروشتی بوو. ئاخر جارێکیان هەوڵی دا ڕوحی خوان دی مەلەگە لە ماڵ دەرکا کە زۆر هەراسانی کردبووین، بەڵام ئەنجامەکەی مردنی چەند مریشکێک بوو لەو شەوە و ڕۆژی دواتریش ئاژەڵکی لامای دوو سەر پەیدا بوو. دیار کەوتنی ئەو ماڵاتە دوو سەرە دووبەرەکی خستە نێوان هندی و قشتاڵییەکان چونکە هندیەکان بڕوایان وابوو کە ئەوە بەرجەستەی نەمریی ئینکا ئەتاوالبایە، کەچی قشتاڵییەکان ڕمێکیان لە ماڵاتەکە دا تا بیسەلمێنن نەمر نییە. ئیتر شەڕێک لە نێوانیاندا قەوما کە چەند کەسێک لە هندییەکان کوژرا و ئیسپانییەکیش بریندار بوو.

کاتالینا ساڵانێکی زۆر لەگەڵ من ژیا، بایەخی بە تەندروستیم دەدا و لە زۆر باری مەترسیدار منی پاراست و بۆ وەرگرتنی بڕیاری گرینگ ئاراستەی دەکردم. تاکە بەڵێنێک کە نەیتوانی جێبەجێی بکات ئەوەبوو نەیتوانی لە پیریتیدا هاوڕێم بێت، ئاخر ئەو لە پێش مندا مرد.

ئەو دوو کچە هندییە جحێڵەی کە شارەوانی بۆ خزمەتی من تەرخانیان کردبوو، فێرە پینە و دوورمان و شۆرین و مەکویکردنی جلوبەرگم کردن وەک چۆن خەڵکان لە بلاسینشیا دەیانکرد ئاوا. ئەو وەختە ئەو جۆرە خزمەتانە لە کۆسکۆ ڕەواجێکی چاکیان هەبوو، فەرمانم دا لە حەوشەکەمان تەندوورێک لە قوڕ دروست بکەن، ئیتر لەگەڵ کاتالینا خەریکی ئامادەکردنی کولێرە بووین. ئەو کاتە نرخی ئاردی گەنم زۆر گران بوو، وەلێ ئێمە فێر بووبووین لە ئاردی گەنمەشامی دروستمان دەکرد. هەرکە لە تەندوورەکە دەرمان دەهێنا بەوە ڕانەدەگەیشت ساردبێتەوە؛ ئاخر بۆنی کولێرە لە هەموو گەڕەک دەگەڕا و مەعمیلەکانی بەئاگا دێنا، ئیتر بە پەلە بۆ کڕینی دەهاتن. هەندێکمان لە لاوە دادەنا تا بیدەینە سواڵکەرەکان یان ئەو نەدارانەی کە لەسەر سەدەقەی گشتی دەژیان. ئەو بۆنە بەربڵاوەی کە لە گۆشت و پیازە سوورکراوەکەوە دەهات

لەگەڵ ڕەشکە و هەویرەکە چووەتە ژێر پێستم و تاکو ئێستاش هەرماوە، کاتێ کە دەشمرم هەر بۆنی کولێرەم لێ دێت.

توانیم خەرجییەکانی ماڵەوە دابین بکەم، بەڵام بێوەژنێکی وەک من لەو شاری گرانی و گەندەڵیدا، بۆ دەربازبوون لە هەژاری، خۆی لە تەنگەتاوییەکی توند دەبینێتەوە. دەمتوانی شوو بکەمەوە پیاوی ڕەبەن و تامەزرۆش زۆر بوون، هەندێکیشیان جوان و لێهاتوو بوون؛ وەلێ کاتالینا بەردەوام لەوانە وریای دەکردمەوە. هەموو جارێ بەو مۆروو و سەدەفانەی پێشبینی کە هەیبوون بەختی دەگرتمەوە و هەمان شتی پێ دەگوتم: تەمەنێکی درێژ دەژیت و دەبیتە شاژن و ئایندەشت بە پیاوێکەوە پێوەستە خۆت بینیوتە.

بە گوێرەی قسەکانی، ئەو پیاوە یەکێک لەو کەسانە نییە کە داوای لێ کردبم یان لە شەقامەکاندا بە دوامدا گەڕابێت. هەروەها بەڵێنی دەدامێ و دەیگوت: گەورەم تۆ سەبر بگرە، بیراکوچایەک دێتە لات کە هی خۆتە.

یەکێک لەوانەی داوای دەستی منی کردبوو هەڵگری ئاڵا، نۆنێسی لەخۆبایی بوو کە بێ شەرمانە وازی نەدەهێنا. بە وەڵامەکانی من دڵی ئاوی نەدەخواردەوە، بەتایبەتی بیانۆیە کۆنەکانی من سوودیان نەمابوو. ئاخر کە زانی من بێوەژنم، هەروەک لە سەرەتاوە لێی دووبارە دەکردمەوە. ئەو وای خەیاڵ دەکرد کە ڕازینەبوونم جۆرێکە لە نازکردن. ئیتر بەو چەشنە هەرچەندە من لەسەر ڕەتکردنەوەی داواکەی گەرمتر دەبووم، ئەو زیاتر هەڵدەچوو و لێم دەهاتە پێش. دەبوو ڕێی پێ نەدەم کە ئاوا کتوپڕانە بە خۆی و هەردوو سەگەکەیەوە بێنە ماڵم، چونکە کارەکەرەکانم زۆر لە سەگەکانی دەترسان، ئاخر ئەو دوو سەگە لەوانەبوون کە بۆ ملپێکەچکردنی هندییەکان ڕاهێنرابوون، وەلێ کاتێک بۆنی ژنەکانیان دەکرد، زنجیری ملیانی توند دەکرد و ئەوانیش دەیانمڕاند و کەڵبەیان دەردەخست. هیچ شتێک نەبوو ئەوەندەی هەڵچوونی سەگە دڕەکانی لە دژی هندییەکان، چێژ بداتە ئاڵاهەڵگر، بەڵام گوێی بە من نەدەدا و هەر وەختێک بیویستبایە بەخۆی و سەگەکانییەوە هەڵی دەکوتایە ماڵەکەم، وەک ئەوەی لە شوێنەکانی تر دەیکرد. ڕۆژێکیان ئەو

دوو سـەگە بـە لغاوی پڕ لـە کەفێکی سـەوز سـبەینـەیان لێ داهات و پاش چەند سـەعـاتێک هەردووکـیـان وشکبـوونەوە و تۆپین. خـاوەنەکـەیان بەڵێنـی دا ئەو کەسە بکوژێت کە ژەهرخـواردی کـردوونە، وەلێ پزیشکە ئەڵمـانییەکە باوەڕی پێی هـێنا کـە بە تاعـون تۆپـیـون و پـێـویسـتـە بە زووترین کـات لاشـەکـانیـان بسـووتێنرێ نەبادا پەتاکـە بڵاو بێتـەوە. ئیـتـر وای کـرد و لەوەش دەترسـا کـە خۆی یەکەمین کەس بێت نەخۆشییەکەیان لێ بگرێتەوە.

سـەردانەکـانی ئالاهەڵگر لـە جـاران زێتر دەبوو، لـەبەرئەوەی لە شـەقـامـیش تەنگی پێ هەڵدەچنیم، بۆیە بەتەواوی ژیانی لێ کردبوومە دۆزەخ.

«گەورەم، کەواتە ئەو سـپی پێستە بە قسـە حاڵی نابێ، من دەڵێم وا چاکە بە دەردی سـەگەکـانی بچێت»، کـاتالینا ئاوای پێ گـوتم. وام پێ باشبـوو لە واتای قسـەکانی نەکۆڵمەوە.

ڕۆژێکیـان نۆنێس ئاسـایی بەخۆی و بۆنە نێرانەکـەی و دیارییـەکانییەوە کـە حـەزم پێی نەدەکـرد، هـات و مـاڵەکـەمی پڕ لە دەنگەدەنگ کـرد. لە ناوقـەدەوە گـرتمی و بۆ جـاری هـەزارەمین گـوتی: بۆ ئـازارم پێ دەچێـژی، ئەی ئێـنیـسـی جوان؟

لەگـەڵ هەوڵدانم بۆ دوورخـسـتنەوەی وەڵامـیم دایەوە: ئەی بەڕێز، تـەنگم پێ هەڵمـەچنە. من ڕێگەت پێ نـادەم بە نـاوی خـۆشـەویسـتـیـیەوە ڕەفـتـارم لەگەڵ بکەیت.

– ئێ باشە کەواتە ئێنیسـی خۆشـەویستم، کەی زەماوەند بکەین؟

– ئەمـەیان لەو شـتـانەیە کـە هەرگیز ڕوو نادات. ئەدی ئـەوە نییـە کـراس و شـەرواڵەکـانت پینەکراو و خـاوێنن. بە دوای جلشـۆرێکی تـردا بگەڕێ، چونکە من نامەوێ تۆ بێیتە ماڵەکەم. خواحافیزت بێت.

لەگەڵ ئەو قسـانە بۆ لای دەرگەکە پاڵم دا.

لەسـەر شـەقامـەکـەوە بە هـاوارەوە گـوتی: ئێنیس، ئـەوە پێم دەڵێی برۆ. ژنێ، دیارە تـۆ من نـاناسـیت! ئـاخـر کـەس نیـیـە بتـوانێ من سـەرزەنشت بکات،

بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەسە ژن بێت.

خۆشترین ساتم ئەو کاتەبوو کە کڕیارەکانم کۆدەبوونەوە و چاوەڕێی دەرهێنانی دوا کولێرە بوون لە تەندوورەکە، وەلێ ئەو ڕۆژە من حەماسەتی جێبەجێکردنی داخوازییەکانی ئەوانم نەبوو؛ لە تووڕەیی و لە شەرمان دەلەرزیم. تەنیا هەندێک کولێرەم بەسەر برسی و هەژارەکان دابەش کرد تا بێ خواردن نەمێننەوە، پاشان دەرگەکەم گاڵە دا کە ڕۆژانی پێشتر تا درەنگی شەوێ هەر بەکراوەیی دەمهێشتەوە تا دنیا سارد دادەهات.

– گەورەم ئەوە نەفرەت لێکراوە. گومانی تێدانییە کە ئەو نۆنێسە دەرگەی بەختێکی باشت بۆ دەکاتەوە. کاتالینا ئەمەی بە داخ و پەژارەوە دەگوت.

– کاتالینا، ئەو پیاوە جگە لە کارەسات شتێکی ترم بۆ ناهێنێت. ئاخر پیاوی لووتبەرز و ڕق لە دڵ هەمیشە مەترسیدارن.

***

کاتالینا حەقی بوو. ئاخر بە هۆی ئەو ئالاهەڵگرەوە کە چووە بارەکە بخواتەوە تا پاشان بەسەرخۆشی چۆنی ویست وام لێ بکات، هەر ئەو شەوە لەگەڵ ئەو کەسە یەکترمان ناسی کە دوایی بەختیشم کەوتە کۆشی ئەو. ئەو پیاوەی کە کاتالینا قەت لە باسکردنی وەڕس نەدەبوو.

بارەکە بریتیبوو لە هۆڵێکی نەوی، چەند پەنجەرەیەکی بچووکی هەبوون کە ئەوندە هەوایەیان لێ نەدەهاتە ژوورێ بەشی هەناسەی خەڵکەکە بکات. پیاوێکی ئەندەلووسی دڵفرەوان خزمەتی پێشکێش دەکرد و شەرابی بە قەرز دەدایە ئەو سەربازانەی پارەیان نەبوو. لەبەر ئەوە و سەرەڕای مۆسیقا ژێدارەکان و ئەو تەپڵەی دوو زنجییەکە لێیان دەدا، بارەکە پڕ و قەرەباڵغ بووبوو. بە پێچەوانەی هەرا و بەزمی مەعمیلەکان، قەد و قامەتی بە هەیبەتی پیاوێک دیاربوو کە بە تەنیا لە گۆشەیەک دەیخواردەوە. لە سەر کورسییەکی پشت مێزێکی بچووک دانیشتبوو. مێزەکە کاغەزێکی زەردباوی لە سەر ڕاخرابوو کە بەو بوتڵە شەرابەی سەرییەوە بە کراوەیی مابووەوە. ئەو پیاوە

پێدرۆ بالدیبیا بوو، سەرکردەی مەیدانی حاکم فرانسیسکۆ بێسارۆ و پاڵەوانی شەڕی لاس سالیناس کە پاشان بووە یەکێک لە هەرە دەوڵەمەندەکانی پێرۆ. جا بۆ ڕێزلێنان بۆ نەبەردییەکانی ئەو سەرکردەیە، بێسارۆ کانگەیەکی زیو لە بۆرکۆ و پارچە زەوییەکی بەرفرەوانی بە پیت و بەرهەمداری لە دۆڵی لاکانیلا و سەدان هندی وەک کارگەر پێشکێشی کرد. بالدیبیای ناودار لەو ساتەدا لەوێ چی دەکرد؟ ئەو حسێبی پارچە داڕێژراوەکانی زیوی نەدەکرد کە لە کانگەکەوە دەرهێنرابوو و ماڵاتە لاماکان و گونییەکانی گەنمەشامیشی سەرژمێر نەدەکرد کە کێڵگەکانی بەرهەمیان دەهێنا، بەڵکو ئەو نەخشەیەی تاوتوێ دەکرد کە دییگۆ ماگرۆ بە پەلە لە زیندانەکەی کێشابووی بەر لەوەی لە سێدارەی بدەن، خستبوویە بەردەمی ئەم. بیری نەگۆڕی سەرکەوتن لەو خاکە نادیارانە لە نیوەی خوارووی زەوی کە ماگرۆ نەیتوانیبوو بیهێنێتە دی، شەوان خەوی پێدرۆیان دەزڕاند. ئەوێ تاکە هەرێمێک بوو کە پێویستی بە داگیرکردن و ئاوەدانکردنەوە هەبوو، تاکە خاکێکی نەگەچراو بوو بۆ سەربازێکی وەک ئەم کە بتوانێ بە هۆیەوە بگاتە سەربەرزی و نەمری. حەزی نەدەکرد لە سایەی فرانسیسکۆ بێسارۆدا بمێنێتەوە و بە ئارامی لە پێرۆ پیر ببێت. نەشیدەویست بگەڕێتەوە ئیسپانیا هەرچەندە سامان و ڕێزێکی زۆری هەبوو. نیازی گەڕانەوە بۆ لای ماریناشی نەبوو کە چەند ساڵێکە بە وەفادارییەوە لە چاوەڕێیدایە و لە داواکارییەکانی ناو نامەکانی وەرسنابێت کە بە پیرۆزبایی و سەرزەنشتی بارکراون. ئاخر ئیسپانیا بۆ ئەم بووەتە ڕابردوو و شیلیش بووەتە ئاییندە.

نەخشەکە ئەو ڕێگەوبانانە دەگرێتەخۆ کە ماگرۆ لە هێرشەکەی گرتبوویە بەر و ناخۆشترین ڕێگەش لە لەسەر نەخشەکە: زنجیرە چیاکان و بیابان و ئەو ناوچانەبوون کە دوژمن لێی سەقامگیر بوونە.

ماگرۆ زۆر جار لێی دووبارە دەکردەوە و دەیگوت: ناتوانیت بۆ خوارووی ڕووباری پیۆ – پیۆ بپەڕیتەوە، هندییە مابۆچییەکان لێ ناگەڕێن.

ئەو وشانە بەردەوام لە گوێی بالدیبیا دەزرنگانەوە و لە هزری ڕادەچوون.

هەرچەندە هیچ گومانی لە ئازایی ماگرۆ نەبوو، وەلێ بیری دەکردەوە و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: من لەو ڕووبارە دەپەڕمەوە.

هزری بەو کاروبارانەوە سەرقاڵبووبوو، وەختێ لەو بارە پڕ لە دەنگ و هەرایەدا هاوارێکی سەرخۆشانە سەرنجی ڕاکێشا؛ بێدەستی خۆی بە بایەخەوە گوێی لێ گرت. دەنگەکە باسی دەرسدانی یەکێکی دەکرد کە شایانیەتی، ئەو کەسەش ژنێکی خۆبەزلزانە کە ناوی ئێنیسە و وێراوە بەگژ ئالاهەڵگرێکی پایەداردا بچێت لە سوپاکەی ئیمپراتۆری مەسیحییان کارلۆسی پێنجەم. ئەو ناوە لە لای بالدیبیاوە زانراو بوو، زۆری پێنەچوو بەبیری هاتەوە کە ئەو بێوەژنە گەنجەیە کە لە شەقامی پەرستگەی پاکیزەکان جل دەشوا و دەیاندووریتەوە. ئەم قەت خزمەتی ئەو ژنەی پێ نەگەیشتووە – دیارە بۆ ئەو مەبەستە کارەکەری هندی لە ماڵدا هەنە –، وەلێ جاروبار لە شەقام و کەنێسە دەیبینێ و بە دیقەت سەرنجی داوەتێ، چونکە یەکێکە لەو ژنە ئیسپانییە دەگمەنانەی شاری کۆسکۆ. لە بیری خۆیدا پرسی داخوا لێرە ژنێکی وەک ئەو دەبێ چەند خۆی ڕاگرێت. لە دوو بۆنەدا دوور بە دووری بە دوایدا چووە و چەند هەنگاوێک لە پشتییەوە ڕۆیشتووە. هیچ مەبەستێکی لەو بەدواداچوونە نەبووە تەنیا ئارەزووی دەکرد لە دواوەڕا لە جولەی سمت و کەفەڵی ڕامێنێت. ئاخر بە هەنگاوی قەرەجانەی جێگیرەوە دەڕۆیشت و تیشکی خۆریش لە سەر پرچە مسییەکەی پێچەوانە دەبووەوە. وای زەندەکرد کە ئەو ژنە لەخۆی ڕازییە و سروشتێکی بەهێزی هەیە، کە ئەمانە دوو مەرجن پێویستە لە کەسێتی ئەفسەرەکانیدا هەبن، وەلێ هەرگیز بیری نەدەکردەوە کە ئەو خەسڵەتانە لە ژنێکدا ببینێت. بالدیبیا تا ئەو کاتەش تەنیا ئەو کچانە سەرنجی ڕادەکێشان کە تازە پێڕادەگەن و ناسکن و ئارەزووی بە ئاگادێنن. هەر لەبەر ئەوەش بوو مارینای خواست. لە ئێنیسدا هیچ شتێکی لاواز و سادەیی بەدی نەدەکرا، بەڵکو زێتر لە ژنێکی مەترسیدار دەچوو. ئەو تا بڵێی زیندوو بوو و لە ڕەشەبایەکی دامرکاوە دەچوو، لەگەڵ ئەوەش ئەو خەسڵەتانەی زیاتر سەرنجی بالدیبیایان ڕادەکێشا.

لە نێو ئەو قسانەی کە لە دەنگە دەنگی ناو بارەکە لێی حاڵی بووبوو، بالدیبیا توانی لە پیلانی ئالاهەڵگری سەرخۆش تێ بگات، کە هاواری دەکرد و داوای لە دوو کەسی خۆبەخش دەکرد تا لەگەڵی بچن و بەو شەوە ژنەی لە ماڵەکەی خۆی بڕفێنن. لەگەڵ داواکارییەکەی پێ دەکەنی و قسەی ناشیرینی لە دەم دەهاتە دەرێ، وەلێ کەسێک بە پیل داواکەی نەچوو، چونکە کارێکی لەم چەشنە نەک هەر شورەییە، بەڵکو ڕەفتارێکی پڕ لە مەترسیشە. ئاخر بەزۆر لاقەکردنی ژنە هندییەکان شتێکی تەواو جیاوازە لەوەی غەدر لە بێوەژنێکی ئیسپانیایی بکەیت کە کەسی فەرمانڕەوا خۆی پێشوازیی لێی کردووە. هاوڕێکانی ئامۆژگارییان کرد کە ئەو بیرۆکەیە لە مێشکی خۆی دەربکات؛ وەلێ نۆنێس ڕای گەیاند کە ئەم ئەوەندە بێکەس نییە و خەڵکێک هەیە بۆ جێبەجێکردنی مەبەستەکەی یارمەتی بدات.

پێدرۆ بالدیبیا ئەو ماوەیە هەر چاوەدێری نۆنێسی دەکرد، دوای نیو سەعات لە شەقامەکە خۆی بە دوایدا چوو. پیاوەکە بە شپرزەییەوە چووە دەرێ بێ ئەوەی ئاگای لێ بێت کە یەکێک لە دوایەتی. ماوەیەکی کەم لە بەردەرگەی ماڵەکەم وەستا و بیری کردەوە داخوا دەتوانێ بەتەنیا ئەو کارە ئەنجام بدات، بەڵام بڕیاری دا ئەو جەربەزەییە نەکات؛ ئاخر هەرچەندە شەرابەکە کاریگەریی لەسەر مێشکی هەبوو، وەلێ دەیزانی کە ناودەنگ و ژیانی سەربازیی تووشی هەڵدێر دەبێت. بالدیبیا ئەوی بینی وا دوور دەکەوێتەوە، چونکە وەک کەسێک کە لە بۆسەدابێت، لە تاریکایی خۆی حەشاردابوو. کاتێکی زۆر لە چاوەڕێدا نەمایەوە، چونکە ئەوەندەی نەبرد دیتی دوو هندی بە دزی بە دەوری ماڵەکەی مندا دەسووڕێنەوە و لەو دەرگە و پەنجەرانەی کە دەڕواننە سەر شەقامەکە ورد دەبنەوە. کاتێکیش کە بینییان دەرگەکە لە ژوورەوەڕا گاڵە دراوە، بڕیاریان دا بە شوورە بەردینەکەدا هەڵگەڕێن کە بەرزییەکەی لە پێنج پێ زێتر نەدەبوو و لە لای پشتەوە پارێزگاری لە ماڵەکەم دەکات. لە دوای چەند خولەکێکی کەم خۆیان هەڵدایە ئەودیو و لە بەدبەختییان لە کەوتنەوەیاندا گۆزەیەکیان وەرگێڕا و شکاندیان. لەبەرئەوەی من خەوم

سـووک بوو، لەگـەڵ دەنگە دەنگەکـە بە ئاگـاهاتم. بەڵام پێـدرۆ لێـیان گـەڕا تا بزانێ دەگەنە کوێ، پاشان بە سـەر شوورەکەدا بە دوای ئەوانەوە بازی دا. لەو ئانەدا چرایەکم داگـیرسـاند و دەسـتم دایە کـێـردێکی درێژ کـە بۆ لەتکردنی گۆشتی کولێرە بەکارم دەهێنا. من ئامادەبووم بەکاری بێنم، بەڵام چووم نوێژم دابەستـا بەڵکە ناچاری ئەوە نەبم، چونکە سبـستـیان ڕۆمـێرۆ باری دەروونی گران کردبووم و نەمـدەویست بە کوشتنی یەکێکی تر ویژدانم بـارگرانتر بکەم. چوومـە نـاو حـەوشـە و کاتالیناش بە دوامـەوە بـوو، باشـترین شـت لەو دیمەنە ئەوەبوو درەنگ گـەیشـتین، چونـکە پێدرۆی سـوارچاک هەردوو هندییـەکەی لە گۆشـەیەک گـەمارۆ دابوو بە هـەمـان ئەو پەتە دەیبـەستنەوە کـە بۆ بەسـتنەوەی من هێنابوویان. ڕووداوەکـان زۆر خـێـرا تێ دەپەڕین، بالدیبـیـاش بێ ئەوەی خۆی مانـدوو بکات کە زێتر  زەردەخەنەی پێوە دیاربوو لەوەی کە تووڕە بێت و خۆی مشـەوەش بکات، ئاخر ڕووداوەکە بۆ ئەو دەتگوت گەمەی منداڵانە.

بارودۆخـەکـە پێکەنیناوی بوو. منیش بە قـژی تێکئـاڵاو و جلی نووسـتنەوە چووبوومـە حـەوشـە؛ کاتالینـاش بە زمـانی کـیـچـوایی نەفـرەتی لێ دەکـردن و هـەردوو هـندیـیــەکــەش لە ترســان دەلـەرزین؛ لەو لاش ڕێزدارێکی خــانەدان جـبـەیەکی قـەدیفـە و شـەرواڵێکی حـەریر و پۆسـتـاڵێکی بەرزی لەبەردابوو و شـمـشـێـرەکەشی لە دەسـت گـرتبـوو، وەختـێ بۆ سـەندنەوەی سـڵاوەکـەی من چەمایەوە، ڕیشـی کڵاوەکەی ئەرزەکەی دەماڵی. هـەردووکمان پێکەنین.

جوامێرانە هاتە قسە و گوتی: بەڕێزم، ئەو دوو بەدبەختە چی تر هـەراسانت ناکەن.

– نیـگـەرانبــوونی من بە هـۆی ئـەو دووانەوە نـیــیــە، بەڵکو بـە هـۆی ئـەو کەسـەوەیە کە ئەوانی ناردووە.

– ئەویش چی تر خۆی ڕیسوا ناکات، چونکە ئەو وەختە حسێبی لەگەڵ من دەبێت.

– جا ئایا ئێوە دەزانن ئەو کەسە کێیە؟

– بیرم بۆ کەسێک دەچێت، خۆ ئەگەر هەڵەش بم ئەوا ئەو دوو بەدبەختە لە ژێر ئەشکەنجەدا پێمان دەڵێن کە کێ ئەوانی ناردووە.

لەگەڵ ئەو قسەیەی هەردوو هندییەکە کەوتنە سەردەستیان تا پێڵاوی سوارچاکەکە ماچ بکەن و لێی پاڕانەوە تا نەیانکوژێت و ناوی نۆنێسی ئالاهەڵگریشیان دەهێنا.

– نا گەورەم، تکات لێ دەکەم نامەوێ لە حەوشەکەم کەس بکوژرێت، چونکە حەوشەکە پیس دەکەن و بەدبەختیمان بۆ دێنن.

بالدیبیا دیسان پێکەنی و دەرگەکەی کردەوە و بە سەرە شاپان لە پشتەوەی دەدان و ئاگاداری کردن کە هەر ئەو شەوە لە شاری کۆسکۆ بچنە دەرێ، دەنا خراپیان بەسەردێنێت.

گوتم: ئەی سوارچاک، دەترسم نۆنێس وەک تۆ نەیانبوورێت. لە عەرد و ئاسمان بە دوایاندا دەگەڕێت، چونکە ئەوانە زۆر شت دەزانن و بۆ ئەویش باش نییە ئەو دووە قسان بکەن.

وەڵامی دامەوە: خاتوونی بەڕێزم، پێم بڕوا بکە دەسەڵاتی ئەوەم هەیە کە ئالاهەڵگری ڕەوانەی دارستانەکانی چۆنچۆ بکەم و لەوێ بۆگەنی بێت، دڵنیاشت دەکەمەوە کە وا دەکەم.

من ئەو کاتە ئەوم ناسییەوە کە ئەوە سەرکردەی مەیدانی و پاڵەوانی چەندان شەڕە و یەکێکە لە دەوڵەمەندترین و دەستڕۆیشتووترین پیاو لە پێرۆ. لە چەند بۆنەیەکدا ئەوم بینیبوو، بەڵام هەمیشە لە دوورەوە کە بە ئەسپە عەرەبییەکەی و دەسەڵاتە سروشتییەکەی خۆی دەنازی.

***

لەو شەوەدا چارەنووسی ژیانی من و پیدرۆ بڕیاری لەسەر درا. ئێمە لە ڕابردوودا هەردووکمان لە چەندان بازنەدا کوێرانە بە دوای یەکتر دەگەڕاین، تا دواجار لە حەوشەی ماڵێک لە شەقامی پەرستگەی پاکیزان بەیەکگەیشتین. بە سوپاسەوە داوام لێی کرد کە بفەرمووێتە ماڵە بێ نازەکەم

تا ڕێزی لێ بگرم، لەو کاتەدا کە ئێمە بۆ ژوورەوە دەچووین، کاتالیناش چوو پەرداخێک بادە ئامادە بکات کە هەمیشە لە ماڵەکەم نەدەبڕا، تا پێشکێشی بکات. کاتالینا بەرلەوەی لە بەرچاوان ونبێت، وەک خووی هەمیشەیی خۆی، لە پشت میوانەکەوە هێمای بۆ کردم، ئیتر زانیم ئەوە ئەو پیاوەیە کە لە سەدەفەکانی بەختگرتنەوەم بینیومە. لە شوێنی خۆم حەپەسام، چونکە هەرگیز خەیاڵم بۆ ئەوە نەدەچوو کە بەختم بکەوێتە کۆشی پیاوێکی جوامێری وەک بالدیبیا. لەبەر تیشکی زەردی چراکەم، لە پێیەوە تێی ڕامام تا دەگاتە تەوقی سەری. ئەوەی بینیم بە دڵم بوو. دوو چاوی شین وەک ئاسمانی ئیستریمادۆرا، ئاکارێکی پیاوانە، ڕوخسارێکی کراوە هەرچەندە توند و بەهێز دیاربوو، قەڵافەتێکی جەنگاوەرانەی لێهاتوو، لە بەکارهێنانی شمشێردا دوو دەستی بتەوی هەبوون، وەلێ پەنجەکانی درێژ و جوان بوون. پیاوێکی ئاوا لە وڵاتی هندداان بێگومان خۆش ڕادەبوێرێ، چونکە زۆر لە پیاوەکانی ئەوێ بە هۆی شوێنی برینە ترسناکەکانیانەوە تووشی دوودڵی و نیگەرانی بوونە، یان چاوێک یا لووت یا پەلێکیان لەدەست داوە.

دەبێ ئەو منی چۆن هاتبێتە بەرچاو؟ ژنێکی لاواز، باڵا ناوەنجی، بە قژێکی پەرش و تێکەڵاو و دوو چاوی قاوەیی دوو برۆی ئەستوور و بە پێخواسی، کراسێکی نووستنی لە قوماشێکی هەرزانی لەبەردایە. ماوەیەک ئاوا تێکڕامایین و نیگامان دەگۆڕییەوە، بە بێدەنگییەک بۆ کاتێکی جاویدانی، بێ ئەوەی یەکێکمان بتوانێت چاوی لەسەر ئەوی تر هەڵگرێ. هەرچەندە ئەو شەوە دنیا زۆر ساردبوو، وەلێ من لە پێستمدا هەستم بە ئاگر دەکرد و ڕێچکەیەک ئارەقە بە پشتمدا دەچووە خوارێ. دەزانم ئەویش کەوتووەتە بەر تەوژمی هەمان ڕەشەبا، چونکە هەوای ژوورەکە چڕ بووبووەوە. لە هیکڕا کاتالینا لە هیچەوە پەیدابوو و پەرداخێک بادەشی بە دەستەوە بوو؛ وەلێ وەختێ کە زانی چ ڕوو دەدا، خۆی لە بەرچاوان بزر کردەوە و بە تەنیای هێشتینەوە.

ڕۆژانی دواتر پێدرۆ سەلماندی کە ئەو شەوە ئەم دەستپێشخەری بۆ

خۆشەویستی نەکردووە، چونکە پێویستی بە کات هەبووە تا ئارامبێتەوە و بیر بکاتەوە. لە پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی یەکجار زۆر پێی گوتم: ئەو کاتەی تۆم بینی، یەکەم جارم بوو لە ژیانم هەست بە ترس بکەم!.

ئەو پیاوە دۆست و هاوڕێی ئەوینیی نەبوو، کەسێک نەیبیستووە کە ئەویندارێکی هەبێت و قەت لەگەڵ ژنە هندییەکانیش پێوەندی نەبەستبوو، وەلێ من وای دادەنێم جاروبار بە پارە لەگەڵ هەندێ ژن ڕای بواردبێت. ئەو هەمیشە بە شێوازی خۆی بۆ مارینا ئۆرتیس دی گایتی بەوەفابوو و لە ئاستیدا هەستی بە لاوازی هەڵوێستی خۆی دەکرد. ئاخر هێشتا تەمەنی سێزدە ساڵان بوو کە خۆشی ویست، بەڵام بەختەوەری نەکرد و بەجێی هێشت و ڕووی لە وڵاتانی هندان کرد. بە هۆی ئەوەوە لە بەرامبەر خوا هەستی بە بەرپرسیارێتی دەکرد. بەڵام من سەربەست بووم، هەتا ئەگەر پێدرۆ چەندان ژنیشی هەبێت، من هەر خۆشم دەوێت... ئەوە قەدەرێکە و ناتوانم لێی دەرچم. ئەو تەمەنی نێزیکەی چل ساڵ دەبوو، منیش لە سیساڵیدا بووم. هیچ یەکێکمان نەدەبوو کات لەدەست خۆی بدات، لەبەر ئەوە کارەکانم بەو شێوەیە ئاراستە کرد کە ڕەوتی خۆیان وەرگرن کە نەدەکرا بە جۆرێکی تر بێت.

چۆن ئاوا بەو پەلەیە گەیشتینە ئامێزی یەکتر؟ کامەمان پێشتر دەستی ئەویتر گرت؟ کامەمان بە دوای لێوەکانی ئەوی تردا گەڕاین تا ماچیان بکەین؟ گومانی تێدا نییە کە ئەو دەستپێشخەریانە لە منەوە بووە. دواجار من توانیم بێمە قسە و ئەو بێدەنگییە بشکێنم کە بەو نیازانە بارگاوی بووبوون نیگاکانمان تێدا گۆڕیبووەوە. من بێ پێشەکی پێیم گوت کە لە مێژە چاوەڕێی ئەوم، چونکە لە خەونەکانمدا و لە مۆروو و شەیتانۆکەکانی بەختگرتنەوە ئەوم بینیوە و من ئامادەم بۆ تا هەتایە و بۆ سەردەمەکانی تریش ئەوم خۆش بوێت، بێ ئەوەی هیچ شتێکی لێ بشارمەوە و بێ شەرم یان حەیا. پێدرۆ بە ڕەقی و بە ڕەنگی پەڕیوەوە کشایەوە دواوە تا پشتی بە دیوارەکە کەوت. کامە ژنی ڕێزدار بەو شێوەیە قسان بۆ پیاوێکی نامۆ دەکات؟ لەگەڵ ئەوەش وا نەهاتمە بەرچاوی کە عەقڵی خۆم بزرکردبێت یان ژنێکی سۆزانی و بەرەڵابم لە

کۆسکۆ، چونکە ئەویش لە ناو ئێسقانەکانییەوە و لە بۆشایی ڕوحیدا ڕاست و ڕەوان هەستی دەکرد کە ئێمە بۆ ئەوە دروست بووینە تا یەکترمان خۆشبووێت.

هەناسەیەکی درێژی دایەوە کە لە گریان دەچوو و بەدەنگێکی نوساوەوە ناوی هێنام.

من وای لێ حاڵی بووم کە گوتی: منیش لە ئەزەلەوە چاوەڕێی تۆ بووم.

وا دەزانم ئێمە لەگەڵ تێپەڕبوونی ژیان هەندێ لە یادەوەرییەکانمان جوان دەکەین و هەوڵ دەدەین هەندێکیشیان لەبیر بکەین. بەڵام من لێی دڵنیام کە ئێمە لەو شەوەدا خۆشەویستیمان گۆڕییەوە و لە یەکەمین دەستەملانێدا هەمان حەسرەتمان هەڵدەکێشا.

بالدیبیا کە لە نێو جەنگەکاندا دروست بووبوو، هیچی لە بارەی خۆشەویستییەوە نەدەزانی، وەلێ وەختێ بەسەریدا هەڵی کرد بۆ وەرگرتنی ئامادەساز بوو؛ هەردووکمان خاوبووینەوە و کەوتین، ئەو لەسەرە من، ماچی دەکردم و گەزی لێ دەگرتم، لە کاتێک بە دڕین جبە و شەرواڵەکەی لە بەرخۆی دادەکەناند و پۆتین و گۆرەوییەکانی لە پێ دەکردنەوە، بە حەسرەتەوە لە چاوەکانیشی تروسکەی گەنجێکی تامەزرۆم بەدی دەکرد. لێی گەڕام هەرچی دەیەوێ بیکات، بۆ ئەوەی هەڵچوونەکەی دامرکێتەوە؛ چەند لە مێژە لە باوەشی ژنێکدا خۆی نەدۆزیتەوە؟ بە سینەی خۆمەوە بەندم کرد و هەستم بە لێدانی دڵی و گەرمییە حەیوانییەکەی و بۆنی نێرانەی دەکرد. پێدرۆ پێویستە زۆر شتان فێربێت، وەلێ پەلەی ناوێ، ئاخر هەموو ژیانی خۆمانمان لە بەردەم ماوە و منیش مامۆستایەکی شارەزام؛ لانی کەم لەو بارەیەوە دەتوانم سوپاسی خوان دی مەلەگە بکەم. وەختێ کە پێدرۆ زانی ئەوەی لە پشت دەرگە داخراوەکان فەرمان دەدا منم و ئەوەش هیچ نەنگییەکی تێدا نییە، ئیتر بە دەروونێکی ئارامەوە ئامادەیی خۆی نیشان دا بۆ ڕێنوێنییەکانم. ئەمەیان نەختێ درەنگ هاتە دی، چوار پێنج شەوی برد، چونکە ئەو پێی وابوو کە سەردانەواندن هەمیشە هەر بۆ ژنانە و زاڵبوونیش بۆ پیاوان؛ ئەمەیانی لە

ئاژەڵەکان دیبوو و لە پیشەی سەربازیش فێری بووبوو، وەلێ ئەزموونەکانی چەند ساڵەی خوان دی مەلەگە بە فیرۆ نەچوون کە فێری دەکردم کە چۆن بە جەستەی یەکتر ئاشنابین. من هەمیشە دەمگوت کە پیاوان هەموو وەک یەک نینە، بەڵام زۆر لێک دەچن و بە شارەزاییەکی کەم هەر ژنێک دەتوانێ خۆشییان پێ ببەخشێ. بەڵام ئەمەیان پێچەوانەکەی ڕاست نییە؛ واتە دەگمەنن ئەو پیاوانەی کە دەتوانن ژنان ڕازی بکەن و کەمترینیشیان ئامادەیی ئەوەیان هەیە وا ڕەفتار بکات. پێدرۆ زیرەک بوو وەختێ شمشێرەکەی لەولای دەرگەکە دانا و خۆی دایە دەستم. وردەکارییەکانی شەوی یەکەم زۆر گرینگ نەبوون، ئەوەندە بەسە بڵێم کە هەردووکمان خۆشەویستی ڕاستەقینەمان دۆزییەوە، چونکە ئێمە تا ئەو کاتەش نەماندەزانی جەستە و ڕوح چۆن پێکەوە دەتوێنەوە. پێوەندی من لەگەڵ خوان پێوەندییەی جەستەیی بوو و پێوەندی ئەویش لەگەڵ مارینا ڕوحی بوو، وەلێ پێوەندییەکانی من و ئەو گەیشتە سنووری کامڵ بوون.

بالدیبیا دوو ڕۆژان لە ماڵەکەم نەچووە دەرێ. ئەو دوو ڕۆژە دەرگە و پەنجەرەکانمان نەکردەوە و کەسیش کولێرەی دروست نەکرد. ژنە هندییە کارەکەرکانیشم بە بێدەنگی بەسەری پەنجەیان دەهاتن و دەچوون و کاتالیناش دروستکردنی شۆربای گەنمەشامی بۆ سواڵکەرەکان گرتە ئەستۆی خۆی. ئەو ژنە وەفادارە بادە و خواردنی دەهێنایە تەک چوارپاکەمان؛ گۆزەیەک ئاوی کولاویشی ئامادە کرد تا خۆمان پێی بشۆین، ئەمەیان نەرێتێکی پێرۆیی بوو لەوێ فێری کردبووم. ئاخر وەک هەموو ئیسپانییەکان، پێدرۆ بڕوای وابوو کە گەرماوکردن خراپە و دەبێتە هۆی هەوکردنی سییەکان و کەمخوێنی، وەلێ دڵنیابووم کە خەڵکی پێرۆ هەموو سبەینەیەک خۆیان دەشۆن و کەسیش تووشی ئەو نەخۆشیانە نابێت. دوو ڕۆژان بە خێرایی ڕابردن و ئێمەش ڕابردووی خۆمان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە و لە نێو ڕەشەبایەکی سووتێنەردا لە خۆدانەدەستی یەکتری کە قەت تەواو نەدەبوو و ئارەزووی شێتانە بۆ توانەوە لەویدی، ئەویندارییمان دەکرد، - ئاه ئەی پێدرۆ!

– ئاه ئەی ئێنیس! –، بەیەکـــەوە دادەڕووخـــاین و قـــاچ و باڵەکـــانمان تێکئالاّبوون، نەدەمـاین و بە ئارەقـە خۆمان دەشـووشت و بە چرپە یەکتریمان دەدواند. دوای ئـەوە ســـەرلەنوێ بە ئارەزوویەکی بەجـــۆشـــتـــر دەهـاتینەوە ئەویندارى؛ بۆنی پیـاو – ئاسن، بادە و ئەسپ –، بۆنی ژن – مـەتبەخ، دووکەڵ و دەریا –، بۆنی هـەردووکـیـان بەیەکەوە ئەوەندە خـۆشـە لە بیـر ناچنەوە. ئەوە بۆنی خـۆشی دارسـتـانە.. شـۆربـایەکی چڕە. فـێـربووین تا بەری ئاسـمـان بەرزبینەوە و پێکەوە ناڵەمـان بێت، پێکراوی هەمـان ئەو قـامـچـییـەین کـە دەمانگەینێتـە لێوارەکانی مردن، پاشـان لە خـەوێکی قـووڵ غـەرقمان دەکات. هـەرکـاتێ بە ئاگـا دەهاتین جـار لە دوای جـار خـۆشـەویسـتـییـەکی تازەمـان دادەهێنا، تا بەیانی ڕۆژی سـێیـەم بە بانگی کەڵەشـێرەکانی و بۆنی نـانەکانی، ئەو کاتە پێدرۆ ڕای گۆڕا و داوای شمشێر و جلەکانی کرد.

***

ئاخ! هزر چەندە یاخییە! بیر و هۆشم بە ئاشتەوایی جێم ناهێڵن، مێشکم تژی وێنە، وشـە، ئازار و خـۆشـەویسـتی دەکـات. وا هـەست دەکـەم کـە من جـارێکی تریش دەگـەڕێمـەوە ئەو ژیانەی کـە تێـیـدا ژیام. مـاندووبوون لە نوسـینەوەی ئەو چیرۆکە لە هزرکردندا نییە، بەڵکو لە هێدی گـواسـتنەوەیەتی بۆ سەر کاغەز. من قەت دەست و خەتم خۆش نەبووە، هـەرچەندە گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ زۆری لەگەڵ هەوڵدام، وەلێ ئێستا وا ناخوێندرێتەوە. من هـەندێک بە پەلەم، چونکە حـەفـتـەکـان دێن و ئاوا دەبن و منیش هێـشـتـا زۆرم مـاوە بیـگێـڕمــەوە. من مـــاندوو دەبم. پەڕامـــووچەکـــەش کـــاغـــەز دەدڕێـنێ و بە مەرەکەبەکەوە پیس دەبێ و دەکەوێتە خـوارێ. بە کورتییەکەی ئەو کارە بۆ من گەورەیە. بۆ دەبێ پێداگری بکەم؟ ئەوانەی چاک دەمناسن هەموویان مردوونە، تەنیا تۆ ئەی ئیزابێل، ڕەنگە بیرۆکەیەکت لەکن هەبێت و بزانیت من کێم، وەلێ ئەو هزرە بە خـۆشـەویستی و ئاین ئاڵۆزکاوە کە وا دەزانیت بەوانە قـەرزاری منیت. تۆ بە هیچ شتێک قەرزاری من نیت، ئەمەیانم چەندان جار پێ گوتووی؛ ئاخـر من قـەرزاری تۆم، چونکە هـاتووی بۆ ئەوەی پێویسـتـییـە قووڵەکانم تێر

بکەیت تا ببمە دایک. تۆ هاوڕێ و خەمڕەوێنی منی و تاکە کەسێکی کە بە نهێنییەکانم دەزانیت، بەوانەشەوە کە حەیا ڕێگربوو لەگەڵ باوکت دابەشی کەم. ئێمە پەیوەندیمان زۆر باشە، من و تۆ، ئاخر تۆ دڵت خۆشە و پێکەوە پێ دەکەنین، من سوپاست دەکەم چونکە لەگەڵ منداڵەکانت هاتووی لێرە بژیت، هەرچەندە ماڵەکەتان هەر دوو - کوادەر - لێرە دوورە. تۆ بیانوو دەهێنیتەوە کە پێویستیت بە هاوڕێ هەیە، لە کاتێک مێردەکەت لێت دوورە و لە جەنگە، وەک مێردەکەی من و پێشان، بەڵام من بڕوات پێ ناکەم. چونکە ڕاستییەکەی ئەوەیە کە تۆ دەترسیت من بە تەنیا لەو خانووە گەورەیە بمرم کە بەو زووانە دەبێتە هی تۆ، هەروەک چۆن هەموو سەروەت و سامانی دنیاشم هەر بۆ تۆیە. وەختێ کە بە دەوڵەمەندی دەتبینم زۆر دڵخۆش دەبم؛ دوای ئەوەی ئەو بەڵێنەی بۆ پاراستنی تۆ بە باوکتم دابوو، وەختێ کە تۆی بۆ ماڵەکەم هێنا، بە تەواوی جێبەجێم کرد، دەتوانم بە دڵنیایی بچمە دنیاکەی تر. ئەوکاتە من هێشتا ئەوینداری پێدرۆ دی بالدیبیا بووم، بەڵام ئەوە ڕێگەی لێ نەگرتم بۆ ئەوەی ئامێزی فرەوانی خۆمت بۆ بکەمەوە. لەوان ڕۆژاندا شاری سانتیاگۆ لەو هاتوهاوارە ئارام بووبووەوە کە هندییەکان لە یەکەم هێرشدا دروستیان کرد. ئێمەش لە هەژاری ڕزگارمان بووبوو و نەختێ خۆشگوزەران بووبووین، هەرچەندە سانتیاگۆ مابوو ببێتە شارێکی تەواو، بەڵکو هێشتا هەر شارۆچکەیەک بوو. ڕۆدریگۆ دی کیرۆگا بە هۆی خەسڵەت و کەسێتییە پاکەکەی خۆی بووە یەکێ لە ئەفسەرە هەرە نێزیکەکانی پێدرۆ و چاکترین هاوڕێی منیش. دەمزانی منی خۆش دەوێت، چونکە ژنان هەمیشە ئەوەی باش درک دەکەن، هەرچەندە هیچ نیشانەیەک یاخۆ وشەیەکی لە دەم دەرنەچوو کە ناخی ئاشکرا بکات. ئاخر ڕۆدریگۆ لەبەرئەوەی زۆر بۆ پێدرۆی سەرکردە و هاوڕێی وەفاداربوو، قەت ڕێگەی بە خۆی نەدەدا کارێکی وا بکات، جا با نهێنی ناخی دڵیشی بێت. وا دەزانم منیش ئەوم خۆش دەویست - چونکە ژن دەتوانێ لە یەک کاتدا دوو پیاوی خۆش بوێت -، وەلێ ئەو هەستەم دەشاردەوە تا شەرەف و ژیانی ڕۆدریگۆ نەخەمە بارێکی پڕ لە مەترسی. هێشتا وەختی

ئەوە نەهاتووە تا باسی ئەو هەموو شتەت بۆ بکەم، وەلێ دوایێ وەختی دێت.

هەندێ شت هەنە لە بەر سەرقاڵبوونم بە کاری ڕۆژانە، بوارم نەبووە پێتی بڵێم، ئەگەر ئێستا نەیاننووسمەوە، ئەوا لەگەڵ خۆم دەیبەمە ژێر گڵ. من هەرچەندە زۆر حەزم لە وردەکارییە، وەلێ زۆر شتیشم لەبیر دەچێت. من دەبووایە تەنیا گەوهەری شتەکان باس بکەم، بەڵام بڕوام وایە کە خیانەت لە ڕاستییەکان نەکەم. ئەمەیە چیرۆکی من و چیرۆکی پێدرۆ دی بالدیبیا کە تۆمارکەرەکانی هەواڵ هەموو نەبەردییەکانی ئەویان بە تەواوی نووسیتەوە و لاپەڕەکانیان تا کۆتاییی ڕۆژگارەکان هەر دەمێنێت؛ لەگەڵ ئەوەش من دەزانم هەندێ شت هەنە مێژوو هەرگیز ناتوانێ بە دوایاندا بچێت: ئەو لە چی دەترسا و چۆن خۆشەویستیی دەرکرد.

***

پێوەندیم لەگەڵ پێدرۆ دی بالدیبیا کیانی هەڵتەکاندم. نەمدەتوانی بە بێ ئەو بژیم و ئەگەر ڕۆژێک نەمدیتبایە تام دەهاتێ و هەر شەوێک ڕابردبایە و لە باوەشی ئەودا نەبوومایە ئازارم دەکێشا. لە سەرەتادا تەنیا هەر خۆشەویستی نەبوو، بەڵکو لەوەش زێتربوو، شەیداییەکی کوێرانە بوو، لە هەموو کۆت و بەندێک دەرچووبوو، لە خۆشبەختی مندا ئەویش هەمان هەستی بەرامبەرم هەبوو، خۆ ئەگەر وا نەبووایە، شێت دەبووم. پاش ئەوە، کاتێ لە کۆسپەکانی قەدەر دەربازبووین، شەیدایی جێگەی بۆ خۆشەویستی کردەوە. من چەندم حەز لێی بوو، ئەوەندەش ڕێزم لێی دەگرت، بە تەواوی خۆم دایە دەست وزە و تاقەتی ئەو، ئازایەتی و نموونەییبوونی ئەو فریویان دەدام. پێدرۆ بە شێوەیەکی سروشتی دەسەڵاتی خۆی پێڕەو دەکرد، تەنیا ئامادەیی ئەو، گوێڕایەڵی دەهێنایە نێو ژیان. کەسێتییەکی خۆسەپێنەری هەبوو بە جۆرێک کەس نەیدەتوانی لە ڕووی بوەستێ، وەلێ لە بەیەککەیشتنە گەرمەکانماندا بە تەواوی دەگۆڕا. لە نێو نوێندا بۆ من بوو، وەک گەنجێک لە کاتی یەکەمین خۆشەویستی، بە تەواوی خۆی دەدایە دەستم. ئەو لەوە ڕاهاتبوو کە لە شەڕدا دڵڕەق و خێرا و نیگەران بێت؛ لەگەڵ ئەوەش توانیمان ڕۆژانێکی تەواو بە

تەوەزەلێ و بێکاری بەرێکەین، ئەو ڕۆژانەمان بۆ یەکترناسین و گێڕانەوەی بە پەلەی وردەکاری چارەنووسمان تەرخان کرد، وەک ئەوەی هەر حەفتەیەکمان لە ژیاندا مابێت. من بووم کە حسێبی ئەو ڕۆژ و سەعاتانەم دەکرد کە پێکەوە بەسەرمان دەبردن، ئاخر ئەمە گەنجینەی من بوو، وەلێ پێدرۆ دەستەملانە و ماچەکانی دەژماردن. من لەوە سەرسامم کە هیچ یەکێکمان تووشی بێزاری نەدەبووین بەو سۆزەی کە ئەمڕۆکە لە دوورەوە دەیبینم چەندە توند و خۆسەپێنەربووە.

پێدرۆ جگە لەو ڕۆژانەی کە پێویست بوو بچێتە شاری پاشاکان یان سەردانی موڵکەکانی بکات لە بۆرکۆ و لاکانیلا، شەوەکانی تری لە ماڵی من بەسەردەبرد، چونکە منی لەگەڵ خۆی نەدەبردە ئەو شوێنانە. کە بە سەر پشتی ئەسپەکەیەوە دەمبینی یان ئەو وەختەی لە نێو هاوڕێ ئەفسەرەکان و سەربازەکانیدا دەمبینی کە وەک سەرکردەیەک ڕەفتار دەکات، زۆر پێی سەرسام دەبووم. ئەو زۆر شتی دەزانی کە من پێشتر بیرم لێیان نەکردبووەوە و لەگەڵ مندا قسەی لەسەر ئەو بابەتانە دەکرد کە بۆی دەخوێندمەوە و هزرەکانی سوودیان پێ دەبەخشیم. زۆر نەرمونیان بوو لەگەڵم و جلوبەرگی نایاب و قوماش و خشڵ و پارەی زێڕی پێشکێش دەکردم. لە سەرتادا ئەو بەخشندەییەی پەستی دەکردم، چونکە وام دەزانی دەیەوێ بەو شتانە خۆشویستیم لێ بکڕێت، وەلێ پاشان لەسەر ئەوە ڕاهاتم. دەستم کرد بە پاشەکەوتی و بیرم بۆ ئەوە دەچوو شتێکی مسۆگەرم هەبێت بۆ ئاینده. دایکم هەموو جارێ دەیگوت: «کەس نازانێت لە ئایندە چ ڕوو دەدات». هەر ئەویش فێری کردم کە پارە بدەمە لا و پاشەکەتی بکەم. سەرەڕای ئەوانەش من دەمزانی کە پێدرۆ کابانێکی باش نییە و دەستبڵاوە و وەک خانەدانەکانی تری ئیسپانیا گرینگی بە موڵکەکانی نادات، چونکە ئەو خۆی لە کار یان ئەو پارە ڕیسوایە بەرزتر دەبینێ کە دەتوانێ وەک خانەدانێک خەرجی بکات، وەلێ نازانێت چۆنی بەدەست بێنێ. ئەو سەروەتەی کە لە بێسارۆوە لە شێوەی زەوی و کانگەکان پێی بەخشرا بوو، لە کرانەوەی بەخت دەچوو، چۆن بە

ئاسـانی دەسـتی کەوتبوو، ئامادەبوو ئەوهاش بە ئاسـانی لە دەسـتی بدات. ڕۆژێکیان وێرام پێی بڵێم کە من زۆر لە دەسـتبڵاوییەکەی دەترسم، چونکە من هەر لە منداڵییەوە ناچاربوومە کار بکەم تا بژێوی خۆم دابین بکەم، وەلێ ئەو بە مـاچێک بێـدەگی کـردم. پاشـان گـوتی: زێڕ بۆ ئەوەیە خـەرجی بکەیت، سوپاس بۆ خوا زۆرم لێی هەیە.

من بەو قسەیە دڵم ئاوی نەخواردەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە زیاتر مەترسیم لێ نیشت.

بالدیبیا بە پێی سیستەمی ڕاسپێری بە ڕێزێکی زیاتر لە ئیسپانییەکانی تر لەگـەڵ ئەو هندییـانە دەجـولایەوە کـە لە کنی کـاریان دەکـرد، بەڵام هەمـیشـە توندبوو. بڕیاری لەسـەر دیارکـردنی کـاتی کـارکـردن دا و خـۆراکی باشی دەدانێ و چاودێرەکـانی کـاریشی ناچار دەکـرد کـە ئاگـەداری سـزادان بن و بێویژدانی نەکـەن، کـەچی لە کێڵگە و کانگەکانی تـر بەزۆر ئیشـیان بە ژن و منداڵ دەکرد.

کـاتێ لەبارەی ئەو ئیشوکارانەوە قسـەم لەگەڵی دەکرد بـە لووتبەرزییـەوە لە وەڵامی مندا گـوتی: ئـەی ئێنیس، من ئـەوها نیـمـە، مـن تا پێم بکرێ ڕێز لە یاسای ئیسپانیا دەگرم جا لە هەر کوێیەک بم.

– جا کێ ئەو سنوورانە دیار دەکات؟

– ڕەوشـتی مـەسـیـحییـانـە و عـەقـڵی دروست. ئاخـر هـەر وەک چۆن نابێت هێسترەکان باریان قورس بێ و هیلاک بکرێن، ئاواش نابێ هندییەکان خراپ بەکار بێنین، چونکە بەبێ ئەوان کانگا و کێڵگەکان هیچ سوودیان نییە. من حەز دەکەم بە خۆشی و دڵنەوایی لەگەڵیان بژیم، هەرچەندە بەبێ بەکارهێنانی هێز ناتوانرێ گوێڕایەڵ بکرێن.

– باوەڕ ناکەم بەکارهێنانی هێز بۆ ئەوان سوودی هەبێت ئەی پێدرۆ.

بۆ بەرپەچدانەوەی من گوتی: ئایا گومانت لە سوودەکانی مەسـیـحییـەت و شارستانییەکەیان هەیە؟

– دایکە هندییەکانی ئێرە هەندێ جار منداڵە تازەبووەکانیان فڕێ دەدەن و لە برسان دەمرن پێش ئەوەی ڕەحمیان بکەوێتە سەریان و خۆشیان بووێن، چونکە دەزانن کە گەورەبوون، لێیان دەسێنن و دەیانکەنە کۆیلە. ئایا بەر لە هاتنی ئێمە حاڵیان باشتر نەبوو؟

– نا ئەی ئێنیس. جاران بە دەستی ئینکا لە ئێستا خراپتر دەچەوسێنرانەوە. ئێمە پێویستە چاو لە ئایندە بکەین. ئێمە لێرەین و دەشمینێین، ڕۆژێک دادێ نەوەیەکی تازە بکەوێتەوە، تێکەڵەیەک لە ئێمە و لە ژنە هندییەکان و هەموویان لە سەر ئاینی مەسیحی دەبن و زمانی قشتاڵی و یاسا یەکیان دەخات، ئەو کاتە ئاشتەوایی و پێشکەوتن سەراپای ئەو وڵاتانە دەگرێتەوە.

پێدرۆ باوەڕی ئاوابوو، وەلێ پێش ئەوەی ئەمە بە چاوی خۆی ببینێ مرد و منیش دەمرم و ئەو خەونە نایەتە دی، چونکە ئێمە لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٥٨٠ داین و هەروا هندییەکان ڕقیان لێمان دەبێتەوە.

زۆری نەبرد خەڵکی کۆسکۆ لەوە ڕاهاتن کە ئێمە ژن و مێردین، هەرچەند وام خەیاڵ دەکرد کە لە پاشملە قسەی ناشیرینمان لەسەر دەکەن. ئەگەر لە ئیسپانیا بوومایە وەک دۆستی ئەوینی پێدرۆ هەڵسوکەوتیان لەگەڵم دەکرد، وەلێ لە پێرۆ کەس بێرێزیم لەگەڵ ناکات، لانی کەم لە بەرامبەرم، چونکە ئەوە دەبێتە سووکایەتیکردن بە پێدرۆ دی بالدیبیا. هەموو دەیانزانی کە لە ئیستریمادۆرا ژنی هەیە، بەڵام ئەگەر بە هەڵە نەچووبم، نیوەی ئیسپانییەکان وابوون، ژنە شەرعییەکانیان تەنیا بیرەوەرییەکی تەماوی بوون؛ ئەوان لە جیهانی تازە پێویستیان بە خۆشەویستییەکی سەرپێی یان جێگرەوەی ژنەکانیان هەبوو. سەرەڕای ئەوانەش پیاوەکان لە ئیسپانیاش دۆستی ئەویندارییان هەیە؛ سەراپای ئیمپراتۆریەت بە نەوەی زینا متوربە کرابوو، هەتا زۆربەی ئەوانەی بۆ کاری داگیرکاریش هاتوونەتە جیهانی تازە، نەوەی زینان. لە دوو بۆنەدا پێدرۆ باسی خۆی بۆ کردم کە هەست بە ئازاری ویژدان دەکات، نەک لەبەرئەوەی کە چی تر مارینای خۆش ناوێ، بەڵکو لەبەرئەوەی

ناتوانێ زەمـــاوەند لەگـــەڵ من بکات. هـەوها گـــوتی کـــە بۆم هەیە شــوو بە هەرکـەسـێک بکەم لەوانەی پێشـتـر منیـان خـۆش دەویست وەلێ ئێسـتـا جەسارەت ناکەن سەیرم بکەن. بەڵام ئەو گریمانەیەم پێ خۆش نەبوو. ئاخر هەر لە سـەرتاوە شتێکی ڕوون بوو کە من و پێدرۆ ناتوانین ببینە هاوسەر ، تەنیـا ئەگـەر مـارینا بمرێت کـە ئەوە نە من و نـە ئەویش خـوازیاری نـەبووین؛ لـەبەر ئـەوە ئـەو هیـــوایەم لـە دڵی خـــۆم دەرهـێنا و خـــۆم بۆ ئاهـەنگی ئـەو خـۆشـەویسـتی و ڕێککەوتنەکـانی نێـوانمان ئامـادە کـرد کـە هـەردووکـمـان بەشـمـان لێی هەبوو، بێ ئەوەی بیر لە ئاینده یان قسـەوقسـەڵۆک و ئابڕوو و گوناه بکەمـەوە. ئێمـە عاشق و هاوڕێ بووین و بە دەنگی بەرزەوە گفتوگۆمان دەکرد، چونکە هـەردووکمـان سروشـتێکی هێمنمـان نەبوو، وەلێ ئەمـە نەبووە هۆی جیابوونەوەمان. لە شەوی دووەمی ئەویندارییمان پێم گوت: لێرە بە دواوە من پشـتت دەگـرم ئەی پێـدرۆ، بەجـۆرێک لە کـاتی شـەڕدا تۆ هەمـوو زەینت بخەیتە سەر بەرامبەرەکەت.

ئەو قسـەیەی منی بە وردی وەرگرتبوو قەت لە بیری نەدەچووەوە. منیش لە لای خۆمەوە فێربووم ئەو بێدەنگییە بێهوودەیە بشکێنم کە لە کاتی تووڕەیی بەسـەرم دەهات. ئاخر کـە بۆ جاری یەکـەم ویسـتم بـە بێدەنگی سـزای بدەم، پێـدرۆ بە هەردوو دەسـتی بنـاگوێی گـرتم و چاوە شـینەکـانی لە چاوم نا و ناچاری کـردم پێی بڵـێم کـە بۆ لێی تووڕەمـە و پێی گـوتم: ئەی ئێنیس، من نازانم دڵی تۆ چی تێدایە، دەتوانین ڕێگەکە کورت بکەینەوە ئەگەر پێم بڵێیت چیت لێم دەوێ.

وەختێ کە ئەویش سەبری نەدەما و لەخۆبایی دەبوو یان بڕیارێکی نابەجێی بدایە، منیش بە هەمـان شێوە ڕووبەڕووی دەبوومـەوە. ئێمـە هەردووکمـان لێک دەچووین، هەردووک بەهێز و توند و بەئاوات بووین، ئەو دەیویست شانشینێک دامـەزرێنێ و منیش دەمـویست هـاوڕێی بم. ئەوەی ئـەو هەسـتی پێ دەکـرد، منیش هەستم پێی دەکرد، ئیتر بەوجۆرە خەونەکانمان دابەش کردبوو.

لە سـەرتادا کە باسـی وڵاتی شیلی بۆ دەکردم من تەنیـا گوێم لێی دەگرت.

نەمدەزانی مەبەستی چییە، وەلێ خۆم لەو دەراوە نەدەدا کە نایزانم، پاشان بە هۆی ئەو سەربازانەی کە جلیان بۆ شۆرین دەهێنا، یان کولێرەیان لێم دەکڕی، زانیم مەبەستی چییە. ئیتر هەر لەوانەوە زانیم کە دیێگۆ ماگرۆ چۆن لە هەوڵەکەی بۆ داگیرکردنی شیلی سەرنەکەوتووە. ئەو پیاوانەی لەو هەڵمەتە و لە شەڕی لاس سالیناس ڕزگاریان بووە کەسیان تەنیا فلسێکیان لە گیرفاندا نییە و بە جلی دڕاوەوە دێن و دەچن زۆر جاریش بە دزی دێنە بەردەرگەی حەوشە بەڵکە خواردنیان دەستکەوێ، هەر لەر ئەوەیە پێیان دەڵێن "شیلییە شاشەکان". هەرچەندە ئەوانە لە هندییەکان نەدارتر بوون بەلام بۆ سواڵکردن نەدەچوونە نێو گەڕەکەکان، چونکە هەموو کەسێک شانازی بەوە دەکرد یەکێک بووایە لەوان، ئاخر ئەو وشەیە هێمایەک بوو بۆ ئازایی و پێشڕەوی و بەئەزموونی و نەفسبەرزی. بە پێی قسەی ئەوانە شیلی خاکێکی نەفرەتلێکراوە، بەلام دەمزانی کە پێدرۆ دی بالدیبیا هۆکاری دروستی بە دەستە بۆ چوونە ئەوێ و لە کاتی گوێگرتنم لێی، منیش حەماسەتم بۆ هزرەکەی هەبوو.

پێی گوتم: هەوڵ دەدەم شیلی داگیر بکەم، هەتا ئەگەر ژیانی خۆشم لەسەر دانابێت.

– منیش لەگەڵت دێم.

– ئەو ئەرکە بۆ ژنان گونجاو نییە، ناتوانم ژیانی تۆ بخەمە مەترسییەوە، ئەو کارە جەربەزەییە ئێنیس خان، وەلێ ئارەزووش ناکەم لێت دوور بکەومەوە.

– نابێ بیر لەوە بکەیتەوە! یان پێکەوە دەڕۆین یان هیچمان ناڕۆین.

***

چووینە شاری پاشاکان کە لەسەر گۆڕستانی ئینکا دروست کراوە، بۆ ئەوەی پێدرۆ بتوانێ مۆڵەت لە فرانسیسکۆ بێسارۆ وەرگرێت تا بەرەو شیلی بڕۆین. ئەو ماوەیە نەماندەتوانی لە یەک ماڵدا بژین – هەرچەندە هەموو

شـەوێک پێکەوە دەبووین –، هەتا زمـانـخراپان و قـەشـەکان نـەورووژێنین. ئەو قەشـانە لەگـەڵ ئەوەی لە پیـاوچاکی نموونەی باش نەبوون، دەسـتیـشیـان لە هەموو شـتـێک وەردەدا. لە شـاری پاشـاکاندا، زۆر بە دەگـمـەن خۆرم دەدیت، چونکە ئاسـمـان هەمیشـە بە هەور بەری گیرابوو و بارانیش نەدەباری، بەڵام خوناوی ناو هەواکەی بە قڕتەوە دەنووسـا و بە چینێکی ژەنگاوی مەیلەو سەوز دای دەپۆشی. شـەوانیش هەر وەک کاتالینا، کە ئەویشـم لەگەڵ خۆم بردبوو، دەیگوت، مـۆمـیـاکـانی ئینکا کـە لـە ژێر مـاڵەکـاندا شـاردراینەوە، دێنە شەقامەکان، وەلێ من قەت شتێکی وام نەدیت.

من کاتێک بیرم لەو پێداویستیانە دەکردەوە کە لەو پرۆژە ئاڵۆزە دەمانەوێ، برینی هەزار فـەرسـەخ، دروسـتکردنی شـار و سـەپاندنی ئاشـتی بە سـەر هندییـەکان، پێدرۆش لە کۆشکی حاکم چەندان رۆژی بە خەسـار دەدا و بە کـۆبـوونەوە و دانانـی پیـلانـی سـیـاسـی خـەریک دەبوو کـە دەبوونە مـایەی وەڕسـبـوونی. ئەو ڕێز و خۆشـەویستـیـیـەی کە بێسارۆ بۆ پێدرۆی دەنواند، دەبووە مایەی ئیرەیی پێبردنی ئەفسەر و ڕاسپاردراوەکانی تر. ئەو شارە لەو کـاتەوە دەورەی بە پیـلان چنرابوو و حـەرەمسـەراکـەی تژی تەڵە بوو، هەمـوو شـتێک نرخی خـۆی هەبوو بە شـەرەفـیـشـەوە. تەمـاحکار و مەراییکەران بە حەسرەتەوە هەوڵیان دەدا پلەوپایە و دەستکەوتیـان لە حاکمەوە بەرکـەوێ، کە ئەو تاکە کەس بوو دەیتوانی ئەو شـتـانە ببەخشـێت. پێرۆ ئـەوەندەی گەنجینە هەبوو کـە بە نرخ مـەزەندە نـەدەکرا، بـەڵام بەشـی ئەو هەمـوو پیـاوە تووشـەی نەدەکرد. بێسـارۆش تێ نـەدەگـەیشت، لە کـاتێک دەیبـینی کـە ئەوانـە پڕ بە دەستیان چۆن بە دوای دەستکەوتدا دەگەڕێن، کەچی بالدیبیا ئامادەیە کانگە و کێڵگەکانی بداتەوە و هەمـان ئەو هەڵەیە دووبارە بکاتـەوە کە دیێگۆ مـاگرۆ باجێکی زۆری لەسـەر دانا. زێتر لە جارێک لێی پرسی: ئەی پێدرۆ، لەبەرچی جەخت دەکەیت کە ئەو جەربەزەیییە بۆ ئەو خاکە ڕووتەی شیلی، بکەیت؟

بالدیبـیـاش هـەمـیـشـە وەڵامی ئەوەبوو: ئەی خـاوەن شکۆ، بـۆ ئەوەی ناو و ناوبانگ لە دوای خۆمەوە بەجێ بێڵم.

ڕاستییەکەی ئەمە تاکە پاکانەی ئەوبوو. ئاخر گرتنەبەری ڕێگەی شیلی هاوتای لە دۆزەخ پەڕینەوە بوو. هندییەکان لەوێ سەرسەختن و وەک پێرۆش زێڕی زۆر لێ نییە، بەڵام لە دیدی بالدیبیا ئەو تەگەرانە هەمووی سوودبەخش بوون. چونکە خۆلێدان لەو گەشتە و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنە دڕندەکان سەرنجیان ڕادەکێشا، لەگەڵ ئەوەش ئەمەی لەکن بێسارۆ نەدەدرکاند. وەلێ هەژاریی وڵاتی شیلی لە ڕووی سامانەوە، وەک هەموو جارێک پێی دەگوتم، سەرنجی ئەویان ڕادەکێشا. ئەو بڕوای وابوو کە زێڕ گەندەڵی و ئیرەیی دەخاتەوە. پیسی و چاوچنۆکی بڵاو دەکاتەوە. ئەوەتا ئیسپانییەکان لە پێرۆ بە هۆی زێڕەوە دابەشبوونە، ئەو کانزایە دەسیسە و پیلان بەهێز دەکات و خوو و ڕەوشت کاڵ دەکاتەوە و ڕوح لە بەین دەبات. لە بەرچاوی ئەمدا شیلی شوێنێکی نموونەیی بوو، لە پیاوانی حەرەمسەرای شاری شاهانەوە دوورە و دەتوانێ لەوێ کۆمەڵگەیەکی پڕ لە دادپەروەری لە سەر بناغەی کاری قورس و زەوی کێڵان دروست بکات، بێ ئەو سامانانەی کە بە ئاسانی لە کانگە و کۆیلایەتی وەدەستدێن. لەوێ ئاینیش دەبێتە شتێکی ئاسان و سادە، چونکە ئەم خۆی ئەرکی هێنانی قەشە میهرەبانەکان و خزمەتکارانی ڕاستەقینەی خوا دەگرێتە ئەستۆ، کۆمەڵێک قەشەی گەندەڵ و قێزەون. ئەو وەختە ئەو نەوەیەی لە وەچەی دامەزرێنەران دەکەوێتەوە لەو وڵاتە، دەبنە هاووڵاتییەکی خاوەن بڕوا و بە ئابڕوو و دڵسۆز دەبن و ڕێزی یاسا دەگرن. لە ناو ئەوانەدا کەسی ئۆستوکراتی دروست نابێ، ئەوانە توێژێک بوون ڕقی لێیان دەبووەوە، چونکە تاکە نازناوی چاک ئەوە نییە کە بە میرات بۆت بەجێ بمێنێ، بەڵکو نازناوی چاک ئەوەیە کە خۆت بە خەسڵەتی ژیانێکی ئاسوودە و ڕوحێکی پاک بەدەستی بێنی.

بۆ چەندان سەعات گوێم لێی دەگرت و بەو جۆرە دەدوا، بە دوو چاوی نووقاو و دڵێکی ملکەچی ورووژانەوە بیری لەو میللەتە یۆتۆبیایە دەکردەوە کە پێکەوە دروستمان دەکرد.

دوای چەند حەفتەیەک لە هاتوچۆی نێو هۆڵ و ڕێڕەوەکانی کۆشکی حاکم،

پێدرۆ سەبری نەما و بڕوای هات کە هەرگیز ڕەزامەندی بەدەست ناهێنێ؛ بەڵام من دڵنیابووم کە بێسارۆ مۆڵەتی پێ دەدات. دواخستن لە ڕەفتاری بێسارۆ کارێکی ئاسایی بوو کە هاوڕێی ئیشی دروستەکان نەبوو؛ خۆی نیگەران نیشان دەدا لەو مەترسییانەی کە هاوڕێکەی لە شیلی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، وەلێ ئەوەی کە بە ڕاستی لەگەڵ بەرژەوەندی ئەو دەگونجا، ڕۆیشتنی بالدیبیا بوو بۆ شوێنێکی دوور، کە لەوێوە ناتوانێ پیلانی لە دژ دابڕێژێ یان بە هۆی ئەو ناوبانگەی کە هەیەتی خەڵک ئەمیان لەبیر نەمێنێ. خەرجییەکان و مەترسی و نەهامەتییەکان هەمووی لە بەرپرسیارێتی پێدرۆدا دەبن، بەڵام ئەو زەوییانەی کە داگیر دەکرێن دەبێتە موڵکی حکوومەتی پێرۆ؛ ئەو لە پرۆژەیەکی ئاوا هیچ زەرەر ناکات، چونکە تاکە فلسێکی لێ خەرج ناکات.

بالدیبیا گوتی: گەورەم حاکمی بەڕێز، هێشتا شیلی دەستی بەسەردا نەگیراوە و نەکراوەتە نەسرانی، ئەوەش ئەرکی ئێمەیە و ئێمەی ڕەعیەتی خاوەن شکۆی ئیمپراتۆر ناتوانین لێی دەربچین.

– ئەی دۆن پێدرۆ، من گومان دەکەم کە پیاوی وات دەستکەوێ ئامادە بن لەگەڵت بێن.

– لە نێو ئیسپانییەکاندا قەت پیاوی ئازا و جەنگاوەری چاک زۆرن، هەرکە هەواڵی ئەو هەڵمەت بۆ شیلی بڵاو بووەوە، لە پێویستی خۆمان زێتر چەکهەڵگر پەیدا دەبن.

دوای ئەوەی کە کێشەی دارایی ڕوون بووەوە و دیارکەوت کە بالدیبیا خۆی خەرجییەکان دابین دەکات، حاکم مۆڵەتی پێدا و ئەوهاشی دەرخست کە ئەم کارەکەی بەدڵ نییە، وەلێ بە پەلە کانگە و کێڵگەکانی وەرگرتەوە کە پێشتر خۆی دابوویە سەرکردە مەیدانییە ئازاکەی. پێدرۆ زۆر بایەخی بەو شتانە نەدەدا، ئاخر بای ژیانێکی بەختەوەرانەی بۆ مارینا لە ئیسپانیا دابین کردبوو و باکیشی بە سامانەکەی خۆی نەبوو. ئەو وەختە نۆ هەزار پێزۆی زێڕ و چەندان دۆکیومێنتی پێویستی هەبوو بۆ بەجێهێنانی ئەو هەڵمەتە.

بەبیریم هێنایەوە و گوتم: ڕێپێدرانەکە کەموکوورییەکی تێدایە.

– کامە ڕێپێدران؟

– ئەوەی تایبەتە بە من، بەبێ ئەوەش من ناتوانم هاوڕێت بم.

پێدرۆ گەڕایەوە لای بێسارۆ و بە شێوەیەکی زیادەڕۆیی داوای لێی کرد کە من شارەزاییيەکی زۆرم لە تیمارکردنی بریندار و چارەسەرکردنی نەخۆش هەیە و زانیاریم لە بەرگدرووێتی و چێشتلێنانیش هەیە. ئەو پیشانەش لە گەشتێکی وادا ناتوانرێ دەستبەرداری بین، وەلێ سەرلەنوێ خۆی لە نێو پیلانەکانی کۆشک و ڕێگرەکان و بەربەستە ئەخلاقییەکان بینییەوە. من زۆر پێم داگرت کە هەردەبێ منیش ببات تا ئەو ڕادەیەی پێدرۆ لەگەڵی گەیشتە ڕێکخستنی بەیەکگەیشتنێک لە نێوان من و بێسارۆدا تا خۆم قسانی لەگەڵ بکەم. حەزم نەدەکرد پیدرۆ لەگەڵم بێتە لای حاکم، هەندێ کاروبار هەیە ئەگەر مروڤ بە تەنیابێ باشتر پێی هەڵدەستێ.

لە کاتی دیارکراودا چوومە کۆشک، بەڵام ناچاربووم چەندان سەعات لەو هۆڵە چاوەڕێ بم کە پڕ لە خەڵکی وەک من بوو و بەدوای داواکانیان هاتبوون. شوێنەکە پڕ لە خشڵ بوو و بە ڕیزێک مۆم ڕووناک کرابووەوە کە لە ناو مۆمدانی زیوین دانرابوون. ئەو ڕۆژە دنیا کەوەڕۆژ بوو و ئەو تیشکەی لە پەنجەرەکانەوە دەهاتە ژوورێ زۆر کزبوو. وەختێ یاریدەران زانییان کە من لەسەر ڕاسپاردەی پێدرۆ هاتوومە، کورسییەکیان دامێ تا لەسەری دانیشم، بەڵام خەڵکەکەی تر دەبوایە بە پێوە بوەستن. هەندێکیان چەند مانگێک بوو ڕۆژانە دەهاتن و دیاربوو هیچ چارەشیان نەبوو. بە دڵنیایی دانیشتم بێ ئەوەی وا خۆم نیشاندەم کە کەوتوومەتە بەر نیگای ساردی هەندێ لە ئامادەبووەکان، لەوانەی کە بە پەیوەندی من و پێدرۆیان دەزانی و ڕەنگە لە ناخیانەوە بپرسن کە داخوا بەرگدروویەکی بێ کەڵک و ژنێک کە بەبێ شووکردن لەگەڵ پیاوی خەڵک دەنوێ، چۆن دەوێرێ بچێتە لای حاکم. کات دەوروبەری نیوەڕۆ بوو، سکرتێرەکە هات و ڕای گەیاند کە نۆبەتم هاتووە بچمە ژوورێ. بە دوایدا چوومە هۆڵێکی فرەوان و شکۆدار، زۆر بەبێتامی

ڕازێنرابووەوە - پەردە، زرێ، ئالا، زێڕ و زیو -، سروشتی قەناعەتی ئیسپانیایی دەورووژێنێ، بەتایبەتی سروشتی ئەوانەی لە ئیستریمادۆراوە هاتوونە. پاسەوانەکان بە پەڕامووچە ڕازێنراونەتەوە و پاسەوانی لە حاکم دەکەن، زێتر لە دوازدە نووسەر و سکرتێرێک و یاساییەک و هاوڕێیەکی مەرایبکەری حاکم و قەشەیەک، ئەوانە خەریکی ئەو تۆمار و بەڵگەنامانەبوون کە حاکم نەیدەزانی بیانخوێنێتەوە. ژمارەیەک لە خزمەتکارە هندییەکانیش جلی وەک یەکیان پۆشیبوو وەلێ پێخواس بوون، بادە و میوە و ئەو حەلوایە پێشکێش دەکرد کە قەشەژنەکان دروستیان دەکرد. بێسارۆ لە سەر قەنەفەیەکی لە قەدیفەی زیو دانیشتبوو کە لەسەر سەکۆیەکە دانرابوو. شەرەفێکی گەورەی پێ دام کە گوتی بەیەکگەیشتنی ڕابردووی لەگەڵ منی لە بیرماوە. من کراسێکی بێوەژنانەم بۆ ئەو بۆنەیە دووریبوو و خۆم ڕەشپۆش کردبوو، لەگەڵ پەچە و کڵاوێک قژی دادەپۆشیم. باوەڕ ناکەم دیمەنەکەی من حاکمی فێڵباز هەڵخەڵەتێنێ، لە کاتێک چاک دەزانێ کە پێدرۆ بۆ حەز دەکات منی لەگەڵدا بێت. بەڵام بە دەنگە نەگۆڕەکەی لێی پرسیم: خانمی بەڕێز، بە چ شتێک دەتوانم خزمەتت بکەم؟

بە ملکەچییەوە بێ ئەوەی هەستی پێ بکەم وەڵامیم دایەوە: ئەی خاوەن شکۆ، ئەوە منم کە دەمەوێ خزمەتی ئێوە و ئیسپانیا بکەم.

ئەو نەخشەیەی دیێگۆ ماگرۆم لە بەردەمی دانا کە بەردەوام بالدیبیا هەڵی دەگرت و بە سینگی خۆیەوەی دەنا. لەسەر نەخشەکە هێمام بۆ ڕێگاکانی ناو بیابان کرد کە پێویست بوو لەو هەڵمەتەدا پێیدا برۆین. پاشان پێم گوت کە من لە دایکمەوە بەهرەی دۆزینەوەی ئاوی ژێر زەمینم بە میرات بۆ ماوەتەوە.

فرانسیسکۆ سەرسامی دای گرت و سەیری منی دەکرد، وەک ئەوەی گاڵتەم پێی کردبێت. وا بزانم پێشتر گوێبیستی هەبوونی ئەو جۆرە بەهرەیە نەبووبوو، هەرچەندە تا ڕادەیەک باو و زانراو بوو.

- خانمی بەڕیز، گوتت کە تواناتان هەیە ئاو لە بیاباندا بدۆزنەوە؟

- بەڵێ گەورەم.

- دەزانی ئێمە باسی وشکترین بیابانی دنیا دەکەین؟

- ئەی خاوەن شکۆ، هەندێک لەو سەربازانەی کە لە هەڵمەتەکەی پێشتر بەشداربوونە دەڵێن هەندێک گیا و ڕووەک لەوێ شین دەبن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو بیابانە ئاوی ژێزەمینی هەیە، جا دەشێ لە قووڵاییەکی دیاریکراودا هەبێت، ئەگەر ئەو قسەیەی ئەوان ڕاست بێت، ئەوا من دەتوانم شوێنەکەی دەستنیشان بکەم.

لەو ئانەدا لە هۆڵی کۆبوونەوەکان کارەکان گشت وەستان و ئامادەبووان و خزمەتکارە هندییەکان هەموویان دەمیان بەش بووبووەوە و گوێیان لە گفتوگۆکەی ئێمە گرتبوو.

- گەورەم حاکمی شکۆدار، بوارم بدە تا ڕاستی قسەکانمت بۆ بسەلمێنم. داوا دەکەم لەگەڵ هەندێ شایەد بمنێریتە وشکترین شوێن کە خۆت هەڵی بژێری، جا ئەو وەختە بە هۆی چڵەدارێک بۆت دەسەلمێنم کە دەتوانم ئاو بدۆزمەوە.

بێسارۆ لە دوای ماوەیەک بێدەنگی گوتی: خانمی بەڕێز پێویست بەوە ناکات، من بڕوات پێ دەکەم.

پاشان فەرمانی دا کە ڕێپێدانی پێویستم بۆ دەربکەن، سەرەڕای ئەوەش وەک پێشدەستی دۆستایەتیمان، چادرێکی چاکی دامێ و گوتی: ئەو چادرە بۆ سووککردنی ناخۆشییەکانی گەشتەکەتانە. منیش لە بری ئەوەی بە دوای سکرتێرەکە بەرەو دەرگە بچم، لە بەردەم مێزی نووسەرەکان وەستام تا بەڵگەنامەکەم بۆ بکەن. ئاخر ئەگەر خۆت بە دوای ئەو جۆرە کارەدا نەچیت، ڕەنگە چەند مانگێکی پێ بچێت. لە دوای نیو سەعات، بێسارۆ بە مۆرەکەی خۆی ئیمزای کرد و بە بزەیەکی لاخوارەوە دایە دەستم. ئیتر تەنیا ئەوە مایەوە کە مۆڵەتی کەنیسەش وەربگرم.

***

من و پێدرۆ گەڕاینەوە شاری کۆسکۆ تا کاروباری گەشتەکەمان ڕێک بخەین، کە ئەمەش ئەرکێکی ئاسان نەبوو، چونکە سەرەڕای خەرجییەکان، ژمارەیەکی زۆر کەم لە سەربازەکان ئارەزووی بەشداریکردنی ئەو هەڵمەتەیان هەبوو. ئەوەی بالدیبیا پێشتر دەیگوت کە سەربازێکی زۆر هەنە دەست بدەنە چەک و بەرەو خاکی شیلی بێن، ڕاست دەرنەچوو. ئاخر ئەو سەربازانەی کە پێش چەند ساڵێک لەگەڵ ماگرۆ چووبوون، بۆ ئەوە گەڕابوونەوە تا مەترسییەکانی ئەو شوێنە بگێڕنەوە کە پێیان دەگوت "گۆڕستانی ئیسپانییەکان". وەک دەڵێن ئەو شوێنە پر لە نەهامەتییە، ئەوەندە خۆراکەی نییە کە بەشی تێرکردنی سی پیاوی ئیسپانی بکات. "شیلییە شاشەکان" بەدەستی بەتاڵ گەڕابوونەوە و لێرەش لەسەر خێر و سەدەقە دەژین؛ ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە کە وڵاتی شیلی جگە لە نەهامەتیی و ئازارچەشتن شتێکی ترت پێ نابەخشێ. ئەم ڕاستییە ورەی ئازاترین سوارچاکی دەهێنایە خوارێ، وەلێ بالدیبیا لە توانایدا هەبوو کە قسەکانی گەیەنەر بن، بەتایبەتی وەختێک کە دەیگوت: ئێمە کۆسپ و تەگەرەکانی ڕێگە دەبڕین و دەگەینە زەوییە بەپیت و بەرەکەتەکان و لەوێ دەتوانین پێش بکەوین.

پیاوەکان لێیان دەپرسی: ئەدی لەبارەی زێڕەوە چی دەڵێی؟

ئەویش دڵنیای دەکردنەوە کە لەوێ زێڕیش هەیە، بەڵام دەبێ بە دوایدا بگەڕێیت.

لەوەوە دەرکەوت کە خۆبەخشەکان بۆ ئەو گەشتە پارەیان نییە و دەبێ بە قەرز بیانداتێ تا چەک و ئەسپی پێ بکڕن، هەروەک چۆن ماگرۆش پێشتر لەگەڵ سەربازەکانی وای کردبوو، کە چاک دەیزانی قەرزەکانیشی نادەنەوە. ئەو نۆ هەزار پێزۆیە کەمی کرد و بەشی ئەو پێداوستییانەی نەکرد کە دەبوو پێمان بێت. لەو کاتەدا بالدیبیا بەبێ دوودڵی پارەی لە بازرگانێک وەرگرت، بە مەرجێک لە بەرامبەر ئەوەدا لە سەدا پەنجای ئەو دەستکەوتانەی بداتێ کە لەو هەڵمەتە دەستی دەکەوێت.

بۆ دانپێنان بە گوناهەکانم چوومە کن مەترانی کۆسکۆ کە پێشتر بە

پێشکێشکردنی چەند چەرچەفێکی نەخشێنراو بۆ ژووری پیرۆزەکان لە کەنێسەکەی، دڵیم نەرم کردبوو، چونکە دەبوو بەرلەوەی بۆ گەشتەکەمان برۆین، مۆڵەتی ئەویشم پێ بێت. لەبەرئەوەی بەڵگەنامەم لەلایەن بێسارۆوە هەبوو، بەدڵنیاییەوە چومە لای، بەڵام کەس بۆی نەبوو بزانێت کە داخوا کاردانەوەی قەشەکان چۆنە، چجای مەترانەکان!

لە کاتی دانپیانانەکە هیچ چارم نەبوو کە دەبوو لە بارەی ئەویندارییم لەگەڵ پێدرۆ، ڕاستییەکانم پێی بگوتبایە. مەتران وەک ئاگەدارییەک پێی گوتم: خیانەتی هاوسەری گوناهێکی مەرگهێنە.

– ئەی خاوەنی مەزنی، من بێوەژنم. ئەوەی کە دانی پیادەنێم زینایە، ئەو گوناهەش ترسێنەرە، بەڵام خیانەتی هاوسەریش نییە کە زۆر لەوە خراپترە.

– ئەی کچم، چۆن داوام لێ دەکەی بێ تۆبەکردن و بێ نیازپاکی لێت ببورم، کە نەزانم جارێکی تر ئەو گوناهانە دووبارە ناکەیتەوە؟

– ئەی خاوەنی مەزنی، وەک ئەوەی کە لەگەڵ هەموو ئیسپانییەکانی پێرۆ دەیکەی ئاوا، دەنا هەموویان بەسەر سەریانەوە بۆ دۆزەخ دەچن.

ئیتر لێی بووردم و بواری پێ دام گەشتەکەم بکەم. منیش لە بەرامبەر ئەوەدا بەڵێنم پێ دا کە کەنێسەیەک بۆ ڕیزدارمان "ژنە پاکیزەی لێبووردەیی" لە شیلی دروست بکەم، بەڵام ئەو وای پێ چاکتر بوو بۆ ڕێزدارمان "پاکیزەی ستایش" دروستی بکەم، لەگەڵ ئەوەی هەردووکیان هەر یەکن وەلێ بە ناو جیاوازبوون. بەڵام من پێم زیادبوو لەو بارەیەوە گفتوگۆ لەگەڵ مەتران بکەم.

لەو ماوەیەدا پێدرۆ سەرقاڵی تۆمارکردنی ناوی سەربازەکان و کۆکردنەوەی هندییەکان بوو کە بۆ ئەو ئەرکە زۆر پێویست یارمەتیدەر بوو، جگە لە کڕینی چەک و زەخیرە و چادر و ئەسپ. منیش هەندێک کاروباری لاوەکیم خستە ئەستۆی خۆم کە بە هزری پیاوی گەورە نایەنەوە، وەک: خۆراک، کەرەسەی زەوی کێڵان، قاپ و قاچاخی مەتبەخ و ماڵاتی لاما و مانگا و هێستر و بەراز و مریشک و دانەوێڵە و بەتانی و قوماش و خوری و شتی تریش.

خـــەرجـــیـــیـــەکـــان گـــەلێک زۆر بـوون بـە ڕادەیەک نـاچـار بووم پـارە پاشەکەوتکراوەکەم خەرج بکەم و خشڵەکانیشم بفرۆشم کە هێشتان بەکارم نەهێنابوون، چونکە بۆ کـاتی پێویسـتیم هەڵگرتـبوو و بە لێکدانـەوەی خۆشم هیچ شتێک لە داگیرکردنی شیلی گرینگتر نەبوو. هەروەها من دەیسەلمێنم کە هەرگیز خشڵم لێنایێ، چجای ئەگەر نایاب و گرانبـەهابن وەک ئەوانەی کە پێدرۆ پێشکێشی کردبووم. ئەو چەند جارەش کـە خۆم پێ ڕازاندبووەوە وام دەهاتە خـەیاڵ کە دایکم بە برۆیـەکی سـوارەوە دەبینم و بەبیـرم دێنێتـەوە کـە گونجـاو نییـە سەرنجی خـەڵک ڕاکێشی یان ئیرەییـیان بورووژێنی. دوکتـۆرە ئەڵمـانییـەکە سـەندووقێکی بـچووکی دابوومێ کـە چەقۆ و مـاشـە و کـەرەستـەی تری نەشتەرگەری و دەرمانی وەک: جیوە و سبیداج و جیوەی شیرین و ئاردی گیای قـەتماخـە و خوێی ترشـۆڵەی دوردی و خـوێیەکانی زوحل و کل و خـوێنی ئەژدیهـا و بەردی دۆزەخ و پۆلۆی ئـەرمـەنی و گـڵی سـابوونی و ئەسـیـری لە ناودابوو. کاتالینا سـەیرێکی بوتڵـەکانی کرد و بە گاڵتەوە شانی هەڵتەکاند. هەگبەکەی خۆی لە دەست گرتبوو کە دەرمانی لە گیا دروستکراوی تێدابوو و خـەڵکی ئەوێ بەکـاریـان دەهێنا، لـە ڕێگەش بە گـیـای شـفـابەخـشی شـیـلی دەوڵەمـەندی کرد. هەروەها حـەوزە دارینەیەکی خـۆشـۆرینیـشی لەگـەڵ خۆی هێنابوو، چونکە بە بۆنی گەنیوی بیراکۆچا زۆر پەست دەبوو و دەشیـزانی کە پیسی سەرچاوەی هەموو نەخۆشییەکانە.

من بەو کـاروبارانەوە سـەرقـاڵ بووم، وەخـتێ پیـاوێکی کـامڵ و سـادە لە دەرگەی دام، ڕوخسـاری منداڵانە بوو و بە ناوی بینیتۆ خۆی پێ ناساندم. ئەو کەسـە یەکێک بوو لە پیاوەکانی مـاگرۆ و سـاڵانێکی زۆر لە ژیانی سـەربازی ئەزمووندار بووبوو و تاکە کەس بوو کە لە دوای گەڕانەوەی بە شیلی سەرسام بووبوو، وەلێ نەیدەوێرا لە بەردەم خـەڵک ئەوە ئاشکرا بکات، نـەبادا پێی بڵێن شـێت بووە. جلێکی شـڕی لەبـەردابوو وەک هـەر کـەسـێکی تری شـیـلی، بەڵام سەروسەکوتی بە سەرباز نەدەچوو؛ بۆ ئەوەش نەهاتبوو پارە بـە قەرز وەرگرێ یان مـــەرجـێکی هەبێت، بەڵکو تەنیـا دەیویست هاوڕێیـەتیـمـان بکات و

یارمەتیمان بدات. لەگەڵ بالدیبیا ڕایان وەک یەکتر وابوو کە دەتوانرێ دەسەڵاتێک بۆ گەلێکی دادپەروەر و تەندروست لە شیلی دامەزرێنن.

پێی گوتم: خانمی بەڕێز، ئەو زەوییە هەزار فەرسەخ بۆ خوارەوو درێژ دەبێتەوە و لە خۆرئاواوە سەر تا خوارێی کەناری دەریایە، لە ڕۆژهەڵاتیشی زنجیرە شاخێکی بەرز و سەختە نموونەی وام لە ئیسپانیا نەدیوە.

دۆن بینیتۆ وردەکارییەکانی گەشتە کارەساتبارەکەی دییگۆ ماگرۆی بۆ گێڕاینەوە. دەیگوت ماگرۆ ڕێگەی بە پیاوەکانی دا کاری ناشیرین و ئابڕووبەر بکەن کە بۆ کەسێکی مەسیحی ناشێت ئەو ڕەفتارانە بکات. ئەوان لە کۆسکۆوە هەزاران هندییان بردبوو کە بە زنجیر و پەت لە ملیانەوە کۆتکرابوون تا نەتوانن ڕاکەن. هەر یەکێکیش لەو دیلانە بمردبایە بۆ ئەوەی زۆر خۆیان بە کردنەوەی پەتەکە لە ملی دیلەکانی تر خەریک نەکەن و ڕەتڵەکە لە ناو زنجیرە شاخەکان لە ڕۆیشتن نەکەوێ، سەری مردووەکەیان دەبڕی. وەختێکیش کە هندییە خزمەتکارەکان ژمارەیان کە مدەبووەوە، بەسەر گوندێکیان دادەدا و پیاوەکانیان کۆت و زنجیر دەکردن و ژنەکانیشان بەزۆر لاقەدەکردن و دەیانبردن، منداڵەکانیشیان دەکوشتن یان پەرتەوازەیان دەکردن، دوای ئەوە خۆراک و ماڵاتەکانیان دەدزین و ماڵ و دەغڵودانەکانیان دەسووتاندن. هندییەکانیان ناچاردەکردن باری لە تاقەتی خۆیان زێتر هەڵگرن، هەتا جوانییە ئەسپە تازەبووەکان و قەرەوێڵە و جۆلانەی نووستنیشیان لەسەر شانیان باردەکردن بۆ ئەوەی ئەسپەکانی خۆیان هیلاک نەکەن. لە بیابانیشدا هەندێک لە ئیسپانییەکان ئەو ژنە هندییانەیان لە وڵاخەکانیان دەبەستایەوە کە تازە منداڵیان بووبوو، بۆ ئەوەی شیری مەمکیان بخۆنەوە، چونکە هیچ شلەیەکی تر دەست نەدەکەوت، منداڵە تازەبووەکەشیان فڕێ دەدایە سەر زیخە سووتێنەرەکە. چاودێرەکانیش بە قامچییەکانیان ئەو هندییانەیان مارکوژ دەکردن کە لە هیلاکیان تاقەتیان نەدەما. ئەو هندییە بەدبەختانە ئەوەندە برسی دەبوون تا ئەو ڕادەیەی لە خواردنی گۆشتی تەرمی هاوڕێ مردووەکانیان نەدەسڵەمینەوە. ئەو ئیسپانییە دڵڕەقەی کە لەوانی تر

زیاتر هندی بکوشتبایه به چاکتر دادەنرا، ئەوەیش کە کاری وای نەکردبایە بە ترسنۆکیان دادەنا.

بالدیبیا خەمی بەو ڕەفتارانەوە دەخوارد، دووبارەی دەکردەوە کە ئەگەر ئەم لە شوێنی ماگرۆ بووایە نەیدەهێشت ئەو ڕەفتارانە ئەنجام بدرێت. وەلێ دەیزانی کە ئەو دیاردەیە بەشێکە لە بێ سەروبەرییەکانی جەنگ، هەروەک چۆن لە تالانکردنی ڕۆماش ئەمە ڕووی دا. ئێش و ئازار و ئازاری زێتر، خوێنی سەر ڕێگە، خوێنی قوربانییەکان، خوێنێک کە هەر لە ستەمەکار و بێویژدانەکان دەوەشێتەوە.

دۆن بێنیتۆ دەردەسەرییەکانی ئەو سەفەرەی دەزانی، چونکە تێیدا ژیابوو. هەروەها باسی پەڕینەوەی بیابانی ئەتاکامای کرد، ئەو ڕێگەیەی کە لە هاتنەوەیان بۆ پێرۆ گرتبوویانە بەر. بەڵام ئێمە بۆ چوونە شیلی بە پێچەوانەی گەشتەکەی ماگرۆ، ئەو ڕێگەیەمان هەڵبژارد.

بێنیتۆ بۆ ئاگەداری پێی گوتم: پێویست ناکات هەموو بیرمان تەنیا لە پێویستیی سەربازەکان چڕ بکەینەوە، بەڵکو دەبێ باری ژیانی هندییەکانیشمان لە بەرچاو بێت، ئاخر ئەوانیش پێویستیان بە خواردن و پۆشاک و ئاو هەیە. بەبێ ئەوان ناتوانین زۆر دوور بڕۆین.

ئەوەیان لە هزری منیشدا هەبوو، وەلێ دابینکردنی خۆراکی هەزار هندی بەو پارە و پوولەی کە هەمانە ئەرکێک بوو تەنیا بە کەسێکی سحرباز دەکرا.

***

لە نێو ئەو سەربازە کەمانەی کە بۆ شیلی لەگەڵمان دەهاتن، ئەفسەرێکی گەنجی جوان و ئازای تێدابوو، کوڕی خوشکی خوالێخۆشبوو دیێگۆ ماگرۆ بوو و بە ناوی خوان گۆمێس. ڕۆژێکیان لە ماڵەوە هاتە لام، کلاوێکی مەخمەڵی لە دەست گرتبوو و زۆر شلەژاو دیاربوو. پەیوەندی خۆی لەگەڵ شاژنێکی ئینکای بۆ ئاشکرا کردم کە بووبووە مەسیحی بە ناوی سیسیلیا. پێی گوتم: ئەی دۆنیا ئینیس، ئێمە یەکتریمان خۆش دەوێت، ناتوانین لێک

جیاببینەوە و سیسیلیا دەیەوێ لەگەڵم بێتە شیلی.

- کەواتە با ئەویش بێت!

خوان گۆمێس زمانی تێکئالاّ و گوتی: باوەڕ ناکەم پێدرۆ بالدیبیا لێ بگەڕێ لەگەڵم بێت، چونکە سیسیلیا زگی هەیە.

ئەوە کێشەیەکی ئاسان نییە، چونکە پێدرۆ لە بڕیارەکانیدا هەڵویستی ڕوونە کە لە گەشتێکی وا ترسناکدا ناکرێ کەسێکی لەو بارودۆخەمان لەگەڵ بێت، ڕێگەکە پڕ لە ماندوویێتی و چەرمەسەرییە. وەلێ کە بینیم خوان گۆمێس پەست بووە، زانیم کە ناچارم دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەم. لێم پرسی: زگەکەی چەند مانگەیە؟

- لە نێوان سێ تا چوار مانگیدایە.

- خۆ ئێوە دەزانن ناخۆشییەکانی ئەو سەفەرە بۆ ئەو چەند زەحمەتە، وا نییە؟

- بەڕێز دۆنیا ئینیس، سیسیلیا زۆر بەهێزە و هەموو هۆکارەکانی حەسانەوەشی هەیە، منیش هەموو یارمەتییەکی دەدەم.

- بێگومان شازادەی نازهەڵگیراو بە خۆی و زگەکەیەوە دەبێتە سەرچاوەی وەڕسبوونێکی زۆر.

- گەورەم، دڵنیات دەکەم کە سیسیلیا نابێتە هۆی وەڕسکردنی هیچ کەسێک، نایەڵم لە نێو کاروانەکەدا کەس تێبینی ئەو بکات..

- زۆر چاکە خوان، ئێستا باسی ئەو بابەتە لەگەڵ هیچ کەسێک مەکە، دوایێ خۆم لە وەختێک کە بە چاکی بزانم لەگەڵ سەرکردەی گشتی بالدیبیا باسی دەکەم. ئێوە دەبێ لە ماوەیەکی کورتدا خۆتان بۆ ڕۆیشتن ئامادەساز بکەن.

خوان گۆمیس بە شەیداییەوە سەگێکی ڕەشی بە دیاری دامێ، تووکەکەی وەک تووکی بەراز دڕبوو. ناوم لێنا بەڵستار، چونکە ئەو ڕۆژە دووەمین ڕۆژی کانوونی دووەم بوو، ڕۆژی پاشای ئاگرپەرستەکان. ئیتر ئەو سەگە پاش

ماوەیەکی کەم وەک سێبەری خۆم بووە هاوڕێم. ئەوە یەکەم سەگ بوو لە نێو نەوەیەک سەگی لێکچوو لە وەچەی خۆی کە بۆ ماوەی چل ساڵ هاوڕێیەتییان کردم. لە دوای دوو ڕۆژ لە هاتنی خوان، شازادە ئینکا، کە لەسەر تەختەبەرەیەک چوار پیاو هەڵیان گرتبوو، هاتە سەردانم و چوار کارەکەریش بە دوایەوە بوون دیارییان هەڵگرتبوو. من پێشتر کەسم لە خانەوادەی ئینکا نەدیتبوو؛ گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە شازادە ئیسپانییەکان لە بەرامبەر سیسیلیادا لە ئیرەییان ڕەنگیان لە ڕوودا نامینێ. ژنێکی تازە جحێڵ و شۆخ و جوان بوو، ئاکارێکی نەرم و نیمچە منداڵانەی هەبوو. باڵای کورت و لاواز بوو؛ وەلێ بۆم دەرکەوت کە کەسێتییەکی بە هێزی هەیە و جوانییەکەی سروشتییە وەک ئەو کەسەی لە نێو بێشکەیەکی زێڕین پەروەردە کرابێت ئاوا، لەسەر ئەوە ڕاهاتبێت کە بە خزمەتکردن و چاوەدێری دەورە درابێت. هەر لەسەر دەستووری ئینکا بە سادەیی و جوانی جلی دەپۆشی. سەری دانەدەپۆشی و پرچی پەخش بووبووەوە دەتگوت پەچەیەکی ڕەشی نەرم و بریقەدارە بەسەر پشتیدا تا ناوقەدی شۆڕ بووەتەوە. پێی گوتم کە خانەوادەکەیان ئامادەن یارمەتی ئیسپانییەکان بدەن بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی هەڵمەتەکەیان، بەمەرجێک بە کۆت و زنجیرەوە نەیانبەن. ئاخر ماگرۆ بە بیانووی ئەوەی دوو چۆلەکان بە بەردێک دەکوژێت، ئەوهای کردبوو: نەیەڵێت هندییەکان ڕابکەن و ئاسنیش بۆ ئەوێ ببات. ئەو بەدبەختانەی لە گەشتەکەی ماگرۆدا بە هۆی قورسایی ئەو زنجیرانەوە مردن، زۆر پتربوون لەوانەی کە بە هۆی نالەباری کەشوهەواوە مردن.

من تێم گەیاند کە بالدیبیا بیر لە کاری وا ناکاتەوە، وەلێ ئەو بیری هێنامەوە کە ئیسپانییەکان لە ئاژەڵ خراپتر ڕەفتار لەگەڵ خەڵکی ڕەسەنی جیهانی تازە دەکەن. هەروەها لێی پرسیم: ئایا دەتوانم بالدیبیا و سەربازەکانی تر ناچار بکەم کە ڕەفتاری مرۆڤانە لەگەڵ هندییەکان بکەن؟ منیش پێم گوت کە ناتوانم وا بکەم، بەڵام بەڵێنم پێ دا کە لەو بارەیەوە وریابم. هەر لەو کاتەدا پیرۆزباییم لێی کرد کە ئەو هەستی میهرەبانی هەیە، چونکە

خانەدانەکانی ئینکا بە دەگمەن گرینگی بە چارەنووسی گەلەکەی خۆیان دەدەن.

لەگەڵ ئەو قسانە بە سەرسامییەوە سەیری کردم. بە زمانێکی ڕەوانی ئیسپانی کە لە خۆشەویستەکەی فێر بووبوو گوتی: مردن و ئازارکێشان دوو شتی سروشتین، وەلێ کۆت و زنجیر نا، ئەمەیان ڕیسواییيە.

سیسیلیا بە شۆخی و جلوبەرگی کە لە نایابترین چنینەکانی پێرۆیی دروست کرابوون و بە دیمەنە شازادەکەی، سەرنجی دەوروبەری بۆ خۆی ڕادەکێشا، بەڵام لە پەنجا فەرسەخی یەکەمی گەشتەکەدا وای دەکرد کە نەبێتە جێگەی بایەخی خەڵکانی تر، هەتا ئەو چرکەساتەم دۆزییەوە کە لە بارەی ئەوەوە قسەم لەگەڵ پێدرۆ کرد. لە سەرەتادا پێدرۆ زۆر تووڕە بوو وەک چۆن پێشبینی دەکرا لە کاتێک کە یەکێ لە فەرمانەکانی پشتگوێ دەخرێن. هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و پێم گوت: ئەگەر منیش لە بارێکی وەک سیسیلیا بامایە دەبووایە بۆ ئەو گەشتە نێم، وا نییە؟

– جا ئایا تۆش وەک ئەویت؟

ئەو پرسیارەی لێم کرد، لە کاتێک هەمیشە بە هیوابوو کە کوڕێکی هەبێت.

– نەخێر لە بێبەختی خۆم، بەڵام سیسیلیا وایە، وەلێ هەر ئەو بەتەنیا وا نییە، چونکە سەربازەکان هەموو شەوێک زگی ژنە هندییەکان پڕ دەکەن و ئێستا دە ژنمان لەوانە زگیان هەیە.

سیسیلیا بەرگەی ناخۆشییەکانی ناو بیابانی گرت، هەندێ جار بە سەر پشتی هێسترەوە بوو و هەندێ جاریش لە ناو جۆلانەکەی بە سەر شانی خزمەتکارەکانییەوە بوو. کوڕەکەی ئەو یەکەم لە دایکبووی ئێمە بوو لە شیلی. خوان گۆمێس لە بەرامبەر ئەوەدا بە دڵسۆزیی بێ مەرجی چاکەی دامەوە کە لە مانگ و ساڵانی دواتر سوودێکی زۆرم لێی بینی.

ئەو وەختەی کە هەموو شتێک بۆ گەشتەکە لەگەڵ ئەو سەربازانەی کە ڕازیبوون هاوڕێیەتیمان بکەن، ئامادە کرا، کۆسپێکی لە ناکاو هاتە ڕێگەمان،

یەکێ لە پیاوەکانی حەرەمسەرا لە ئیسپانیاوە هات کە یاریدەری بێسارۆ بوو و ڕێگەپێدانی شاهانەی پێ بوو بۆ داگیرکردنی ئەو زەوییانەی دەکەونە خوارووی پێرۆ، لە ئەتاکاماوە بگرە تا دەگاتە تەنگەی ماجەلان. سانچۆ دیلا ئۆس لە سەرڕا کەسێکی نەرم و قسەخۆش دیاربوو، بەڵام لە ناخی دڵەوە کەسێکی سووک و چرووک بوو. لێ ڕاستییەکەی کەسێکی پۆشتە بوو، کراسێکی نایابی لەبەردەکرد و گوڵاویشی لە خۆی دەدا. لە پاشملە پیاوەکان پێی پێ دەکەنین، وەلێ لە بەرامبەریدا بە پەلە دەچوونە بەردەمی و مەراییان بۆی دەکرد. ئەو پیاوە وای لێ هات زۆر لە دەردەسەرییەکانی بیابان و دوژمنە هندییەکان مەترسیدارتر بوو لە سەر گەشتەکەمان، جا لەگەڵ ئەوەی شایەنی ئەوە نییە لەو چیرۆکە باسی بکەم، وەلێ ناشتوانم بە تەواوی پشتگوێی بخەم، چونکە دوایێ دیسان بەدیار دەکەوێتەوە. خۆ ئەگەر بگەیشتبایە مەبەستەکانی ئەوا من و پێدرۆ نەماندەتوانی بە چارەنووسی خۆمان بگەین. بە هاتنی ئەو کابرایە بوونە دوو پیاو بۆ بەجێگەیاندنی هەمان ئەو ئەرکە. چەند حەفتەیەک وا دیاربوو کە هەموو ڕێگەکان لە بەردەم ئەو هەڵمەتە بە تەواوی گاڵە دراون. بەڵام لە دوای گفتوگۆ و دواخستنێکی زۆر، فرانسیسکۆ بێسارۆ بڕیاری دا کە هەردووکیان پێکەوە وەک دوو هاوبەش داگیرکردنی شیلی بخەنە ئەستوی خۆیان: بالدیبیا لە ڕێگەی وشکانییەوە بچێت و دیلا ئۆسیش لە ڕێگەی دەریاوە و لە ئەناکاما بگەنەوە یەکتری. کاتالینا وەختێ بەو کێشانەی زانی پێی گوتم: خانمی گەورەم، لە داهاتوودا تۆ زۆر بایەخ بەو سانچۆیە دەدەی.

کاتالینا ئەوی نەدیتبوو، وەلێ لە هێلکە شایتانۆکەکانی فاڵگرتنەوەی خۆی ئەمەی بۆ دەرکەوتبوو.

دواجار لە سبەینەی ڕۆژێکی گەرمی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٥٤٠ بەڕێ کەوتین. بێسارۆ لەگەڵ کۆمەڵێک لە ئەفسەرەکانی هاتبوون بۆ ئەوەی ماڵئاوایی لە بالدیبیا بکەن و چەند ئەسپێکیشی بە دیاری بۆ هێنابوو کە ئەمە تاکە هاریکاری ئەو بوو بۆ هەڵمەتەکە. هەر لە بەیانییەکەوە دەنگی زەنگوڵەکانی کەنێسە زرنگانەوە و باڵندەکانی ئاسمان و گیانەوەرەکانی سەر

زەوی تێکڕا لە هەڵچوون و بێ ئۆقرەییدا بوون. مەتران کەشێکی نوێژی پیرۆزی بە دەنگ و ئاواز ساز کرد و هەموومان بەشداریمان تێدا کرد، لە بارەی باوەڕەوە ئامۆژگاری کردین و گوتی کە هەڵگرتنی خاچ بۆ شوێنە دوورەکانی زەوی، ئەرکێکی سەرشانمانە. پاشان چووە مەیدانەکە تا ئەو هەزار هندییە یاریدەدەرانە پیرۆز بکات کە لە تەک کەلوپەلە پێچراوەکان و ماڵاتەکان چاوەڕێیان دەکرد. هەر کۆمەڵە هندییەک فەرمانیان لە کۆراکا یان سەرکردەکەیانەوە وەردەگرت کە ملکەچی فەرمانەکانی چاودێرە زنجییەکان بوون، ئەوانیش بە ڕۆڵی خۆیان ملکەچی ڕیشدارە ئیسپانییەکان بوون. پێم وا نییە هندییەکان پیرۆزکردنەکەی مەترانیان بەهەند وەرگرتبێت، وەلێ ڕەنگە هەستیان کردبێت کە مادام خۆری ئەو ڕۆژە درەوشاوەیە، کەواتە ئاخیری خێر دەبێت. ئەو هندییانە زۆربەیان گەنج بوون، جگە لەوەش هەندێ ژنی دڵسۆزیان لەگەڵدابوو کە ئامادەبوون لەگەڵ مێردەکانیان بچن و چاک دەیانزانی جارێکی تر ناتوانن منداڵە جێماوەکانی تریان ببیننەوە لە کۆسکۆ. هەروەها هەندێک ژنیش هەبوون کە دۆستی ئەوینی سەربازەکان بوون پاشان بەردەوامبوونی گەشتەکە لەگەڵ ئەو کچانەی کە لە گوندە وێرانەکانەوە بە دیلی دەهێنران، ژمارەیان زۆرتر دەبوو.

دۆن بێنیتۆ لە بارەی جیاوازییەکانی ئەو گەشتە و ئەوی پێشوتر قسەی بۆ دەکردم. دەیگوت، ماگرۆ بە سەرکردەی پێنج سەد سەربازەوە هەڵمەتەکەی دەست پێ کرد کە هەموویان زرێی قورس و ئاڵای بریقەداریان هەڵگرتبوو، پڕ بە سینەیان گۆرانییان دەگوت و چەند قەشەیەکیش خاچە گەورەکانیان بەرز دەکردەوە. جگە لەمانە، هەزاران هندی کەلوپەلیان هەڵگرتبوو و مێگەلێک لە ئەسپ و ماڵاتی تریشان پێ بوو، هەموویان لە سەر ڕێتمی تەپڵەکان دەڕۆیشتن. ئێمە بە بەراورد لەگەڵ ئەوان تەنیا کۆمەڵێکی بچووک بووین بەزەییان پێمان بێتەوە، جگە لە پێدرۆ و من، تەنیا یازدە سەربازمان هەبوو، وەلێ منیش ئامادەبووم لە کاتی پێویستیدا دەست بدەمە شمشێر و بەرگری بکەم.

دۆن بێنیتۆ بە دڵنیاییەوە پێی گوتم: خانمی گەورەم، مادام بە ئازایی و حەماسەتەوە بۆ ئەو هەڵمەتە دەچین، ئەوا هیچ گرینگ نییە کە ژمارەمان کەمە. لە ڕێگەش بە یارمەتی خوا و پیاوانی ئازای ترمان بەگەڵ دەکەون.

بالدیبیا بە سەر پشتی ئەسپەکەیەوە لە پێشەوە دەڕۆیشت و خوان گۆمێس و فەرمانبەرێکی دادوەری و دۆن بێنیتۆش لە دوای ئەوەوە بوون. لە بەرچاوم بە زرێ و خودە بە ڕیشەکە و شمشێرە چاکەکەیەوە جوان و لێهاتوو دیاربوو و دەتگوت سوڵتانە سواری ئەسپە عەرەبییەکەی بووە. بە دوای ئەوانیشەوە من و کاتالینا لە پشتی ئەسپەکانمانەوە بووین. بە سەر زینی ئەسپەکەمەوە پەیکەری ژنە گەورەی ڕێزدارمان - پاکیزەی لێبووردەییم - هەڵگرتبوو، کاتاليناش بەڵستاری گوجیلەی لە باوەش هەڵگرتبوو، چونکە دەمانویست لە بۆنی هندییەکان ڕابێت. ئێمە ڕاهێنانی ئەوهامان پێی دەکرد کە ببێتە پاسەوانمان نەک بکوژ. سیسیلیاش لەگەڵ کۆمەڵێک لە کارەکەکانی دەڕۆیشت و لە نێو ژنە دۆستەکانی ئەوینی سەربازەکان خۆی ون کردبوو. لە دوای ئێمەشەوە ڕاستەوخۆ ڕیزی درێژی مالآتەکان و حەماڵەکان دەستی پێ دەکرد. زۆربەی ئەوانە بۆ کەسوکارە جێماوەکانیان دەگریان، چونکە بەزۆر هێنرابوون؛ وەلێ چاودێرە زنجییەکان لە هەردوو لاوە دەوری ڕەتڵی هندییەکانیان گرتبوو. ئەو زنجییانە لە ئسپانییەکان دڵرەقتربوون و زێتر ئەوانیان تۆقاندبوو، بەڵام بالدیبیا فەرمانی دا کە تەنیا خۆی بۆی هەیە سزای گەورە بەسەر هندییەکاندا بسەپێنێت و چاودێرەکان نابێت لە قامچی بەولاوە شتێکی تر بەکار بێنن، ئەویش بە وریاییەوە. وەلێ ئەو فەرمانە لە ڕێگەدا بە تەواوی لە بیر کرا، ئەوەندەی نەبرد کە تەنیا من لە بیرم مابوو.

# بەشی سێیەم

گەشتێک بەرەو شیلی ١٥٤٠ ـ١٥٤١

کاروانە دلێرەکەمان بە رێگەی بیاباندا بەرەو شیلی کەوتە رێ، ئەو رێگایەی کە دییگۆ ماگرۆ لە گەڕانەوەیدا گرتبوویەبەر، بە گوێرەی نەخشەی سەر ئەو کاغەزە لۆچدارەی کە ماگرۆ دابوویە پێدرۆ. لە کاتێک کە ئەو چەند سەربازە کەمە و هەزار هندی هاریکار وەک کرمێکی هێواش بەرێگەدا دەڕۆیشتین؛ بە چیاکاندا سەردەکەوتین نشێو دەبووینەوە و دۆڵ و ڕووبارەکانمان بە ئاراستەی خواروو دەبڕی، هەواڵی گەیشتنمان بە پێش ئێمە کەوت و خێڵە شیلییەکان بە چەکەوە چاوەڕێ بوون تا لە پڕێکا پەلامارمان بدەن. ئینکاکان نامەبەری خێرایان بەکار دەهێنا، پێیان دەگوتن - چاسکی -. ئەوانە بە نێو ڕێڕەوە عاسێ و بزرەکانی ناو شاخەکاندا بە ڕاکردن و بە سیستەمێکی یەک بە دوای یەکدا لە سەرتاسەری ئیمپڕاتۆریەکە لە باکوورەوە بۆ خوارووی ڕووباری پیۆ - پیۆ هەواڵەکەیان دەگواستەوە. ئیتر بەوچەشنە هەر لەگەڵ بەڕێکەوتنمان لە کۆسکۆوە هندییەکانی ئەوێ بە هەڵمەتەکەی ئێمەیان زانی. وەختێکیش کە لە دوای چەندان مانگ گەییشتینە ناو خاکی ئەوان، بۆ شەڕی ئێمە خۆیان ئامادە کردبوو. ئەوان دەیانزانی کە ئیسپانییەکان ماوەیەکی زۆرە دەستیان بە سەر پێرۆدا گرتووە، ئینکا ئەتاوالباش لە سێدارە دراوە، ئەو کەسەش کە لە شوێنی ئەو حوکم دەکات، ئینکا - باوێیۆ - ی برایەتی کە شووشە وابوو. ئەو پاشایە گەلەکەی خۆی کردبووە خزمەتکاری بێگانان و بەخۆیشی لە قەفەسی کۆشکە زێڕینەکەیدا دەژیا و غەرقی لەزەتەکانی داوێنپیسی و دڵڕەقی بووبوو.

هەروەها دەیانزانی بزووتنەوەیەکی یاخیبوونی فرەوان لە پێرۆ بە سەرکردایەتی ئەندامێکی تری بنەماڵەی پاشا ئامادە دەکرێ کە ناوی ئینکا – مانکۆ – یە و پێشتر خۆی نەدابووە دەست و ڕای کردبوو، پاشان سوێندی خواردووە کە بیانییەکان لە خاکی پێرۆ دەربکات. هەروەها ئاگەداریش کرابوونەوە کە ئیسپانییەکان دڕندە و بە ئاگا و بە چیرە و چڵێسن و سەیرترین شتیش لەوان ئەوەیە ساحێبی قسەی خۆیان نینە. چۆن دەتوانن بە شوورەییییەوە بژین؟ ئەوە نهێنییەکی پەنهانە. هندییەکانی شیلی ناویان لێنابووین – هوەینکا – بە زمانی مابۆدۆنگۆ، واتە «خەڵکە درۆزنەکان، دزەکانی خاک». من دەبووایە خۆم فێری ئەو زمانە بکەم، چونکە لە شیلی، لە باکوورەوە تا خواروو هەموویان قسەیان پێ دەکرد. گەلی مابۆچی بە زەین ڕوونییان قەرەبووی نەخوێندەوارییەکەیان کردبووەوە. ئاخر مێژووی خوو و ڕەوشت و داوونەریتیان، ڕابردووی پاڵەوانەکانیان گشتی لە چیرۆکەکانیاندا بە زمانی مابۆدۆنگۆ تۆمار کراوە و لە دێرزەمانەوە بە تەواوی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگواسترێنەوە. هەندێکیانم بۆ ئەلۆنسۆ دی ئێرسیا کە پێشتر هێمام بۆ کرد، وەرگێڕایە سەر زمانی ئیسپانی، تا لە هۆنینەوەی شیعرەکانیدا بەهرەی لێ وەرگرێت. وا دیارە ئەو چامەیە بڵاو کراوەتەوە و لە حەرمسەرای مەدرید دەستا و دەستی پێ دەکرێت، وەلێ من تەنیا ڕەشنووسی ئەو شیعرانەم لەکن هەیە کە ئەلۆنسۆ بۆی جێ هێشتم پاش ئەوەی لە پاکنووسکردنی دانەیەکی یارمەتیم دا. ئەگەر بە هەڵە نەچووبم ئەو شیعرانە لە هەشتەوانەکەیدا باسی شیلی و مابۆچی و ئەرۆکانییەکان دەکات بەم جۆرە:

شیلی هەرێمێکی بە پیت و جیاوازە
لە ناوچە ناودارەکانی خوارووda،
خاکی گەلانێکی دێرینی ڕێزدار
بەهێز، نەبەرد، خۆسەپێن.
دانیشتووانەکەی خەڵکانێکن پوخت و بێ گەرد،

نەفسبەرز و بەسام و ئازانە،
قەت شایەک حوکمی نەکردوونە
ملکەچیی بێگانەشیان نەزانیوە.

بێگومان ئەلۆنسۆ زیادەڕۆیی کردووە، وەلێ ئەمە بۆ شاعیران کارێکی ئاساییە، دەنا شیعر هێزەکەی خۆی لەدەست دەدات. چونکە شیلی نەبەرد و خۆسەپێن نەبوونە و دانیشتووانەکەشی پوخت و بێ گەرد نینە، هەر وەک ئەو دەڵێت، وەلێ من لەگەڵیدام کە هندییە مابۆچییەکان نەفسبەرز و بەسام و ئازانە و قەت هیچ پاشایەکیش حوکمی ئەوانی نەکردووە و ملیان بۆ بێگانەش کەچ نەکردووە. ئەوان گاڵتەیان بە ئازار دێت و بەرگەی هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەک دەگرن، بێ ئەوەی ناڵەیەک بکەن؛ نەک لەبەرئەوەی کەمتر لە ئێمە هەست بە ئێش دەکەن، بەڵکو لەبەر ئازاییانە. جەنگاوەری لەوان ئازاتر پەیدا نابێت و پێیان شەرەفە ئەگەر لە جەنگدا گیانیان بەخت بکەن. قەت نەیانتوانیوە بەسەر ئێمەدا زاڵبن، وەلێ ئێمەش نەمانتوانیوە ملیان پێ کەچ بکەین، هەتا ئەگەر هەمووشیان بکوژرێن. من وا دەزانم شەڕی هندییەکان چەند سەدەیەک دەخایەنێ، چونکە کۆیلە بۆ ئیسپانییەکان بەرهەم دێنێت. تەنیا دیلی شەڕەکان نەدەبوونە کۆیلە، بەڵکو هندییە سەربەستەکانیش کە ئیسپانییەکان ڕاویان دەکردن و پاشان دەیانفرۆشتن. ژنە زگپڕەکان بە دوو سەد پێزۆ و سەد پێزۆش بۆ پیاوە پێگەیشتووەکان و منداڵە تەندروستەکان. بازرگانیکردنی ناشەرعی بەو خەڵکەوە تەنیا لە شیلی پەیڕەو نەدەکرا ، بەڵکو دەگەیشتە شاری شاهانیش. لەو بازرگانییەدا ڕاسپێردراوەکان و چاودێرەکانی کاری کانگەکان، هەتا کاپتنی کەشتییەکانیش بەشدار دەبوون . ئاوا خەڵکی ئەو وڵاتانەمان لە ناو دەبرد، وەک چۆن بالدیبیا دەترسا، چونکە ئەوان مردنی بە سەربەستییان لە ژیانی کۆیلەیی پێ خۆشتربوو. خۆ ئەگەر لە ئێمەی ئیسپانیشیان بپرسیبایە کامەی هەڵدەبژێرن، بێگومان وەک ئەوانمان دەکرد. بالدیبیا لە ڕقان ئەوەندە لەو بێویژدانانە توورە دەبوو کە بەو شێوەیە دەجولانەوە و ئەو وڵاتانە لە دانیشتووانەکی بەتاڵ دەکەن. هەمیشە دەیگوت کە

ئەو خاکە بێ دانیشتووانە ڕەسەنەکەی هیچ نییە. ئیتر کە مردیش کۆتاییی ئەو خوێنڕێژییەی نەبینی کە چل ساڵ بەردەوام بوو. هاتنی ئیسپانییەکان بەردەوام بوو و دوو ڕەگەزەکانیش لە دایک دەبوون، وەلێ پیاوە مابۆچییەکان خۆیان لە شەڕی نەهێشتن و کۆیلایەتی و ئەو نەخۆشییانەش دەشاردەوە کە ئیسپانییەکان لەگەڵ خۆیان هێنابوویان و جەستەی ئەوان بەرگەی نەدەگرتن. من بە هۆی ئەو دەردەسەرییانەی کە بەسەریان هێنایین، لە مابۆچییەکان دەترسام؛ لەوەشیان تووڕە دەبووم کە وشەی مەسیح بەرپەچ دەدەنەوە و بەرگری لە هەوڵەکانی ئێمە دەکەن بۆ ئامادەکردنیان؛ لەو شێوازە دڕندانەیەشیان نابوورم کە پێدرۆ بالدیبیایان پێ کوشت، هەرچەندە لەوەیان زێتر نەکردبوو کە بە خۆیان کرابوو، چونکە زۆر کاری توند و دڵڕەقانە بەرامبەر ئەوان کرابوون. ئاخر هەروەک لە ئیسپانیا دەڵێن: هەر کەسێک بە ئاسن بکوژێت بە ئاسن دەکوژرێتەوە. من ڕێزیان دەگرم و حسێبیان بۆ دەکەم، ناشتوانم ئەوە بشارمەوە. ئێمەی ئیسپانی لەگەڵ مابۆچییەکان دوو دوژمنی هاوتای یەکین و لێک دەوەشێینەوە: ئاخر هەموومان لەم لایەنە یان ئەولا، ئازا و دڵڕەقین و دەمانەوێ بە هەر نرخێک بێت لە شیلی بژین. ئەوان بەر لە ئێمە گەیشتوونەتە ئێرە، ئەوەش مافێکی زیاتریان پێ دەدات، بەڵام هەرگیز ناتوانن لێرە دەرمان کەن. منیش وای دەبینم کە هەردوو لامان ناتوانین پێکەوە بە ئاشتەوایی بژین.

ئەو مابۆچییانە لە کوێوە هاتوونە ئێرە؟ دەڵێن ئەوانە بە هەندێک لە گەلەکانی ئاسیا دەچن. باشە ئەگەر ڕەچەڵەکیان لەوێ بێت، من ناتوانم وێنای ئەوە بکەم کە چۆن لەو دەریا شەپۆلدارانە و ئەو زەوییە پان و بەرینانەدا پەڕیونەتەوە و گەیشتوونەتەنە ئێرە. ئەوانە وەحشینە و لە بارەی نووسین و هونەر هیچ شتێک نازانن، شار و پەرستگا دروست ناکەن، نە نەسەب و نە نازناو و نە قەشەیان هەیە، تەنیا سەرکردەی شەڕیان هەیە و پێیان دەڵێن – تۆکی –. بە ڕووتی و ئازادانە لەگەڵ ژنە زۆرەکانیان و منداڵەکانیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەچن. وەک هندییەکانی تری ئەمریکایی،

قـوربانی لە بەشـەرەکـان نادەن و هیچ خـوایەک ناپەرستن و تەنیا بڕوایان بە یەک خـوا هەیە، وەلێ نەک خـوایەکەی ئێمـە، بەڵکو خـوایەکی تر کە پێی دەڵێن - نگینیچین -.

***

لەو مـاوەیەی کە خەریکی دامەراندنی چادرگەکەمـان بووین لە تاراباکا، لە دوای ئەو ماندووبوونەی ڕۆژانی ڕابردوو، بالدیبیا پلانی دانا هەتا یارمەتیمان بگاتە دەست و تـاقـەتمان بێتـەوەبـەر، لایەنگرانی ئینکای شـیلییـەکـان خۆیان ڕێک دەخست تا ئەوەندەی پێیان دەکرێت کاروانی ڕۆیشـتنەکەمان ناخۆشتر و گـرانتـر بکـەن. بە دەگمـەن نەبێت ڕووی خـۆیان نیـشـانی ئێمـە نەدەدا. بەڵام دزییان لێ دەکردین و لە دواوەڕا پەلاماریان دەدایـن، ئیتر بەو جۆرە وایان کرد سـەرقاڵی چارەسـەرکردنی بریندارەکان بم بەتایبەتی ئەو یاناکۆنایانەی کە بێ ئەسـپ و بێ زرێ شـەڕیان دەکـرد. هەواڵدەرەکـان ڕاهاتبـوون کـە نـاوی ئەو قـوربانیـیـانە نەهێنن، هەرچەندە بە بێ ئەو جـەمـاوەرە بێـدەنگەی هـندییـە دۆستـەکان کە پاڵپشـتی ئیسپانییەکانیـان دەکرد لە ئەرک و شـەڕدا، جیهانی تازە داگیر نەدەکرا.

لە ڕێگەی نێوان کۆسکۆ و تاراباکادا بیست و چەند سـەربازێکی ئیسپـانی هاتنە ڕیزەکـانمـان. پێـدرۆ دڵنیـابوو کـە وەختـێ دەنگوباسـی دەسـتـپێکردنی هەڵمەتەکە بڵاو دەبێتەوە ژمارەیەکی زیاتریش دێن، بەڵام ئێمە پێنج سەبازمان لەدەسـت دابوو کـە ئەوەش ژمـارەیەکی گـەورە بوو بۆ ئێـمـە، چونکە هـەر لە سـەرەتاوە ژمارەمـان کەم بوو. یەکێکیـان بە تیرێکی ژەهراوی زۆر بە سـەختی پێکرا، وەلێ کاتێک کە نەمتوانی چارەسـەری بکەم، پێدرۆ لەگەڵ برایەکی خۆی ڕەوانی کـۆسکۆی کـردەوە، هـەروەها دوو سـەربـاز و ژمـارەیەک هـندیشـمـان ونبـوون. لە دوای چەند ڕۆژێک لەو ڕووداوانە، سـەرکـردەی مـەیدانیـمـان بە شلەژاوییـەوە لە خـەو هەڵسـا، چونکە خـەونی بە ژنەکـەیەوە دیتـبـوو کـە لە ئیـسـپـانیـا چاوەڕێی هاتنەوەی ئەمی دەکـرد، پاشـان ئاشکرای کـرد کـە حـەفتـەیەکە ئێشـێکی پڕ لە ژان بەسـینگیدا دێت. منیش لەگەنێک ئاردی نۆکم

تێکەڵ بە ئاو و هەنگوێن کــرد، ئەویش لەســـەرەخـــۆ خـــواردی، دەتگوت خـواردنێکی بە لەزەت دەخـوات و بە مـیـهـرەبانیـیـەکەیەوە گـوتی: ئەی دۆنیـا ئێنیس، تۆ ئەمڕۆکە لە هەموو کاتێک جوانتری.

پاش ئەو قسـەیە لە هیکرا چاوەکانی وەک شـووشـە ڕەقـهەڵاتن و بەربووەوە بەر پێم و مـرد. دوای ئەوەی بە ڕێورەسـمێکی مەسـیحـیـیانە شـاردمـانەوە، ئامۆژگاری پێدرۆم کرد کە دۆن بێنیـتۆ لە جێگەی ئەو سـەرکردە مەیدانییـە دابمەزرێنێ، چوونە ئەو پیـرەپیـاوە ڕێگاکـان شـارەزایە و لە دروسـتکردنی ئۆردوگا و پاراستنی ئەمن و ئاسایش زانیارییەکی باشی هەیە.

ئێـمــە چەند سـەربازێکمــان لەدەست چـوو، بەڵام هـی تر وردە وردە وەک تارمـایی دەهاتن و هەندێکیش لە پیاوەکانی مـاگرۆ کە لە گـوند و کێـوەکان دەسـووڕانەوە و لە شـانشـینی بێسـارۆ بێ ورە و هاوڕێ بـوون، هاتنەوە ڕیزی ئێـمـــە. ئەوانە چەند چەند ســاڵێک بوو لەســـەر ســـەدەقـــە دەژیان و لە بەشداریکردنیان بۆ داگیرکردنی شیلی، هیچیان نەبوو تا بیدۆڕێنن.

بۆ ماوەی چەند حـەفتەیەک ئۆردوگایەکمان لە تاراباکا دروست کرد تا بوار بدەینە هندییـە هاریکار و مـاڵاتەکانمان نـەختێ قـەڵەو ببنەوە و هێزیان بێتـەوە بەر، پێش ئەوەی بیابانەکە ببڕین کە بە پێی قسـەکانی بێنیـتۆ ناخۆشـترین قۆناغی گەشـتـەکەمـان بوو. بۆی ڕوون کردینەوە کـە بەشـی یەکەمـی بیابانەکە وشکە، بەڵام بەشـی دووەمـیـان هـێشـتـا زۆر وشکتـر و ناخـۆشـتـرە و گـیـای لێ شـین نابێت.

لەو ئانەدا پێدرۆ بالدیبیا چەند فەرسـەخێک بە ئەسپەکەی ڕۆیشت سـەیری ئاسۆی دەرد و چاوەڕێی خۆبەخشی تازە بوو. دەبووایە سـانچۆ دی لا ئۆسـیش بگاتە ئێـمــە و لـە ڕێگەی دەریاوە پیـاو و زەخـیـرەمــان بۆ بێنێت، بـەڵام ئەو هاوبەشـە مشـەخۆرە هیچ هێمـایەکی نەداینێ تا بزانین داخـوا لە ژیاندا مـاوە یان نا.

لەو کاتەی کـە من بەتانییـەکانم دەچنییـەوە و گۆشـتی وشک و دانـەوێڵـە و

خـواردنی ترم ئامـاده دەکرد کـە، بێنیـتـۆ زنجیـیـەکانی ناچار دەکرد کـە لە خۆرهەڵاتنـەوە تا ئاوابوونی لە کوورەی ئـاسن کـار بکەن بۆ ئەوەی فـیـشـەک و نالّی ئـەسپ و سـەرەرِم دروست بکەن. هەروەها پـێـشـبـرِکـێـیـەکی لـە نێـوان سەربازەکان دروست کردبوو کە داخوا کامەیان شوێنی شـاردنەوەی خۆراکی هندییـەکـان دەدۆزێتـەوە. لە گونجـاوترین و پرِ ئەمـانـترین شـوێن ئۆردوگاکەی دامـەزراندبوو، کـە سـێبـەر و ئـاو و زورگی بۆ پاسـەوانی لێ بـوو. تاکە چادری بەکەڵک چادرەکەی من بـوو کە بێسارۆ پێشکێشی کردبووم. ئاخر سـەرەرِای فرەوانییـەکەی، لە دوو بەش پێک هـاتبوو و لە قومـاشێکی سـخ دروست کرابوو، بە ئەستووندەیەکی بتەو هەڵدەدرا و ژیانی تێدا لە هـی ماڵەوە ناخۆشتر نەبوو. بەڵام باقی سـەربازەکانی تر چۆنیـان پێکرابایە ئاوا ژیانیان رێک دەخست، بە جۆرێک بە قومـاشێکی پینە پینە کە هیچ گەرمی و ساردی نەدەگێرِایەوە، شـەو و رِۆژیان بەسـەر دەبرد. هـەندێکیـان ئەوەشـیـان دەستنـەدەکەوت و بە ناچاری شـەوان لە تەک ئەسـپـەکـانیـان دەخـەوتن. ئۆردوگـای هندییـەکـان جیـاوازبوو و بەردەوام پاسـەوانی لێ دەگیرا تا رِانەکەن. شـەوان سەدان ئاگردانی بچووک ئاگـری لێ دەکـرایەوە و خـواردنیـان لـە سـەر دەبرژاند و دەکـوڵاند. شـنەی با لەگەڵ خـۆی چەندان ئاوازی خـەمگینی لە ئامـێرە مۆسـیـقـاکـانـەوە دەهێنا و بەرگـوێمـانی دەخست کـە بە قـەد یەک حـەسـرەتی لـە دڵی بەشـەر و ئاژەڵیش بەرپا دەکرد.

دوو گوندی چۆلکراو لە نزیک شـوێنەکەی ئێمـەوە بوون، ئەوەندەی بە دوای خۆراکدا گەرِاین هیـچمـان نەدۆزییـەوە. لەوێ بۆمـان دەرکـەوت کە هـندییـەکـان عـادەتیـانە لە نزیک مـردووەکـانی خـۆیانـەوە دەژین، زیندووەکـان لە لایـەکی کوخـەکە و مردووەکانیش لـە لایەکەی تـر. هـەمـوو ماڵێکیش ژوورێکی تایبـەتی تێدایە مردووە مۆمیاکراوەکانی بەرِێکی لە ناو هەڵگیراوە. ئەو ژوورانە تاریکن و بۆنی قـەوزەیان لێ دێت. تـەرمـە مـۆمـیـاکـراوەکـانی باو و بـاپیـران و ژن و منداڵ، هـەر یەکێک بە کەلوپەلەکانی خۆیەوە لەو ژوورانەیە، بەڵام بەبێ خشـڵ و زێرِ، کەچی لە پێرۆ بە پێچەوانەوە، گۆرِی وا هـەیە پرِ لە شتی گرانبـەهایە، کە

لە نێویاندا پەیکەری ساف لە زێڕی تێدایە، جا بۆیە لە شیلی سەربازەکان دەیانگوت: لێرە تەنانەت مردووەکانیش هەر کڵۆڵن و تەنیا زەڕەیەک زێڕ لە هیچ شوێنێک نییە. لە ڕقان مۆمیاکانیان بە پەت لە ئەسپەکانیان دەبەستەوە و بە دوای خۆیان ڕایان دەکێشان تا پێچەرەوەکان دەدڕان و مۆمیاکان دەبوونە چەند پارچە ئێسقانێکی پەرش و بڵاو. لەو کاتەدا بە بەزمی ئەو نەبەردییەی خۆیان قاقا پێ دەکەنین و لە ئۆردوگای هندییەکانیش ترس و تۆقین بڵاو دەبووەوە. ئەو کاتەی خۆر ئاوا دەبوو دەنگوباسی ئەوە بڵاو دەبووەوە کە گوایە ئەو پارچە ئێسقانانە یەکیانگرتیتەوە و پەیکەرە ئێسقانەکان وەختی بەیانییان چەشنی سوپایەک لە گۆڕستانەوە هاتبێتە دەرێ، ئاوا دێن و لەناومان دەبەن. زنجییە تۆقیوەکان ئەم چیرۆکەیان لە نێو خۆیاندا دەگوتەوە تا گەییشتە گوێی ئیپسانییەکان، ئەوانەی بە ناویش ترسیان نەدەزانی، وەک منداڵی ساوا دەستیان بە گریان دەکرد. نیوەشەوێ سەربازەکانمان لە ترسان ددانەکانیان پێک دەکەوتنەوە، بۆیە بالدیبیا ناچاربوو وتارێکی پڕ لە حەماسەتیان بۆ بدا و بە بیریان بێنێتەوە کە ئەوان سەربازی ئیسپانیانە و لە هەموو سەربازانی جیهان خۆڕاگرتر و ڕاهێنراوترن، خۆ ئەوان کۆمەڵێک ژنە جلشۆری نەزان نینە. من چەند شەوێک خەو نەچووە چاوم و هەر نوێژم دەکرد، هەر کەسێکیش پێچەوانەی ئەمە بڵێت، لەبەر ئەوەیە کە لەوێ نەبووە.

سەربازەکان زۆر بە نائومێدییەوە دەیانپرسی کە ئاخۆ دەبێ لەبەر چ هۆیەکی شەیتانی لەو شوێنە نەفرەتلێکراوە چەند حەفتەیەکە خستوومانە و لە بەرچی بەرەو شیلی ناڕۆین کە نەخشەکەمان وابووە، یاخۆ بۆ ناگەڕێینەوە کۆسکۆ کە لە هەموان زێتر حیکمەتی تێدایە. ئەو دەمەی بالدیبیا لە گەیشتنی کۆمەک بێ هیوابووبوو، لە ناکاو هێزێکی هەشتا سەربازی دەرکەوت و لە نێویاندا هەندێ گەورە ئەفسەری تێدابوو کە نەمدەناسین، وەلێ پێدرۆ باسی ئەوانی بۆ کردم کە پیاوی ناودارن، لەوانە فرانسیسکۆ بیاگرا و ئەڵۆنسۆ دی مۆنرۆی، کە یەکەمیان پرچ زەردێکی خەنەیی و ڕوخسار سوور و تێکسمڕا و بزەیەکی گاڵتەجاڕانەی بە دەمەوە بوو و بە شێوازێکی سووک

هەڵسوكەوتی دەكرد، من هەمیشە وەک پیاوێكی هەراسانكەر لێیم دەڕوانی، چونكە ڕەفتاری خراپی لەگەڵ هندییەكان دەكرد و سەرەڕای ئەوەش چاوچنۆک و دژ بە هەژارەكان بوو. بەڵام دوایێ كە زانیم پیاوێكی ئازا و بەوەفایە، منیش ڕێزم بۆی دادەنا. بەڵام مۆنرۆدی لە دایكبووی سەلەمەنكا و نەوەی خانەوادەیەكی خانەدان، پیاوێكی تەواو جیاوازبوو: ڕەوشتبەرز، ڕێكوپێک، بەخشندە. هەر زوو بووینە هاوڕێ. هەروەها لە نێو ئەو پیاوانەدا، خێرۆنیمۆ ئەڵدێرێتی، كۆنە هاوڕێی سەربازی بالدیبیایان لەگەڵدا بوو، ئەو كەسەی كە ساڵانی پێشوو گەشتی جیهانی تازەی لە بەردڵ شیرین كردبووین. بیاگرا ئەوە پیاوەی قەناعەتی پێ هێنابوون كە وا چاكترە خۆیان بگەینێتە بالدیبیا و گوتبووی: «كاركردن لە خزمەتی پاشای خاوەن شكۆ باشترە لە مانەوەتان لە خاكێک كە هێشتا شەیتان تێیدا سەربەستە». لەو قسانەدا مەبەستی بێسارۆ بوو و گاڵتەی پێی دەكرد. هەروەها قەشەیەكی ئەندەلووسییان لەگەڵدا بوو كە پیاوێكی تەمەن پەنجا ساڵە بوو و ناوی گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ بوو، كە پاشان بووە ڕێبەر و ئامۆژگاری من، هەر وەک پێشتریش گوتم. ئەو پیاوە ئاینییە بە درێژایی ژیانی نموونەیەكی پڕ لە میهر و لێبووردەیی پێشكێش دەكرد، وەلێ من پێم وابوو ئەگەر سەرباز بووایە چاكتر بوو لەوەی قەشەیە، چونكە زۆر مەیلی بۆ جەربەزەیی و سامان و ژن دەچوو.

ئەو پیاوانە چەند مانگێک لە ناو دارستانەكانی چۆنچۆ ژیانیان بەسەربردبوو لە ڕۆژهەڵاتی پێرۆ. بۆ هەڵمەتێک دەرچووبوون كە سێ سەد ئیسپانی گرتبووە خۆ، بەڵام لە هەرسێ كەسیان دووانیان مردبوون، ئەوانەیش كە مابوونەوە لە برسان و لە ناخۆشی ژینگەی هەرێمی ئیستیوایی بووبوونە تارمایی. لەو دوو هەزار هندییەی كە بەشداری ئەو هەڵمەتەیان كردبوو تاكە كەسێكیان ڕزگار نەبووبوو. لەوانەی كە ئێسک و پرووسكیان لەوێ بەجێ مابوو نۆنێسی ئالاهەڵگری بەدبەخت بوو كە بالدیبیا لە جەنگەڵەكانی چۆنچۆ بە بۆگەنیبوون حوكمی دابوو، ئەو وەختەی كە لە كۆسكۆ ویستی من بڕفێنێت.

کەسم نەبینی خەبەرێکی یەکلاکەرەوەی نۆنێسم بۆ بێنێت کە داخوا چی بەسەر هاتووە، هەر ئەوەبوو لە جەنگەڵەکە خۆی بزر کردبوو و هیچ ئەسەرێکی دیارنەما. هیوادارم مردنێکی مەسیحییانە مردبێت و گۆشتی مرۆڤی لە دەمدا نەبووبێت. ئەو دەردەسەرییانەی کە بالدیبیا و خیرۆنیمۆ لە جەنگەڵەکانی ڤەنزوێلا بە سەریان هاتبوو وەک گەمەی منداڵان وابوو لە چاو ئەوەی بەسەر ئەو پیاوانەدا هاتبوو لە دارستانەکانی چۆنچۆ، لە ژێر لێزمەی بارانی گەرم و تەمی مێشوولەکان. ئەوانە لە نێو قوڕ و لیتەدا دەچەقین و نەخۆشی سەری تێ دەنان بە برسێتییەوە دڕندەکان بە دوایانەوە بوون کە ئەگەر ئیسپانییەکیان بۆ ڕاونەکرابایە، لە قووتدانی یەکتری نەدەسڵەمینەوە.

پێش ئەوەی درێژە بەچیرۆکەکەم بدەم، پێویستە بە شێوەیەکی تایبەت پێت بڵێم کە کێ سەرکردایەتی ئەو هێزەی کردبوو. ئەو کەسە پیاوێکی باڵابەرز و جــوان بوو، ناوچەوان پان و لووتێکی لە چەشنی هەڵۆی هەبوو، دوو چاوی قاوەیی گەورە وەک چاوی ئەسپ. برۆیەکانی چڕ و نیگایەکی دووربین و نەختێ خەواڵووی هەبوو کە کەمێک شیرینی دەدایە ڕوخساری. ئەمەیان ڕۆژی دووەمین توانیم درکی پێ بکەم، دوای ئەوەی چینێک قەوزەی نیشتووی سەر دەموچاوی لێ کردەوە و پرچی سەر و ڕووی هەڵپاچی کە دیمەنی کەسێکی ڕزگاربووی لە غەرقبوون پێ دەبەخشی. ئەو پیاوە هەرچەندە لە سەربازە ناودارەکانی تر تەمەنی کەمتربوو، وەلێ ئەوان خۆیان بە هۆی ئازایی و زیرەکی ئەویان بە سەرکردەی سەرکردەکان هەڵبژاردبوو. ئەو کەسە ناوی ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا بوو و لە دوای نۆ ساڵی دواتر دەبێتە مێردم.

***

بەرپرسیارێتی گەڕانەوەی هێز و تەندروستی ئەو سەربازانەم خستە ئەستۆی خۆم کە لە جەنگەڵەکانی چۆنچۆ هاتبوونەوە و کاتالینا و هەندێک لەو ژنە هندییانەی کارەکەرم بوون و فێری پیشەی چارەسەرکردنم کردبوون، لەو ئەرکە یارمەتییان دەدام. ئەو سەربازە داماوانە هەروەک دۆن بێنیتۆ دەیگوت، کە تازە لە دۆزەخی جەنگەڵە تەڕ و قوڕاوییەکە هاتبوونە دەرێ و بەم زووانەش

دەبێ بچنە ناو دۆزەخی بیـــابانی وشک و بێ ئاو؛ تەنیـــا شـــۆرین و خاوێنکردنەوەی زیبکە و نەهێشتنی ئەسپێ و برینی قژ و نینۆکیان ئەرکێکە چەند ڕۆژێکی دەوێ. هەندێکیـان ئـەوەندە لەڕولاواز بـووبوون بە ڕادەیەک ژنە هندییـەکان ناچاربوون بە کەوچک خـواردنی هاڕڕاوی منداڵەکانیـان بدەنێ. کاتالینا بۆ ئەو دەرمانەی کە هندییەکانی ئینکا لە کاتی ناچاریدا پەنای بۆ دەبەن، بە گـوێمـدا چرپاندی، ئیـتـر ئەو دەرمـانەمـان دەدایە ئەوانەی کـە زۆر پێویستیان پێی هەبوو، بێ ئەوەی پێیان بڵێین کە لە چ شتێک دروست کراوە، بۆ ئەوەی بێزار نەبن. کاتالینا شەوان بە نهێنی دەچووە دەرێ و ملی ئاژەڵێکی لامـای نەختـێک بریندار دەکرد و خـوێنی لێ وەردەگـرت. پاشـان ئێـمـە ئەو خوێنەمـان لەگەڵ شیـر و کەمێک میـز تێکەڵ دەکرد و دەمـاندایە نەخـۆشـەکە، ئیـتر بەو جۆرە هاتنەوە سـەرەخـۆ و چاکبـوونەوە، لە دوای دوو حـەفتـە کەوتنە بارێکی وا باش کە بتوانن لە هەڵمەتەکە بەشداری بکەن.

هندییەکانی یاناکۆنا خۆیان بۆ ئەو دەردەسـەرییانە ئامادە کرد کە چاوەڕێی دەکـردن؛ لە ناویاندا خـەڵکی وا هـەبوون کـە نەیدەزانی لە کـوێی ئەو خـاکـەدا بسـووڕێتـەوە، بەڵام گوێبسـتی ئەو بیابـانە مـەترسـیداره بووبوون. هەریەکێک لەوان دێمکەیەک ئاوی هەڵگرتبوو کە لە پێستی ڕانی ئاژەڵی لاما یان گواناکۆ یاخۆ ئـەڵبەکە دروست کـرابوون. ئەوان پێسـتی ئاژەڵەکەیان دادەڕنـی و پاشان وەریان دەگێڕا وەک تووڕەگە، تووکەکەیان دەخسـتـە ڕووی ژوورەوە. هەندێکی تر میـزڵدان یان پێستی گورگی دەریایان دەکردە دێمکە و دەنکە گەنمەشـامی وردیان لە ئاوەکە دەکرد تاکو لە بۆنە نـاخۆشـەکەی کەم بکەنەوە. دۆن بێنیتـۆ بەو بەرمیـلانەی کـە دروسـتی کـردبوون و لەگـەڵ ئەو کوندانەی کـە لە پێسـتی مـــاڵات ئامـــادەی کـــردبوون، پرۆســـەی گـــواســـتنەوەی ئاوی بە برێکی زۆر، ڕێکخست. کە زەینمـان دایێ ئەو برە ئاوە بەشـمان نـاکات، چونکە ژمارەمـان یەکـجـار زۆر بـوو، وەلێ نەدەکـرا لەوەش زیاتر بە شـانی پیـاوەکـان و پشـتی ماڵاتەکان بگوازرێتەوە. لەوەش خراپتر ئەوەبوو کە هندییەکانی شیلی هەر بە شـــاردنەوەی خـــۆراک نەوەســـتـــان، بەڵکو، بە پێی ئەو زانیـــاریانەی کـــە

هەواڵنێرێکی ئینکا لە دوای گرتن و ئەشکەنجەدانی ئاشکرای کرد، بیرە ئاوەکانیشیان ژەهراوی کردبوو. بێنیتۆ ئەو هەواڵگرەی لە نێو هندییەکانی خۆمان دۆزییەوە و داوای لە بالدیبیا کرد کە ڕێگەی پێ بدات تا بە ئەشکەنجەدان قسەی لێ دەربێنێت. پاشان زنجییەکان لەسەر ئاگرێکی بێگڕ سووتاندیان. من بەرگەی سەیرکردنی ئەشکەنجەدانیم نەدەگرت، بۆیە تا پێم کرا دوورکەوتمەوە، وەلێ هاوار و ناڵەی ئەو بەدبەختە تێکەڵ بە هاتوهاواری پڕ لە ترسی هندییەکانی یاناکۆنا دەبوو و لە دووری فەرسەخێکیش بووای هەر گوێت لێیان دەبوو. جا بۆ ئەوەی چی تر ئەشکەنجەی نەدەن، دانی پێدانا کە لە پێرۆوە بۆ ئەوە هاتووە کە ڕێنوێنیی بداتە هندییەکانی شیلی تا نەهێڵن ئیسپانییەکان پێشڕەوی بکەن. هەر لەبەرئەوەیە کە هندییەکان دوای ئەوەی خۆراکەکانیان دەشارنەوە و بەروبوومەکانیان دەسووتێنن، بە خۆیان و بەوەندە ماڵاتەی کە دەتوانن لەگەڵ خۆیان ببەن لە شاخەکان خۆیان بزر دەکەن. هەروەها گوتی من تەنیا هەواڵگرێک نیمە بۆ ئێرە هاتووم، بەڵکو سەدانی تریش بە ڕێگەی نهێنی بەرەو خواروو دەچن و ڕێنوێنی ئینکا مانکۆیان پێیە. لە دوای ئەوەی هەموو شتێکی ئاشکرا کرد، لە ئەشکەنجەدانی بەردەوامبوون و لەسەر ئاگری نێو ئاگردانەکە دەیانبرژاند تا ببێتە پەندێک بۆ ئەوانی تر. بالدیبیام ئاگەدار کردەوە کە چۆن ڕێگە بەو دڵڕەقییە دەدات، وەلێ بە تووڕەیی بێدەنگی کردم و گوتی: دۆن بێنیتۆ خۆی دەزانی چی دەکات، من پێش دەرچوونمان پێم گوتی کە ئەو جۆرە کارانە بۆ خەڵکی دڵنەرم و بەناز گونجاو نییە، بەڵام ئێستا کەڵکی پەشیمانبوونەوەی نییە و کاتی بەسەر چووە.

چەندە وشک و دێم و نەبڕاوەیە ڕێگەی بیابان! چەندە تاقەتپڕووکێن و لەسەرەخۆیە کاروان! چەندە گەرمە تەنیایی؛ ڕۆژەکان بە درێژی بەسەردەچوون، لە بێئاویی هەمیشەییدا لێکدەچوون، دیمەنێکی وشک لە گڵ و خاکی دڕ و بەردی ڕەق، بۆنی تۆزی سووتاو و خۆڵەمێشی دڕکی لێ دەهات، بە ڕەنگێک کە دەستی خواوەند دای هێناوە ڕەنگڕێژبووە. بە پێی قسەکانی دۆن بێنیتۆ، ئەو ڕەنگانە کانزای شاراوەن، وەلێ بە گاڵتەجاڕییەکی

شـەیتـانانەن هیچ زێڕ و زیویان تێدا نییە. من و پێدرۆ بۆ چەندان سـەعات بە پێ دەڕۆیشـتین و ئەسپـەکانیشـمـان بە جڵـەویانەوە بە دوای خـۆمـان دابوو تا مـاندوو نەبن. زۆر کـەم گفـتـوگۆمان دەکرد، چونـکە قوڕگمـان گڕی گـرتبـوو و لێویشمـان وشک، بەڵام ئێمە کە پێکەوە دەبووین، هـەر هـەنگاوێکمان هەڵدەگرت زیاتر لێک نزیک دەبووینەوە و بۆ پێشـەوە بەرەو ئەو خـەونە دەچووین کە پێکەوە خەونمان پێوەوە بینیبوو و لەمەودواش قوربانییەکی زۆری گەرەکە: شیلی.

بە چەترێکی لێوار بـەرین خـۆم دەپاراست و پارچە قـواشـێکم بە ڕووی خـۆم دادابوو کە دوو کونی لە کـەرخی چاوم هـەبوو و بە پارچەی تریش دەسـتـەکانم پێـچـابوون، چونکە دەسـتکێـشـم نەبوو. سـەربازەکـان زرێیـە گـەرمـەکـانیـان نەدەپۆشی و بە دوای خـۆیاندا ڕایاندەکێشـان. ڕەتڵـە دووروودرێژی هندییەکان بە هـێـواشی و بێـدەنگی و لـە ژێر پاسـەوانـیـیـەکی لاوازی زنجـیـیـەکـان بەڕێوەبوون. چونکە ئەو زنجـیـیـانە بـێ وره بوون و لە ڕۆیشـتن سـەریـان لەبەر خۆیان دەنا، بە شێوەیەک کە تاقەتیان نەبوو قامچییەکانیان بەرز بکەنەوە. ئەو ڕێگایە بۆ ئێمـە چەند نـاخـۆش بوو، بۆ بـارهـەڵگرەکـان هـەزار ئەوەندە؛ لەگـەڵ ئەوەی ئەوان لە ئیشـی قـورس و خـواردنی کـەم و خـراپ و سـەرکـەوتن و هـاتنە خوارەوەی چیاکـان ڕاهـاتبوون و وزەیەکی نهێنییان لە گەڵای کۆکا وەردەگرت، وەلێ نەیاندەتـوانی بەرگەی تێنوێتی بگرن. هـەر چەند ڕۆژان ڕادەبردن و بیرە ئاوێکی پاکمـان نـەدەکـەوتە سـەر ڕێگە، ئێمە زێتـر نائومـێد دەبووین. ئاخـر ئەو چەند بیرە کەمەی کە دۆزیمانەوە، هندییە شیلییەکان بە لاشـەی ئاژەڵ پیسیان کـردبوون. هـەندێک لە هندییەکـانـی خـۆمـان ئەو ئاوە بۆگـەنـەیان خـواردەوە، بە هـاوار و ناڵەوە مردن، دەتگوت ئاگر لە هـەناویان بەربووە.

وەخـتێ کـە زانیـمـان گـەیشـتـوینەتە دوا سنووری تاقـەتمان، ڕەنگی چیـا و زەوی گۆڕا و هـەوا وەسـتـا، ئاسـمـان سپی هـەڵگەڕا و هـەمـوو شێـوەکانی ژیانی بزربوون، لە ڕووەکە دڕکاوییەکانەوە تا دەگاتە باڵندە تەنیاکان کە پێشـتـر لە بینینیان ڕاهـاتبـووین: گەیشـتینە خاکێکی ترسناکی بێ ژیان. لەگـەڵ کازیوەی بەیانی دەستمان بە ڕۆیشـتن کردەوە، چونکە پاش کەمێکی تر خۆر لێ ناگەڕێ

پێشڕەوی بکەین. پێدرۆ پێی ڕاگەیاندین کە هەرچەند خێرا بڕۆین و زوو گەشتەکەمان تەواو بێت، زیانی گیانیمان کەمتر دەبێت، هەرچەندە هەڵنانی هەر هەنگاوێک ماندووبوونێکی گەورەی گەرەکبوو. لە ساتەکانی جۆشانی گەرمادا پشومان دەدا و لەسەر ئەو دەریا زیخە سووتێنەرەدا ڕادەکشاین و لە سەرەوەش تیشکی خۆر دەتگوت قورقوشمی تواوەیە لە نێو ئۆقیانووسێکی تەواو مردوودا. لە دوای سەعات پێنجی ئێواران دەستمان بە ڕۆیشتن دەکردەوە تا دنیا تاریک دادەهات و لە تاریکی شەوەزەنگدا نەماندەتوانی بەردەوام بین. بەڕاستی دیمەنێکی ترسناکبوو، درێژکراوەیەکی مەزنی ستەم و دڵڕەقی بوو. هیچ ورەی ئەوەمان لەبەردا نەمابوو تەنیا بۆ چەند سەعاتێکی کەم چادرەکانمان هەڵدەین و ئۆردوگایەک ڕێک بخەین. هیچ مەترسییەکمان لە هێرشی دوژمنان نەبوو، چونکە لەو چۆڵەوانییە کەس ناژیت یان بە گەڕان و سووڕان گیانی خۆی ناخاتە لێواری مردن. شەوان ئاووهەوا بە شێوەیەکی سەیر پێچەوانە دەبووەوە، لە گەرمای سووتێنەری ڕۆژدا بۆ سەرمایەکی شەختەیی دەگۆڕا. هەر یەکێکمان چۆنی بۆ پێ بکرابایە پاڵدەکەوت و لە سەرمان دەلەرزی، بێ ئەوەی کەس گوێ بە فەرمایشەکانی بێنیتۆ بگرێت کە ئەو تاکە کەس بوو داوای ڕێکوپێکی و دیسپلینی دەکرد. من و پێدرۆ هەوڵمان دەدا خۆمان لە باوەشی یەکتری گەرم بکەینەوە و لە بەینی ئەسپەکانمان دەنووستین. ئێمە زۆر هیلاک بووبووین و کاری ئەوینداری و جووتبوونمان چەند حەفتەیەک بوو لە بیر کردبوو. ئەو خۆگرتنەمان تەرخان کردبوو بۆ ئەوەی بە قووڵی شارەزای یەکتری بین و خاڵە لاوازەکانمان نیشان بکەین و جۆرێک لە تاسە و دڵسۆزی لە دەروونمان ببوژێنینەوە کە پێشتر کپ و خامۆشانە، سۆزە سەرکێشەکان خنکاندبوویان. مەزنترین شت لەو پیاوە ئەوەبوو کە قەت گومانی لە کارەکەی خۆی نەدەکرد: جێنشینکردنی قشتاڵییەکان لە شیلی و بە نەسرانیکردنی هندییەکان. هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئێمە ڕۆژێک لەو بیابانە دەبرژێین و دەمرین، هەر وەک ئەوانی تر کە وایان دەگوت؛ بەڵێ ئەو پیاوە قەت باوەڕی لەق نەدەبوو.

هەرچەندە ئەو یاسایانەی کە پێدرۆ کاری پێ دەکرد پوختە و بتەو بوون، ئەو ڕۆژە داهات ئاومان نەمێنێ. لەو ئانەدا ئێمە نەخۆشی تێنوێتی بووین، قورگمان بە وردە لم و زیخ ڕووشابوو، زمانمان ئاوسابوو و لێومان بریندار بووبوو. خەیاڵمان بۆ ئەوە دەچوو لە پڕێکا گوێمان لە دەنگی تاقگەیەک بێت و گۆمە ئاوێکی شیرین ببینین. ئەفسەرەکان دەبووایە هێز بەکار بێنن بۆ ئەوەی پێش لەو پیاوانە بگرن و نەمرن لە کاتێک کە بە دوای تارماییدا لەسەر زگ دەخشن. هەندێ لە سەربازەکان میزی خۆیان و ئەسپەکانیان دەخواردەوە. سەرەڕای ئەوەش میزەکە کەم و ڕەنگ تۆخ بوو. هەندێکی تر سەرشێتانە بەسەر هندییەکاندا زاڵ دەبوون تا ئەگەر چۆڕە ئاوێک لە دێمکەکانیان هەبێت بیخۆنەوە. خۆ ئەگەر بالدیبیا نیزامی بە سزایەکی سووک و تایبەت نەسەپاندایە، وا دەزانم پیاوەکانیش نەدەوێران کەسێک بکوژن و خوێنەکەی بمژن. لەو شەوەدا خوان دی مەلەگەی مێردم هاتە خەونم، مانگێکی تیشکدار ڕووناکی دەکردەوە، بە پێدرۆم نیشان دا، وەلێ نەیبینی و وای زانی هورێنە دەکەم. مێردەکەم لە بارێکی شڕدابوو و جلەکانی بە خوێن و تۆزەوە وشک هەڵگەڕابوون. ڕوخساری پڕ لە نائومێدی بوو، دەتگوت ئێسقانیشی لە تێنوێتیدا دەناڵێنێ.

ڕۆژی دواتر، ئەو کاتەی وامان دانا کە بزربووینە و تازە ڕزگارمان نابێت، گیانداریکی خشۆکی زۆر سەیر بەپەلە بە بەر پێمدا ڕەت بوو. ئێمە چەند ڕۆژێکی زۆر بوو جگە لە ژیانی خۆمان، هیچ شێوەیەکی ژیانمان نەدیتبوو، بەڵکو ئەو دڕکانەشمان نەدەبینی کە لە بەشەکانی تری بیابان زۆر بوون. ڕەنگە ئەو گیاندارە بزنمشک بووبێت، کە دەتوانێ لە ناو ئاگریش بژییێت. گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە هەرچەندە ئەو گیاندارە خۆڕاگر و شەیتانیش بێت، وەلێ ناوە ناوە پێویستی بە قومە ئاوێک دەبێت.

– ئەی پاکیزەی خۆشەویست، ئەوجا نۆرەی ئێمەیە –، بۆ وەبیرهێناوەی ڕێزدارمان پاکیزەی لێبووردەیی، ئەمەم گوت. ئەو لقەدارەم دەرهێنا کە لەگەڵ کەلوپەلەکانم هەڵم گرتبوو و دەستم کردە نوێژکردن. کات نیوەڕۆ بوو، ئەو

وەختە کە گشت خەڵک و ماڵاتە تێنوەکان پشوویان دەدا. بانگی کاتالینام کرد تا لەگەڵم بێت، هەردووکمان پێکەوە چەترێکمان بۆ خۆپاراستن هەڵگرت و هێدی ڕۆیشتین و لەبەر خۆمەوە هەر نوێژم دەخوێند: ئەی مەریەمەی پیرۆز. کاتالیناش بە زمانی کیچوا سرووتێکی دەخوێند. ماوەیەکی باش ڕۆیشتین، ڕەنگە سەعاتێکمان پێ چووبێت. ئێمە لە بازنەیەکدا دەخولاینەوە و وردە وردە فرەوانمان دەکرد، بۆ ئەوەی ڕووبەرێکی زۆر بپشکنین. دۆن بێنیتۆ وای زانی لە تێنوێتییان عەقڵی خۆم بزر کردووە و لەبەرئەوەی تاقەتی لەبەر بڕابوو، داوای لە ئەفسەرێکی لە خۆی گەنجتر و بەتاقەتتر کرد، کە ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا بوو، بۆ ئەوەی بمگێڕێتەوە.

ئەفسەرەکە بەوەندە دەنگەی کە مابوو لێم پاڕایەوە: خانمی گەورەم، بیکە بۆ خاتری خوا بگەڕێوە! وەرە ئێرە ئیستراحەت بکە. ئێستا بە پارچە قوماشێک سێبەرت بۆ پەیدا دەکەم...

منیش قسەکەیم پێ بڕی: ئەی ئەفسەر، بڕۆ بە دۆن بێنیتۆ بڵێ کە هەندێ پیاوم بە قازمە و خاکەناسەوە بۆ بنێرێت.

بە سەرسامییەوە وەڵامی دامەوە: قەزمە و خاکەناس؟

– تکات لێ دەکەم پێی بڵێ، با لەگەڵ هەندێ پیاوی چەکدار ژمارەیەک بەرمیلیش ڕەوان بکات.

ڕۆدریگۆ گەڕایەوە تا بە دۆن بێنیتۆ بڵێت کە من زۆر خراپترم لەوەی کە ئەو دەیزانێت، وەلێ بالدیبیا کە گوێبیستی ئەو قسانەبوو، دڵی پڕ لە هیوا بوو و فەرمانی بە سەرکردەی مەیدانی دا کە چیم داوا کردووە بۆمی ڕەوان بکەن. پاش ماوەیەکی کەم شەش هندی دەستیان کرد بە هەڵکەندنی بیرێک. هندییەکان بە قەدەر ئێمە بەرگەی تێنوێتییان نەدەگرت و ئەوان لە هەناوڕا وشک بووبوونەوە. هەر ئەوەتە دەیانتوانی قەزمە و خاکەناسەکە ڕاوەشێنن؛ بەڵام خاکەکە تەڕبوو و توانیان بیرێک بە قووڵایی بەژن و نیوێک لێ بدەن. لەی بنی بیرەکە ڕەنگی تار و تۆخ بوو، لە هیکرا یەکێ لە هندییەکان هاواری لێ هەستا و دیتمان لە بنی بیرەکە ئاو پەیدا بوو. سەرەتا تەڕاییەکی کەم بوو

وەک ئارەقەی زەوی، وەلێ لە دوای دوو سێ خولەک ئاوەکە گۆمێکی بچووکی دروستکرد. پێدرۆ کە زۆر لێم دوور نەبوو، دوو سەربازی نارده لام تا بیرەکە بپارێزن ئەگەر بە گیانی خۆشیان بێت، چونکە لەوە دەترسا ئەو هەزار پیاوە بۆ قەترە ئاوێک نائومێدانە هێرش بکەن. دڵنیام کردەوە کە ئاوەکە بەشی هەمووان دەکات، بە مەرجێ بە ڕێکوپێکی بیخۆینەوە. شوکر توانیمان وا بکەین. بێنیتۆ ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ هەر کەسە و جامە ئاوێکی دەدایێ، بۆ شەوەکەش، ڕۆدریگۆ بە خۆی و چەند سەربازێک، وڵاخ و ماڵاتەکانیان ئاودا و بەرمیل و دێمکەکانیشیان پڕکردن. ئاوەکە بە گوڕ دەهاتە دەرێ، نەختێ شێلو بوو و تامی کانزای لێ دەهات، وەلێ لەبەر دڵی ئێمە وەک نافوورەکانی سیڤیلیا سارد و شیرین بوو. خەڵکەکە بەدیارکەوتنی ئاوەکەیان بە موعجیزە دادەنا و ناویان لە بیرەکە نا - کانی پاکیزە -، وەک ڕێزلێنانێک بۆ ڕێزداری گەورەمان پاکیزەی لێبووردەیی. ئۆردوگایەکمان لەوێ دروست کرد و سێ ڕۆژان لەو شوێنەماینەوە و تینوێتیمان دەشکاند. کە دووبارە بەڕێکەوتینەوە هێشتا جۆگە ئاوێکی تەنکی بە سەر خاکی گەرمی بیابانەکە لەبەر دەڕۆیی.

پێدرۆ بالدیبیا بە دڵسۆزییەوە گوتی: ئەی ئێنیس، ئەو موعجیزەیە لە پاکیزەوە نەبوو، بەڵکو لە تۆوە بوو. لە سایەی تۆوە توانیمان ئەو ئەو دۆزەخە بە سەلامەتی ببڕین.

- ئەی پێدرۆ، من تەنیا دەتوانم لەو شوێنە ئاو بدۆزمەوە کە لێی هەیە، توانای ئەوەم نییە وا بکەم لە هەر شوێنێک بێت بێتە دەرێ، ناشزانم داخوا لە پێشمان ئاو هەیە یان نا؛ ئەگەر هەشبێت ڕەنگە بەو زۆرییە نەبێت.

بالدیبیا فەرمانی دا کە نیو قۆناغ لە پێشەوە بڕۆم تا زەوی بپشکنم و بە دوای ئاودا بگەڕێم. بۆ ئەو مەبەستە مەفرەزەیەک سەرباز و چل هندی یاریدەدەر و بیست ماڵاتی لامای بۆ هەڵگرتنی گۆزەی ئاو، لەگەڵم نارد. ئەوان تریشی کۆمەڵ کۆمەڵی کردن و نێوانیان سەعاتە ڕێیەک بوو، هەتا ئەگەر ئاومان دۆزییەوە قەرباڵغی لەسەر دروست نەکەن. دۆن بێنیتۆ بۆ سەرکردایەتیکردنی ئەوانەی لەگەڵ من بوون، ڕۆدریگۆی هەڵبژارد، چونکە ئەو

گەنجە لە ماوەیەکی کەمدا بووە جێگەی باوەڕی هەمووان، سەرەڕای ئەوەش چاوی لە هەموو ئەفسەرەکانی تر تیژتر بوو؛ ئاخر بە دوو چاوە قاوەییە گەورەکانی دەیتوانی ئەو شتانەش ببینێ کە نینە. ئەگەر لە ئاسۆی دووری بیابانەوە مەترسییەک هەبووایە پێش هەمووان دەیبینی، وەلێ بەوە چاک بوو تووشی هیچ مەترسییەک نەبووین. چەند سەرچاوەیەکی تری ئاوم دۆزییەوە، کە هیچیان وەک ئەوەی پێشوو ئاوی زۆر نەبوو، وەلێ بەشی ئەوەی دەکرد لە پەڕینەوەی بیاباندا، لە ژیان بمێنینەوە. ڕۆژێکیان سەرلەنوێ ڕەنگی زەوی گۆڕا و دوو باڵندە بە ئاسمانەوە بەسەرماندا دەسووڕانەوە.

***

ئەوکاتەی بەتەواوی لە بیابان پەڕینەوە، حسێبم کرد دیتم لەو ڕۆژەوەی لە کۆسکۆوە بۆ ئەو گەشتە بەڕێکەوتووین نێزیکەی پێنج مانگمان پێچووە. بالدیبیا بڕیاری دا چادرگەیەک دروست بکەین و چاوەڕێ بین، چونکە هەواڵی پێگەییشتبوو کە هاوڕێی گیانی بە گیانی – فرانسیسکۆ ئەگێری – ڕەنگە لەو شوێنە بمانگاتێ. هەندێ لە هندییە دوژمنەکانیش لە دوورەوە چاوەدێری ئێمەیان دەکرد، بێ ئەوەی لێمان نێزیک ببنەوە. جارێکی تر توانیم چادرە جوانەکەم هەڵدەم کە بێسارۆ پێشکێشی کردبووم. ئەرزەکەم بە مافووری پێرۆیی فەرشڕێژ کرد و بالیفی جوان و نەخشینم خستە بانی. قاپ و لەنگەرییە فەخورییەکانم لە سەندووقەکە دەرهێنا بۆ ئەوەی چی تر چێشت لە قاپی دارین نەخۆین. بڕیارم دا تەنوورێک لە قوڕ دروست بکەین بۆ چێشت لێنان، لە دوای دوو مانگ لە خواردنی دانەوێڵە و گۆشتی قاورمە. لە ژووری چادرە گەورەکەی بالدیبیا کە کرابووە بارەگای سەرکردایەتی و هۆڵی کۆبوونەوە و دادگا، کورسییە گەورەکەی ئەو و چەند کورسییەکی تری لە پێست دروستکراوی بێ پشتم بۆ ئەو میوانانە دانا کە لە هیکرا پەیدا دەبوون. کاتالینا وەک تارماییەکی نادیار، لە سبەینەوە تا ئێوارێ بە نێو چادرگاکەدا دەسووڕایەوە تا هەواڵم بۆ کۆ بکاتەوە. هیچ شتێ نەبوو لە بەینی ئیسپانییەکان و هندییەکان ڕوو بدات و من پێی نەزانم. زۆر جاران

سەرکردەکان بۆ نانخواردنی ئێوارە دەهاتن و لەوەش ڕاهاتبوون لە ناکاو پێدرۆی بە بانگکردنی من هەراسان بکەن تا لەگەڵیان لەسەر خوانەکە نان بخۆم. ڕەنگە تەنیا بۆ جارێکیش یەکێکیان لە ژیانی خۆیاندا لەگەڵ ژنێک نانی نەخواردبوو، چونکە ئەوە لە ئیسپانیادا باو نەبووە، بەڵام داوونەریتەکانی ئێرە زیاتر ئاسانکاری تێدابوو. ئێمە مۆم و چرای زەیتمان بۆ ڕووناکی بەکار دەهێنا، بۆ خۆگەرمکردنەوەش بە دوو مەقەڵە پەنگری پێرۆیی گەورە، چونکە شەوانی ئەوێ زۆر ساردبوون. گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ کە حەزی لە سوعبەت و گاڵتە بوو سەرەڕای قەشەییەکەی، ئەوەی بۆ ڕوونکردینەوە کە بۆچی وەرزەکان گۆڕاون و لەبەرچی کە لە ئیسپانیا وەرزەکە زستان بێت لە شیلی هاوینە، یان بە پێچەوانە، وەلێ کەسێک تێی نەدەگەیشت چی دەڵێت و هەر لەسەر باوەڕەکانی خۆمان ماینەوە کە یاساکانی سروشت لە جیهانی تازە جیاوازە.

لە لایەکەی تری چادرەکە ئەو چوارپایەی لێ دانرابوو کە من و پێدرۆ لە سەری دەنووستین. هەروەها مێزێکی نووسین و شوێنی تایبەتی نوێژکردنی من و سەندووقەکانی کەلوپەلمان و حەوزێکی دارینی خۆشۆرینی لێ بوو کە لەمێژبوو بەکار نەهێنرابوو. پێدرۆ ئەوەندەی جاران لە خۆشۆرین نەدەترسا و جار جارە ڕازی دەبوو بچێتە ناو حەوزەکە و منیش بە سابوون بیشۆم، وەلێ ئەو حەزی دەکرد تەنیا بە پارچە قوماشێکی تەڕ جەستەی بسڕمەوە. ئەو ڕۆژانە زۆر خۆش بوون، بووینەوە دوو عاشقەکەی جارانی کۆسکۆ. حەزی دەکرد بەر لەوەی بکەوینە کاری ئەوینداری، ئەو کتێبانەم بە دەنگێکی بەرز بۆ بخوێنێتەوە کە خۆی ئارەزووی لێ بوون. ئەو نەیدەزانی کە قەشە گونزالس فێرە خوێندن و نووسینم دەکات، وەلێ ئەمەیان خۆم وام دەویست، چونکە من گەرەکم بوو لە وەختێک ئەوەی پێ بڵێم کە تەواو فێر بیبوومە.

دوای چەند ڕۆژێک پێدرۆ لەگەڵ هەندێک لە پیاوەکانی چووە دەرێ تا هەرێمەکە بپشکنن و بە دوای فرانسیسکۆ ئەگێریدا بگەڕێن و سەیریش بکەن بەڵکو بوار هەبێت لەگەڵ هندییەکان گفتوگۆیەک بکەن. چونکە فرانسیسکۆ

تاکە کەسێک بوو کە پێی وابوو دەکرێت لەگەڵ هندییەکان تێکگەیشتن هەبێت. ڕۆیشتنی ئەوم قۆستەوە تا گەرماو بکەم و قژم بە دەرمانی "کێیای" بشۆم، ئەو مادەیە شیلەی دارێکی شیلییە کە ئەسپێی دەکوشت و پرچی وەک حەریر نەرم دەکردەوە و تا مردن سپی نەدەبووەوە. وەلێ لەگەڵ مندا وا دەرنەچوو و پرچمی تەواو سپی کرد، هەرچەندە بەردەوام بەکاریشم دەهێنا. بەوە چاک بوو وەک زۆربەی ژنانی تەمەنی خۆم، سەرم نیوە ڕووتاوە نەبوو. بە هۆی زۆر ڕۆیشتن و سواربوونی ئەسپەکەم، هەستم بە پشتئێشە دەکرد، یەکێک لە کارەکەرکانم بە مەرهەمێک شێلامی کە کاتالینا ئامادەی کردبوو. دوای ئەوە لەسەر پشت ڕاکشام و هەستم بە ئیسترااحەت کرد و بەڵستاریش لەکن پێم وەرکەوتبوو. تەمەنی ئەو گوجیلەیە دە مانگ بوو و هێشتا حەزی بە یاری دەکرد، وەلێ لەشی گەورە بووبوو و پێیەوە دیاربوو کە پاسەوانە. ئەو شەوە خەوزڕان ئازاری نەدام و زوو خەوم لێ کەوت.

لە دوای نیوە شەوێ لە حەپەی بەڵستار بەئاگا هاتم. لەسەر چوارپاکە دانیشتم و بەو تاریکییە بە دوای شاڵەکەمدا دەگەڕام تا بەخۆمی دادەم و بە دەستەکەی تریشم تاقیبی سەگەکەم دەکرد. لەو وەختەدا لە ژوورەکە تر گوێم لە دەنگێک بوو و گومانم کرد یەکێک لەوێ بێت. سەرەتا وام زانی پێدرۆ گەڕاوەتەوە، چونکە دەرگەوانەکان لێ نەدەگەڕان بێجگە لەو کەسێکی تر بێتە ژوورەوە، وەلێ ڕەفتاری سەگەکە وای لێ کردم بە وریایی هەست ڕاگرم. وەختی ئەوە نەبوو چراکە داگیرسێنم. بە ترسەوە گوتم: ئەوە کێیە لەوێ؟

بێدەنگییەکی ترسبار ئەو ناوەی داگرت، پاشان یەکێک لە تاریکاییەوە بانگی پێدرۆی کرد. منیش بە تووڕەیییەوە لێم پرسی: لێرە نییە، تۆ کێی؟

– بمبوورە خانمی بەڕێز، من "سانچۆ دیلا ئۆس"م خزمەتکاری بەوەفای سەرکردەی گشتیمە. لەمێژە بەڕێوەمە تا گەیشتوومەتە ئێرە، حەز دەکەم ئەحواڵی بپرسم.

هاوارم کرد: سانچۆ دیلا ئۆس؟ چۆن وێرای بەو نیوەشەوە بێیتە ناو چادرەکەم؟

لەودەمەدا بەڵستار بە توورەیی دەحەپی و پاسەوانەکانی خەبەردار کردەوە. لە ماوەی چەند خولەکێکدا دۆن بێنیتۆ و کێرۆگا و خوان گۆمیس و هەندێکی تر بە پەلە هاتن، چرایان بە دەستەوە بوو و شمشێرەکانیشیان هەڵکێشابوو نەک بەتەنیا بۆ دیلا ئۆسی ڕەزاقورس، بەڵکو چوار پیاوی تریشی لەگەڵدابوو. یەکەم کاردانەوەی پیاوەکانمان ئەوەبوو دەستبەجێ دەستگیریان کردن، بەڵام باوەڕم پێهێنان کە تێکنەگەیشتنێک لە گۆڕێدا هەیە و تکام لێ کردن کە بکشێنەوە. پاشان لە کاتێک کە خێرا جلەکانم دەپۆشی، بە کاتالینام گوت کە خواردن بۆ میوانە تازەکان بێنێت. بە دەستی خۆم بادەم بۆ تێکردن و نانی ئێوارەم دانێ بە پێی ئەرکەکانی خانەخوێ، بە بایەخەوە گوێم لەو بابەتانە گرت کە دەیانویست لە بارەی ناخۆشییەکانی گەشتەکەیان پێمی بڵێن.

لە دوای خواردنەوەی چەند بەرداخێک بادە، بە خێرایی چوومە دەرێ تا بە بێنیتۆ بڵێم کە تا زووە یەکێک بە دوای پێدرۆدا بنێرێت. بارودۆخەکە زۆر هەستیار بوو، چونکە دێلا ئۆس ژمارەیەک لایەنگرانی ئێمەی لا بوو لەوانەی لە هەڵمەتەکەدان و تووشی نائومێدی و بێ ورەیی بوونە. ئاخر هەندێ لە سەربازەکان پێدرۆیان بە زەوتکردنی ئەرکی دەستبەسەراگرتنی شیلی لە نوێنەری تاج، تاوانبار دەکرد، چونکە ئەو ئەوراقی پشت پێ بەستنی شاهانەیەی کە لە کن سانچۆ دیلا ئۆس هەیە، دەسەڵاتێکی بەرزترە لەو ڕێگەپێدانەی کە لە لایەن بێسارۆوە دەرچووە. لەگەڵ ئەوەش دیلا ئۆس، پاش ئەوەی ئەو سامانەی کە وەک بەخشش لە ئەتاوالبا وەری گرتبوو و هەمووی لە ئیسپانیا تەخشان و پەخشان کرد. هیچ پشتگیرییەکی ئابووری نەمابوو، نەشیدەتوانی کەشتی و سەرباز بۆ ئەو کارە گرینگە پەیدا بکات. پاشان قسەی ئەو حسێبی بۆ ناکرێت، چونکە لە پێرۆ بە هۆی قەرز و فڕوفێڵ زیندانی کرابوو. گومانم لێی پەیدا کرد کە دەیەوێ خۆی لە بالدیبیا ڕزگار بکات و دەست بەسەر هەڵمەتەکەدا بگرێت و بە تەنیا لەسەر داگیرکردنی شیلی بەردەوام بێت.

بڕیارم دا بەوپەڕی ڕێزەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ میوانەکان بکەم، بۆ ئەوەی

هەست بە دڵنیایی بکەن و نەختێ لە وریاییان کەم بێتەوە تا ئەو وەختەی پێدرۆ دەگەڕێتەوە. خواردنێکی زۆرم دانێ و هەندێکم لە خەشخاشی خەوهێنەر لە بەرداخی بادەکەیان کرد کە بای ئەوەی دەکرد گامێشێک بخاتە سەر ئەرزێ، ئاخر من نەمدەویست هاوار و دەنگەدەنگ لە سەربازگەکەمان ڕوو بدات؛ چونکە دوا شتی گونجاو بۆ ئێمە ئەوەبوو ببین بە دوو تیم، هەر ئەوەش ڕەنگە ڕوو بدات ئەگەر دیلا ئۆس گومانەکانی لە بارەی شەرعیەتی بالدیبیا بڵاو بکاتەوە. گومانم نییە ئەو پێنج سەرسەختە کە دەبین قسەم خۆش و نەرمونیانم لەگەڵیان، لە پشتڕا پێم پێ دەکەنن و دڵخۆشن بەوەی کە توانیویانە بە زمانە ڕەوانەکەی خۆیان بۆشی ئەو ژنە گێلە وەرگرن، وەلێ سەعاتێکی نەبرد سەرخۆش بوون و هۆشیان نەما، بە شێوەیەک کە وەختێ دۆن بێنیتۆ و پاسەوانەکان هاتن و بردیانن، هیچ بەرگرییەکیان پێ نەکرا. وەختێ کە باخەڵیان پشکنین دیارکەوت کە هەریەکە و خەنجەرێکی دەسک زیوی نەخشداری پێیە و هەموویان وەک یەکن، ئیتر گومانمان نەما کە پیلانێکی نەخشە کێشراو بۆ کوشتنی پێدرۆ لە گۆڕێدا بووە. لێکچوونی خەنجەرەکانیش زادەی بیری دیلا ئۆس بوو، بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی تاوانەکە بخاتە سەر ملی پێنج لایەن. ئەفسەرەکانمان ویستیان هەر لەوێ لە سێدارەیان بدەن، بەڵام ئاگەدارم کردنەوە کە ئەو بڕیارە ترسناکە و جگە لە پێدرۆ کەس بۆی نییە بیدات. من زۆر مەکر و شیوازم بەکار هێنا تا نەهێڵم بێنیتۆ ئەو دیلا ئۆسە بە نێزیکترین دار هەڵواسێت.

***

سێ ڕۆژ لە دوای ئەوە پێدرۆ گەڕایەوە و هەموو زانیارییەکی لە بارەی پیلانەکە پێ گوترابوو، لەگەڵ ئەوەش هەواڵەکە هیچ کاری لە وڕەی نەکردبوو، چونکە فرانسیسکۆ دی ئەگێری کۆنە هاوڕێی لە دوای چەند حەفتەیەک لە چاوەڕوانی، دۆزیبووەوە. ئەو پیاوە پازدە سوار و دە چەکهەڵگر و ژمارەیەکی زۆری لە هندیی خزمەتکار و خۆراکی چەند ڕۆژێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو. بە هاتنی ئەوان ژمارەمان زیادی کرد، وەک لە بیرم مابێت بووینە سەد و سی و

هەندێک سەرباز. بەڕاستی هاتنی ئەوانە موعجیزەیەکی گەورەتر بوو لە موعجیزەی دۆزینەوەی کانی ئاوی پاکیزە.

پێدرۆ پێش ئەوەی لەگەڵ سەرکردەکانی تر گفتوگۆ لەسەر مەسەلەی سانچۆ دیلا ئۆس بکات، جودای کردمەوە هەتا گوێی لە گێڕانەوەی من بگرێت کە چی ڕووی داوە. زۆر جاران دەڵێن کە من سیحرێکی پیسم لە پێدرۆ کردووە و بادەی ئەفرۆدیتم داوەتێ و لە نێو جێگەدا بە مەکر و حیلەبازی و گومڕایی تورکیانە شێتی دەکەم و تاقەتی لەبەر دەبڕم و ئیرادەی پێ ناهێڵم، ئیتر چۆنم بوێ ئاوای لێ دەخورم. ئەوان زۆر دوور نەبوون لە ڕاستی، چونکە پێدرۆ پێشتر کەللەڕەق و ڕوحگەورە بوو و چاک دەیزانی کە چی دەوێت و کەسیش نەیدەتوانی بە هونەرەکانی سیحربازی یان لەزەتی ژنان ئاراستەکەی بگۆڕێت، بەڵکو تەنیا گوێی لە بەڵگەی عەقڵانی دەگرت. ئەو لەو کەسانە نەبوو کە زۆر گوێ لە ئامۆژگاری بگرێت، چجای ئەوەی ئەو ئامۆژگارییە لە ژنانەوە بووایە. وەلێ لە بەیەککگەییشتنە گەرمەکانی لەگەڵ مندا بێدەنگ دەبوو و ئەمسەر و ئەوسەر ژوورەکەی دەپێوا و گوێشی لای من بوو تا ڕای خۆمی بە دروستی پێ بڵێم. من هەوڵم دەدا شتەکانی بە نەختێک ئاڵۆزییەوە پێ بڵێم تا دواجار بێتە ئەو بڕوایەی کە ئەو خۆی بڕیارەکەی داوە. من هەمیشە لەو شێوازە سوودم وەردەگرت. ئاخر پیاو ئەو شتانە دەکات کە لە توانایدا هەیە، ژنیش ئەو شتانە دەکات کە بە پیاو ناکرێن. من پێم وابوو کە لە سێدارەدانی دیلا ئۆس کارێکی ڕاست و دروست نییە - کە بێگومان ئەو سزایە پڕ بە پێستی ڕەفتارەکەی ئەو بوو- چونکە بە بەڵگەنامەی پشتگیری شاهانە پارێزراوە و خزمێکی زۆریشی لە کۆشکی مەدرید پەیوەندییان لەگەڵ پاشا هەیە و ڕەنگە لە سێدارەدانی ببێتە هۆی ئاژاوە و یاخیبوون لە دژی بالدیبیا. ئەرکی من بوو کە نەیەڵم خۆشەویستەکەم ژیانی بە ئەشکەنجە و سێدارە کۆتایی بێت.

پێدرۆ لە ژوورەکەدا وەک کەڵەشێرێکی ئامادەی شەڕ پیاسەی دەکرد و لە بەرخۆیەوە ورتەورتی بوو، پاشان گوتی: خائینێکی وا هەقی چی هەیە؟

– تۆ بووی کـه دەتگوت باشـتـر وایە دوژمنەکـانت لێـتەوە نـێـزیک بێت هەتا بتوانی چاوەدێرییان بکەیت...

پێـدرۆ لە بری ئـەوەی یەکـسـەر دادگـایی تاوانبـارەکـان بکات، بڕیاری دا نەختێ سـەبر بگرێ تا بزانێت داخـوا باری مـەعنەوی سـەربازەکـان چۆنە و بەڵگەش لە سـەر پیلانەکە کۆ بکاتـەوە و پەردە لە ڕووی ئەوانەش هەڵماڵێ کە دەستیـان لە پیلانەکەدا هەیە. لە هیکرا فـەرمـانی بە بێنیـتۆ دا کە چادرگەکە هەڵگرن و بەرەو خـواروو بڕۆین. هەمـوو دیل و زیندانـیـیـەکـان و ئەوانـەی لە ترسـان حەجـمانیان نەمابوو، بە پێش خـۆیدان، جگە لە سـانچۆ دیلا ئۆس کە وای دەزانی ئەم لە سـەرووی دادوەرییە. سەرەڕای ئـەوەش لە زیندانەوە هەوڵی دەدا لایەنـگر بۆ خـۆی پەیدا بکات و خـۆی پۆشـتـە نیـشـان بدات. داوای لە کارەکەرە هندییەکەی دەکرد کە یەخە پڕ لۆچەکەی ڕێک بخات و شەرواڵەکانی بۆ دەق بکات و پرچی شانە بکات، بە گولاویش بیرشێنێ و نینۆکەکانی بکات. پیاوەکان فەرمانی ڕۆیشتنەکەیان بە نابەدڵی وەرگرت، چونکە لەو شوێنە زۆر ئاسـوودە بوون کـە ئاو و فـێنکایـەتی و داورودرەحـتی لـێ بوو. وەلێ پێـدرۆ بە هاوار و خۆتووڕەکردنەوە پێی گوتن کە فەرمانی سەرکردە گفتوگۆی لەسـەر ناکرێت. بالدیبیـا لەگەڵ ئەو ناخـۆشـییـانـەش، توانی بەبێ کۆسـپ و تەگەرە ڕایان پێچێ؛ پەڕینەوەی بیابان سـەرکەوتنێکی گـەورەی پێکهێنـابوو، کە لەو پەڕینـەوەیەدا تەنیـا سێ سـەرباز و شـەش ئـەسپ و سـەگـێک و سێ مـالاتی لامـامـان لە دەسـتـدابوو، بەڵام کـەس حـسـێـبی ژمـارەی هندییـە مـردووەکـانی نەکردبوو، وەلێ بە پێی قسەی کاتالینا ژمارەیان دەگەیشتە نێوان سی تا چل کەسێک.

هەر لەو ڕۆژەوەی فرانسیـسکۆ ئەگێریم ناسی هەسـتم بـە بڕوا و مـتـمـانە دەکـرد لە بـەرامـبـەری، هەرچـەندە دیمەنی زۆر ترسـناک بوو. لەگـەڵ ڕابردنی کات کە بینیم خـۆی لە دڵڕەقی دوور دەخـاتەوە، ترسم لێی شکا. پیـاوێکی زۆر کـەلەش گـەورە بوو، حـەزی بە هاتوهاوار دەکـرد، بالای بـەرز و بتـەو بوو، هەمـیـشـە قـاقـای پێکەنینی سـواربوو، بە قـەد سێ کـەسـانی دەخـوارد و

دەخواردەوە، هەروەک پێدرۆ پێی گوتم، توانای ئەوەی هەبوو بە شەوێک دە ژنە هەندی ئاوس بکات و دەی تریش لە شەوی دواتر. تەمەنێکی درێژی بەڕێ کردبوو و ئێستاش پیرێکی بێ وەسوەسەی ویژدان و بێ ڕق و قینە. هەرچەندە ساڵانێکی زۆر لە زیندانەکانی دادگاکانی پشکنین و زیندانە بۆگەنەکانی پاشا بووە، کەچی هێشتا هزر ڕوون و لەش ساغە. لە سایەی ئەو زەوییەی کە مێردە مردووەکەم پێی دابوو گوزەرانێکی باشی هەبوو. زۆر زەحمەتبوو دوو کەسی ئەوەندە لێکجیاوازی وەک ڕۆدریگۆی دڵفرەوان و خانەدانی مێردم لەگەڵ فرانسیسکۆی سەرکێش بدۆزیتەوە، وەلێ لەگەڵ ئەوەش یەکتریان وەک دوو سەربازی چاکی شەڕوان و دوو هاوڕێی کاتی ئاشتی خۆش دەویست. ڕۆدریگۆ نەیدەهێشت هاوڕێکەی لە تەنگانەدا بە هۆی بەدفەڕی تاج و کەنیسە ببێتە سواڵکەر، بۆیە تا مردنی ئاگەداری لێی بوو. ئەگێریش کە هیچ شوێنێکی جەستەی نەمابوو کە شوێنەواری برینی شەڕەکانی پێوە دیار نەبێت، دوا ڕۆژەکانی ژیانی لە کێڵگە بچووکەکەی لە تەک ژنەکەی بە چاندنی گەنمەشامی بە ڕێ دەکرد کە لە ئیسپانیاوە بە دوای خۆشەویستی مێردەکەی لەگەڵ منداڵەکانی و نەوەکانی هاتبوو. ئەو پیاوە تەمەنی گەیشتبووە هەشتا ساڵ کەچی نەکەوتبوو و هێشتا خەیاڵی بۆ جەربەزەیی دەچوو و گۆرانی گەنجانەی بە ژناندا هەڵدەگوت. جگە لە منداڵە شەرعییەکانی، زێتر لە سەد منداڵی ناشەرعیشی هەبوون کە کەس نەیدەناسین، ڕەنگە سەدانی تریشی هەبن وەلێ کەس سەرژمێری نەکردبوون. بڕوای وابوو کە باشترین ڕێگە بۆ خزمەتکردنی پاشای خاوەن شکۆ لە وڵاتی هند ئەوەیە بە نانەوەی نەوەی دوو ڕەگەزەکان ئاوەدانی بخەیتەوە، باوک ئیسپانی و دایک هندی،؛ کار گەیشتە ئەوەی بڵێت کە چارەسەرکردنی کێشەی خەڵکە ڕەسەنەکە ئەوەیە، بە سەبر و بەرنامەیەکی ڕێک، هەموو نێرەکان بکوژرێن ئەوانەی لە سەرووی تەمەنی دوازدە ساڵیدان و منداڵەکانیان بڕفێنن و بە زۆر لاقەی ژنەکانینشیان بکەن. پێدرۆ وای دەزانی هاوڕێکەی گاڵتە دەکات، وەلێ من دەمزانی هی ناوەندی دڵییەتی. هەرچەندە

زۆر بەبێتامی لەگەڵ ژنان ڕای دەبووارد، بەڵام تاکە ژنێک کە لە ناخەوە خۆشی دەویست، کچە مامەکەی بوو کە بە پێی ڕێگەپێدانێکی تایبەتی لەلایەن پاپاوە بووە هاوسەری، هەر وەک پێشتریش وا بزانم باسم لێوە کرد.

ئیزابێل گیان، سەبرم لێ بگرە؛ ئاخر تەمەنم حەفتا ساڵە و ڕەنگە قسەکانم دووبارە ببنەوە.

***

چەند ڕۆژێک لە ڕێگەدا بووین و گەیشتینە دۆڵی کۆبیابۆ، کە لەوێوە ئەو خاکەی ژێر دەسەڵاتی پێدرۆ دی بالدیبیا دەست پێ دەکات. هاوارێکی پڕ لە شادی لە ناخی ئیسپانییەکانەوە دەرچوو: ئەوا گەیشتینە جێ. پێدرۆ خەڵکەکەی کۆکردەوە و خۆی بە ئەفسەرەکانی دەورەدا و بانگی منیشی کرد لە تەنیشتی بوەستم، بە سام و هەیبەتەوە ئاڵای ئیسپانیای چەقاند و بەرسیارێتی پایەی خۆی ڕاگەیاند. ناوی لەو وڵاتە تازەیەنا "ئیستریمادۆرای تازە"، چونکە خۆی و بێسارۆ و زۆربەی خانەدانەکانی هەڵمەتەکە و منیش لەو هەرێمەی ئیسپانیاوە هاتبووین. قەشە گۆنزالس دی مارمۆلیخۆش یەکسەر پەرستگەیەکی دروست کرد و پەیکەرێکی مەسیحی لە خاچدراو و کەڵەشێرێکی زێڕین و - ئەمە تاکە زێڕێک بوو کە چەند مانگێک بوو دیتبوومان - پەیکەرێکی بچووکی ڕێزدارمان پاکیزەی لێبووردەیی لەسەر دانا، کە ئەو پاکیزەیە لە بیاباندا بە خێروبێری خۆی ڕزگاری کردین. قەشەکە کۆنوێژێکی شوکرانەی کاریگەری دابەستا و هەمووومان بە ڕوحێکی زلەوە بەشداریمان لە نانی قوربانیدا کرد.

ئەو دۆڵە چەند میلەتێکی تێکەڵی لێ دەژیا و ملکەچی نیزامی ئینکا بوون؛ بەڵام زۆر لە وڵاتی پێرۆ دووربوون، بە جۆرێک کاریگەری ئینکا بەسەریانەوە زۆر نەبوو. گەورەکانیان بە دەست و دیاری ساکارەوە لە خواردن و گوتاری بەخێرهێنان هاتنە پێشوازیمان و بەڵام لە هاتنی ئێمە خاترجەم نەبوون. خانووەکانیان کە لە قوڕ و پووش و پەڵاش دروستکرابوون، بتەوتر و چاکتر دابەشکرابوون لە کوخی ئەو خەڵکانەی کە پێشتر دیتبوومان. ئەوانە خوویان

وابوو کە لەگەڵ باو و باپیرە مردووەکانیان پێکەوە دەژیان، وەلێ سەربازەکان ئەوجارە مۆمیاکانیان نەخستە ژێر پێیان و سووکایەتییان پێ نەکردن. هەندێ گوندمان دۆزییەوە کە تازە چۆڵکرابوون و هی ئەو هندییە دوژمنانە بوون کە میشیمالۆنکۆی کاسیکی ڕابەرایەتی دەکردن.

دۆن بێنیتۆ فەرمانی دا کە لە شوێنێکی قایم سەربازگە دروست بکەین، چونکە دەترسا لەوەی خەڵکی ئەوێ شەڕمان پێ بفرۆشن، پاش ئەوەی کە دەزانن کە ناگەڕێینەوە پێرۆ، وەک ئەوەی شەش ساڵ لەمەوبەر لە هەڵمەتەکەی ماگرۆ ڕووی دا. هەرچەندە زۆر پێویستیمان بە خۆراک هەبوو، بەڵام بالدیبیا، پەلاماردان و تەنگەتاوکردنی دانیشتووانی ئەوێی قەدەغە کرد، بەو نیازەی بەڵکەم بەم ڕێگەیە بتوانین بیانکەینە هاوپەیمانی خۆمان. دۆن بێنیتۆ چەند هەواڵگرێکی تریشی گرت و لە کاتی لێکۆڵینەوە هەر ئەوەیان دووبارە کردەوە کە ئێمەش دەمانزانی: ئینکا فەرمانی داوە کە خەڵکەکە لەگەڵ خێزانەکانیان بچنە شاخەکان خۆیان بزر بکەن و چی خۆراکیشیان هەیە لە ناوی ببەن. دۆن بێنیتۆ بۆی دەرکەوت کە گومانی تێدا نییە شیلییەکان خۆراکیان لە ژێر لمدا شاردووەتەوە، چونکە هەڵکەندنی ئاسانە. بۆیە فەرمانی بە هەموو سەربازەکان دا، جگە لە پاسەوانەکان، کە لە ناوچەکەدا بگەڕێن و شمشێر و ڕمەکانیان لە ئەرزەکە ڕابکەن تا خۆراکە شاراوەکان دەدۆزنەوە. ئیتر بەو جۆرە گەنمەشامی و پەتاتە و فاسولیا و هەتا دێمکەی پڕ لە شەرابیان دۆزییەوە. من شەرابەکەم هەمووی لای خۆم گلدایەوە، چونکە لە کاتی تیمارکردنی بریندارەکان و داغکردنی برینەکانیان دەمدانێ تا کەمتر هەست بە ئازار بکەن.

هەرکە لە دامەزراندنی سەربازگەکە بووینەوە، بێنیتۆ یەکسەر فەرمانی بە چەسپکردنی سێدارەیەک دا. پێدرۆ بالدیباش ڕای گەیاند کە ڕۆژی دواتر دادگاییکردنی سانچۆ دیلا ئۆس و زیندانییەکانی تر بەڕێوە دەچێ. ئەو سەرکردانەی کە لە دڵسۆزییەکەیان دڵنیابووین لە چادرەکەی ئێمە لە دەوری مێزێکدا کۆبوونەوە، هەر یەکەو لەسەر کورسییەکی لە پێست دروستکراوی

خۆی دانیشت و سەرکردەی گشتیش لەسەر کورسییە قەنەفەکە دانیشت. بالدیبیا لە بەرچاوی هەموویان فەرمانی دا منیش بانگ بکەن، پاشان هێمای بۆ کردم تا لە تەنیشتی دانیشم. لە بەرچاوی ئەو سەرکردانەی کە باوەڕیان بە چاوی خۆیان نەدەکرد، نەختێ هەستم بە شلەژان دەکرد، چونکە قەت پێشتر نەیانبینیبوو ژنێک لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی جەنگ بەشداری بکات. بالدیبیا گوتی برایان، ئەو ژنەبوو لە تێنوێتی بیابان و پیلانی ئەو خائینانە ڕزگاری کردین، بۆیە لە هەموو کەسێک زیتر مافی بەشداریکردنی ئەو کۆبوونەوەیەی هەیە.

کەسێک لە خۆی ڕانەدیت بەرهەڵستی بکات. خوان گۆمیس زۆر دڵتەنگ دیاربوو، چونکە سیسیلیای هاوسەری لەودەمە منداڵی دەبوو؛ بەڵام پێنج خەنجەرە لەیەکچووەکەی لەسەر مێزەکە دانان، پاشان لێکۆڵینەوەکەی لە بارەی پیلانەکە خستە بەردەمیان و ناوی ئەو سەربازانەشی ئاشکرا کرد کە گومان لە دڵسۆزییان دەکرێت، بەتایبەتی ناوی ڕوێس کە بە دەستخەڕۆکردنی پاسەوانەکانمان بۆ هاتنە ناوەوەی پیلانگێڕەکان بۆ ناو سەربازگەکە، ئاسانکاری کردبوو. سەرکردەکان بە درێژی باسی ئەو سەرەڕۆییەیان کرد کە بە لەسێدارەدانی دیلا ئۆس دێتە کایەوە. دواجار ڕای ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا پەسند کرا کە لەگەڵ بۆچوونی من دەگونجا. وەلێ من لەو کۆبوونەوەیە هیچ قسەیەکم نەکرد، نەبادا بەوە تاوانبارم بکەن من ژنێکی نێرانەم و هەرچیم بوویت بە پێدرۆی دەکەم. وەختێ کە کێرۆگا قسەی کرد سەری ڕەزامەندیم بۆی لەقاند. بالدیبیا بڕیاری خۆی دابوو، وەلێ چاوەڕێ بوو یەکێکی تر دەری ببڕێت، تا لە بەرامبەر ئەوراقەکانی پشتگیری شاهانە وەک کەسێکی ترسنۆک دەرنەکەوێ کە لەکن سانچۆ دیلا ئۆس بوو.

هەروەک کە ڕاگەیاندرابوو، ڕۆژی دواتر لە چادری زیندانییەکان دادگا دامەزرا. بالدیبیا تاکە دادوەر بوو لەو دادگایە و ڕۆدریگۆ یارمەتی دەدا، سەربازێکی تریش مەحزەرەکەی دەنووسییەوە. ئەوجارە بەشداری دانیشتنەکەم نەکرد، وەلێ هیچ ئەرکێکیشم نەکێشا تا زانیاری تەواو لە

بارەی ڕووداوەکە وەرگرم. پاسەوانییەکی چەکدارییان بە دەوری چادرەکە داسەپاند تا بەرپەچی ئەوانە بدەنەوە کە خۆ لە شتان هەڵدەقورتێنن. مێزێکیان دانا و لە پشتییەوە سێ سەرکردە دانیشتن، لە هەردوو لاوە کۆیلە زنجییەکان دەورەیان دابوون کە شارەزاییان لە ئەشکەنجەدان و لە سێدارەدان هەبوو. نووسەرەکە دەفتەرەکەی تۆماری کردەوە و پەڕاموچە و مەرەکەبەکەی ئامادە کرد. ڕۆدریگۆش خەنجەرەکانی لە سەر مێزەکە ڕیز دەکرد. هەروەها مەقەڵەیەکی پێرۆیی پڕ لە پەنگری گەشاوەیان لە چادرەکەی من برد، نەک بۆ گەرمکردنەوەی ژوورەکە، بەڵکو بۆ ترساندنی گیراوەکان بوو کە دەیانزانی ئەشکەنجەدان بەشێکە لە هەر دادگاییکردنێکی لەو چەشنە؛ لەگەڵ ئەوەش ئەشکەنجەدان لە دژی هندییەکان بەکار دەهات نەک لە دژی خانەدانەکان، کەسێک لەوە دڵنیا نەبوو کە بالدیبیا بەتەمایە چی بکات. تاوانبارەکان بە کۆت و زنجیرەوە لە بەردەم مێزەکە وەستابوون و سەعاتێک زیاتر گوێیان لەو تووەمەتانە گرت کە ئاراستەیان کرابوو. ئەوان هیچ گومانیان نەبوو کە بالدیبیا زانیاری وردی لە بارەی پیلانەکە هەیە و لیستی تەواوی لایەنگرانی سانچۆ دیلا ئۆسی لایە، ئەوانیش هیچ بەڵگەیەکیشیان پێ نییە تا ڕاستی قسەکانی پێدرۆی پێ بەتاڵ بکەنەوە. لە دوای گوتارە درێژەکەی پێدرۆ بێدەنگییەکی تەواو کۆبوونەوەکەی داگرت، نووسەرەکەش ئەو قسانەی گوتران هەمووی لە دەفتەرەکەیدا تۆمار کردن.

ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا دواجار لێی پرسین: ئایا هیچ شتێکتان هەیە بتانەوێ بیڵێن؟

لەو وەختەدا سانچۆ دیلا ئۆس لە ناخڕا ڕووخا و کەوتە سەرچۆک و گوتی: هەموو ئەو تومەتانە دەسەلمێنم کە دراونەتە پاڵم، جگە لە مەسەلەی کوشتنی پێدرۆ کە ئەو پێنج کەسە زیندانییە ڕێزێکی زۆریان بۆی هەیە و ئامادەن ژیانیان لە پێناویدا بەخت بکەن، مەسەلەی خەنجەرەکانیش جگە لە گەمژەیی شتێکی تر نییە، تەنیا بینینیان بەسە بۆ ئەوەی بزانن کە چەکێکی کاریگەر نییە.

ئیتر ئەوانی تریش وەک ئەو کەوتنە پاڕانەوە و داوای لێبووردنیان دەکرد و سوێندیان دەخوارد کە تا لە ژیاندان هەر دڵسۆزبن. بالدیبیا فرمانی پێدان کە بێدەنگ بن. دیسان بێدەنگییەکی درێژ باڵی کێشایەوە. دواجار سەرکردە هەڵسایەوە و حوکمەکەی دەرکرد کە بە ڕای من دادپەروەرانە نەبوو، بەڵام قسەم لەسەری نەکرد، چونکە وام زەنکرد کە پێدرۆ لەبەر هەندێ هۆکار کە خۆی دەیزانێ، ئەو فەرمانەی داوە.

سێ کەس لە پیلانگێڕەکان بە دوورخستنەوە حوکمکران و دەبووایە لەگەڵ چەند هندییەک و تاکە ئاژەڵێکی لاما بەرەو پێرۆ بگەڕێنەوە. بە بێ ڕوونکردنەوەش دووانەکەی تر ئازاد کران. بەڵام سانچۆ دیلا ئۆس بە پێی گرێبەستێک ئازاد کرا – کە ئەمەش یەکەم بەڵگەنامەی نووسراوە لە مێژووی شیلی – کە تێیدا هاوبەشییەکەی لەگەڵ بالدیبیا هەڵدەوەشایەوە و هەر بەکۆت و زنجیرکراوی لە زیندان دەمایەوە نەشیدەزانی چارەنووسی بە چی دەگات، چونکە جارێ هیچ حوکمێکی بۆ دەرنەچووبوو. بەڵام سەیرترین شت ئەوەبوو کە بالدیبیا هەر ئەو شەوە فەرمانی دا ڕوێس لە سێدارە بدەن، ئەو سەربازەی کە لە ژێرەوە دەستی لەگەڵ پیلانگێڕەکان تێکەڵ کردبوو. بەڵام لە یەکێ لەو پێنج کەسە نەبوو کە بە خەنجەرەکانیانەوە هاتبوونە چادرەکەی ئێمە. دۆن بێنیتۆ خۆی سەرپەرشتی ئەو زنجییانەی دەکرد کە ڕوێسیان لە سێدارە دا و پاشان لاشەکەیان پارچە پارچە کرد و سەرک و چوارپەلیان کە بە تەور لێ کردبووەوە بە قولابی سەربڕین لە چەند شوێنێک هەڵواسرا، بۆ ئەوەی ئەو نرخە وەبیر دوودڵەکان بهێنێتەوە کە خیانەتکارانی بالدیبیا دەیدەن. ڕۆژی سێیەمین بۆنێکی ناخۆش ئەو ناوەی داگرت و پڕ لە مێشومەگەز بوو، بۆیە ناچاربوون تەرمەکە بسووتێنن.

***

ژانی شازادە ئینکا سیسیلیا درێژ و سەخت بوو، چونکە کۆرپەڵەکەی لە زگدا وەرگەڕابوو و لە جیاتی سەری، پێیەکانی هاتبوون. هەروەک دایەنەکان دەڵێن، هەر منداڵێک ئاوا لە دایک ببێت، بەختەوەر دەبێت. کاتالینا منداڵەکەی

بە توندی ڕاکێشایە دەرێ و دیتی هەندێ شوێنی لەشی مۆرهەڵگەڕاوە، وەلێ ساغبوو و دەیقیژاند و دەگریا. هاتنە دنیای یەکەم منداڵی دوو ڕەگەزەی شیلی مژدەیەکی خۆش بوو.

کاتالینا لە کن دەرگەی چادرەکەمان چاوەڕێی خوان گۆمێسی دەکرد، لە کاتێک سەرکردەکان باسیان لە چارەنووسی پیلانگێڕەکان دەکرد. گۆمێس ئەو پیاوە بوو کە لە هەموو پیاوە ئازاکانی تر زۆرتر دەردەسەری بینیبوو و لە بیاباندا بەشە ئاوی خۆی دەدایە ژنەکەی. دوای ئەوەی هێستری ژنەکەی تووشی ڕووداوێک هات، ئەسپەکەی خۆی دایە ئەو و بە خۆی بە پێیان دەڕۆیشت و بە سینگی خۆی لە هێرشی هندییەکان دەیپاراست، وەلێ وەختێ کاتالینا کوڕەکەی خستە باوەشی، دەستی بە گریان کرد.

گۆمێس لە کاتێک کە بە کوڵ دەگریا گوتی: بۆ ڕێزلێنان لە حاکمەکەمان، ناوی لێ دەنێین پێدرۆ.

هەموو بە بڕیارەکەی خۆشحاڵ بوون، جگە لە بالدیبیا کە بە گرژییەوە پێی گوتین: من حاکم نیم، بەڵکو جێگری ئەوم، من نوێنەری مەرکیز بێسارۆ و پایەدار پاشای ئیسپانیام.

گۆمێس گوتی: ئێمە لە خاکێکین کە بۆ داگیرکردنی ڕەنجت داوە ئەی سەرکردەی گشتی، ئێرەش دۆڵێکی دڵڕفێنە. جا بۆ لێرە شارێک دروست نەکەین؟

- ئەمەیان بیرێکی باشە. پێدرۆ گۆمێسی بچووکیش دەبێتە یەکەم منداڵە مەسیحی لەو شارە.

خێرۆنیمۆ دی ئەڵدێریتی کە هێشتا بە تەواوی لە گرانەتای جەنگەڵەکان چاک نەبووبووەوە، پشتگیری قسەکانی ئەوی کرد، چونکە حەزی نەدەکرد لە ڕۆیشتن بەردەوم بین.

بەڵام من دەمزانی کە پێدرۆ بە نیازە بەرەو دوورترین شوێن لە خوارووی شیلی بڕۆین، بۆ ئەوەی لە پێرۆ دوورکەوینەوە. ئەو لە هزری خۆیدا دەیویست یەکەمین شار لە شوێنێک دروست بکات کە دەستی بێسارۆ و دادگاکانی

پشکنین و نوێنەری پاپا و بەرازخۆرەکانی نەگاتێ - واتە ئەو فەرمانبەرە دوورووانەی تاج کە هیچ خەمێکیان نییە تەنیا بە دوای دروستکردنی کۆسپ دەگەڕین لە جیهانی تازە -.

- نەخێر بەڕێزان، ئێمە لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبین تا دەگەینە دۆڵی مابۆچۆ. چونکە ئەوێ شوێنێکی گونجاوە هەروەک چۆن دۆن بێنیتۆ دەڵێت کە پێشتر لەگەڵ دیێگۆ ماگرۆ چووەتە ئەوێ.

ئەڵدێرێتی بە پێداگرییەوە گوتی: ئەو شوێنە چەند فەرسەخ لێرە دوورە؟

دۆن بێنیتۆ وەڵامی دایەوە: زۆر دوورە، وەلێ لەوەندە کەمترە کە تاکو ئێستا بڕیومانە.

سیسیلیام بە گەڵای هۆوییە چارەسەر کرد و ڕەحمیم پاک کردەوە و پاشان بە شەرابێک کە لە ڕەگی داری گوێڕێوی خوێنبەربوونەکەمان وەستاند، کە ئەمەیان دەرمانێکی کاریگەربوو و کاتالینا لە شیلی فێری ئامادەکردنی بووبوو. لەو کاتەی کە سەربازەکانمان بەرپەچی پەلاماری هندییەکانیان دەدایەوە، کاتالینا لە سەربازگەکە دەچووە دەر و لەگەڵ ژنە هندییەکانی شیلی داو و دەرمانی تاقی دەکردەوە و شتیان لێ فێر دەبوو. نەمدەزانی چۆن خۆی لە چاوی پاسەوانەکان دەشاردەوە و بە چ شێوەیەک خۆی دەرباز دەکرد و چۆن لەگەڵ دوژمنەکان ڕێککەوتبوو و لەوە نەدەترسا بە تۆبزێک کەللەی بهاڕن.

شتی خراپ لەو کارەدا ئەوەبوو کە دەرمانی هەندێ لە گیایەکان بوونە هۆی وشککردنی شیری سیسیلیا، بۆیە گۆمێس ناچاربوو بە شیری ئاژەڵی لاما بەخێوی بکات. خۆ ئەگەر منداڵەکە چەند مانگێکی تر درەنگتر بووبووایە، ئەو وەختە شیردەر زۆر دەبوون، چونکە ژنە هندییەکی زۆر سکپڕ بووبوون. شیری لاما شیرینییەکی وای تێدابوو کە لە ئایندە دەبووە کێشەیەکی گەورە بۆ منداڵەکە، چونک تازە چارەنووسی وایە دەبێ لە شیلی بژیت و بجەنگێ، ئەو جۆرە شوێنەش بۆ پیاوانی دڵناسک گونجاو نییە.

***

پێویستە ئاماژە بۆ ڕووداوێک بکەم کە هیچ ئاسەوارێکی نەبوو، مەگەر بۆ گەنجێکی هەژار کە نازناوی ئیسکۆباری هەڵگرتبوو، وەلێ ڕەنگە بۆ دیارخستنی کەسێتی پێدرۆ و سروشتەکەی سوودێکی هەبێت. دڵدارەکەی من پیاوێکی بەخشندە بوو و خاوەنی هزری جوان و باوەڕێکی کاسۆلیکی بتەو و ئازاییەکی بەدەر لە تاقیکردنەوە بوو کە ئەمانە خەسڵەتی باشن بۆ ڕێز لێ گرتنی، وەلێ چەند کەموکوورییەکیشی هەبوون کە هەندێکیان زۆر خراپ بوون. بێگومان خراپترینیان ئەوەبوو زۆر حەزی لە ناوبانگ بوو کە دواجار بووە هۆی لەسەردانانی ژیانی خۆی و زۆر کەسی تریش؛ بە نەزەری من گەورەترین عەیبی ئەو کە هەڵگرتنی گران بوو، غیرەتەکەی بوو. ئەو دەیزانی کە من ناتوانم ناپاکی لەگەڵ بکەم، چونکە ئەوە بەشێک بوو لە خووی من، کە ئەوەندە زۆریشم خۆشدەویست، ئەدی لەبەرچی گومانی لێ دەکردم؟ یان ڕەنگە ئەو گومانی لە خۆی کردبێت.

سەربازەکان هەر ژنە هندییەکیان بویستابایە لەگەڵیان ڕایان دەبووارد، هەندێکیان بەزۆر و هەندێکیش بە ئارەزووی خۆیان، وەلێ حەزیشیان دەکرد گوێبیستی ئەو وشانە بن کە لە بارەی خۆشەویستییەوە بە ئیسپانی بە گوێیان دەچرپاندن. من تاکە ژنی ئیسپانیایی بووم لەو هەڵمەتە، ئەوینداری سەرکردە، لە بەرچاوان دیار، ئامادەساز، نەک سۆزانی وەلێ لانی کەم هەوەسباز. هەندێ جار دەپرسم کە داخوا من لە ڕەفتارەکانی سبستیان ڕۆمێرۆ بەرپرسیار بووم یان ڕۆمێسی ئالاهەڵگر، یاخۆ ئەو گەنجە کە نازناوی ئیسکۆبار بوو؟. من جگە لەوەی کە ژنم هیچ کەموکوورییەکی ترم نییە، ئەمەش وادیارە تاوانێکی تەواوە. ئێمە بەوە تاوانبارین کە ئارەزووی پیاوان هەڵدەستێنین، وەلێ گوناهەکە لەو کەسە نییە کە پێی هەڵدەستێ؟ لەبەرچی دەبێ من باجی گوناهەکانی ئەوان بدەمەوە؟

بۆ گەشتەکەکەی ئەوجارە، هەمان جلم پۆشی کە لە بلاسینشیا لەبەرم دەکردن – تەنوورەکی ژێرەوە، بەرتەنگ، کراسێک، تەنوورەیەک، ڕووپۆشێک، جوتێک پێڵاو– بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو کە بە ناچاری لەگەڵ بارودۆخەکە خۆم

گـونجـاند. ئاخـر نـاکـرێت گـەشـتـی هـەزار فـەرسـەخ دوور ڕێ بکەیت و بە بەلاتەنیشت سـواری ئەسـپـەکەم ببم، بێ ئەوەی پشـتم بشکێنمـەوە، هـەروەک ژنان وا سـوار دەبن. دەبووایە قـاچەکـانم بکەمـەوە و سـواری ئـەسـپـەکـە ببم. شـەرواڵێکی پیـاوانە و پۆسـتـاڵێکم پەیدا کـرد. جلە تەنگەبـەرەکـەی ژێرەوەم داکەناند و ڕووپۆشـەکەم فڕێ دا و پرچم وەک ژنە هندییـەکان لوولدا و کردمـە کـەزی، چونکـە گـرانـایی دەخـسـتـە سـەر ملم. بـەڵام قـەت بـەبێ چاکـەت نەدەڕۆیشتم و ڕووی خۆم نەدەدایە سەربازەکان.

لە کـاتی هێـرشـی هندییـەکـانیش خـودەکـەم دەخـسـتـە سـەرم و زرێیـەکی سووکی لە پێستم لەبەردەکرد و دوو قاچپارێزیشم لە لاقەکانم هەڵدەکێشا کە بە فـەرمانـی پێدرۆ بەتایبـەتی بۆم دروسـتکرابوون، خۆ ئەگەر ئەوانەم نەبووایە لە قۆناغی یەکـەمی ڕێگەوە بە تیری هندییـەکـان دەکوژرام. جا ئەگـەر دیمەنم هـەوەسـی ئـیسـکـۆبار و پیـاوانـی تـری هـەڵمـەتەکـە هـەسـتـاندبێت، ئـەوا مـن تێ ناگەم کە عـەقڵی نێرەکان چۆن ئیش دەکات. لە فرانسیسکۆ دی ئەگێریم گوێ لێ بووبوو کـە دەیگوت: نێرەکـان تەنیـا بیـر لە خـواردن و جـووتبـوون و کـوشـتن دەکـەنـەوە، ئەمـە یـەکـێک بـوو لە قـسـە پوخـتـەکـانی ئـەو، هـەرچەندە ئەوە ڕاستییـەکی ناتەواو بوو، چونکە ئەو پیاوانە بیر لە دەسەڵاتیش دەکەنەوە. من لەگەڵ قسـەکانـی ئەگێریدا نیم، هـەرچەندە زۆر دیاردەی لاوازم لە پیاوان دیوە، وەلێ هـەموویان وەک یەک نینە.

سـەربازەکـانی ئێـمـە زۆر باسـی ژنان دەکـەن، بەتایبـەتی ئەو وەختـەی چەند ڕۆژێک بە نـاچاری چادرەکـان هەڵدەدەین و جگە لـە پاسـەوانی هیـچ کـاری تر ناکەن. لە ژنە هندییەکان ڕادەمینێن و شانازی بە نـەبەردییەکانیان دەکـەن – لە بەزۆر لاقەکردنی ژنان – و زۆر بە ئیرەییەوە باسـی داستانە نەبەردییەکانی ئەگـێـری دەکـەن. هـەروەها دەڵێن گـوایە مـن ژنێکم تێـر نابم و وەک و پیـاوان سـواری ئەسـپـەکـەم دەبم تا لەسـەر زینـەکـە زەوقم هـەسـتـێت، و لـە ژێر تەنوورەکـەشـم ژێرشـەرواڵی پیـاوانەم لەبـەرکـردووە. ئەو قـسـەیەی دواییـان ڕاست بوو، چونکە نەدەکرا بە ڕانی ڕووتەوە سواری ئەسپ ببم.

بچووکترین سەرباز لەو هەڵمەتە کوڕێک بوو بەناوی ئیسکۆبار، تەمەنی تەنیا هەژدە ساڵ دەبوو. ئەو کاتەی کە بۆ پێرۆ هاتبوو دەریاوانێکی منداڵ بوو و ڕقی لە زۆربڵـێـیی پیـاوەکـان دەبووەوە. هێشـتـا بە توندوتیـژی و خراپەکارییەکانی شەڕ پیس نەبووبوو و هزرێکی ڕۆمانسییانەی لەبارەی منەوە دروست کردبوو. ئەو لەو تەمەنە دابوو کە مرۆڤ دەکەوێتە خۆشویستنی خۆشەویستی. لە خەیاڵی خۆیدا وای لێک دابووەوە کە من فریشتەیەکی پاکم و شەهوەتەکانی بالدیبیا پەلکێشی لادانیان کردوومە کە ناچارم دەکات وەک ژنێکی سـۆزانـی لە ناو نوێندا لە خـزمـەتیـدابم. لە ڕێگەی کـارەکـەرە هندییەکانەوە ئەمەم زانی، هەروەک چۆن لە هەموو شتێک ئاگەداریان دەکردمەوە. هیچ نهێنییەک نەبوو ئەوان پێی نەزانن، چونکە پیاوەکان لە بەردەم ژنان هەموو شتێک هەڵدەڕێژن و وریا نین، وەک چۆن لە بەرامبەر ئەسپ و سەگەکانیشیان ئاوا کەمتەرخەمن. ئەوان وا تێ دەگەن کە ئێمە لەو شتانە ناگەین کە گوێبیستی دەبین. بە دزی چاوەدێری هەڵسوکەوتی ئەو مێردمنداڵەم کرد و دڵنیابووم کە لە دەورم دەسووڕێ. ئاخر ئیسکۆبار بیانووی دەدۆزییەوە تا لێم نزیک بێتەوە و پاکانەشی ئەوەبوو گوایە دەیەوێ بەڵستاری فێرە فێڵ بکات کە بە دەگمەن نەبێت لێم دوورنەدەکەوتەوە، یان هەندێ جار داوای لێ دەکردم برینی قۆڵی بۆ تیمار بکەم، یان فێرە دروستکردنی حەلوای ئاردی بکەم، چونکە دوو کارەکەرەکەی بە کەڵک هیچ نایەن.

بالدیبیا نەختێ لە منداڵ گەورەتر سەیری ئیسکۆباری دەکرد، وا دەزانم پێش دەستپێکردنی سوعبەت و گاڵتەی سەربازەکان، بایەخی بە جموجۆڵی ئەو کوڕە نەدەدا. دوای ئەوەی ئەوانی تر تێبینییان کرد کە بایەخدانی ئەو کوڕە بە من لە ڕۆمانسییەتەوە نزیکترە تا لە سێکس، ئیتر بە ئاسانی لێی نەدەگـەڕان و ئەوەندەیان دەوروژاند تا بە ڕیسـوایی دەگـریا. ئەو گاڵتەجارییەش زوو یا درەنگ گەیشتنە گوێچکەکانی بالدیبیا، کە ئەویش بە پەلەپەوە دەستی کرد بە پرسیار لێ کردنم و پاشان کەوتە چاودێریکردن و تەڵە دانانەوە. ئیسکۆباری ڕەوان دەکرد تا لە هەندێ کاردا یارمەتیم بدات کە بە

کارەکەرەکان تایبەت بوو، کوڕەش لەجیاتی ئەوەی ڕازی نەبێت، وەک سەربازەکانی تر، بە پەلە گوێڕایەڵی پێدرۆ دەبوو. ئیتر زۆر ئیسکۆبارم لە ناو چادرەکەم دەبینی کە پێدرۆ بە دوای شتێکدا ڕەوانی دەکرد و دەشیزانی من بەتەنیا لە چادرەکەمم. دەبووایە هەر لە سەرەتاوە ڕووبەڕووی پێدرۆ ببمایەوە، وەلێ نەوێرام، چونکە دڵپیسی کردبوویە بوونەوەرێکی ترسناک و ڕەنگە وای لێکدابێتەوە کە من هۆکاری نهێنیم هەبێت بۆ پاراستنی ئیسکۆبار.

ئەو گەمە شەیتانییە کە ماوەیەکی کەم بەر لە ڕۆیشتنمان لە تاراباکا دەستی پێ کردبوو، لە نێو پەرینەوەی پڕ لە دەردەسەری بیاباندا لە بیر کرا، چونکە کەسێک تاقەتی ئەوەی نەبوو بە دوای ئەو گەمژەییەدا بچێت، بەڵام لە دۆڵی کۆبیابۆ لە جاران توندتر تازە بووەوە، برینە کۆنەکەی ئیسکۆبار سەرلەنوێ دەستی بە سووتانەوە کرد، هەرچەندە پێشتر داغیشمان کردبوو. دەبووایە زۆر جار پەڕۆکەکەی بگۆڕم و کار گەیشتە ئەوەی کە بیر لە بڕینەوەی دەستی بکەمەوە، وەلێ کاتالینا ئاگەداری کردمەوە کە گۆشتی دەوری برینەکە بۆگەنی نەبووە و کوڕەکەش تای نایەتێ. پێی گوتم: ئەی خانمی گەورەم، وا برینەکەی دەخورێنێ، ئەدی نابینی؟

بڕوام نەدەکرد کە ئیسکۆبار بە گاڵتە وا لە برینەکەی بکات تا بە بیانووی ئەوە بۆ تیمارکردن بێتە لام، وەلێ درکم کرد کە کاتی ئەوە هاتووە قسانی لەگەڵ بکەم.

لە ساتەکانی خۆرئاوابووندا، ئەو کاتەی مۆسیقا لە سەربازگە دەستی پێ کرد: گیتار و نایەی سەربازەکان و کلارنێتە خەمبارەکانی هندییەکان و تەپڵی ئەفریقیی چاودێری کرێکارەکان. لە تەک یەکێ لە ئاگردانەکان دەنگی فرانسیسکۆ دی ئەگیری ڕەوشتبەرز دەهات کە گۆرانییەکی بەجۆشی دەچڕی. لە هەواشدا بۆنی خۆشی ئەو تاکە خواردنە بڵاو بووبووەوە کە هەموو ڕۆژێک دەمانخوارد: گۆشتی برژای، گەنمەشامی، هێلکە بە ئارد و ڕۆنی سەر پەنگرەکە. کاتالینا وەک هەموو شەوەکانی تر خۆی بزر کرد و منیش بە تەنیا لەگەڵ ئیسکۆبار لە چادرەکەم مامەوە کە تازە لە خاوێنکردنەوەی برینەکەی

بووبوومەوە. سەگە بەڵستاریشم لەکن بوو، وەلێ ئێستا زیاتر مەیلی بۆ ئیسکۆبار دەچێت.

ڕاستەوخۆ پێم گوت: ئەگەر برینەکەت خێرا چاک نەبێتەوە، دەترسم ناچاربین قۆڵت ببڕینەوە.

لە ترسان ڕەنگی هەڵبزڕکا و زمانی تێکئالا: ئەی دۆنیا ئێنیس، سەربازی بێ قۆڵ بۆ هیچ شتێک دەست نادات.

- بەڵکو هێشتا سەربازێکی مردوو لە قوڵبڕاو بە سوودترە.

پەرداخێک بادەی سەبارم دایێ بۆ ئەوەی بەسەر ترسەکەی زاڵ بێت و منیش سوود لە کاتەکە وەرگرم، چونکە نەمدەزانی چۆن بابەتەکەی لەگەڵ باس بکەم. دواجار شێوازی ڕاستەوخۆ و بێ پێچ و پەنام هەڵبژارد.

- ئەی ئیسکۆبار، وا هەست دەکەم دەتەوێ لێم نزیک بکەوییەوە. جا لەبەرئەوەی ڕەنگە ئەو ڕەفتارەی تۆ دەرئەنجامی خراپی بۆ هەردووکمان لێ بکەوێتەوە، بۆیە لە ئێستا بە دواوە کاتالینا تیمارکردنت لە ئەستۆ دەگرێ.

ئا لەو کاتەدا، هەروەک چاوەڕێ بکات کە یەکێک دەرگەی دڵی بکاتەوە، ئیسکۆبار بە قسەی تێکەڵ و پێکەڵ پێی لێنا کە منی خۆش دەوێ و چەندان بەڵێن و پەیمانی دڵداری دامێ. هەوڵم دا بیری بخەمەوە کە ئەو لەگەڵ کێ سنوورەکانی بەزاندووە، وەلێ بواری نەدام قسەکانم بکەم و منی توند لە باوەشی خۆی گرت و لە بەدبەختی خۆم کە کشامەوە بەڵستار کەوتە بەر پێم و بە پشتدا بەربوومەوە، ئیسکۆباریش کەوتە سەرم. خۆ ئەگەر هەر یەکێکی تر بووایە بەڵستار هەڵی دەدڕی، وەلێ کوڕەی دەناسی و وای زانی گەمە دەکەین. بە دەورماندا بازی دەدا و بە خۆشییەوە دەحەپی. من بە تاقەت بووم و هیچ گومانم نەبووکە دەتوانم بەرگری لە خۆم بکەم، بۆیە هاوارم نەکرد. لەگەڵ خەڵکەکەی دەرەوە تەنیا پەردەیەکی قوماشمان لە بەین بوو و نەشمدەویست سووک و ڕیسوا بم و خەڵکمان تێ بگات. بە دەستە بریندارەکەی منی بە خۆیەوە بەند کردبوو و بە دەستەکەی تریشی ملی گرتبووم و بە دەمی بە لیکاو

و فرمێسکەکانی چاوی گەردەن و ڕوخساری تەڕ کردم و کەوتە ماچکردنیان. ناوی پاکیزەی فریادڕەسم هێنا. دەمتوانی بە چۆکەکانم لێدانێک لە بەری ڕانەکانی بدەم، وەلێ پێڕانەگەیشتم؛ ئاخر لەو ساتەدا پێدرۆ بەدیارکەوت و شمشێرەکەشی بە دەستەوە بوو، تومەز لە ژوورەکەی تری چادرەکەوە چاوەدێریمان دەکات.

وەختێ دیتم ئامادەیە بە شمشێرەکەی لەو بەدبەختە بدات، بە ترسەوە هاوارم کرد: نااا!!

بە خێراییەکی وەحشییانەوە توانیم هەستمەوە تا ئیسکۆباری بپارێزم کە کەوتبووە ژێرەوەم. هەوڵم دا لە شمشێرە تیژەکە و لە سەگەکەش بیپارێزم کە لەو دەمە وەک پاسەوانێک ئەرکی خۆی بەجێ دەهێنا و دەیویست گازی لێ بگرێت.

***

هیچ دادگاییکردن و لێکۆڵینەوەیەک نەبوو، پێدرۆ بە ئەنقەست زۆر بە سادەیی دۆن بێنیتۆی بانگ کرد و فەرمانی دا کە سبەینەی ڕۆژی دواتر لە دوای کۆنوێژ و لە بەردەم سەربازگەکەدا، ئیسکۆبار لە سێدارە بدات. دۆن بێنیتۆ قۆڵی کوڕەی تۆقیوی گرت و لە یەکێک لە چادرەکان لە ژێر پاسەوانی دانا، بەڵام کۆت و زنجیری نەکرد. ئیسکۆبار دەتگوت پارچە پەڕۆیە، نەک لە ترسی مردن، بەڵکو لە ئازاری دڵە تێکشکاوەکەی. پێدرۆ چووە چادرەکەی فرانسیسکۆ دی ئەگێری، لەوێ لەگەڵ سەرکردەکانی تر یاری کاغەزێنی دەکرد و تا سبەینێ نەگەڕایەوە. لێنەگەڕا قسانی لەگەڵ بکەم، وام زەندەبرد کە ئەگەر بگەمە کنیشی، ئەو جارە ڕێگەیەکی گونجاو شک نابەم تا ڕایەکەی پێ بگۆڕم، چونکە بە شێتییەکی شەیتانانە غیرە گرتبووی.

لەو کاتەدا قەشە گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ هەوڵی دەدا دڵنەواییم بداتەوە و دەیگوت کە من لەو ڕووداوە تاوانم نییە و ئیسکۆبار خۆی تاوانبارە، چونکە حەزی چووەتە ژنی یەکێکی تر یان قسەیەکی بێ سەروبەری لەو جۆرە. منیش پێم گوت: ئەی باوکە وا دەزانم تۆش دەستەوەستان دانانیشیت، پێویستە

باوەڕ بە پێدرۆ بێنی کە بەو کارەی زوڵمێکی گەورە لەو کوڕە دەکات.

– کچی خۆم، سەرکردە ناچارە لە نێو پیاوەکانیدا نیزام بپارێزێ و ناشتوانێ لە خراپەکارییەکی وا ببوورێت.

– پێدرۆ لێ دەگەڕێ پیاوەکانی بەزۆر لاقەی ژنی ئەوانی تر بکەن و لێیان بدەن، وەلێ وای لەو کارەساتەی کە ئەگەر یەکێک دەست بگەیێنێتە هی خۆی!

– ئەو ناتوانێ پاشەگەز بێتەوە. چونکە فەمانی سەربازی گەڕانەوەی بۆ نییە.

– با دەتوانێت پاشەگەز بێتەوە! گوناهی ئەو لاوە ناگاتە ئاستی لە سێدارەدان، تۆش ئەمە وەک من، زۆر چاک دەزانی. جا برۆ قسانی لەگەڵ بکە!

– وا دەچم ئەی دۆنیا ئێنیس، بەڵام من پێشوەخت پێت دەڵێم کە ئەو ڕای خۆی ناگۆڕێت.

– تۆ دەتوانێت هەڕەشەی بە بێبەشکردنی لە کەنێسە لێ بکەیت.

قەشەکە داواکەی من ترساندی و هاوار یکرد: ئەوە هەڕەشەیەکە نابێت بە سووکی بیڵێیت!

وەڵامیم دایەوە: بەڵام پێدرۆ لە بەرامبەر ئەوەدا دەتوانێ ئۆباڵی مردنی پیاوێک بە سووکی بخاتە ئەستۆی خۆی، وانییە؟

ئەی دۆنیا ئێنیس، تۆ ملکەچیی نازانیت، ئەو کارە بە دەست تۆ نییە، بەڵکو بە دەست خوایە.

قەشە گۆنزالس چووە لای پێدرۆ تا قسەی لەگەڵ بکات. لە بەرچاوی سەرکردەکانی تر کە یارییان دەکرد، لەگەڵی دوا، وای زانی لە داواکارییەکەی بۆ لێبووردنی ئیسکۆبار یارمەتی دەدەن، وەلێ تەواو بە هەڵەدا چووبوو. ئاخر بالدیبیا نایەوێ لە بەردەم خەڵکانی تر باڵی نەرم بکات، سەرەڕای ئەوەش هاوڕێکانی لەگەڵ بڕیارەکەی هاوڕابوون؛ چونکە ئەوانیش ئەگەر لە شوێنی ئەو بانایە هەر وایان دەکرد.

ئەو کاتە منیش بە بیانووی ئەوە دەمەوێ کوڕەکەیان ببینم، چوومە

چادرەکەی خوان گۆمێس و سیسیلیا. شازادەی هندی ئەو ڕۆژە لە هەموو کاتێک زیاتر شۆخوشەنگ دیاربوو، لەسەر جێگەکەی ڕاکشابوو و کارەکەرەکانیشی لە دەوری بوون. یەکێکیان پێی دەشێلا، یەکێکی تر پرچە سوورباوەکەی دادەهێنا و یەکی تریش شیری لامای بە پارچە پەڕۆکێک دەپاڕزنییە دەمی کۆرپەکە. خوان گۆمێسیش بە دیاریانەوە دانشتبوو بە چاوێکی کراوەوە سەیری دیمەنەکەی دەکرد، وەک ئەوەی لە بەرامبەر ئەو لانەیە بێت کە بۆ عیسای منداڵ دروستکرابوو. هەستم بە مووچڕکەی ئیرەیی کرد و ئامادەبووم لە نیوەی تەمەنم خۆشبم لە بەرامبەر ئەوەی بمخەنە شوێنی سیسیلیا. دوای ئەوەی پیرۆزباییم لەو دایکە گەنجە کرد و کۆرپەکەیم ماچ کرد، دەستی باوکەم گرت و بۆ دەرەوە بە پێشی کەوتم. هەموو ڕووداوەکەم بۆی گێڕایەوە و داوای یارمەتیم لێی کرد. بە پاڕانەوەوە پێم گوت: ئەی دۆن خوان، تۆ فەرمانبەری دادگاییت، داوات لێ دەکەم شتێک بکەیت.

بە دوو چاوی زەقەوە گوتی: ناتوانم بەرهەڵستی فەرمانەکانی دۆن پێدرۆ دی بالدیبیا بکەم.

– ئەی دۆن خوان، من شەرم دەکەم بە بیرت بێنمەوە، بەڵام خۆ تۆ بە چاکەیەک قەرزاری منی...

– خانمی بەڕێز، ئایا بۆ ئەوە داوام لێ دەکەیت چونکە بەرژەوەندییەکی تایبەتت لەگەڵ ئیسکۆبار هەیە؟

چۆن وا زەن دەبەیت؟ من ئەو داوایەت لە پێناوی هەر پیاوێکی ئەو سەربازگەیە لێ دەکەم، ناتوانم لێ بگەڕیم کە پێدرۆ ئەو گوناحە بکات. پێم مەڵێ کە ئەوە مەسەلەی دیسپلینی سەربازییە. چونکە هەردووکمان دەزانین ئەوە تەواو پەیوەندی بە دڵپیسی و غیرەوە هەیە نەک شتێکی تر.

– تۆ پێشنیازت چییە؟

– هەروەک قەشە دەڵێت، ئەوە کارێکە بە دەست خوایە. تۆ ڕات چییە ئەگەر نەختێ یارمەتی دەستی خواوەند بدەین؟

ڕۆژی دواتر لە دوای کۆنوێژی پیرۆز، بێنیتۆ بانگی خەڵکەکەی کرد تا لە گۆڕەپانی سەربازگەکە کۆببنەوە کە لەوێ هێشتا ئەو سێدارەیە بە پێوە بوو کە بۆ ڕوێسی قوڕبەسەریان ساز کردبوو و پەتەکەشی پێوە مابوو. ئەوە یەکەم جارم بوو لە دیمەنێکی وادا ئامادەببم، چونکە پێشتر لە دیمەنی ئەشکەنجەدان و لە سێدارەدان خۆم دەپاراست؛ هەر ئەوەندەم بەسبوو کە لە شەڕ و ئازاری ئەو برینداراتە دەمبینی کە چارەسەم دەکردن. پەیکەری ڕێزدار پاکیزەی لێبووردەییم لە باوەش کردبوو بە جۆرێک هەموو دەیانتوانی بیبینن. سەرکردەکان لە پێشەوە لە شێوەی چوارگۆشەیەک ڕیز بووبوون، لە دوای ئەوانیش سەربازەکان، پاشان چاودێرە زنجییەکان و حەشاماتێکی زۆر لە هندییەکانی یاناکۆنا و ژنە هندییە کارەکەر و ئەویندارەکان وەستابوون. قەشەکە دوای ئەوەی نەیتوانیبوو پێدرۆی پەشیمان بکاتەوە، شەوێ نەنوستبوو هەر نوێژی کردبوو. ڕەنگی دەموچاوی مەیلەو سەوز هەڵگەڕابوو، لۆچێکی ڕەنگ مۆری تۆخ دەوری چاوی گرتبوو، وەک ئەو کاتانەی کە بە قامچی لە خۆی دەدات، هەرچەندە ئەو خۆئەشکەنجەدانەی بە نەزەری ئەو ژنە هندییانەی کە دەیانزانی واتای قامچی چ دەگەیەنێ، کارێکی پێکەنیناوی دیاربوو.

جارچی و دەهۆڵ لێدەرەکان پرۆسەی لە سێدارەدانەکەیان ڕاگەیاند. خوان گۆمێس بەو سیفەتەی کە فەرمانبەری قەزاییە گوتی: ئیسکۆبار وەک سەربازێک کاریکی مەترسیداری دژ بە دیسپلینی سەربازی ئەنجام داوە کە بە نیازێکی ناپاکەوە چووەتە چادرەکەی سەرکردەی گشتی و دەستدرێژی کردووەتە سەر شەرەفی.

هیچ بەڵگەی تری نەهێنایەوە و کەسێک گومانی نەبوو کە ئەو لاوە ژیانی خۆی دەکاتە قوربانی خۆشەویستییە سەرکێشەکەی. هەردوو زنجییەکەی کە بە جێبەجێکردنی حوکمەکە فەرمانیان پێ درابوو، کوڕەی تاوانباریان بردە گۆڕەپانەکە. ئیسکۆبار زنجیر نەکرابوو، قەدوقامەتی وەک ڕم وابوو، هێمن و لەسەرەوخۆ و سەیری پێشەوەی خۆی دەکرد، دەتگوت لە خەودا دەڕوا. داوای

کرد بواری بدەن تا خۆی بشوا و ڕیشی بتراشێ و جلێکی خاوێن بپۆشێ. کەوتە سەر چۆکان، قەشەکەش دوا نیشانەی بۆ کرد و پیرۆزی کرد پاشان خاچە پیرۆزەکەی دایێ تا ماچی بکات. دوای ئەوە هەردوو زنجییەکە بەرەو سەکۆی سێدارەکەیان برد. هەردوو دەستیان لە پشتەوەڕا بەست و پێیەکانیان بە یەکەوە گرێ دا، پاشان پەتەکەیان خستە ملی. ئیسکۆبار ڕازی نەبوو کیسەی بخەنە سەری، من وام زەن کرد کە دەیەوێ لە کاتێک کە ڕوحی دەردەچێ، بە سەیرکردنی من لە ڕووی پێدرۆ بوەستێتەوە. منیش بۆ دڵدانەوەی ئەو، چاوم لە سەری هەڵنەدەگرت.

لەگەڵ دووەمین لێدانی دەهۆڵ، زنجییەکان تەختەیان لە ژێر پێی ڕاکێشا بە هەڵواسراوی لە هەوادا مایەوە. بێدەنگیی مردن باڵی بەسەر هەمووواندا گرتبوو لەو سەربازگەیە، جگە لە دەنگی تەپڵ و دەهۆڵەکان گوێت لە شتێکی تر نەدەبوو. لە نێو کاتێک کە بۆ من نەبڕاوە بوو، جەستەی ئیسکۆبار بە سێدارەکەوە جۆلانەی دەکرد و منیش بە نائومێدانە پەیکەری پاکیزەم بە سینگی خۆمەوە دەگوشی و هەر نوێژم دەکرد و دەخوێند. ئا لەو وەختەدا موعجیزەیەک ڕووی دا: لە هیکرا پەتەکە پسا و لاوەکە کەوتە سەر زەوی و وەک لاشەی مردوو ڕاکشا. هاوارێکی پڕ لە سەرسامی و درێژ لە دەمی خەڵکەکە دەرچوو. پێدرۆ بالدیبیا سێ هەنگاو چووە پێشێ و وەک مۆم ڕەنگی هەڵبزڕکابوو، باوەڕی بە چاوی خۆی نەدەکرد. بەرلەوەی فەرمانێکی تازە بداتە جەللادەکان، قەشە خێرا چووە پێش و خاچە پیرۆزەکەی بەرز کردەوە و وەک سەرجەمی خەڵکەکە لە ڕووداوەکە تیامابوو. هاواری کرد: خەڵکینە ئەمە حوکمی خوایە! ئەمە حوکمی خوایە!.

یەکەم جار وەک شەپۆل پستەپستی خەڵکەکە دەگەیشتە گوێچکەم، پاشان دەنگەدەنگی هەڵچووی هندییەکان، شەپۆلێک بوو وەبەر بەستانی سەربازە ئیسپانییەکان کەوت تا یەکێکیان ڕەسمی خاچێکی کێشا و لەسەر زەوی کڕنۆشی برد، یەکسەر یەکێکی تر سەندییەوە و پاشان هی تر، تا وای لێ هات جگە لە بالدیبیا، هەمووومان کڕنۆشمان برد. ئەوە حوکمی خوابوو...

خـوان گـۆمـێس جـەللادەکـانی دایـە لا و بـە دەسـتـی خـۆی پەتـەکـەی لە مـلـی ئیسـکۆبار کردەوە و کۆتی دەست و پێی بڕی و یارمـەتی دا تـا ڕاسـتبـێـتـەوە سەر پێیان. هـەر تەنیا من ئاگام لێ بوو کە پەتەکەی دایە دەستی هندییەک و ئەویش لەو نـاوەی نەهێشت و دووری خـسـتـەوە، نەبادا یەکێک فکری بۆ ئەوە بچێت و لە نێزیکەوە پەتەکە بپشکنێ. ئیتـر چی تر خـوان گـۆمێس قـەرزداری چاکەی من نەما.

ئیسکۆبار ئازاد نەکرا و حوکمـەکەی بۆ دوورخسـتنەوە گۆڕا. پێویسـتـە بە شـەرمەزاری و بە هـاوڕێیـەتی هندییـەکی یاناکۆنا بەپێیـان بۆ پێرۆ بگەڕێتـەوە. خـۆ ئەگـەر لە دەسـت هندییـەکـانیش ڕزگـاری بێت، ئەوا بیـابان دەیکوژێت و تەرمـەکەشـی وەک مـۆمیا وشـک دەبێتـەوە بێ ئەوەی بشـاردرێتەوە. ئەمـەش بەو واتایە دێت هێشـتـا لە سـێدارەدان لەو چارەنووسـە بە بەزەییـترە. سـەعـاتێک دوای ئەوە بە هـەمـان ئەو مەندییـەوە کەوتە ڕێ کـە بۆ سـەر سـەکۆی سـێدارەکە دەڕۆیشت. ئەو سـەربازانەی کە پێشتـر تا ڕادەی هـەراسانکردن گاڵتەیان پێی کردبوو، ئەوجارە بە دوو ڕیزی ڕێزلێنانەوە وەستـابوون، ئەویش بە هێواشـی بە بەینیـاندا تێ دەپەڕی و بە چاوەکـانیـشـی مـاڵئـاوایی لێ دەکـردن، بێ ئەوەی وشـەیەک لە دەمی بێـتـە دەرێ. زۆربەیان لـە شـەرمـان و لە خـەجـاڵەتیـیـان، چاوەکـانیـان پڕ لە فـرمـێـسک بووبوون. یەکـێکیـان شـمـشـێـرەکـەی خـۆی پێشکێشی کرد، یەکێکی تر تەورێکی دەسک کـورتی دایێ، سێیـەمین کـەس هات و ئاژەڵێکی لامای بە بارێک کەلوپەل و دێمکە ئاوێکەوە پێشکێشی کرد. من لە دوورەوە دیمـەنەکـەم لـە بەرچاو بوو و لـە نـاخـەوەش ملمـلانێی ئـەو دوژمنکارییەم دەکرد کە بەرامبەر بە بالدیبیا هـەستـم پێی دەکرد. ئەو کاتەی ئیسکۆبـار گـەیشـتـە دەروازەی سـەربازگـەکە بە پێیـان خـۆم گـەیاندێ و تاکە گەنجینەکەی خۆمم پێشکێشی کرد کە ئەسپەکەم بوو.

***

حـەفت حـەفتە لەو دۆڵە مـاینەوە، هـەر لەوێ بیـست ئیسـپـانیـایی تـر هـاتنە ڕیزەکـانمان، کە لە نـاویاندا چەند قـەشـەیەک و پیـاوێک بە ناوی چیچنیـایان

لەگەڵدا بوو. ئەو پیاوە کەسێکی ئاژاوەگێڕ و نەفسنزم بوو، هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ سانچۆ دیلا ئۆس لە دژی بالدیبیا کەوتە پیلانگێڕان. زنجیرەکان لە پێیەکانی دیلا ئۆس کرابوونەوە و لە سەربازگەکەدا بە ئازادی دەسووڕایەوە، وەلێ خوان گۆمێس بە وردی چاوەدێری دەکرد. ئەو سەد و پەنجا کەسەی کە ئێستا لە هەڵمەتەکە بەشدارن، جگە لە نۆ کەسیان، ئەوانی تر هەموویان لە چینە خانەدانەکانی هێدالگۆ بوون، واتە چینی خانەدانی لادێکان و ئەوانەی کە سەروەت و سامانیان نەمابوو، سەرەڕای ئەوەش هەر بە چینی خانەدان حسێب بوون. ئەمە بەڕای بالدیبیا هیچ مانایەکی نەبوو، چونکە ئیسپانیا خانەدانی زیادەی هەبوو. وەلێ من وا دەزانم ئەو دامەزرێنەرانە، نەفسبەرزی خۆیان خستە سەر شانشینی شیلی. ئاخر خوێنی ڕەگەزی ئەو مابۆچییە سەرسەختانە تێکەڵ بە خوێنی ئەو ئیسپانیاییە ڕوحزلانە بووبوو، لەو تێکەڵییەش گەلێکی لووتبەرزی سەرشێتانە پەیدا بووبوو.

لە دوای دەرکردنی ئیسکۆبار، سەربازگەکە چەند ڕۆژێکی پێویست بوو تا بگەڕێتەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆی. هەموویان تووڕە بووبوون، بە شێوەیەک دەتتوانی لە هەوای ئەو شوێنە هەست بەو تووڕەییە بکەیت. سەربازەکان پێیان وابوو کە من تاوانبارم: واتە من کوڕەی بێگوناهم لە خشتە بردووە و لە ڕێڕەوی ژیانی خۆی لام داوە و تووشی ئەو چارەنووسەم کردووە. منم ئەویندارە بێ حەیایەکە، بەڵام پێدرۆ جگە لە بەرگریکردن لە شەرەفی خۆی هیچی تری نەکردووە. وەک ئێشی سووتانی پێست ئەوها ماوەیەکی زۆر هەستم بە ڕقی ئەو پیاوانە دەکرد، هەروەک چۆن پێشتر هەستم بە ئارەزوو هەستانیان دەکرد ئاوا. کاتالینا ئامۆژگاری کردم کە لە چادرەکەم دەرنەچم تا ئەو کاتەی هزرەکان ئارام دەبنەوە، وەلێ کارێکی زۆر هەبوون کە بۆ خۆ ئامادەکردنی گەشتەکە دەبوو بیانکەم و هیچ چارەم نەبوو دەبووایە ڕووبەڕووی قسەوقسەڵۆکی خەڵک ببمەوە.

پێدرۆ سەرقاڵی وەرگرتنی سەربازە تازەکان بوو تا لە هێزەکەی خۆی ڕێکیان بخات. هەروەها دەبوو بایەخ بەو پڕۆپاگەندانەش بدات کە لە بارەی

خیانەتەوە دەکران، وەلێ لە هەلێکدا هەموو ڕقی خۆی بە من هەڵڕشت. خۆ ئەگەر درکی بەوە کردبێت کە لە سزادانی ئیسکۆبار زیادەڕۆیی کردووە، بەڵام هەرگیز ئەوەی نەدەسەلماند. هەستکردن بە تاوانباری و دڵپیسی هەوەسی پڕ لە شەهوەتی ئەویان جۆشدا و هەموو دەمێک ئارەزووی جووتبوونی لەگەڵم دەکرد، جا با کاتی نیوەڕۆش بووایە. ئەرک و کۆبوونەوەکانی لەگەڵ سەرکردەکانی تر بەجێ دەهێشت و بە تۆبزی ڕای دەکێشامە بن چادرەکە و لە بەرچاوی هەموو سەربازگەکە، بە جۆرێک کەس نەبوو نەزانێت چ دەکەین. بالدیبیا بایەخی پێیان نەدەدا، بەڵکو بە ئەنقەست لە پێناوی سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی و ڕیسواکردنی من و بەرپەچدانەوەی پڕۆپاگەندەچییەکان وای دەکرد. پێشتر قەت ئەوها بە توندی لاقەی نەدەکردم. بە ڕووخاوی دەیهێشتمەوە و دەیویست ئاوا چێژ وەرگرم. دوای ئەوەی بەهۆی چێژەوە ئاهم هەڵنەدەکێشا، دەیویست بەهۆی ئازارەوە بناڵێنم. ئەوە سزادانی ئەوبوو بۆ من: وەک سۆزانییەک ئازار بکێشم، وەک چۆن ئیسکۆبار لە بیابان ئازار دەکێشێ ئاوا. تا پێم کرا ئەو خراپەکارییانەی ئەوم قبوڵ کرد، بیرم دەکردەوە کە ڕۆژێک دێت ئەو لووتبەرزییەی پێدرۆ کۆتایی پێ بێت، وەلێ پاش چەند حەفتەیەک ئارامم لەبەر بڕا و لە جیاتی ئەوەی خۆمی بۆ شلکەم، هەتا دەستم تێی دابوو زللەیەکم خێوانده بناگوێی. نازانم چۆن بوو تاوێکی کەم کتوپڕ وەستاین و پاشان یەکسەر ئەو سیحرە بەدە تێکشکا کە تێی ئالابووین. پێدرۆ بە پەشێمانییەوە لە ئامێزی گرتم و منیش لە شادییەکدا دەلەرزیم کە لە شادیی ئەو کەمتر نەبوو.

بە زمانێکی لەرزۆکەوە گوتی: ئەوە چیم کرد؟ بە چ ئاستێکی نزم گەیشتین خۆشەویستەکەم؟ ئێنیس لێم ببوورە، تکایە هەموو ئەو شتانە لە بیری خۆت ببەوە...

بە دەستەملانێوە ماینەوە و ڕوحیشمان بە داوێک پێکەوە بەسترابووەوە، وردە گلەییمان دەجوییەوە، لێبووردەییمان دەگۆڕییەوە، تا دواجار بێ پشوودان نووستین. لەو چرکەساتەوە دەستمان بە گەڕاندنەوەی

خۆشەویستییە ونبووەکەمان کردەوە. ئیتر پێدرۆ وەک سۆز و شیرینی جاری جاران کەوتەوە نازهەڵگرتنم. گەشتی کورتمان پێکەوە دەکرد و بەردەوام پاسەوانیشمان لەگەڵدا بوون، چونکە هندییە دوژمنەکان هەر دەرفەتێکیان بۆ هەڵکەوتبا لە ناویان دەبردین. لە ژێر چادرەکەمان پێکەوە نانمان دەخوارد، شەوانیش بۆی دەخوێندمەوە و بە سەعات گەمەی لەگەڵ دەکردم تا چێژم پێ ببەخشێت. ئاواتی ئەو بۆ کوڕیک لە هی من کەمتر نەبوو، هەرچەندە سەلەواتم بۆ پاکیزە لێ دەدا و کاتالیناش شەربەتی تایبەتی بۆ ئامادە دەکردم، وەلێ قەت منداڵم بەزگ نەدەکەوت. من نەزۆک بووم، ئاخر لە هیچ یەکێک لەو پیاوانەی خۆشم ویستن، منداڵێکم لێیان بەزگ نەکەوت، خوان، پێدرۆ، ڕۆدریگۆ، سەرەڕای ئەوانەش کە بە سەرپێیی و نهێنی پێیان دەگەیشتم؛ وەلێ وا زەندەبەم کە پێدرۆش وەک منە، چونکە ئەویش نە لە مارینا منداڵی بووە و نە لە ژنانەکانی تریش.

– من دەمەوێ ناوبانگ و یادەوەری لە دوای خۆم جێ بێڵم – ئەمە پاڵنەری ئەو بوو بۆ ئەوەی شیلی داگیر بکات. ناوی خۆی خستە ناو مێژوو، وەلێ نەیتوانی ئەو وڵاتە بکاتە میرات بۆ نەوەکانی خۆی.

***

پێدرۆ پێشبینی پێشوەختی هەبوو، ئەوەندە سەبرەشی هەبوو تا فێری بەکارهێنانی شمشێرم بکات. لە سەرووی ئەوانەوە ئەسپێکی تری پێشکێش کردم لە جیاتی ئەو ئەسپەی  کە دابوومە ئیسکۆبار، باشترین سوارچاکی خۆی بۆ تەرخان کرد تا ماڵی بکات و ڕای بهێنێ. چونکە ئەسپی شەڕ دەبێ خۆڕسکانە ملکەچی سەربازەکەی بێت لەو دەمەی بە چەکەکانییەوە خەریک دەبێت.

پێدرۆ ئاگەداری کردمەوە و گوتی: ئەی ئێنیس، کەس نازانێت کە چ شتێک ڕوو دەدات، مادام تۆ وێرایت بۆ ئەو سەفەرە هاوڕێیەتیم بکەیت، کەواتە دەبێ ئامادەبیت تا بەرگری لە خۆت بکەی وەک هەر پیاوێک لە پیاوەکانم.

بەڕاستی ئەوە کارێکی ژیرانەبوو. لەگەڵ ئەوەی ئێمە لە کۆبیابۆ بە هیوای

هێنانەوەی هێز و تاقەتمان بووین، وەلێ ئەوەندەی نەبرد تووشی نائومێدی بووین، چونکە هندییەکان هەرکە دەیانبینی ئێمە پشتی خۆمان کردووەتەوە و لە پاسەوانی خاوبووینەوە، یەکسەر پەلاماریان دەداین. بالدیبیا بە ئەفسەرە پایەدارەکانی ڕاگەیاند: با نوێنەری خۆمان ڕەوانی لایان بکەین و بۆیان ڕوونکەینەوە کە ئێمە شەڕیان ناکەین و حەزمان لە ئاشتەواییە.

دۆن بێنیتۆ گوتی: بیرکردنەوەیەکی باش نییە، چونکە بێگومان ئەوان هێشتا ڕووداوەکانی شەش ساڵ بەر لە ئێستایان لە بیر ماوە.

باسی کامە ڕووداو دەکەیت بێنیتۆ؟

– ئەو کاتەی لەگەڵ دیێگۆ ماگرۆ هاتین، هندییەکانی شیلی نەک هەر تەنیا هەستی خۆشەویستییان بەرمبەرمان نیشان دا، بەڵکو ئەو زێڕەی کە وەک سەرانە دەیانداپە ئینکا، پێشکێشی ئێمەیان کرد و دەشیانزانی ئینکا شکستی خواردووە، وەلێ ماگرۆ بەوەندە ڕازی نەبوو کە بە ئێمەیان دەدا و گومانی لێیان هەبوو، بە بەڵێنی پڕ لە چاکەخوازییەوە داوەتی کۆبوونەوەی کردن، ئیتر هەرکە متمانەی وەرگرتن و دڵنیای کردن، فەرمانی پێداین کە پەلاماریان بدەین، ئەوەبوو زۆربەیان لەو ئاژاوەیە کوژران، سەرەڕای ئەوەش سی کەسمان لە سەرکردەکانیان دەستبەسەر کرد، پاشان لە ئەستووندەمان گرێدان و بە زیندوێتی سووتاندمانن.

بالدیبیا بە تووڕەییەوە گوتی: جا بۆ واتان کرد؟ ئایا باشتر نەبوو بە ئاشتی لەگەڵیان بژین؟

فرانسیسکۆ دی ئەگێری هاتە ناو بابەتەکە و گوتی: ئەگەر ماگرۆ یەکەم جار وای نەکردبایە، ئەوا پاشان هندییەکان بە ئیسپانییەکانیان دەکرد.

ئەوەی هندییە شیلییەکان چاویان تێ بڕیبوو ئەسپەکانمان بوو، ئەوەشی کە زۆر لێی دەترسان سەگەکانمان بوو، لەبەر ئەوە دۆن بێنیتۆ ئەسپەکانی لە تەویلەکان ڕادەگرت و بە سەگەکان پاسەوانی دەکردن. دەستەوتاقمی شەڕکەرە هندییەکانی شیلی لە ژێر فەرمانی سێ سەرۆک خێڵ بوون، لە

سەرووی ئەو سێ کەسەشەوە سەرکردەی جێبەجێکەر میشیمالۆنکۆ بوو. ئەو کابرایە پیرێکی فێڵباز بوو، دەیزانی کە هێزەکانی ناتوانن بە شەڕ سەربازگەی هوەینکا بگرن، بۆیە بێزارکردن و ماندووکردنی ئێمەی هەڵبژارد. جەنگاوەرە بێدەنگەکانی لاما و ئەسپەکانی ئێمەیان دەدزی و خۆراکیان لە ناودەبرد و ئەو ژنە هندییانەیان دەرفاند کە لەگەڵ ئێمەدا بوون و هێرشیان دەکردە سەر ئەو مەفرەزانەمان کە بۆ پەیداکردنی خۆراک و ئاو دەردەچوون. ئیتر بەو جۆرە سەربازێک و ژمارەیەک لە هندییە لاینگرەکانی ئێمەیان کوشت، کە دوایێ ناچار بوون خۆیان فێری هونەری شەڕ بکەن تا چی تر بە ئاسانی نەمرن.

وەرزی بەهار ئەو دۆڵ و کێوانەی داگرت کە بە گوڵ و گوڵزار ئەو ناوە ڕازابووەوە، هەوا نەختێ گەرم بووبوو و ژنە هندییەکان و ماین و مێیینەی لاما دەستیان بە زان کرد. هیچ شتێک لە بەچکەی لاما جوانتر نییە. لەگەڵ ئەو تازەبووانەدا باری دەروونی سەربازگەکەمان بەرەو باشی چوو کە تاوێک کزەبای شادی بۆ ئیسپانییەکان و یاناکۆنا هەڵگرتبوو. ئەو ڕووبارانەی کە لە زستاندا شێلو بوون، بۆ ڕوونی و سازگاری گۆڕان و لەگەڵ توانەوەی بەفری چیاکان. زیاتر لە جاران ئاویان پێدا دەڕۆیشت. خۆراکی ئاژەڵەکان پەیدابوو و بۆ مرۆڤەکانیش سەوزایی و بەروبوومی ڕووەکی بەردار و نێچیر زۆربوون. ئەو کەشەی شادمانییە کە بەهار لەگەڵ خۆی هێنای، وای کرد لە پاسەوانیکردن و ئاگا لەخۆبوون خاوببینەوە. ئەوکاتە ئێمە لەو بڕوایەدا نەبووین ئەوە ڕوو بدات: دوو سەد یاناکۆ لێمان هەڵگەڕانەوە و ڕایان کرد، دوای ئەوان چوار سەدی تریش خۆیان بزر کرد. ئەوانە لە کتوپڕێکا زۆر بە ئاسانی بزر دەبوون. هەرچەندە دۆن بێنیتۆ فەرمانی دا چاودێرە زنجییە کەمتەرخەمەکان و هندییەکانی بە قامچی سزا بدرێن، وەلێ کەسێک نەیزانی چۆن و بۆ کوێ ڕایان کردووە. بەڵام شتێکی مسۆگەر هەبوو: نەیاندەتوانی بە بێ یارمەتی هندییە شیلییەکانی دەوروبەرمان دوور بڕۆن، چونکە ئەوانە ئەگەر پێشتر لەگەڵیان ڕێک نەکەوتبان ئەوا دەیانکوشتن. دۆن بێنیتۆ ژمارەی

پاسەوانەکانی کردە دوو ئەوەندەی جاران و هندییە یاناکۆناکانیشی پەلبەست کرد و شەو و ڕۆژ بۆیان نەبوو لە سەربازگەکە بجوولێنەوە. چاودێرە زنجییەکانیش بەخۆ و سەگ و قامچی دەستیانەوە بە بێ پشوودان دەسووڕانەوە. بالدیبیا چاوەڕێ بوو تا گۆلک و بێچووەکانی لاما قاچیان قایم بوو، پاشان فەرمانی دا کاروانەکەیان بەرەو خواروو بڕوات، بۆ ئەو شوێنە بەهەشتەی کە دۆن بێنیتۆ هەموو جارێ باسی دەکات: دۆڵی مابۆچۆ. ئێمە دەمانزانی کە مابۆچی و مابۆچۆ یەک مانایان هەیە؛ لە سەرمان پێویستە ڕووبەڕووی ئەو دڕندانە ببینەوە کە توانییان هێزەکەی ماگرۆ کە لە پێنج سەد سەرباز و هەشت هەزار هندی هاریکار پێک هاتبوو، پاشەکشە پێ بکەن. بەڵام ئێمە تەنیا سەد و پەنجا سەربازمان هەبوو و چوار سەد یاناکۆناشمان لەگەڵ بوو. ئێمە تەواو زانیمان کە وڵاتی شیلی لە شێوەی شمشێرێکی باریک و درێژە. خاکەکەی لە چەند زنجیرە دۆڵێک پێک هاتووە کە دەکەوێتە نێوان چیایە بورکانییەکان و ئاوی ئۆقیانووس. چەند ڕووبارێکی بە ئاوی پێدا دەڕوات و کەنارەکانی سەخت و نشێو و هەڵدێرن، شەپۆلە بەسامەکانی دەریا بەرپەچ دەدەنەوە؛ ئاوەکەی سارده و دارستانەکانی چڕ و بۆندارن؛ شاخاکانی بێکۆتان و زۆر جاران گوێمان لە هەناسەدانەوەی زەوی دەبوو و هەستامان دەکرد خاکی بن پێمان دەجولێت، بەڵام دوایێ لەگەڵ زەمینلەرزەکان ڕاهاتین.

پێدرۆ لە بەردەم جوانی دیمەنی ئەو سروشتە نەگەچراوە بە دەنگێکی شکاوە کە کاریگەری ئەو دیمەنەی پێوە دیاربوو گوتی: ئەی ئێنیس، من ئەوهام خەیاڵ لە شیلی دەکردەوە.

تێڕامان و چێژوەرگرتن لە سروشت هەموو شتێک نەبوو، بەڵکو ناخۆشی و چەرمەسەریشی هەبوو، چونکە هندییەکانی میشیمالۆنکۆ بەردەوام پەلاماریان دەدراین و هێرشی لە ناکاویان بۆمان دەهێنا. لە دوای بڕینی مەودایەکی کەم زۆر بەزەحمەت دەمانتوانی پشوو بدەین، چونکە ئەگەر خۆمان خاوبکردایەوە بە سەرماندا زاڵ دەبوون. هەروەها لەبەرئەوەی لاما ئاژەڵێکی ناسکە، ئەگەر بارێکی زۆرت لێ بارکردابایە قاچەکانی دەنووشتانەوە و

دەشکان، بۆیە دەبووایە هەندێک لەو کەلوپەلانەمان بە کوڵی هندییە یاناکۆناکان هەڵبگرتایە کە هندییە ڕاکردووەکان پێشتر هەڵیان دەگرتن. لەگەڵ ئەوەی هەموو ئەو شتانەمان فڕێ دا کە زۆر پێویست نەبوون – لە نێویاندا سەندووقە پڕ شتومەکەکەی من کە لە شیلی بە کەڵکم نەدەهات –، وەلێ هندییەکان سەرەڕای ئەوەی کۆتکرابوون تا ڕانەکەن، هەر بەباری گرانەوە دەڕۆیشتن، کە ئەمەش وای کردبوو بە هێواشی و زەحمەتەوە پێشڕەوی بکەین. سەربازەکان بڕوایان بە کارەکەرەکانیان نەمابوو، چونکە ئەوەندە ملکەچ نەبوون کە ئەوان دەیانویست، لەگەڵ ئەوەش بەردەوام لەگەڵیان ڕایان دەبوارد، بەڵام نەدەوێران لە باوەشیان بنوون و گومانیان لێ پەیداکردبوون کە لەسەرەخۆ ژەهرخواردیان دەکەن، وەلێ ئەوە ژەهر نەبوو کە ڕوحی ئەوانی دەتواندەوە و ئێسقانی کلۆر دەکردن، بەڵکو ئەرک و ماندووبوون بوو. هەندێ لە سەربازەکان لە تووڕەییان هەڵدەچوون و چی ڕق و کینەیان هەیە بەو ژنانەیاندا هەڵدەڕشت، بۆیە بالدیبیا هەڕەشەی لێ کردن کە ئەو ژنانەیان لێ دادەبڕێت و ئەو هەڕەشەیەی دوو سێ جاران جێبەجێ کرد. سەربازەکان یاخی دەبوون، چونکە نەیاندەویست هیچ کەس دەستبخاتە ناو کارێک کە زۆر تایبەتمەندە، وەک پەیوەندی نێوان خۆیان و دۆستە ئەویندارەکانیان؛ بەڵام پێدرۆ وەک خەسڵەتی هەمیشەیی خواستی خۆی دەسەپاند. لەو بارەیەوە دەیگوت گومانی تێدا نییە کە ئامۆژگاریکردن بە ڕابەرایەتییەوە چاکە. نابێ ئیسپانییەکان ڕەفتاری خراپتر لە دڕندەکان بکەن. لەگەڵ تێپەڕبوونی کات سەربازەکان بە بێزاری و ناتەواوییەوە گوێڕایەڵی بوون. کاتالینا پێی گوتم کە سەربازەکان هەروا لە ژنەکان دەدەن، بەڵام نەک لە دەموچاویان، بەڵکو لەو شوێنانەی کە ئاسەواری دیار نابێت.

هەرچەندە بوێریی هندییە شیلییەکان لە دژی ئێمە زێتر بووایە، لە خۆمان دەپرسی کە داخوا چارەنووسی ئیسکۆباری بەدبەخت بەچی گەیشتووە. وامان زەندەکرد کە بە مردنێکی هێواش و پڕ لە ترسەوە سەری ناوەتەوە، وەلێ کەس نەبوو لەوێ بوێرێ ناوی بێنێت، بۆ ئەوەی ئەویش بەدبەخت

دەرنەچێت. ئێمە ناو و ڕوخسارمان لە بیر نەمابوو، ئاخر ڕەنگە تێکەڵی بێڕەنگی هەوا ببێت و بتوانێ بە نێو دوژمنەکانیدا ڕەتبێ بێ ئەوەی بیبینن.

***

ئێمە وەک کیسەڵ لەسەرەخۆ هەنگاومان دەنا، چونکە یاناکۆناکان نەیاندەتوانی بەو بارە گرانەیانەوە خێرا برۆن. هەروەها زۆرمان جوانییە ماین و ئاژەڵی ساوا هەبوو. ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا بەهۆی چاوتیژییەکەی کە لە دوورەوە شتی دەبینی و لە ئازاییش بێ وێنە بوو، پێمان باش بوو هەمیشە لە پێشەوە بڕوات. بیاگراش دوای ئەوەی بالدیبیا کردییە یاریدەری خۆی، لە دواوەڕا دەیپاراستین و ئەگێریشی لەگەڵ بوو کە هەمیشە حەزی دەکرد ڕووبەڕووی هندییە شیلییەکان ببێتەوە، بە ڕادەیەک چەندەی حەز لە ژنان بوو ئەوەندەش حەزی بە شەڕوشۆڕ دەکرد.

ڕۆژێکیان نامەهەڵگرێک هات کە کێرۆگا لە پێشەوە ڕەوانی کردبوو، وەک ئاگەدارکرنەوە هاواری دەکرد: هندییەکان وا هاتن. بالدیبیا منی لەگەڵ ژن و منداڵ و ماڵاتەکان لە شوێنێکی بەردەڵانی قایم و پڕ دار و درەخت هێشتەوە، پاشان پیاوەکانی بۆ شەڕ ڕێکخست نەک لەسەر شێوەی سریەی ئیسپانیا، بۆ هەر سوارێک سێ پیادە، چونکە سەربازەکانی ئێرە هەمووی سوارچاک بوون و ئەسپی خۆیان پێ بوو. وەختێ کە دەڵێم سەربازەکانمان سواری ئەسپەکانیان دەبوون، ڕەنگە هەندێک وا خەیاڵ بکات کە لەشکرێکی ئازای لە سەد و پەنجا سوارچاک دەتوانێت دە هەزار هێرشبەر ببەزێنێ، بەڵام ڕاستییەکەی ئەسپەکانیان لە زەحمەتییەکانی گەشتەکە لەڕولاواز بووبوون و ئێسکیان دەرپەڕیبوو، جلی سەربازەکان دڕابوون و زرێکانیان بتەو نەبوون، خوودەکانیان قەپوقۆپ و چەکەکانیان ژەنگاوی بووبوون. ئەوان ئازابوون وەلێ گێرەشێوێن و لووتبەرز بوون؛ هەر یەکێک لەوان دەیویست سەربەرزی بۆ خۆی دەستەبەر بکات. بالدیبیا بە حەسرەتەوە دەیگوت: بۆچی قشتاڵییەکان ناتوانن ببنە یەکێک لە کۆ؟ هەموویان دەیانەوێ ببنە ژەنەراڵ!.

هەروەها ژمارەی هندییە هاریکارەکانمان زۆر کەم بووبووەوە، ئەوانەیش کە

مابوونەوە لە ماندوێتی و ئەو مامەڵە خراپەی لەگەڵیان دەکرا، ڕقیان لێمان دەبووەوە، بە جۆرێک نەیاندەتوانی یارمەتییەکی ئەوتۆمان بدەن، ئەگەر لە ترسی مردن نەبووایە هەر شەڕیشیان نەدەکرد.

پێدرۆ وەک هەمیشە هەر لە پێشەوە بوو، هەرچەندە ئەفسەرەکانی تکایان لێی دەکرد کە ئاگەداری خۆی بێت، چونکە بەبێ ئەو هەموومان لەناودەچووین. لەگەڵ هاواری «بە ناوی خواناسی سانتیاگۆ، دەستیان لێ مەپارێزن!»، ئەمە ئەو هاوارە بوو کە هێشتا قشتاڵییەکان بە هۆیەوە، بە درێژاییی چەند سەدەیەکی ململانێیان لەگەڵ موسڵمانەکانی ئەندەلووس، ناوی ئەو پەیامبەرەیان دەگوتەوە. پێدرۆ لە پێشەوە وەستا و تفەنگچییەکانیش لەسەر چۆک دامەزرابوون، چەکەکانیان سوار و نیشانەیان لە پێشەوە گرتبوو. بالدیبیا دەیزانی کە هندییە شیلییەکان بە سینگی ڕووتەوە هێرش دەکەن و زرێ ناپۆشن و هیچ باکیشیان بە مردن نییە. ئەوان لە تفەنگ ناترسن و پێیان وایە تەنیا دەنگێکە و بەس. هیچ شتێک بەریان پێ ناگرێت تەنیا سەگ نەبێت کە لە گەرمەی شەڕدا بە زیندوێتی دەیانخۆن. بە تۆپەڵێک بەرەو ڕووی ئیسپانییە پۆلاکان هێرشیان هێنا، وەلێ زیانێکی زۆریان بەرکەوت لە کاتێک کە چەکە بەردینەکانی ئەوان لەسەر زرێکان هەڵدەبەزینەوە و کاریگەرییان نەبوو. ئاخر ئیسپانییەکان لەسەر پشتی ئەسپەکانیانەوە نەدەبەزین، بەلام ئەگەر هندییەکان بیانتوانیبایە بیانخەنە خوارەوە، ئەوا دەیانکوشتن. هێشتا تەواو ڕیزەکانمان ڕێک نەخستبوو وەختێ گوێمان لە هاوارێک بوو کە کەس خۆی لەبەری پێ نەدەگیرا، هێرشی هندییەکانی ڕادەگەیاند. هاوارێک کە مووچڕکی بە جەستەدا دەهێنا، حەماسەتێکی سەرشێتانەی دەدایە ئەوان و دوژمنەکانیشیانی تووشی ئیفلیجبوون دەکرد، وەلێ کاریگەرییەکی پێچەوانەی لەسەر ئێمە هەبوو: ڕقیان هەڵدەستاندین. بەر لە چەند چرکەیەک لە شەپۆلی هێرشەکەی دوژمن کە لە شاخەکانەوە دەهات، هێزەکەی ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا توانی خۆی بگەیەنێتە هێزەکەی بالدیبیا. ئەوان هەزاران جەنگاوەر دەبوون کە بە نیمچە ڕووتییەوە بە تیروکەوان و تەور

و تۆبزەکانیانەوە غاریان دەدا و بە هەلهەلە لێدانەوە هاواریان دەکرد. ڕیزی یەکەم دەستڕێژییان لێ کردن، وەلێ نەیانتوانی بیانوەستێنن یا لە توندییان کەم بکەنەوە. پاش چەند خولەکێک دەمانتوانی دەموچاویان ببینین کە بە هێڵی ڕەنگاوڕەنگ بۆیەکرابوون و شەڕی دەستەویەخە هەڵگیرسا. ڕمی سەربازەکانی ئێمە جەستە ڕەنگ قوڕاوییەکانی ئەوانی ئەودیو و ئەودیو دەکرد و شمشێرەکانمان سەر و چوارپەلیانی دەپەڕاند و سمی ئەسپەکانیش جەستەی کەوتووەکانیان هەڵدەدڕی. ئەو کاتەی هندییەکان دەیانتوانی بێنە پێش، هەوڵیان دەدا بە کوتەک و تۆبزەکانیان ئەسپەکان بخەن، هەر ئەسپێک قاچەکانی بچەمابایەوە بیست دەست بە جارێک بۆ سوارەکە دەچوو و لە ئەرزیان دەدا. خوودە و زرێکان بۆ چەند چرکەیەک سەربازەکانی دەپاراست، هەندێ جاریش ئەو چەند چرکەیە بەس بوو بۆ ئەوەی یەکێک لە هاوڕێکانی بە هاوارییەوە بچێت و ڕزگاری بکات. تیرەکان کاریگەرییان لەسەر زرێ و قەڵغانەکان نەبوو، وەلێ ئەگەر بە شوێنێکی نەپارێزراو بکەوتانایە زۆر کاریگەر بوون. لە گەرمەی شەڕ و هەرادا، برینداره‌کانمان بەبێ ئەوەی هەست بە ئازار بکەن و بایەخ بە برینە خوێن لێ هاتووەکانیان بدەن، درێژەیان بە شەڕ دەدا. کاتێکیش کە لە شپرزەییان دەکەوتن، هەندێکی تر ڕزگاریان دەکردن و بۆ کنە منیان دەهێنا.

تیمارگەیەکی بچووکم دروست کرد و کارەکەرە هندییەکانیشم لە دەورە بوون و چەند یاناکۆنایەکی دڵسۆز کە بەتەنگ ژنانەکانی هاوڕەگەزی خۆیانەوەبوون پارێزگارییان لێ دەکردین. هەروەها ژمارەیەک لەو کوێلە زنجییانەی کە دەترسان بکەونە دەستی دوژمن، بەرگرییان لێ دەکردین، چونکە دەترسان ئەگەر بکەونە دەستی دانیشتووانی ڕەسەنی ئەوێ ڕەنگە پێستیان لەبەر داماڵن تاکو بزانن داخوا ئەم پێستڕەشییە بۆیەیە یاخۆ هەر خۆی وایە، ئاخر لە زۆر شوێن ئەوەیان کردبوو. ئێمە بە پارچە پەڕۆک برینەکامان خێرا بە پەنگرێکی ڕەژووی گەشاوە داغ دەکرد و پاشان بە توندی دەمانپێچایەوە تا خوێنی دەمارە خوێنبەرەکان بوەستێت. هەرکە پیاوەکان

دەکـــەوتنەوە ســـەرپێ، بە پەلە هـەندێک ئـاو و چۆڕێک بادەمـــان دەدانـێ و چەکــەکــانمـان دەدانە دەســـتی و ڕەوانی شـــەڕمـــان دەکــردنەوە. لـە کــاتی چارەسـەرکردندا هـەرکە بوارم دەبوو، هەناسـەیەکم هەڵدەکێشا و دەمگوت: ئەی پاکـیـزەکـەمـان، پێدرۆمـان بۆ بـپـارێـزە. هـەواکـە لەگـەڵ خـۆی بۆنی بـاروود و ئەسـپـەکـانی بە تێکـەڵی لەگەڵ بۆنی خـوێن و گۆشـتی سـووتـاو بۆمـان دەهێنا. ئەوانەی لە سـەرەمـەرگدابوون ئارەزووی دانپیانـانیان هـەبوو، بەڵام قەشـەکـان خەریکی جەنگ بوون، بۆیە من نیشانەی خاچێکم لەسـەر نیوچەوانیان دەکێشا و لێبـووردنم پێ دەبەخـشـین تا بە ئاشـتـەوایی جێمـان بێڵن. ئاخـر قـەشـەکـە پێشـتـر پێی گوتبووم کـە ئەگەر لە بارێکی وادا هیچ پیاوی ئاینی لەو شـوێنە نەبێت، هـەموو مـەسـیـحـییـەک دەتوانی دەروونی ئەو کەسانە پاک بکاتەوە کە لە سـەرەمـەرگن و داوای بەخشینیشیان بۆ بکات، وەلێ پێی نەگوتم کـە ئاخۆ ژنە مەسیحی بۆی هـەیە وا بکات یان نا.

سـەرەڕای هـاواری مردن و ئازار و زیقەی هندییەکان و حیلەی ئەسپەکان و تەقینەوەی باروود، دەنگی گریانی پڕ لە ترسـی ژنەکانیشـی هـاتبووە سـەر کـە زۆربەیان منداڵکانیـان بە پشـتـیـانـەوە بەسـتـبـووەوە. سـیـسـیلیـاش کـە لەوە ڕاهـاتبوو کـارەکـەرەکـانی وەک شـازادەیەک خـزمـەتی بکەن. ئەو ڕۆژە دابەزییە دنیای مـرۆڤە نەماوەکان و لە تەک من و کاتالینا کـاری دەکرد. ئەو ژنە لاواز و نەرمونیانە زۆر بەهێزتر دیارکەوت وەک مەزەندەمـان دەکرد. کراسـە شۆڕەکەی کە لە باشترین خوری دروست کرابوو بە خوێنی بریندارەکان سوور بووبوو.

لە چرکـەیەکدا ژمـارەیەک لە دوژمنەکان توانییان بگەنە نزیک تیمـارگەکـەی ئێـمـە. لە هـیکرا گـوێـم لە هـاوارێکی بەرز و نـزیک بوو، لەو کـاتەی کـە ژنەکـان هـەوڵیان دەدا بێنیتۆی بەربەست بکەن، چاوم لەسـەر ئەو تیرە بەرز کردەوە کە دەمـویست لە ڕانـی بێنیـتـۆی دەرکـێـشـم، خـۆم ڕووبەڕووی کـۆمـەڵێک دڕندە بینییـەوە کـە کـوتەک و تەورەکـانیـان بەرز کـردبووەوە و پـەلامـاریان دەداین. پاســەوانە یاناکـۆنـا و زنجـیـیـەکـانمان زۆر خـۆیان ڕانەگـرتبـوو، بێ ئەوەی بیربکەمەوە دەستم بۆ ئەو شـمشێرە برد کە پێشـتـر پێدرۆ لەسـەر بەکارهێنانی

ڕای هێنابووم و بە هەردوو دەستم گرتم و ئامادەبووم بەرگری لەو قیچە شوێنەکەمان بکەم. پیاوێکی بەساڵاچوو لە پێشوەی هێرشبەرەکان بوو، بە هێڵی ڕەنگدار و پەڕامووچە دەموچاوی نەخشاندبوو. لەسەر یەکێ لە ڕوومەتەکانی شوێنی برینێکی کۆن دیاربوو لە لاجانگییەوە گرتبووی تا دەگاتە دەمی. ئەو دیقەتەم لە ماوەی چەند چرکەساتێک دایێ، چونکە ڕووداوەکان خێرا ڕەت دەبوون. بە بیرم دێ ئێمە ڕووبەڕووی یەکتر بووینەوە، ئەو بە ڕمێکی کورت و منیش بە شمشێرەکەمەوە، لە هەڵوێستێکی وەک یەکدا و بە تووڕەییییەوە ئەو هاوارە ترسێنەرەمان لە دەم دەردەچوو کە لە کاتی شەڕدا دەیچڕن و هەردووکمان بە چاوی پڕ لە قینەوە لە یەکترمان دەڕوانی. ئەوکاتە پیرەمێردەکە بە دەست ئیشارەتی دایە هاوڕێکانی ئیتر یەکسەر وەستان. ناتوانم سوێند لەسەر ئەوە بخۆم، وەلێ بزەیەکی نەرمم لەسەر ڕوخسارە ڕەنگ خاکییەکەی دیت، پاشان وەرسووڕا و گەنجانە هەنگاوی بۆ دەرەوە هەڵنا، لە هەمان ئەو چرکەیەی کە ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا بە ئەسپەکەیەوە هاتە هانامان. ئەو پیرە پیاوە میشیمالۆنکۆ بوو.

پاش ماوەیەکی زۆر لە ڕۆدریگۆم پرسی: ئەرێ بۆ هێرشی نەکردە سەرم؟

ئەویش بۆ ڕوونکردمەوە: چونکە ناتوانێ شوورەیی شەڕکردنی لە دژی ژنێک لەگەڵ خۆی هەڵگرێ.

- ئەی سەرکردە، ئایا تۆش وا دەکەی؟

بە بێ دوودڵی وەڵامی دامەوە: بەڵێ منیش هەروا دەکەم.

شەڕەکە دوو سەعاتی خایاند، دوو سەعاتی پڕ لە گرژی و ترس، لە چاوترووکانێکدا بەسەرچوون، چونکە وەختی بیرکردنەوەمان نەبوو. لە هیکرا و لە وەختێک کە دوژمنەکان چیوای نەمابوو دەست بە سەر گۆڕەپانەکەدا بگرن، پەرتبوون و لە هەمان ئەو شاخانە خۆیان بزر کرد کە لێیەوەی هاتبوون؛ بریندار و کوژراوەکانی خۆیان لەوگۆڕە بەجێ هێشت، وەلێ ئەو ئەسپانەیان برد کە توانیبوویان لە پیاوەکانی ئێمەی بستێنن. ئەوجارەش

ڕێزدارمـان پاکیزەی لێبووردەیی ڕزگـاری کردین. گـۆڕەپانەکە پڕ لە تەرمی کوژراوەکان بوو و دەبووایە سەگە دەم بە خوێنەکانمان ببەستینەوە بۆ ئەوەی برینداره‌کـانمان نەخـۆن. زنجـیـیـەکـان بـە نێـو بریـنداری شـیلیـیـەکـانـدا دەسـووڕانەوە تا تەواویان کـەن. پاشـان بـریندارەکـانی خـۆمـانیـان هەڵگرت و هێنـایانە لام. منـیش خـۆم بۆ ئـەرکی داهـاتووم ئامـادە کـرد، ئاخـر لـە مـاوەی چەند سـەعـاتێک ئـەو دۆڵە پڕبوو لە هـاتوهاوار و ناڵەی بـریندارەکـان کـە دەبووایە چارەسـەریان بکەین. من و کاتالینا بەردەوام تیرمان لە جەسـتەیان دەردەکێشـا و برینەکانمان داغ دەکردن، کە ئەوەش کـارێکی دڵخۆشکەر نەبوو. دەڵێن مـرۆڤ لە هەمـوو شـتێک ڕادێت، وەلێ ئەوە ڕاست نـەبوو، چونکە قـەت نەمـدەتوانی لەگەڵ ئـەو هاوارکردنە پڕ لە ترسـانە ڕابێم. هەتا ئێسـتـاش کە پیربوومـە و پاش ئەوەی یەکەم خەسـتـەخانەم لـە شیلی دروست کرد و هەمـوو ژیانم لـە برینپـێـچـی خـەرج کـرد، هـەروا شـیـوەنـەکـانی جـەنگم لـە گـوێ دەزرنـگێنـەوە. ئەگـــەر بکرایە برینـەکـــان بـە دەرزی و داو وەک قـــومـــاش بدوورێنەوە، ئەوا کارەکە زۆر ئاسـانتر دەبوو، وەلێ جگە لە ئاگر هیچ شـتێک ناتوانێ خوێنبەربوون ڕاگرێت.

پێدرۆ چـەند شـوێنێکی جـەسـتـەی بە سـووکی بریندار بووبوو و خـوێنی تێ زابوو، بەڵام نەیدەهێشت تیمـاری بکەین. بە پەلە ئەفسـەرەکانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی سـەرژمێری زیانەکانمان بکەن. بۆ ئەو مـەبەسـتـە پرسـیاری کـرد: چەند کوژراو و بریندارمان هەیە؟

فرانسـیسکۆ ئەگێری کـە لە حسێبەکەی زۆر ورد نەبوو، وەڵامی دایەوە: دۆن بێنیـتۆ بە تیرێک زۆر سـەخت بریندار بووە و سـەربازێکی کوژراومـان هەیە و سێزدە بریندارێشـمـان حـاڵیان باش نییە. بە حـسـابی من نێزیکەی بیست ئەسـپیان لێمان دزیوە و ژمارەیەکیش هندییە هاریکارەنیان لێمان کوشتووە.

منیش بۆ ڕاسـتکردنەوەی زانیـارییـەکـانی ئەگـێری گـوتم: چوار زنجی و شـــەست و سـێ هندی یاناکــۆنا بـریـندارن و برینـی هـەندێکیــان جـێـگەی مـەترسییە، پێم وایە دووانیـان ئەم شـەو تـەواو دەبن. پێویسـتـە بریندارەکان بە

پشـتی ئەسپ بگوازینەوە، چونکە ناکرێ لە دوای خـۆمـان بـەجـێـیـان بێـڵـین. ئەوانەیش کـە حـاڵـیان لە مـەترسـیـدایە پێـویسـتـە بە تەخـتـە دەسـتـبـەرەکـان بگوازرێنەوە.

بالدیبیا بـە فـەرمـانەوە گـوتی: چادرگـەیەک بۆ مـاوەی چەند ڕۆژێک دروست دەکەین، کێرۆگا تۆ بە شێوەیەکی کاتی وەک سەرکردەی مەیدانی، بڕۆ شوێنی بێنیـتـۆ، تۆش ئـەی بیـاگـرا سـەرژمـێـری کـوژراوەکـانی دوژمـن بکە، ئێـوە هـەردووکـتـان لە پاراسـتنی ئـەمن و ئاسـایش بەرپرسـن. من وا دەزانم دوژمن بەم زووانـە جـارێکی تـر پەلامـارمـان دەدەنەوە. تۆش ئـەی قـەشـەی بـەڕێز، کـاروبـاری شـاردنەوەی تەرمـەکـان و نوێژکـردن بگرە ئـەسـتـۆی خـۆت. هەر کاتێکیش دۆنیا ئێنیس پێی باش بوو، لە کاروانەکەمان بەردەوام دەبین.

سەرەڕای ئامادەکارییەکانی بیاگراش، سـەربازگەکەمان بە ئاسانی دەگیرا، چونکە لە دۆڵێکی ناقایم بوو و هـندییە شـیلییـەکانیش شاخـەکانیان گرتبوو، وەلێ لە ڕۆژانی یەکەمی لەوێ بـوونمان هیچ خۆیان دەرنەدەخست. دۆن بێنیـتۆ پێی گـوتین کـە ئەو هندییـە شـیلییـانە لە دوای هـەر شـەڕێک خـۆیان تا ڕادەی بێـهۆشـبوون سـەرخۆش دەکـەن، ئیـتر دوای چەند ڕۆژێک لە بەهـۆشـهـاتنەوەیان هێرش ناکەنەوە. ئەمـە هـەواڵێکی نەختێک خـۆش بوو، یاخـوا قـەت بادەیان لێ نەبڕێت.

# بەشی چوارەم

## سانتیاگۆ دی ئیسریمادۆرای تازە ١٥٤١ – ١٥٤٣

لەسەر ئەو تەختەدارەی سەردەستان کە بە پێیان هەڵمان گرتبوو، دۆن بێنیتۆ لە دوورەوە زورگەکانی هوەیلینی ناسییەوە، کە خۆی لە گەشتی پێشتری لەگەڵ دیێگۆ ماگرۆ خاچێکی لێی چەقاندبوو.

ئەو پیرەمێردە لەبەر ئەو تایە دەیناڵاند کە بەهۆی تیرەکەوە دەیهاتێ، نە دەرمانی گیاکانی کاتالینا و جادووەکانی و نە نوێژەکانی قەشە شفایان پێ نەدا، ئا بەو حاڵەوە هاواری دەکرد و دەیگوت: ئا لێرێهێیە! ئەو بەهەشتەی کە هەردەم لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا ئارەزوویم دەکرد!.

بەرەو دۆڵێکی زۆر دڵڕفێن شۆڕدەبووینەوە کە پڕ بوو لە درەختی بەڕوو و چەندان چەشنە داری تر کە لە ئیسپانیادا نەناسراون: وەک داری کیلکی، پیۆمۆ، ئیتینی، کۆیگۆی، قورفە. لە گەرماترین ڕۆژەکانی هاویندا بووین، وەلێ شاخە بەرز و سەرکەشەکان بە بەفر داپۆشرابوون. هەرچوار دەوری ئەو دۆڵە بە شاخی زێڕین و نەرم گیرابوو. تاکە نیگایەک بەس بوو بۆ ئەوەی پێدرۆ درک بکات کە دۆن بێنیتۆ ناهەقی نەبوو: ئاسمانێکی شین، کەشێکی ڕووناک، دارستانێکی سەوز و گەشاوە، لە خاکێکی بەپیت و پڕ لە گۆماو و ڕووباری گەورە، ئەمە دۆڵی "مابۆچۆ"یە؛ ئەوە ئەو شوێنەیە کە خواوەند هەڵی بژارد تا یەکەم گوندی لێ دابمەزرێنین. ئاخر ئەو شوێنە سەرەڕای جوانی و بەپیتی خاک و کەشەکەی، لەگەڵ ئەو بنچینە تۆکمەیەش یەکدەگرێتەوە کە ئیمپڕاتۆر کارلۆسی پێنجەم بۆ دروستکردنی شارەکان لە وڵاتی هندان دای ناوە: نە شوێنە زۆر بەرزەکان بۆ دروستکردنی شار هەڵبژێرن، کە با هەراسانت دەکات و خزمەتگوزاری و هاتوچۆشی تێدا زەحمەتە، نە شوێنە زۆر

نزمەکانیش کە هەمیشە دەبنە مایەی نەخۆشی؛ بەڵکو لەو شوێنانە دروستی بکەن کە نە زۆر بەرز و نە نزمن و بۆ هەوای شەماڵ و نیوەڕۆیان بەری والا بێت، ئەگەر ناچاربوون لە بەرزاییش دروستی بکەن، ئەوە با لای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای گوندەکە بۆ هەوا کراوە بێت. ئەگەریش لە دەم کەنار ڕووبارەکان دروستتان کردن، با شوێنەکەی ئاوا بێت کە خۆری سبەینان بەر لە ڕووبارەکە لە گوندەکە بدات.

وا دیاربوو خەڵکی ئەوێ تەواو لەگەڵ ڕایەکەی کارلۆسی پێنجەم بوون. ئەوێ چەند هۆزێکی لێ دەژیا و کێڵگەیەکی زۆر و کەناڵی ئاودان و جۆگە و ڕێگەی لێ بوون. ئێمە یەکەمین کەس نەبووین کە خێروبێری دۆڵەکەمان دۆزیبێتەوە.

هەردوو سەرکردە، بیاگرا و ئەگێری لەگەڵ مەفرەیەک دەرچوون تا لە کاردانەوەی خەڵکە ڕەسەنەکە بگەن. ئێمەش لە نێو پاسەوانییەکی توندەوە چاوەڕێ بووین. ئەوان بە هەواڵێکی خۆشەوە هاتنەوە، گوایە هندییەکان ئەگەرچی بە گومانن، وەلێ هیچ کاردانەوەیەکی دوژمنکارانەیان پێوە دیار نییە. هەروەها بۆیان دیارکەوتبوو کە ئیمپراتۆریەتی ئینکا تا ئەو شوێنە هاتووە و نوێنەرەکەشیان "کۆراکا بیتاکۆرا" کە حوکمی ئێرە دەکات، ئامادەیە هاریکاریمان بکات، چونکە دەزانێت کە ئیستا لە پێرۆ، ڕیشدارەکان حوکم دەکەن. دۆن بێنیتۆ بە پێداگرییەوە گوتی:" بروایان پێ مەکەن، ئەوانە بێویژدان و شەڕخوازن". وەلێ بڕیار وا درا کە لە دۆڵەکە بگیرسێینەوە، جا ئەگەر کار بگاتە ئەوەش کە بە هێز ناچاریان بکەین ملمان بۆ کەچکەن. ئەو ڕاستییەی کە ئەوان چەندین نەوەیە لەوێ ماڵ و کێڵگەی خۆیان هەیە، هاندەرێک بوو بۆ داگیرکارە حەماسەتدارەکان. ئەوە بەو مانایە دێت کە ئەوێ کەشوهەوا و خاکێکی لە باری هەیە بۆ ژیان. بیاگرا بە چاو ئەژماری کرد کە بە گوێرەی ئەو کێڵگانەی کە دەتوانین ببینین، لەوانەیە نزیکەی دە هەزار کەس لەو دۆڵەدا بژین و زۆربەشیان ژن و منداڵن. هەروەها گوتی کە ئەوەش مایەی نیگەرانی نییە، تەنیا ئەگەر هێزەکانی میشیمالۆنکۆ سەرلەنوێ بێنەوە.

دەبێ خەڵکی ئێرە، وەختی کە ئێمەیان دیت هاتین و پاشان زانییان دەمانەوێ لێرە بمێنینەوە، هەستیان بەچی کردبێت؟

دوای تێپەڕبوونی سێزدە مانگ بەسەر دەرچوونمان لە کۆسکۆ، لە مانگی شوباتی ١٥٤١، پێدرۆ ئالای قشتاڵەی لە بناری شاخی هوەیلین چەقاند و بە ناوی سانتا لۆسیا پیرۆزی کرد، چونکە ئەو ڕۆژە ڕێکەوتی جەژنی ئەو ژنە باوەڕدارە شەهیدەی دەکرد و بە ناوی پاشای پایەداری ئیسپانیاوە دەسەڵاتی گرتە دەست. لەوێ بڕیاری دروستکردنی شاری سانتیاگۆ دی ئیستریمادۆرای تازەی دا. پاش گوێگرتنی لە کۆنوێژەکان و وەرگرتنی قوربانی، بڕیاری دا لەسەر شێوەی کەشی لاتینی کۆن مەوداکانی شار دیاری بکرێت. لەبەرئەوەی هەوجارِ و گاجووتمان نەبوو، بۆیە بە ئەسپەکان دەمانپێوا. بە کۆمەڵ و لەسەرخۆ دەڕۆیشتین و لە پێشەوە پەیکەری ژنە ڕێزداری پاکیزەمان هەڵگرتبوو. بالدیبیا ئەوەندە کاریگەری کەشەکەی بەسەرەوە بوو، تا ئەو ڕادەیەی فرمێسک لە چاوەکانی هاتنە خوارێ، وەلێ ئەو تاکەکەس نەبوو کە دەگریا، بەڵکو نیوەی سەربازە چاپووکەکانیش دەگریان.

دوو حەفتە دوای ئەوە، ئەو ئەندازیارەی لەگەڵمان بوو کە چاوێکی کوێر و لە نەوەی گامبوا بوو، نەخشەیەکی ئاسایی شارەکەی کێشا. یەکەم جار شوێنی گۆڕەپانی گەورە و جێگەی داری عەدالەت یاخۆ سەکۆی لە سێدارەدانی دیار کرد. ئیتر لەوێوە بە بەکارهێنانی داو و ڕاستەیەک، هێڵی شەقامە ڕاست و تەریب و شاقووڵییەکانی کێشا و زەوییەکەی کردە چەندان بەشی چوارگۆشەیی درێژی هەر پارچەیەکی سەد و سی و هەشت ڕم بوو و کە کۆی گشتی بووە هەشتا پارچەی وەک یەک و هەر پارچەیەکیش بۆ چوار پارچە زەوی دابەش کرابوو. یەکەم ستوونی نیشانە کە لە زەوییان چەقاند لە پێشەوەی گۆڕەپانی گەورە، دەبووە دیاریکەری شوێنی کەنیسە. قەشە گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ بە دەنگێکی بە لەرز و سۆزەوە بەڵێنی دا و گوتی:" ئەو کەنیسەیە لە دوا ڕۆژ دەبێتە کاتەدرائییە". پێدرۆ پارچە زەوییەکی لە باکووری گۆڕەپانەکە بۆمان دیارکرد، ئەوانی تریشی بە پێی پێگەی هەر

یەکێک لە ئەفسەرەکان و سەربازەکان و ڕادەی دڵسۆزییان بە سەریان دابەشی کرد. بە یارمەتی ئەو یاناکۆنایانەی لەگەڵمدا بوون و هەندێک لەو هندییانەی دانیشتووانی دۆڵەکە کە بە ئارەزووی خۆیان هاتبوون، بە قوڕ و دار دەستمان بە دروستکردنی خانوو کرد و سەرەکەیشمان بە پۆش دەگرتەوە – تا ئەو وەختەی توانیمان قەرمید دروست بکەین – دیوارەکانمان ئەستوور دەکرد و دەرگە و پەنجەرەکانیش تەسک. لەمەیان دوو مەبەستمان هەبوو: بۆ ئەوەی لە کاتی هێرشی دوژمنان بتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین و پلەی گەرماش لە ژوورەکان پارێزراو بێت و نە زۆر گەرم و نە زۆر سارد. دوایێ بۆمان ڕوونبووەوە کە کەشوهەوای ئەوێ بە هاوینان گەرم و وشک و خۆشە، بە زستانانیش سارد و باراناوییە. گامبوای یەکچاو و یاریدەرەکانی نەخشەی شەقامەکانیان دەکێشا و ئەوانی تریش بە تیمێک کرێکارەوە کاری بینا دروستکردنیان دەکرد. کوورەکانی ئاسنگەریش بەبێ وەستان بزمار و ڕێزە و کلیل و کیلۆن و گۆشەیان دروست دەکرد. ئیتر تا شەو دادەهات و دەبووە کاتی کۆنوێژ، دەنگە دەنگی چەکوش و دەزگابەرە نەدەبڕایەوە. بۆنی دارە تازە بڕاوەکان بە هەوادا بڵاو بووبووەوە. ئەگێری و بیاگرا و ئەڵدێرێتی و کێرۆگا، دووبارە سوپایە هەڵوەشاوەکەیان ڕێکخستەوە کە لە گەشتە دوورودرێژەکەماندا باری زۆر خراپ بووبوو. بالدیبیا و مۆنڕوی کە هەردووکیان شانازییان بە شارەزاییان لە بواری دبلۆماسی خۆیان دەکرد، لەگەڵ دانیشتووانی ئەوێ کەوتنە گفتوگۆ. بەڵام من دەبووایە نەخۆش و بریندارەکان چارەسەر بکەم و بەو کارەش هەستم کە لە هەموو کارەکانی ترم خۆشتر دەویست: بناخەدانان. پێشتر ئەو کارەم نەکردبوو، وەلێ هەرکە لە دوای دانانی نیشانەکانی سەر گۆڕەپانەکە، یەکسەر ئەو بەهرەیەم لە خۆم دۆزییەوە، بۆیە بەچاکم زانی ئاشکرای بکەم و نەیشارمەوە، ئیتر لەو کاتەوە بە بناخەدانان هەستام بۆ خەستەخانە و کەنیسە و گوند بە کاملی و پەرستگە و خانووی مالان. ئەگەر ژیان بواری بدامایە هەتیوخانەیەکیشم دروست دەکرد کە ئەوە لە سانتیاگۆ زۆر پێویستمان پێی هەبوو، چونکە زۆر

شەرمە ئەو هەموو منداڵە برسی و کڵۆڵە لە شەقامەکان ببینرابانایە، وەک ئەوەی لە ئیستریمادۆرا هەبوو. ئەو زەوییانە زۆر بەپیت بوون و بەرووبوومەکەی بەشی هەمووانی دەکرد. بە پێداگرییەوە ئەرکی بناخەدانانم گرتە ئەستۆی خۆم کە لە دنیای تازە وەبەر ژن کەوتبوو. ئاخر پیاوەکان سەرپێیی گوندیان دروست دەکرد و پاشان بۆ ئێمە و منداڵەکان بەجێیان دەهێشت تا لە شەڕی دانیشتووانی ڕەسەنی ئەوێ بەردەوامبن. دەبێ چل ساڵ بەسەر کوشتن و قوربانیدان و نەوەستان و کارکردن ڕابردبێت، ئەوجا سانتیاگۆ بووەتە خاوەنی ئەو هێزەی کە ئەوڕۆکە هەیەتی. ئەو ڕۆژگارانەم لە بیر ناچن کە تەنیا پەناگەیەکمان هەبوو و بە ددان و ڕنۆک بەرگریمان لێی دەکرد. ژنەکان و ئەو پەنجا یاناکۆنایە کە ڕۆدریگۆ دابوویە بەر دەستم، هەموویانم دابەش کردە سەر کاری دروستکردنی مێز و کورسی و چوارپا و مافوور و ڕایەخ و تەندوور و قومماش و قاپ و لەگەنی قوڕی سوورکراوە و کەرەسەکانی مەتبەخ و قەفەزی مریشکان و جلوبەرگ و بەتانی و هەر شتێک کە بۆ ژیانی شارستان پێویستە. بۆ ڕێکخستنی کارەکان، هەر لە سەرەتاوە سیستەمێکم دانا کە هیچ کەس بێ خواردن نەدەمایەوە. ڕۆژێ یەک جار خواردن دروست دەکرا و لەسەر مێزی گەورە دادەنرا لە گۆڕەپانە گشتییەکە کە پێدرۆ ناوی لێنابوو گۆڕەپانی چەک، هەرچەندە تەنیا یەک تۆپمان هەبوو بۆ بەرگری لێ کردنی. ژنەکان کولێرەیان دروست دەکرد و فاسولیا و پەتاتە و گەنمەشامییان لەگەڵ گۆشتی باڵندە و کەروێشک لێدەنا کە هندییەکان ڕاویان دەکردن. هەندێ جاریش ماسی و سەدەفی دەریامان بۆ دەهات کە هندییەکانی دۆڵەکە لە کەنارەکانەوە دەیانهێنا، وەلێ بۆنیان زۆر ناخۆش بوو. هەر یەکێک بە پێی توانای خۆی لەو خوانە هاوبەشە هاریکاری دەکرد، وەک ئەوەی چەند ساڵێک پێشتر لە کەشتییەکەی مانوێل مارتینی دەریاوان دەمانکرد، ئاوا. ئەو کارە هەرەوەزییە لایەنێکی چاکەی تێدابوو کە هەمووانی کۆ دەکردەوە و خەڵکە بێ ئومێدەکانی لانی کەم بۆ چەند ساتێک بێدەنگ دەکرد. ئێمە بایەخێکی زۆرمان بە ئاژەڵەماڵییەکان دەدا؛ تاکە باڵندەیەکمان

سەرنەدەبڕی تەنیا لە بۆنە تایبەتەکان نەبێت، چونکە من بڕیارم دا لە ماوەی ساڵێک تەویلەکان پڕکەم. ئاخر بەراز و مریشک و مراوی و لاما وەک ئەسپ پێویست بوون و لە ڕاستیدا زۆر لە سەگەکان گرینگتربوون. ئاژەڵەکان لەو گەشتەدا وەک مرۆڤەکان دەردەسەرییان چەشتبوو، هەر هێلکەیەک و هەر بێچووە ئاژەڵێکی تازە مایەی ئاهەنگگێران بوو. تۆوی چەند دانەوێڵەیەکم ئامادە کردبوو تا لە وەرزی بەهار لەو کێڵگانە بیانچێنم کە ئەندازیاری بیناسازی، گامبوا دیاری کردبوو: گەنم، سەوزە، تا دەگاتە تۆوی گوڵ، چونکە ناکرێ بەبێ گوڵ بژیت؛ ئاخر ئەو ڕووەکە تاکە شتێکی جوانبوو لەو ژیانە ناخۆشەی ئێمە. هەوڵم دا لە کشتوکاڵ لاسایی هندییەکانی ئەو دۆڵە بکەمەوە، چونکە بێگومان ئەوان لە ئێمە چاکتر خاکەکەیان دەناسی.

باسی گەنمی هندییەکانم نەکرد کە ئەگەر بە دەستمان نەکەوتبایە نەماندەتوانی لەوێ جێنشین ببین. ئەو دانەوێڵانە بەبێ کێڵانی زەوی دەچێندرێن. هەر ئەوەندە بەسە بە بەردێکی سەر تیژ لقی دارەکانی تەنیشتی ببڕیتەوە تا گەرمایی تیشکی خۆری بگاتێ؛ بە بەردی سەرتیژەوە وردە کونیان لە زەوی دەکرد ئەگەر پیشەقانیان نەبایە و تۆوەکانیان دەخستە کونەکانەوە، پاشان سەربەخۆی شین دەبوو. دەکرێ کلکی گەنمە شامییە پێگەیشتووەکە بە درێژاییی چەند حەفتەیەک بەسەر ڕووەکەکەوە بمێنێتەوە بێ ئەوەی بۆگەنی بێت، لە قەدی ڕووەکەکە دێتە دەر و شەقی ناکات. چاندنی ڕووەکی گەنمەشامی زۆر ئاسانە و بەرهەمەکەشی زۆرە لەبەر ئەوە هیندییەکان کردوویانە بە خواردنی سەرەکی خۆیان - هەروەها ئیسپانییەکانیش - لە سەراپای جیهانی تازە.

بالدیبیا و مۆنرۆی بە هەواڵێکی خۆش گەڕانەوە کە گوایە هەوڵە دیبلۆماسییەکانیان سەرکەوتوو بووە و بیتاکۆرا دێتە سەردانیان. دۆن بێنیتۆ وریای کردنەوە کە "کۆراکا"، واتە سەکردەکەیان، غەدری لە ماگرۆ کرد، جا وا پێویست دەکات کە ئامادە بین بۆ هەر فێڵێکی چەپەڵ. بەڵام وریاکردنەوەکەی لە وورەی پیاوەکانی نەهێنایە خوارێ، چونکە ئێمە لەو هەموو شەڕوشۆڕ و

کـوشـتـاره بێـزار بووبووین. خـووده و زریێی پیـاوەکـان بریقـەی دەدایەوە، گۆڕەپانەکەمـان بە ئاڵا ڕازاندبووەوە، ئەسپەکانمان لە بـازنەیەکدا دابەش کرد، ئاخر هیندیەکانی زۆر هەناسەسـارد دەکرد، ئامێرێکی زۆری مۆسـیقـامـان ئامـاده کرد. بۆ وەرگرتنی ئامادەباشی، بالدیبیا فـەرمـانی دا کە تفەنگەکان سـوارین و کێرۆگا و لەگەڵ کۆمـەڵێک سـەربـازی تر لە دەوروبەرەکەدا خۆیان شـاردبووەوە و ئامـادەسـاز بـوون بۆ هـەر حـاڵەتێکی نائاسـایـی. بیـتاکۆرا سێ سـەعـات لـە دوای وادەکـەی ئامـادەبـوو و بە پێی ڕێـوڕەسـمـی ئینکایی، وەک ئەوەی سـیـسـیلیـا بۆی ڕوونکردینەوە. بە پەڕامـووچـەی ڕەنگاوڕەنگ خـۆی ڕازاندبووەوە و تەورێکی بچـووکی زیوینی بە دەسـت هەڵگرتبـوو کـە ئەوەش ڕەمزی سـەرکردەیە. لەسـەر ڕێوشـوێنی خـانەدانەکـانـی پێرۆ، خـانـەوادەکـەی خۆی و هـەندێک لە کەسایەتییەکانی نزیکی خۆی لە دەوری دابوون. هـەموویان بەبێ چەک هـاتبـوون. بە زمـانـی کـیـچـوایـی گـوتارێکـی دا، پێدرۆش بە زمـانـی ئیسـپـانی بە نیـو سـەعـات مـەراییکردن وەڵامی دایەوە. کـۆراکـا هـەندێ پارچە زێڕی بـە دیاری دایـێ و گـوتی ئەو زێڕە لـە پێـرۆوە هـاتووە. هـەروەهـا چـەند شـتێکی بچـووکی لە زیو دروسـتکراوی لەگـەڵ عـەبایەک کـە لە لـوای ئاژەڵی ئەلبـەکە دروسـتکرابوو، پێشـکێشـی کرد و چەند پیاوێکیشـی خسـتە خزمـەتی پێـدرۆ تا لە دروسـتکردنی شـارەکە یارمـەتیـمـان بدەن. لـە بەرامـبـەر ئەوەدا، پێدرۆ هـەندێ دیـاری سـادەی پێشـکێشـی کـرد کـە لە ئیسـپـانیـاوە هێنرابوون لەگەڵ چەندان شـەپقـە کە هندییەکان زۆر کەیفیان پێی دەهات. منیش بە ڕۆڵی خـۆم لەگـەڵ خـۆراکێکـی زۆر و بـادەی سـەبـار و مـەوادیم لـە پێشـیـان دانا، کـە ئەوەی دووەمـیـان زۆر بـە هێـزە و بـە هـۆی ترشـانـدنـی گـەنمەشـامـی دروست دەکرێت.

دی مۆنرۆی بە ناوی هـەمـوو پیاوەکانەوە کە جگە لە زێڕ هیچ شـتێکی تریان لەکن گرینگ نەبوو، پرسـی: ئایا لەو ناوچەیە زێڕ هـەیە؟

بیـتـاکـۆرا وەڵامی دایەوە: ئێـرە زێڕی لێ نیـیـە، وەلێ لە ناو شـاخـەکـاندا کانگەی زیو هـەیە.

ئەو هەواڵە حەماسەتی سەربازەکانی وورووژاند، بەڵام بالدیبیا دڵی پێ توند بوو. لەو شەوەدا، لە کاتێک ئەوانی تر پرۆژەیان لە بارەی ئەو زێڕە دادەنا کە هێشتا نەبووبوونە خاوەنی، کەچی بالدیبیا خەم و پەژارە دای گرتبوو. ئێمە چونکە هێشتا دیواری حەوشە و سەقفی خانووەکەمان دروست نەکردبوو، بۆیە لە پەناگەکەی خۆمان، لەو چادرەی کە بێسارۆ پێشکێشی کردبووم دەژیاین نیوەڕۆیان خۆم لە ئاوی ساردی حەزە دارینەکە نقوم دەکرد تا تۆزێ لە گەرمای بە جۆشی ڕۆژێ فێنک ببمەوە.

– مەسەلەی ئەو زیوە چەند جێی داخە ئێنیس! من پێم باشتر بوو شیلی وەک باسیان دەکرد، وڵاتێکی نەدار بووایە. کە هاتم حەزم دەکرد بناخەی ژیانێک دامەزرێنم کە گەلەکەی حەزی لە کار و چاکەخوازی بکردایە و نامەوێ بە سەروەت و سامانی ئاسان و زۆر تووشی گەندەڵی ببن.

– ئەی پێدرۆ، پێویستە یەکەم جار لەو کانگەیە دڵنیا بیت کە داخوا بوونی هەیە یان نا.

– بە هیوای ئەوەم بوونی نەبێت، وەلێ هەرگیز ناتوانرێ پێش لە چوونی پیاوەکان بگریت کە بە دوایدا دەگەڕێن.

ئەمە بوو کە ڕووی دا، هەر ڕۆژی دواتر چەند دەستەیەکیان ڕێکخست تا بە دوای ئەو کانگە نەفرەتییەدا بگەڕێن، ئەوەش دروست بۆ دوژمنەکانمان بارێکی گونجاوی دەڕەخساند: ببینە چەند دەستەیەکی بچووک بچووک.

***

سەرکردەی گشتی یەکەم ئەنجوومەنی شارەوانی دەستنیشان کرد و دڵسۆزترین هاوڕێکانی لێ دامەزراند، پاشان خۆی ئامادەکرد، لەگەڵ ئەو هندییانەی کە کاریان تێدا دەکرد، بۆ دابەشکردنی شەست پارچە زەوی تر بە سەر ئازاترین پیاوانی هەڵمەتەکە. من پێم وابوو کە ئەو هەنگاوە پەلەکردنێکی تێدایە، چونکە هێشتا هندییەکان بەتەواوی نەبووبوونە موڵکی ئێمە، بە تایبەتی کە تا ئەوکاتەش نەماندەزانی ڕووبەری شیلی چەندە و چ سامانێکی

تێدایە، بەڵام هەمیشە ئەو شتانە ڕوو دەدەن: ئالایەک دەچەقێنرێ و لەسەر کاغەز موڵکەکان بەم و بەو دەدەن، پاشان کێشەی گۆڕینی نووسینەکە بە موڵک دێتە گۆڕێ؛ جا لە پێناوی ئەوەدا پێویستە زەوی و زارەکان لە خەڵکە ڕەسەنەکە زەوت بکرێت و سەرەڕای ئەوەش ناچار بکرێن لە بەرژەوەندی گەورە تازەکانیان کاری تێدا بکەن. من وا هەستم کرد کە ڕێزێکی زۆرم لێ گیراوە، چونکە پێدرۆ لە پێشەوەی ئەفسەرەکانی دانام و گەورەترین پارچە زەوی بە هندییەکانەوە دابوومێ و کەوتنە ژێر چاوەدێری من. بیانووشی ئەوەبوو کە من تووشی هەڵوێستی زۆر ناخۆش بوومە و وەک ئازاترین سەرباز ڕووبەڕووی مەترسییەکان بوویمەوە و لە زۆر بۆنەدا ڕزگارم کردوونە: خۆ ئەگەر ئەو کارە قورسانە بۆ پیاو زەحمەت بن ئەوا بۆ ژنێکی بێدەسەڵات زەحمەتریشن. بێگومان من هیچ خاڵێکی لاوازم نەبوو، وەلێ کەس بە دەنگی بەرزەوە دژی ئەو بڕیارانە نەوەستا. بەڵام سانچۆ دیلا ئۆس ئەوەی قۆستەوە تا ئاگری ڕق و کینە لە نێو یاخیبووەکان بجۆشێنێ. بیرم کردەوە کە ئەگەر ئەو کێڵگە خەیاڵییانە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببنە ڕاستی، ئەوا منی بەرگدرووی ئیستریمادۆری دەبمە یەکێک لە گەورەترین خاوەن موڵکەکان لە شیلی، ئایا دایکم بەم هەواڵە چەند دڵخۆش دەبێت!

لە مانگەکانی داهاتوودا ئەو شارە دەتگوت موعجیزەیە لەسەر زەوی بەرز بووەتەوە. لە کۆتاییی هاویندا ژمارەیەکی زۆر لە خانووبەرەی دیمەن جوان ئەو شارەیان ڕازاندەوە. لە لێواری شەقامەکاندا دار و درەختێکی زۆرمان چاند تا سێبەر و چۆلەکەشمان هەبێت. خەڵک لە باخچەکانیان یەکەمین بەرهەمی سەوزەیان دەچنییەوە، ماڵاتەکانیشمان لەشساغ و بە خوڵق دیاربوون، سەرەڕای ئەوانەش خۆراکێکی زۆرمان بۆ زستان دابین کردبوو. ئەو پێشکەوتنە تووڕەیی هندییەکانی ئەوێی وروژاند و پێکەوتن کە ئێمە تەنیا ڕێبوارێک نینە و لەوێ دەمێنینەوە. باوەڕیان وابوو کە هێشتا هوەینکای - واتە ئیسپانی - زیاتر دێن و بە زەبری هێز زەوییەکانیان لە بەرەدست دەردێنن و دەیانکەنە کۆیلەی خۆیان. ئەوان لەو لێکدانەوەیە لەسەر هەق بوون،

بۆیە لەو کاتەی کە ئێمە خەریکی خۆڕێکخستن و گیرسانەوە بووین، ئەوان بۆ دەرکردنمان خۆیان ئامادە دەکرد. ئەوان نەدەبینران، وەلێ گوێمان لە بانگەوازی بێلۆیی خەمگین دەبوو، کە نایەک بوو لە ئێسقانی دوژمنانیان دروستیان دەکرد. جەنگاوەرەکانیان هەوڵیان دەدا خۆیان لە ئێمە بپارێزن؛ جگە لە پیر و ژن و منداڵ، کەسیان بۆ سانتیاگۆ نەدەهاتن، بەڵام ئێمە هەمیشە بە وریایی ماینەوە. بە پێی قسەکانی دۆن بێنیتۆ. سەردانەکەی ڤیتاکۆرا بۆ ئەو مەبستە بووە تا لە توانا‌داری سەربازیمان بگات، گومانیشی تێدا نەبوو کە ئەو کۆراکایە "سەرکردەیە" زۆر سەخڵەت نەبووە، هەرچەندە وەک شانۆگەرییەک خۆمان نیشانی دابوو لە سەردانەکەی. هەروەها پێدەچێت لە گەڕانەوەیدا زۆر پێمان پێکەنیبێت، چونکە هێزەکەی ئێمە لەچاو ئەو هەزاران شیلییە ڕەسەنەی کە لە دارستانەکەی تەنیشتمانەوە چاوەدێرییان دەکردین، زۆر کەمبوو. ئەو سەرکردەیە لە نەوەی خێڵی کیچوا بوو کە لە پێرۆ دەژیان و لێرە نوێنەرایتی ئینکا دەکات، بیری لە خۆتێکەڵکردن لە شەڕی نێوان هوەینکا و خێڵەکانی برۆماوکا نەدەکردەوە لە شیلی. بە پێی لێکدانەوە دیاربوو ئەگەر شەڕ لە نێواندا داگیرسێت، ئەوا لە قازانجی ئەودایە، چونکە هەر وەک لە بلاسینشیا دەڵێن: ئاوی شێلو بە سوودی ڕاوکەرە.

من و کاتالینا بۆ بازاڕکردن دەچووینە شوێنەکانی دەوروبەرمان و خۆمان لەو تیروتوانجانە دەپاراست کە بە زمانی کیچوا تێیان دەگرتین، ئیتر بەوجۆرە لە بەرامبەر چەند شتێکی هەرزان کە لە بنی سەندووقەکەم دەرم دەهێنا، یان لە بەرامبەر خزمەتی چارەسەری نەخۆشەکانیان، پەلەوەڕ و ماڵاتی واناکۆمان پەیدادەکرد. ئەو ماڵاتە ئاژەڵێکە بە لاما دەچێت و خورییەکی زۆر باشی هەیە. ئێمە لە گرتنەوەی شکانی ئێسک و داخ کردنی برین و مامانیدا دەستێکی پیرۆزمان هەبوو و ئەو پیشانە زۆر بەکەڵکمان دەهاتن. لە کێڵگەکانی خەڵکەکەی ئەوێدا دوو ژنەتیمارکاری ماچیم ناسی و لەگەڵ کاتالینا هەندێ گیا و دەستەواژەی سیحری جۆراوجۆرمان لەگەڵیان گۆڕییەوە لەوانەی کە لە پێرۆ باون.

پزیشکەکـانـی تری ئەو دۆڵە جـادووگــەر بوون و بە هـاتوهاوارێکی زۆرەوە کرمیان لە زگی نەخۆشەکان دەردەهێنا؛ قوربانیی بچووکیان پێشکێش دەکرد و بە تەقسـە هێمادارەکانیـان خـەڵکەکەیان دەترسـاند کە ئـەمەش شـێوازێکە، ڕەنگە هـەندێ جار ئـەنجامـێکی باشـی لێ بکەوێتەوە، هـەروەک چۆن ئەوەیانم بە چاوی خـۆم بینیوە. ئاخـر کاتالینا وەخـتێ لە کۆسکۆ بوو لەگەڵ یەکێک لەوانە بە شـێوازە بێنیـتۆیان چارەسـەردەکرد پاش ئەوەی ڕێگەچارەکانی تر دادیان نەدا. ئەو وەخـتە لەگەڵ دوو کارەکەری بێدەنگی نێومـاڵی سـیسـیلیا ئەو پیـاوە پیرەمـان زۆر بە نـهێنی بردە دارسـتانەکە و کـاتالیناش کەشە سـیحـراوییـەکەی بۆ کـرد. بە شــەرابێکی لە گـیـا دروسـتکراو بێـهـۆشـی کـرد و بـە دووکـەڵیش قانگیدا، پاشـان برینـی ڕانی شێلا کە هێشتا تەواو یەکتری نەگرتبووەوە. دۆن بێنیـتۆ تا لە ژیاندا بوو ئەوەی دەگێڕایەوە بۆ هـەرکەسـێک حـەزبکردایە گـوێی لێ بگرێت کــە چۆن بـە چاوی خــۆی بینیــبــووی کــرم و مــار لـە برینـەکــەی دێنەدەرێ، پاش ئەوەی قاچیـان ژەهراوی کـردبوو و دوای ئەوە چۆن بە تەواوی چاک بووبووەوە. ڕاسـتـە ئێـسـتـا شـەلەیە، وەلێ خـۆ نەمـرد، وەک دەترسـاین بە هۆی بۆگەنیبـوونی برینەکەی بمرێت. بە پێویستم نەزانـی پێی بڵێم کە کاتالینا ئەو خشۆکە مردووانەی لە ناو قۆڵی خۆی شاردبووەوە.

سیسیلیاش گوتی: ئەگەر سیحر چاکی دەکاتەوە بڕۆن بیگەنێ.

بەڵام ئەو ژنە شـازادەیـە کە پردێکی لە نێوان کولتووری ئێـمـە و کولتووری کــیـچــوا دروست کـردبوو، تۆڕێکی زانیـاری فـرەوانی بە ســوودوەرگـرتن لە کـەنیـزەکـەکانی خـۆی ڕێکخسـتـبـوو. نەک هـەر ئەوەندە بـەڵکو چووە بینینی کـۆراکا ڤـیـتـاکـۆرا. ئەو پیـاوە وەخـتێ زانی ئەو ژنە خـوشکە گـچکەی ئینکا ئەتاوالبـایە، بۆی هـاتـە سـەرچۆک و نێـوچەوانی لە خـاک دا. سـیـسـیلیـا لەوێ زانی کــە بـاری پێـرۆ زۆر شلەژاوە، تا ئـەو ڕادەیەی هـەندێ خــەبـەری وا هـەبوو باسـیان لە مردنـی بێسارۆ دەکرد. منیش بە پەلە و زۆر بە نـهێنی ئەو هـەواڵەم گەیاندە پێدرۆ.

– ئەی ئێنیس، چۆن دەزانی کە ئەو هـەواڵە ڕاستە یان نا؟

– پەیامنێرەکانی ئینکا وا دەڵێن و ناشتوانم بە تەواوی بڵێم ڕاستە، وەلێ ئامادەسازیش بۆ شتێکی وا خراپ نییە، تۆش وای نابینی؟

– کارەکە بەوە چاکە لە پێرۆ دوورین.

– بەڵێ وایە، بەڵام ئەگەر بێسارۆ مردبێت، نازناوەکەی تۆ چی بەسەردێت؟ ئاخر تۆ بە فەرمانی ئەو جێگری حاکمی.

– ئەگەر مردنی بێسارۆ ڕاست بێت، من دڵنیام کە سانچۆ دیلا ئۆس و ئەوانی تر بۆ گفتوگۆکردن لەسەر شەرعییەتی من دەگەڕێنەوە.

منیش بە پێداگرییەوە گوتم: بەڵام ئەگەر تۆ خۆت حاکم بیت کارەکە دەگۆڕێت، وا نییە؟

– بەڵام ئەی ئێنیس من حاکم نیم.

ئەو بیرۆکەیە لە هەوادا مایەوە، پێدرۆش دەیزانی کە من لێناگەڕێم کارەکان لاسارانە تێپەڕن. دۆستایەتی خۆم لەگەڵ ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا و خوان گۆمێس قۆستەوە بۆ ئەوەی ئەو بیرۆکەیە بڵاو بکەمەوە کە هیچ چارەمان نییە دەبێ پێدرۆ بکەینە حاکمی خۆمان. پاش چەند ڕۆژێکی کەم جگە لەو مەسەلەیە هیچ بابەتیکی تر لە سانتیاگۆ قسەی لەسەر نەدەکرا، هەروەک چۆن پێشبینینم دەکرد ئاوا. لەو کاتەدا یەکەم بارانی زستانە باری و ئاستی ئاوی ڕووباری مابۆچۆ بەرز بووەوە و لافاو دەستی پێ کرد و شاری سانتیاگۆ بووە یەک پارچە قوڕ و لیتە. وەلێ ئەوە نەبووە هۆی نەبەستنی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی شارەوانی کە لە یەکێ لە کوختەکان بەڕێوە دەچوو. لیتاو دەگەیشتە گۆزینگی ئەو سەرکردانەی کە بۆ دانانی پێدرۆ بە حاکمی ئەوێ، کۆبوونەوەیان دەکرد. ئەو وەختەی هاتنە ماڵێ تا بڕیارەکەیان ڕابگەیەن، پێدرۆ لەو کتوپڕییە ئەوەندە سەری سووڕمابوو بە ڕادەیەک منی ترساند. ڕەنگە لە زەینیدا ئەو سنوورەم بەزاندبێت کە بیری لێ دەکردەوە.

– ئەو موتمانەیەی کە ئێوە بە منتان داوە زۆر کاری لێ کردوومە، وەلێ ئەو بڕیارە پەلەکردنی پێوە دیارە. ئاخر هێشتا لە مردنی بێسارۆ دڵنیا نین کە

چاکـەیەکی زۆری بـە سـەرمـەوە هـەیـە و بە هیچ شـێـوەیەک ناتوانم سـنووری دەسـەڵاتەکانی ئەو ببـەزێنم. برایانی دڵسۆزم من بەداخـەوە دەیڵێم کە ناتوانم ئەو شەرەفە گەورەیە قبوڵ بکەم کە ئێوە بە منتان بەخشیوە.

هەرکـە سـەرکـردەکـان ڕۆیشـتن، یەکسـەر بۆی ڕوون کـردمـەوە کـە ئەو هەڵوێستەی وەک مـانۆڕێکی فێڵبازانە وەرگرتووە تا پارێزگاری لە خۆی بکات، چونکە لەوانە لە ئایندە بە خیانەتکردن لە بێسارۆ تۆمەتباری بکەن، بەڵام ئەم بڕوای وایە کە برادەرەکانی دووبارە هەوڵی لەگەڵ دەدەنەوە.

قسـەکـەی پێدرۆ ڕاست دەرچوو، ئەندامـانی ئەنجـوومـەنی شـارەوانی بە پەیماننامـەیەکی نووسـراوە کـە هەمـوو خـەڵکی سـانتـیاگـۆ مۆریان کـردبوو، گەڕانەوە کنی. پاساوی ئەوەیان دەهێنایەوە کە پێرۆ زۆر دوورە و ئیسپانیاش هێشتا دوورتر، دەیانگوت: ئێمە هیچ شێوازێکی پەیوەندی و بەیەکگەیشتنمان لەگەڵیان نییە و لەوسەری جیهان بەتەنیا دابڕاوین، بۆیە لە پێدرۆ دی بالدیبیا دەپاڕێینەوە کە داواکـەمـان قـبوڵ بکات ببێتە حـاکـمـمـان، جـا ئەگـەر بێسـارۆ مردووبێت یان زیندوو، هەر ئەوەیە بڕیارەکەمان.

ئەو خـەڵکە ناچار بوون سێ جاران ئەو داوایە بخەنە بەردەمی پێدرۆ تا ئەو وەختـەی بە گوێیدا چرپاندم کە چی تر ناچاری پاڕانەوەیان نەکات، چونکە دوور نییـە ئەگـەر هاوڕێکانی تەواو لێی بێ ئومـێد ببن، یەکـێکی تر بە حـاکم هەڵبژێرن؛ بە تایبەتی کە ژمـارەیەک لە سەرکردەی ڕێزدار هەنە و حەز دەکەن ئەو پلەیە وەرگرن، هەروەک ئەو قسـەڵۆکانەی کـە ژنە هندییـەکـان لەو بارەیەوە بۆیان دەگێڕامـەوە. ئیـتر ئەو کاتە پێدرۆ پلەی حـاکمـایەتی قـبوڵ کرد. ئاخـر لەبەرئەوەی خـەڵک بە گشـتی ئەو داوایە دەکات، نابێ ئەویش قـبوڵی نەکات. هـەروەها چـونکـە دەنگی تێکڕای خـــەڵک دەنگی خـــوایە، بۆیـە ئـەویش بـە کەساسییەوە گوێڕایەڵی ڕای گشتی دەبێت، تا پایەداریان بە باشترین شێوە بە خـزمـەتکردن هەڵسێ. ئەو بەڵگەنامـە گـونجـاوە خـرایە ڕوو کـە ئـەویان لە هـەمـوو تۆمـەتێک پاراسـتبوو بۆ ئاینده. ئابەوجـۆرە یەکـەم حـاکمی شیلی بە بڕیاری خەڵک دانرا، نەک بە بڕیارێکی شاهانە. پێدرۆ فەرمانی دا کە مۆنرۆی

ببیتە جێگری، منیش بە تەواوی بوومە حاکمەژن، چونکە ئەو پلەیە خەڵک بە درێژاییی چل ساڵ بە منیان بەخشیبوو. ئەو نازناوە لە باری واقیعی ژیان، بە واتای بەرپرسیارێتییەک دەهات کە کە لایەنی بارگرانی زۆرتر بوو لە ڕێزلێنان. من بوومە دایکی گەلە بچووکەکەمان و دەبوایە بۆ بەختەوەری هەر تاکێکیان شەونخوونی بکەم، لە پێدرۆوە بگرە تا دەگاتە دوا مریشکی ناو کۆلیتەکان. من هیچ ئیستراحەتم نەدەکرد و بە دوای وردەردەکارییەکانی ژیاندا دەچووم: خۆراک، جلوبەرگ، تۆو، ماڵاتەکان. بەڵام کارەکە بەوە چاکبوو کە من تەنیا پێویستیم بە سێ چوار سەعات نووستن هەبوو، واتە من لە هەمووان زێتر بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانم کاتم بە دەستەوەبوو. هەوڵم دا هەموو سەرباز و هندییە هاریکارەکان بە ناوی خۆیان بیانناسم و پێم گوتن کە هەمیشە دەرگەم کراوەیە بۆ پێشوازی و گوێگرتن لە داخوازییەکانیان. هەروەها بۆ نەهێشتنی سزادانی لە ڕادەبەدەر ئەرکم دەکێشا، بەتایبەتی سزادانی هندییەکان. پێدرۆش بەرلەوەی هەر حوکمێک بدات، پرسی پێ دەکردم و گوێی لە ڕاکانم دەگرت. وا دەزانم زۆربەی سەربازەکان لەو ماوەیەدا لەسەر ڕووداوە تراژیدییەکەی ئیسکۆبار لێیان بووردم و وایان لێ هات ڕێزیان بۆ دادەنام. ئاخر من برینی زۆربەیانم چارەسەرکردبوو و لە گرانەتا ڕزگارم کردبوون و لەسەر خوانەکەی خۆم خواردنم دابوونێ و لە دروستکردنی خانووش یارمەتیم دابوون.

دەرکەوت کە هەواڵی مردنی بێسارۆ ڕاست نەبووە، بەڵکو هەر پێشبینی بووە. لەو کاتەدا هێمنی باڵی بە سەر پێرۆدا کێشابوو، وەلێ مانگێک دوای ئەوە، کۆمەڵێک لە سەربازە کۆنەکانی هەڵمەتەکەی ماگرۆ، کۆشکی حاکمیان گرتبوو و بە چەقۆ کوشتبوویان. هەردوو خزمەتکارەکەی ویستیان بەرگری لێ بکەن، بەڵام هاوڕێ و پاسەوانەکانی لە تەلارەکە هەڵاتبوون. خەڵکی شاری شاهان هیچ داخێکیان بۆ ئەو ڕووداوە نەدەخوارد، چونکە کاسەیان لە ڕقی برایانی بێسارۆ لێی دەڕژایەوە. لە دوای کەمتر لە دوو سەعات کوڕی دیێگۆ ماگرۆیان بە حاکم دانا، کە ئەویش گەنجێکی کەم ئەزموون بوو و ڕۆژی پێش

ئەو ڕووداوە نرخی ئەو خـواردنەی نەبـوو کـە دەیخـوارد کـەچی لە شــەو و ڕۆژێکدا بووە ڕێزدارێکی ئەفسانەیی ئیمپراتۆریەت. لە دوای چەند مـانگێک، وەخـتێ لە شـیلی لەو هـەواڵە دڵنیـا بووین، بالدیبـیـا دەسـەڵاتی خـۆی وەک حاکمێک جێگیر کـردبوو. کە هەواڵەکـەشی بیست، بـە ترسـەوە بە گـوێمدا چرپاندی: ئەی ئێنیس، بەڕاستی تۆ سیحربازی.

***

لە وەرزی زستاندا ڕەفتاری دوژمنکارانەی هندییەکانی ئەو دۆڵە بە ئاشکرا دیاربوو. پێدرۆ فـەرمانی دا کـە کەس بەبێ هۆیەکی پێویست و بێ پاسـەوان لە شــار نەچێـتـە دەرێ. ئیـتـر لەو ڕۆژەوە نەمـتـوانی سـەردانی ئـەو دوو ژنە تیـمـارکـارە و بازاڕەکە بکەم، وەلێ وا بزانم کـاتالینا پەیوەندی خـۆی لەگـەڵ گوندە هندییـەکان نەپچڕی، چونکە دیارنەمـانی شـەوانەی هـەر بەردەوام بوو. سیسیلیاش بە ڕۆڵی خـۆی ئاشکرای کرد کە میشیمـالۆنکۆ ئامـادەسـازە بۆ ئەوەی هـێـرشـمـان بکاتە سـەر، بە جـەنگاوەرەکـانیـشی ڕاسـپـاردووە کـە ئەسـپەکانمان ببەن و ژنەکـانی سـانتیـاگۆش بە دیل ببـەن. هێزەکـەی هـەتا دەهات زۆر دەبوو و شـەش سـەرۆک خـێـڵی هـەبوون کـە بە پیاوەکـانیـانەوە لە یەکێ لە قـەڵاکانی جێگیر بووبوون و چاوەڕێی سـاتی دەسـتپێکردنی شـەڕیان دەکرد.

پێدرۆ لە دەمی سیسیلیاوە ڕاستەوخۆ ئەو وردەکارییانەی گوێدایێ و لەگەڵ ئەفسـەرەکانی تاوتوێی کـردن و بڕیاری دا کـە دەستپێشـخەرییەکە لەمـانەوە بێت. زۆربـەی سـەربازەکـانی بـۆ پارێزگـاری سـانتیـاگـۆ هێشتـەوە و لەگـەڵ ئەڵدێرێتی و کێرۆگـا و کـۆمـەڵێک لـە سـەربازە ئازاکان بـۆ ڕووبەڕووبوونەوەی میشیمالۆنکۆ دەرچوون لە ماڵی خۆی. قەڵاکە بریتیبوو لە بینایەک کە لە قوڕ و بەرد و دار دروست کـرابوو و پەرژینێکی هـەبوو کـە لە قـەدی دار چاکـرابوو و پێیــەوە دیاربوو کـە بە پەلەپەل بۆ ئـەرکێکی کـاتی دروسـت کراوە. سـەرەڕای ئەوەش شـوێنەکـەی واڵا و دەست بەسـەراگـرتنی زۆر ئاسـان بـوو و بەرگـری لێکردنـی زەحـمـەت بوو، بە جـۆرێک سـەربازەکـانمان بە مـاندووبوونێکی کـەم

توانیان شەوێ بگەنە نێزیکی و ئاگری تێ بەردەن، لە دەرەوەش چاوەڕێی دەرچوونی جەنگاوەرەکانیان دەکرد کە لە دووکەڵدا خنکابوون و ژمارەیەکیان لێ کوشتن. شکستخواردنی دانیشتووانە ڕەسەنەکە زۆر خێرابوو و سەربازەکانمان چەند سەرکردەیەکی ئەوانیان بە دیل گرت کە لە نێوانیاندا میشیمالۆنکۆ بوو. ئێمە ئەوانمان دیت کە بە پێیان دەیانهێنان و تووڕەیی و شوێنی لێدان بە جەستەیانەوە دیاربوو، وەلێ نەفسبەرزانە و لە تەک ئەسپەکان غاریان دەدا و هیچ ترس و ماندوویێتییان پێوە دیارنەبوو. ئەوانە پیاوی بالآکورت بوون، وەلێ ئاکاریان جوامێرانە بوو و دەست و پێیان ورد و پشت و چوارپەلیان بتەو و سینگیان بەرز بوو. قژی ڕەشیان بە تیلمێک بەستبوو و ڕوخساریان بە ڕەنگی زەرد و شین سواق دابوو.

زانیم کە تەمەنی میشیمالۆنکۆ لە حەفتای ئاوا کردووە، وەلێ کەس باوەڕی نەدەکرد ئەوەندە گەورە بێت، چونکە ددانەکانی هیچی نەکەوتبوون و حەماسەتێکی گەنجانەشی هەبوو. ئاخر هندییە مابۆچییەکان ئەگەر بە هۆی شەڕ و ڕووداوی تر نەمرن، ئەوا دەتوانن لە دوای سەد ساڵ تەمەنیش بە ژیانێکی خۆش بژیێن. ئەو پیاوانە زۆر بەهێزن، ئازا و بە هەڵمەتن، بەرگەی ترسناکترین سەرما و برسێتی و گەرمای سووتێنەر دەگرن. پێدرۆ فەرمانی دا کە سەرکردەکان لە کوختە تایبەتەکەی زیندانی دەستبەسەر بکەن؛ ئەفسەرکانیش پێشنیازیان کرد کە دەستبکەن بە ئەشکەنجەدانیان تا بزانن داخوا کانگەی زێڕ لەو ناوە هەیە یان نا، هەروەها بزانن کە ئایا کۆراکا ڤیتاکۆرا درۆی لەگەڵیان کردووە یان نا.

ئەو شەوە، لە کاتێک کە زرێ و جلە بە خوێنەکانم لە بەری دادەکەنی، بە پێدرۆم گوت: سیسیلیا دەڵێت ئەشکەنجەدانی هندییە مابۆچییەکان هیچ سوودێکی نییە، چونکە هەرگیز بە لێدان ناتوانی ناچاریان بکەیت قسان بکەن. پێشتر ئینکا زۆر جار هەوڵیان لەگەڵ داون، وەلێ نەیانتوانی بە ئەشکەنجەدان، چۆک بە ژن و منداڵکانیشیان دابدەن.

– کەواتە ئێمە تەنیا وەک بارمتە دەتوانین سوودیان لێ وەربگرین.

– پێیان گوتم کە میشیمالۆنکۆ زۆر نەفسبەرزە.

پێدرۆ وەڵامی دامەوە: ئێستا ئەو نەفسبەرزییە بە کەڵکی ئەو نایەت کە بە زنجیر کۆت کراوە.

– ئەگەر بە ئەشکەنجەدان نەیەتە قسە، ڕەنگە بەنەرمی قسان بکات. تۆ دەزانیت کە هەندێ لە پیاوان چۆنن...

ڕۆژی دواتر پێدرۆ بڕیاری دا کە خۆی تۆکی میشیمالۆنکۆ بە قسەبێنێت بە شێوەیەکی نائاسایی وا کە هیچ یەکێک لە ئەفسەرەکانی نەیانزانی چ کارێکی شەیتانانەی لە بن سەریدا هەیە. فەرمانی دا کۆت و زنجیرەکەی بکەنەوە و بردیانە خانووێکی چۆڵ و دوور لە دیلەکانی تر. سێ کچی جوانی هندیشی لە کارەکەرەکانی من تێگەیاند کە خاوێن بیشۆن و جلی نایاب و پاکی لەبەر بکەن، خواردنێکی زۆریان دایێ و بڕێکی تەواو شەرابی مۆدایان لە پێشی دانا. هەروەها بالدیبیا فەرمانی دا کە یەکێ لە پاسەوانەکانی شەرەف پاسەوانی بکات و لە نووسینگەی ئەنجوومەن پێشوازی لێ کرد کە بە ئاڵا ڕازابووەوە و خۆشی بەو ئەفسەرانە دەورەدابوو کە زرێکانیان بریقەدار و ڕیشیان ڕەنگین بوو. منیش ئەو ڕۆژە بە کراسێکی مەخمەڵی ئەرخەوانی ئامادەی ئەو کۆبوونەوەیە بووم، کە هەر ئەو تاکە کراسەم مابوو، چونکە ئەوانی ترم لە ڕێگەی باکوور فڕێ دابوون. تۆکی میشیمالۆنکۆ بە چاوێکی پڕ لە ڕێزەوە سەیری منی دەکرد، وەلێ نەمدەزانی کە ئایا ئەو ژنە دەناسێتەوە کە خۆی کردبووە پیاو و بە شمشێرەکەی ڕووبەڕووی بووبووەوە یان نا. دوو کورسی وەک یەکیان دانابوو بۆ پێدرۆ و تۆکی و وەرگێڕێکی زمانیشیان ئامادە کرد، بەڵام ئێمە دەمانزانی کە زمانی مابۆدۆنگۆ زۆر بە زەحمەت تەرجەمە دەکرێت، چونکە زمانێکی شیعرییە و لە ئانی قسەکردندا خەڵق دەکرێت؛ وشەکان تێیدا دەگۆڕین، هەڵدەڕێژرین، کۆ دەبنەوە، هەڵدەوەشێنەوە، ئەوە جولەیەکی پاککراوەیە، بۆیە نانووسرێتەوە. ئەگەر یەکێک هەوڵ بدات وشە بە وشە وەری گێڕێت، هیچ شتێکی لێ حاڵی نابیت. بالدیبیا بە ڕێز و ویقارەوە ستایشی ئازایی میشیمالۆنکۆ و جەنگاوەرەکانی کرد. تۆکی بە

هەمان ڕێزلێنانەوە وەڵامی پێدرۆی دایەوە. ئیدی پێدرۆ بە نەرمونیانییەوە ڕای کێشایە ناو گفتوگۆ، لە کاتێکدا ئەفسەرەکانی بە وەستاوی سەیریان دەکردن و تیامابوون. پیرە پیاو خۆی بەختەوەر دەبینی کە ڕووبەڕوو لەگەڵ ئەو دوژمنە بە دەسەڵاتە و یەکێک لەو ڕیشدارانە قسان دەکات کە ئیمپراتۆریەتی ئینکای شکاندووە. پاشـان وای لێ هات شـانازی بە پایە و باوان و کـولتـوور و بە ئامادەکردنی هێزەکانی و ژنەکانی خۆی دەکرد کە ژمارەیان لە بیستی ئاوا دەکرد، بەڵام ئەو لەوێ لە خانووەکەی خۆی دەتوانێ زیاتریشیان بکات، کە لە نێویاندا ژنێکی ئیسپانییبوو بە ناوی سنیۆرا.

بالدیبیا پێی گوت کە ئەتاوالبا یەک ژووری پڕ لە زێڕی وەک ڕزگارانە پێی دابوو. هەروەها گـوتـی کـە هەرچەندە پێگەی دیل بەرزبێت، ئەوندەش ڕزگارانەکەی زۆر دەبێت. میشیمالۆنکۆ ماوەیەک لە هزری خۆی ڕاچوو بێ ئەوەی کەس بیرکردنەوەکەی پێ ببڕێت. من وا دەزانم ئەو لە بیری خۆی لەوەی دەپرسی کە ئاخۆ لەبەر چ هۆیەک ئەوانە سەرسامی ئەو کانزایە بوونە کە جگە لە دەردەسەری هیچ خێر و خۆشییەکی بۆ خۆی و گەلەکەشی نەهێناوە، چونکە ساڵانێکی زۆریش ئەو کانزایەیان بە سەرانە دەدایە ئینکا. وا ئێستاش دەتوانێ بۆ سوودی خۆی لە بەرامبەر ئازادبوونی بەکاری بێنێت. ئەگەر ئەتاوالبا ژوورێکی پڕ لە زێڕی کردووەتە فیدای خۆی، ئەوا نابێت ئەم کەمتر بدات. هەستایەوە سەرپێ و وەک تاوەر لە شوێنی خۆی وەستا، دەستێکی لە سینگی خۆی دا و بە دەنگێکی بەرز ڕای گەیاند کە ئامادەیە لە بەرامبەر ئازادبوونی تاکە کانگا زێڕەکەی بداتە هوەینکا، واتە ئیسپانییەکان. ئەو کانگایەی شۆشتنەوەی زێڕە پێیان دەگوت: مارگا - مارگا، سەرەڕای ئەوەش هەزار و پێنج سەد کەسی لە پیاوەکانی خۆی دانێ تا لەو کانگەیە کاریان پێ بکەن.

زێڕ! شادی سەراپای شاری گرتەوە. ئا ئەوەتا جەربەزەیی داگیرکردنی شیلی کە دواجار لە نەزەری پیاوان مانایەکی بەخشی. پێدرۆ لەگەڵ دەستەیەک سەربازی پڕچەک، میشیمالۆنکۆیان بە سواری ئەسپێک کە

پێشکێشی کردبوو، بردیان. بارانی سەربەکڵاوە دەباری و ئەوانیش بە دەم ئاو لێچۆڕانەوە و لەرزینەوە دەڕۆیشتن، وەلێ ورەیان گەلێک بەرز بوو. لەو کاتەدا دەنگی ناڕەزایی و تووڕەیی تۆکییەکانی ترت لە سانتیاگۆ گوێ لێ دەبوو کە میشیمالۆنکۆ خیانەتی لێ کردوون، لە کاتێک ئەوان هەروا بە کۆت و زنجیرەوە لە ئەستووندەکان گرێدراون. ئەو ترۆتۆکایانەی - ئەو نایانەی کە لە قەمیشی درێژ دروست کرابوون - لە دارستانەوە ئەو نەفرەتانەی دەچڕی کە سەرۆک خێڵەکان بە زمانی مابۆدۆنگۆ لە میشیمالۆنکۆیان دەکرد.

میشیمالۆنکۆی لە خۆڕازی، دەستە ئیسپانییەکەی بە ناو شاخەکاندا بردە ئەو شوێنەی کە ڕووبارەکە لە دەریای دەکردەوە و نزیکەی سی فەرسەخ لە سانتیاگۆوە دووربوو. لەوێوە چوونە سەر گۆمێک کە زێڕشۆرەکانی لێ دامەزرابوو و ساڵانێکی درێژبوو ئەو گەلە هەژارە تەنیا لە پێناوی تێرکردنی چاوچنۆکی ئینکا بەکاریان دەهێنان. بە پێی ڕیککەوتنەکە هەزار و پێنج سەد کەسی لە ڕۆڵەکانی خۆی خستە بەردەستی بالدیبیا کە دەرکەوت لە نیوە زیاتریان ژنن. کەس نەبوو لەمە ناڕەزایی دەربڕێت، چونکە لە نێو دانیشتووانی ڕەسەنی شیلی ژنەکانن کار دەکەن، بەڵام پیاوەکانیان تەنیا گوتار دەدەن و ئەو ئەرکانە جێبەجێ دەکەن کە پێویستی بە تاقەت هەیە، وەک جەنگ، مەلەوانی، یاری تۆپێن. ئەو پیاوانەی میشیمالۆنکۆ هەڵی بژاردن زۆر گێل بوون، بە ڕۆژ لە ناو ئاودا بە کاوەخۆ تۆڕێکیان هەڵدەگرت و لمەکەیان تێدا دەشووشتەوە، ئیتر هەقیان بەسەر هیچەوە نەبوو، وەلێ بالدیبیا وای بینی کە قامچی چاودێرە زنجییەکان وایان لێ دەکات کە بە گوڕتر کار بکەن. من ساڵانێکی زۆرە لە شیلیم و دەزانم هیچ سوودێک لە بەکۆیلەکردنی مابۆچییەکاندا نییە، چونکە ئەو کاتە یان دەمرن یاخۆ ڕادەکەن. لەبەرئەوەی ئەوان کۆیلە نینە و هیچ شتێکیش لە بارەی کارەوە تێ ناگەن، لەوەش کەمتر لە مەبەستی شۆرینی زێڕ لە ناو ڕووبار و پێدانی بە ئیسپانییەکان ناگەن. ئەوان لەسەر ڕاوکردنی ماسی و گیانەوەری کێوی و هەندێ بەرووبوومی وەک سنۆبەر و کشتوکاڵ و گیانەوەری ماڵی دەژیان. هەر ئەوەندەیان هەیە کە

پێیان هەڵدەگیرێ، جا چ شتێک وایان لێ دەکات بۆ قامچی چاودێرەکانی کار ملیان کەچکەن؟ ئایا ئەوە ترسە؟ ئەوان نایناسن. ئەوان بەر لە هەرشتێک ڕێزیان بۆ ئازایی هەیە، دوای ئەوە بۆ گۆڕینەوە: تۆ بمدەرێ و منیش پێت دەدەم، بە یەکسانی. ئەوان نە زیندانییان هەیە و نە فەرمانبەری دادوەری و نە هیچ یاسایەک، بەڵکو تەنیا یاسای سروشتییان هەیە؛ تەنانەت سزادانیش لە لای ئەوانە سروشتییە، ئەگەر یەکێک کارێکی زیانبەخش بکات ئەوا خۆی تووشی ئەو زیانە دەکاتەوە کە خۆی ئەنجامی داوە. لە سروشتدا ژیان بەو جۆرەیە و ناکرێ لە نێو بەشەرەکاندا جیاواز بێت. ئەوان ئەوە چل ساڵە شەڕی ئێمە دەکەن و فێری ئەشکەنجەدان و دزی و درۆ و تەڵەدانانەوە بوونە؛ بەڵام بۆیان گێڕامەوە کە ئەوان لە نێو خۆیاندا بە ئاشتەوایی دەژین. ژنەکانیان ئەو تۆڕە پەیوەندییە دەپارێزن کە لە نێو خێڵەکاندا هەیە، بەوانەشەوە کە سەدان فەرسەخ لێیانەوە دوورن. زۆر جاران بەر لە هەڵگیرسانی شەڕ سەردانی یەکتری دەکەن، جا لەبەرئەوەی مەودای نێوانیان زۆر دوورە، بۆیە سەردانەکەیان چەند حەفتەیەک دەخایەنێ و دەبێتە هۆی بتەوکردن و دەوڵەمەندکردنی زمانی مابۆدۆنگۆ و چیرۆکی بەسەرهاتەکان و سەما و خواردنەوە و ژن و ژنخوازی تازە. هەموو ساڵێک جارێک لە جەژنی "نەگەییاتۆن" خێڵەکان گشتیان کۆدەبنەوە تا بۆ گەورەی مرۆڤەکان "نگینیچین" و ڕێزلێنانی زەوی، خوای خێروبەرەکەت، خاکی بە پیت و بەرەکەت و دایکی مابۆچییەکان بپارێنەوە. ئەوان پێیان وایە کە شوورەییە هەموو یەکشەممان خوای هەراسان بکەیت، هەروەک ئەوەی ئێمە دەیکەین؛ ساڵێ جارێک زۆریشە. سەرکردەکانیشیان کە پێیان دەگوتن "تۆکی" دەسەڵاتێکی سنوورداریان هەیە، چونکە ناچارنینە بە گوێی بکەن و بەرپرسیارێتیشیان لە دەستکەوتەکانیان زێترە.

ئەڵۆنسۆ دی ئێرسیا ئی زۆنیکا باسی ئەو شێوازە دەکات کە "تۆکی" پێ هەڵدەبژێرن:

نە پێگەی کەسێتی و نە میرات،

نە ناوبانگ و نە زەنگێنی بۆ ماوە؛
بەڵکو ئەوە هێزی بازوو و خۆناسینە،
کە پیاوی لێهاتوو پەسند دەکەن،
ئەوانەن کە بەهای هەرکەسێک دیار دەکەن،
پێدەگەیەنن، ساف دەکەن و بەرزی دەکەنەوە.

ئەو کاتەی کە چووینە شیلی هیچمان لە بارەی گەلی مابۆچی نەدەزانی، وامان دەزانی بە ئاسانی دەستەمۆیان دەکەین، وەک ئەوەی لەگەڵ گەلانی لەوان پێشکەوتووتر کردبوومان، وەک ئەزتێک و ئینکا. چەندان ساڵ بە خۆماندا هاتینەوە تا درک بکەین کە چەند هەڵەبووین. نەماندەتوانی پێشبینی کۆتاییی ئەو شەڕە بکەین، چونکە ئەگەر تۆکیمان لە سێدارە بدایە، یەکسەر یەکێکی تر جێگەی دەگرتەوە، هەروەها ئەگەر هۆزێکمان لەناوببردایە، ئەوا لە ناو دارستانەکەوە هۆزێکی تر دەهاتنەوە مەیدان. ئێمە دەمانویست شار دروست بکەین و پێشکەوتن بەرهەم بێنین و بە ئاسوودەیی بەرقەرارکەین، کەچی ئەوانە جگە لە سەربەستی شتێکی تریان نەدەویست.

پێدرۆ چەند حەفتەیەک نەهاتەوە، چونکە سەرەڕای ڕێکخستنی کاری کانگەکە، بڕیاری دا کەشتییەکی چارۆکەداریش دروست بکەن تا پەیوەندی بە پێرۆوە بکەن – چونکە هەر وەک فرانسیسکۆ دی ئەگێری بە ئاشکرا دەیگوت – ناتوانین بە دابڕاوی و بێ هاوڕێ لە دواوەی جیهان بمێنینەوە و تەنیا خەریکی دڕندە ڕووتەکان بین. کەنداوێکی زۆر گونجاوی دۆزییەوە کە پێی دەڵێن کەنداوی کۆنکۆن، کەنارێکی کراوەی هەبوو و بە لمی خاوێن داپۆشرابوو و دارستانێکیش گەمارۆی دابوو کە دارەکانی ساغ و بتەبوون و بەرگەی ئاویان دەگرت. ئەو شوێنەی بۆ بارەگای تاکە پیاوێکی خۆی دانا کە هەندێ زانیاری بێ سەروبەری لە بارەی کاروباری دەریاوە هەبوو، بەڵام کۆمەڵێک سەرباز و ژمارەیەک لە زنجییە چاودێرەکانی کار و هندییە هاریکارەکان یارمەتییان دەدا، سەرەڕای ئەوانەی کە میشیمالۆنکۆ پێشکێشی کردبوون.

کاکی کارزان بە پێدرۆی گوت: ئایا نەخشەی کەشتیتان لەکن هەیە؟

بالدیبیا بە گرژییەوە گوتی: بەو سادەییە پێم مەڵێ کە تۆ پێویستیت بە نەخشە هەیە بۆ شتێک.

- ئاخر من قەت کەشتیم دروست نەکردووە، ئەی خاوەن شکۆ.

حاکم پێدرۆ کە زۆر بە پرۆژەکەی دڵی خۆشبوو، لەگەڵ ماڵئاواییکردن گوتی: ئەی هاوڕێم، نوێژ بکە تا لە ئاودا نەخنکێی، چونکە تۆ لە یەکەمین گەشت بەشداری دەکەیت.

هزری پەیداکردنی زێڕ بۆ یەکەم جار حەماسەتی ئەویان جولاند و بە خەیاڵ ڕوخساری خەڵکی پێرۆی دەبینی ئەو وەختەی دەزانن کە شیلی ئەوەندە هەژار نییە وەک دەڵێن. بە نیازبوو لەگەڵ گەشتی کەشتییە تایبەتەکەی یەکەم نموونەی زێڕ ڕەوانی پێرۆ بکات، ئەو وەختە سەرنجی خەڵکەکە ڕادەکێشێ کە بێنە ئەوێ و سانتیاگۆش دەبێتە یەکەمین شاری لە نێو شارەکان و بە پێشکەوتنەوە پڕ لە دانیشتووان دەبێت. بەڵێنەکەی خۆی بەجێ گەیاند و میشیمالۆنکۆی ئازاد کرد و بەوپەڕی ڕێزەوە بەڕێی کرد. ئیتر ئەو هندییە بە سواری ئەسپەکەی و بە دەمی بە خەندەوە ڕۆیشت.

***

قەشە گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ لە یەکێ لە گەڕانەکانیدا - بە مەبەستی ئامۆژگاری ئاینی کە تا ئەو کاتە هیچ بەرهەمی نەبوو، چونکە خەڵکی ئەو دۆڵە زۆر گوێیان بە سوودەکانی باوەڕهێنان بە ئاینی مەسیحی نەدەدا - گەڕایەوە و منداڵێکیشی لەگەڵدابوو. ئەو منداڵەی لەسەر لێواری ڕووباری مابۆچی بینی لە کاتێکدا خەریکی کڕنۆشبردن بووە. منداڵێکی لاواز و چڵکن و هەموو گیانی بەپەڵەی خوێنی وشکەوە بوو، کە چاوی بە قەشە دەکەوێ لە جیاتی ئەوەی ڕابکات، هەروەک ئەوەی هندییەکان دەیکەن وەختێ کە بە بەرگی چەوری قەشەیی و خاچە بەرزکراوەکەیەوە دەیبینن، بە دووچاوی گەشەوە وەک سەگێک بە دوای دەکەوێ و هیچ قسەیەک ناکات و ئاگەداری هەموو جولەیەکی

قـەشـە دەبێت. قـەشـەكـە ویسـتی لە خـۆی دووری بخـاتـەوە و بە خـاچەكـەی هەڕەشـەی لێ دەكـرد كـە لە سـەری بدات و گـوتی: لە بـەرچاوام بزربە كـورە، یەڵڵا بڕۆ دەی!. بـەڵام بێ سـوودبوو و تا سـانتـیـاگـۆ لە دووی نـەبووەوە. لەبەرئەوەی هیچ ڕێگەچارەیەكی شك نەبرد، یەكسەر بۆماڵەكەی منی هێنا.

- ئەی باوكە، چ لەو كوڕە بكەم؟ من كاتی ئەوەم نییە بچووكان پەروەردە بكەم - ئەمـەم بە قـەشـەكە گوت، چونكە دوا شت كە لەگـەڵمدا بگونجێ ئەوەیە كە خۆم گیرۆدەی خۆشەویستی منداڵێكی دوژمنانم بكەم.

- ئەی ئێنیس، ئاخر مـاڵەكـەی تۆ باشـترین جێگەیە لەو شـارە. ئەو منداڵە هەژارە لێرە سەلامەت دەبێت.

- بەڵام...!

قسەكەمی بڕی و گوتی: ڕاسپێریی شەریعەتی خـوا چی دەڵێت؟ پێویسـتە برسییەكان تێركەین و ڕووتەكان بە بەرگ بپۆشـین.

- من ڕاسپێریی وام بە بیردا نایەت، وەلێ ئەگەر ئەوە تۆ بیڵێیت...

- كـاری بەخـێـوكـردنی بەراز و مـریشـكی پێ بسـپـێـرە، بە خـوا كـوڕێـكی چاكە.

بیرم كردەوە كە قەشە لە من چاكتر دەتوانـێ پەروەردەی بكات، بەتایبـەتی كە مـاڵێك و ژنەدۆسـتێكیشی هەیە، هەروەهـا دەیتـوانی بیكاتە خـزمـەتكاری كەنێسە؛ وەلێ نەمدەتوانی داواكەی ئەو ڕەت بكەمـەوە، چونكە من زۆر چاكەی ئەوم بە سـەرەوە بوو، ئاخـر ئەو لانـی كـەم فـێـرە خـوێندن و نووسـین دەكردم و ئێـسـتـا دەتوانم بە بێ یارمـەتیـدان ئەو سێ كـتـێـبـەی پێـدرۆ بخـوێنمـەوە: ئامـادیس، چیرۆكی دڵداری و جـەربـەزەییـە و دوو كـتـێبـەكـەی تریش هێشـتا ناوێرم بیـانخوێنمەوە، یەكێكیان بە ناوی "سرووودەكانی كابرایەك"ە لە بارەی جـەنگە، كـتـێبـەكـەی تریش بە ناوی "كـتـێـبی سـەربازێتی مـەسـیـحـییـەت"ە كـە ئەراسـیـمـۆ نووسـیـویەتی و سـەربازەكـان زۆر دەگـەڕێنەوە سـەری و هـیـچ گـرینگییـەكی بۆ من نییـە. قەشـە گۆنزالس هـەندێ كـتـێبی تریشی هـەبوون كـە

دڵنیا بووم ئەوانەش لەو کتێبانەن کە دادگاکانی پشکنین قەدەغەی کردبوون و بە هیوابووم ڕۆژێ لە ڕۆژان بیانخوێنمەوە. ئیتر بەوجۆرە ئەو کوڕە لە لای ئێمە مایەوە. وەختێ کاتالینا جوان شووشتی و خاوێن بووەوە، دیتمان ئەو پەڵانەی سەر جەستەی خوێنی وشک بووەوە نییە، بەڵکو هەمووی قوڕ و لیتە بوون و جگە لە هەندێ شوێن کە نەختێ ڕووشاوە و گۆواوە، هەموو جەستەی ساغە. ئەو کوڕە تەمەنی لە نێوان یازدە تا دووازدە ساڵان بوو، لەبەر لاوازی، دەندە و پەراسووی لە گۆڕە دیاربوون، وەلێ لە سروشتی خۆیدا بەهێزبوو. قژە بۆر و ڕەشەکەی پیسی پێوە وشک بووبووەوە. کە هات نیمچە ڕووت بوو و وەختێکیش ویستمان ئەو نووشتەیەی داکەنین کە لەسەر سینگی بوو و بە داوێکی چەرمین لە ملی کرابوو، نەیدەهێشت و گازی لێ دەگرتین. من بە هۆی سەرقاڵیمەوە زوو ئەوم لە بیرچوو، بەڵام کاتالینا لە دوای دوو ڕۆژ بە بیری هێنامەوە و پێی گوتم کە کوڕە لەوەتەی بردوومانەتە تەویلەکە لە شوێنی خۆی جولەی نەکردووە و هیچیشی نەخواردووە.

– گەورەم چی لێ بکەین؟

– واچاکە بچێتەوە لای کەسوکاری خۆی.

کە چووم سەریم کرد لە پەناگەیەک دانیشتبوو دەتگوت بەردە لە جێی خۆی نەدەجولا. وەک پەیکەرێکی دارین، چاوە ڕەشەکانی هەر لە چیاکان ڕادەمان. ئەو بەتانییەی دابوومانێ، فڕێی دابووە دووری خۆی. وا دیاربوو کەیفی بە زستان و باران دەهات. بە ئیشارەت تێم گەیاند کە ئازادە لەوەی دەڕوات یان نا، وەلێ جولەیەکی نەکرد.

کاتالینا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: نایەوێ بڕوات، دەیەوێ بمینێتەوە.

– کەواتە با بمێنێتەوە.

– جا گەورەم کێ پاسەوانی ئەو دڕندەیە بکات؟ ئاخر ئەو مابۆچییانە وا خەریکە بۆ دز و پیسی دەگۆڕێن.

کاتالینا، ئەوە منداڵە، دواتر بۆ خۆی دەڕوات، ئاخر هیچ کارێکی لێرە نییە

بیکات. هەندێ هێلکەوڕۆنی بە ئاردی گەنمەشامیم دایێ، هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو. بەڵام کە دێمکە پڕ ئاوەکەم لێی نزیکخستەوە، بە هەردوو دەستی گرتی و دەمی پێوەنا تا تێری خواردەوە. پاشان عەباکەی بۆنچۆ و شەروالێکی گەورەی پیاوانەمان لەبەری کرد و لە ناوقەدییەوە بۆمان بەستا تا ئەو کاتەی یەکێکی لە قەدەری خۆی بۆ پەیدا دەکەین. پرچیمان تاشی و ئەسپێ و ڕشکمان بە جەستەیەوە نەهێشت. ڕۆژی دواتر زۆر بە ئیشتیاوە نانی خوارد. لە تەویلەکە هاتە دەرێ و دەتگوت ڕوحێکی سەرگەردانە، سەربەستانە لە ناو ماڵەکەمدا دەگەڕا و دەچووە ناو شارەکە. ئەو کوڕە زێتر بایەخی بە ئاژەڵ دەدا نەک بە خەڵکەکە. ئاژەڵەکانیش بە باشترین شێوە لە گوێڕایەڵی ئەو دابوون: ئەسپەکان لە ناولەپی ئەو شتیان دەخوارد. دڕترینی سەگەکانیش کە بۆ هێرشکردنە سەر هندییەکان ڕاهێنرابوون، کەچی کلکیان بۆ ئەو بادەدا . لە سەرەتای هاتنی بچووبایە هەر شوێنێک خەڵکەکە دەریان دەکرد، چونکە کەسیان حەزیان بە دیتنی چارەی هندییەکی بێ سەروسەودا نەدەکرد لە ماڵەکەی خۆی بە مامە قەشەی پیاوچاکیشەوە کە زۆر جار لە بارەی ئەرکی مەسیحییانە ئامۆژگاری دەکردم، وەلێ پاش ماوەیەکی کەم هەموو لێی ڕاهاتن و کەوتە بەردڵیان، ئیتر بە کەیفی خۆی لەو ماڵ بۆ ئەو ماڵ دەچوو و بێدەنگ و بێ ئەوەی کەس بیبینێت، دەسووڕایەوە. کارەکەرە هندییەکانیش حەلوایان دەدایێ، کاتالیناش ئەگەرچی بە بێزاری و ئاگا لەخۆبوونیش بوو، وەلێ وای لێ هات ڕازیبێت لامان بمینێتەوە.

لەو وەختەدا پێدرۆ بە برسێتی ماندووێتی گەشتە دوورەکەی بە سواری ئەسپەکەی گەڕایەوە، وەلێ زۆر ڕەزامەند دیاربوو؛ ئاخر یەکەمین نموونەی زێڕی کانگەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو: دەنکە زێڕی قەبارە گەورە لە ڕووبارەکەوە دەرهێنرابوون. بەر لەوەی لەگەڵ ئەفسەرەکانی کۆببێتەوە، لە ناوقەدڕا گرتمی و بۆ نێو جێگەی بردم. بە هەناسەی قووڵەوە ماچی دەکردم و دەیگوت:" بەڕاستی تۆ خۆشەویستی ڕوحی منی". بۆنی ئارەقە و ئەسپەکەی لێ دەهات، قەت وەک ئەو ڕۆژە ئەوەندە جوان و بە سیما و بە تاقەت و

نەرمـونیـانم نـەبینیـبوو. من پێـی لێ دەنێم کـە زۆر شـەیدای مـن بووبوو و هـەر چەند لێم دووربکەوێتـەوە ئازار دەکێشـێ، جا ئەگـەر بـۆ چەند ڕۆژێکی کەمـیش بێت. هـەروەها دەزانم کــە لێم دووربێت خــەونی نـاخـۆش دەبینـێ و لە تـرسـی نەهاتنەوە لام خـەم و خـەفـەت دای دەگرێت. وەک ئەوەی منداڵ بێت ئاوا ڕووتم کردەوە و بە پارچە قوماشێکی تەڕ شـووشـتم و شوێنی برینەکانیم ماچ کرد، لەو شــوێنەوە کـە بە لووشکەی ئـەسـپـەکـەوە پێکرابوو لەگــەڵ ئەو ســەدان شـوێنەواری برینەی کـە لەسـەر قـۆڵ و باسکی و قـاچەکانی تێکپەڕیبـوون تا دەگاتە چاڵە بچووکەی سەر لاجانگی کە لە کاتی منداڵی بە هۆی بەربوونەوەی لەسـەر پشـتی ئەسپـەوە دروست بووبوو. وەک دوو کـەسی پیر بە شـێـوەیەکی هێمن و تـازە کـەوتینە کاری ئەویندارى. پێدرۆ لە دوای ئەو چەند حـەفتـەیەی ماندوویێتـی و گەڕان زۆر شەکەت و هیلاک دیاربوو، بۆیە لێمگەڕا بە ئارەزووی خۆم وەک پاکیزەیەکی بێ ئەزموون ڕەفتاری لەگەڵدا بکەم. خۆم خستـە سـەری و هێـدی هێـدی کــەوتمە چێــژپێــدانـی، لەبەر تیـشـکی مــۆمــەکــەش بە سـەرسوڕمانەوە لە ڕوخسـار و نێوچەوانە پانەکەی و لووتە بەرزەکەی و هـەردوو لێوەکانی ورد دەبوومەوە کە زیاتر بە هـی ژن دەچوون. چاوەکانی هـەڵدەهێنا و بزەیەکی پڕ لە ڕەزامـەندی نیـشــان دەدا و لە خـۆبەدەسـتـەوەدانیـشـیـدا وەک گەنجێک خۆی دەنواند کە نابەزێت. زۆر لەو کـەسە جیاوازبوو کە ئەزموونداری شـــەڕ و ئەو تـەمــاحکارییــانـە بێت کــە چەند حــەفــتــەیەک لـەمــەوبەر وەک سـەرکـردەیەک بۆی چووبوو. لە یەکێ لـە چرکـەسـاتەکـان لە تاریکی شـەو بە خەیاڵی خـۆم تارمایی منداڵێکی مـابۆچیم بینی لە گۆشـەیەکی ژوورەکەم، وەلێ دەشـێ ئەوە تەنیا گەمەی منداڵان بێت.

ڕۆژی دواتر، ئەو کاتەی لە کۆبوونـەوەی ئەنجوومـەنی شـارەوانی گـەڕایەوە، پێـدرۆ لێـی پرسـیم کـە ئەو منداڵە هـی کـێـیـە. منیش بۆیم ڕوون کـردەوە کـە قـەشـەکـەمـان بۆ ئێـرەی هێنـاوە و ئێـمـەش وا دەزانین هـەتیـوە. پێدرۆ بـانگی کوڕەی کرد و لە تـەوقی سـەرییـەوە تا بنی پێی ڕوانی. زۆر پێـی سـەرسـام بوو، ڕەنگە خـۆی لەو تەمـەنە وا بەهـێز و ڕوحگەورە هـاتبێتـەوە بەر زەین. سـەرنجی

دایێ کە ئەو کوڕە بە زمانی قشتاڵی نادوێ، بۆیە داوای زمانزانێکی کرد.

بالدیبیا گوتی:" پێی بڵێ دەتوانێت لەگەڵمان بمینێتەوە بە مەرجێک ببێتە نەسرانی. ناویشی لێ دەنێین فیلیپ، چونکە ئەو ناوەم زۆر پێخۆشە و ئەگەر کوڕم هەبووایە ئەو ناوەم لێی دەنا. جا ئایا ڕازییە؟"

منداڵەکە سەری ڕەزامەندی لەقاند. پێدرۆش دیسان گوتی:" پێی بڵێن ئەگەر دزی لێ ئاشکرا ببێت فەرمان دەدەم بە قامچی لێی بدەن و لە شاریش دەری دەکەم؛ دەبێ خۆی بە بەختەوەر بزانێت، چونکە هەر کەسێکی نیشتەجێی ئێرە دەشێ دەستی ڕاستەی بە تەور ببڕین، تێگەیشتن؟"

منداڵەکە بە بێدەنگی و ڕوخسارێکی گاڵتەئامێزە دووبارە سەری لەقاند و هیچ ترسێکی پێوە دیار نەبوو. بە وەرگێڕەکەم گوت کە پێی بڵێت:" ئەگەر زمانی خۆیانم فێر بکات، منیش ئەوی فێرە زمانی قشتاڵی دەکەم". وەلێ فیلیپ هیچ بایەخی بە پێشنیازەکەی من نەدا. ئەو کاتە پێدرۆ گوتی:" ئەگەر فێری زمانی مابۆدۆنگۆم بکات، ئەوا ڕێگەی پێ دەدەین بچێتە خزمەتی ئەسپەکان". فیلیپ یەکسەر ڕوخساری گۆڕا و لەو ساتەوە پێدرۆی خۆشویست و پێی دەگوت تایتا و بە منیشی دەگوت شینیۆرا، وا بزانم مانای سەنیۆرا دەگەیەنێ. ئیتر لەسەر ئەوە ڕێککەوتین. فیلیپ مامۆستایەکی باشی لێ دەرچوو و منیش قوتابییەکی بەختەوەر؛ ئیتر بەو جۆرە بوومە یەکەمین هوەینکا - ئیسپانی - کە بتوانم ڕاستەوخۆ لەگەڵ مابۆچییەکان تێک بگەین، بەڵام ئەوە ساڵانێکی گەرەکە. من گوتم - تێکگەیشتن لەگەڵ مابۆچییەکان -، وەلێ ئەوە تەنیا خەیاڵە چونکە ئێمە هەرگیز تێک نەدەگەیشتین، ئاخر رق و قینەیەکی زۆرمان لە نێواندا هەبوو.

***

هێشتا لە ناوەڕاستی مانگی زستاندا بووین وەختی دوو سەرباز بە سواری ئەسپەکانیانەوە بە هەشتاوی هاتن، ئەوانە لەو کەسانە بوون کە پێدرۆ لە مارگا - مارگا جێی هێشتبوون. کە گەیشتنە لامان زۆر شەکەت و شپڕزە بووبوون، خوێنیان لێ دەچۆڕایەوە و برینەکانیان جێی مەترسی بوون و

ئەسپەکانیان وەختابوو بپسێن. هەواڵیان پێ داین کە هندییەکانی میشیمالۆنکۆ لە کانگەکە هەڵگەڕاونەتەوە زۆر کەسیان لە یاناکۆناکان و زنجی و گشت سەربازە ئیسپانییەکانیان کوشتووە و هەر ئەو دووانەیان توانیویانە بە زیندوێتی خۆیان ڕزگار بکەن. زێڕەکەش تاکە گەردێکی نەماوە و هەموو ئەوانەیش کە لەسەر لێواری کۆنکۆن بوون کوژراون؛ تەرمەکانیان پارچە پارچە کردووە و بە سەر لەکاندا پەرتیان کردوونە، ئەو کەشتییەی کە دروستمان کردبوو بووەتە گوفەکێک لە داری سووتاو. بە کورتییەکەی سێزدە سەرباز و ژمارەیەکی زۆر لە هندییە یاناکۆناکانمان لە دەست چوو.

پێدرۆ بالدیبیا نەڕاندی: نەفرەت لە میشیمالۆنکۆ، هندییەکەی نێو پاشماوە! وەختێ کە دەیگرم بە زیندوێتی لەت لەتی دەکەم!.

هێشتا گرێی ئەو خەبەرە ناخۆشەی لە دەروون نەکرابووەوە، کاتێ بیاگرا و ئەگێری گەیشتن و تا دڵنیای بکەنەوە کە ئەوەی سیخوڕەکانی سیسیلیا پێش چەند حەفتەیەک بۆ وریابوونەوە گوتیان: هەزاران کەس لە دانیشتووانی ڕەسەن بەرەو ئەو دۆڵە ڕەو دێن. لە شێوەی دەستە و تاقمی بچووک دێن، پیاوەکان چەکدارن و خۆیان بە ڕەنگی جەنگ بۆیە کردووە و لە ناو شاخ و ژێر زەمین و دارستانەکان و تا ناو هەوریش خۆیان دەشارنەوە. پێدرۆ هەر وەک خووی هەمیشەیی خۆی بڕیاری دا کە هێرشکردن باشترین شێوازی بەرگریکردنە؛ چل سەربازی ئازا و بە ئەزموونی هەڵبژارد و لەگەڵ کازیوەی بەیانی بە سواری ئەسپەکانیان لەگەڵیان دەرچوو تا تۆڵەی ئەو ڕووداوانەی مارگا - مارگا و کۆنکۆن بکاتەوە.

لە سانتیاگۆ بە هەستێکی پڕ لە غوربەت ماینەوە و وتەکانی فرانسیسکۆ دی ئەگێری باری ئێمەی زۆر بە وردی دەردەخست: ئێمە لە قونی جیهانین و بە دڕندە ڕووتەکان گەمارۆ دراوین. نە زێڕ هەیە و نە کەشتی، کارەساتەکە هەموو لایەکی گرتووەتەوە. قەشە گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ هەموومانی بۆ نوێژ کۆکردەوە و گوتاری حەماسەت ئامێزی لە بارەی ئازایەتی و بڕوا بۆ داین، وەلێ نەیتوانی ورە ڕووخاوەکانی ئەو خەڵکە تۆقیوە بەرز بکاتەوە.

سانچۆ دیلا ئۆس ئەو هەلەی قۆزییەوە و هەموو ئۆباڵەکەی بۆ پێدرۆ گەڕاندەوە و توانی ژمارەی لایەنگرەکانی بکاتە پێنج کەس، کە یەکێک لەوانە چینچیای بەدبەخت بوو کە لەو بیست کەسە بوو لە کۆبیابۆ هاتبوونە ریزەکانمان. من قەت بەو پیاوە سەرسام نەبووم، چونکە زار و دڵی یەک نەبوو و زۆریش ترسنۆک بوو، وەلێ نەمدەزانی ئەوەندە گێل و گەمژەشە. پیلانگێڕەکان ئەو جارە پێنج خەنجەرەکە لێکچووەکەیان پێ نەبوو، چونکە هەمووی لە یەکێ لە سەندووقەکانی هەڵگیرابوون. چینچی زۆر بڕوای بە پلانەکەی خۆی هەبوو و سێ چوار بەرداخ شەرابی زیاتر لە توانای خۆی خواردەوە، بەرگی گاڵتەجارەکانی پۆشی و زەنگ و تەپڵی بچووکی هەڵگرتبوو و چووە گۆڕەپانەکە تا جوڵە و ڕەفتاری پێکەنیناوی بکات و حاکمی دەدواند. خوان گۆمێس یەکسەر دەستگیری کرد، هەرکە ئامێرەکانی ئەشکەنجەدانی پێ نیشان دا و بۆی ڕوون کردەوە کە کوێی جەستەی ڕادەگوشێ، ئیتر چینچیا لە ترسان بوختانی بە هاوڕێکانی کرد.

پێدرۆ بالدیبیا چۆن ڕۆیشتبوو خێراتر گەڕایەوە، چونکە چل کەسە ئازاکەی لە خۆیان ڕانەدیت لە ڕووی ئەو هەموو ژمارە زۆرەی جەنگاوەرەکانی ئەو دۆڵە بوەستنەوە، بەڵام توانیان ئەو یاناکۆنا هەژارانەی کە لە قەسابخانەکەی مارگا - مارگا ڕزگاریان بووبوو، دەربازیان بکەن. ئەوانە بە برسێتی و سەرما و ترسەوە لە دارستانەکە خۆیان دەشاردەوە. پێدرۆ لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا تووشی چەند دەستەیەکی دوژمنان بوو، وەلێ توانی ڕووبەڕوویان بێتەوە و بەسەریاندا زاڵ بێت؛ هەروەها لە سایەی ئەو بەختەی کە تا ئەو کاتەش لێی دانەدەبڕا، توانی سێ سەرۆک خێڵی تر بە دیل بگرێت و بۆ سانتیاگۆی هێنان، بەوانەوە ژمارەی دیلەکان بووە حەفت سەرۆک خێڵ.

بۆ ئەوەی گەلێک ببێتە گەل پێویستە لەدایکبوونی تازە و مردنی تێدا بێت، بەڵام گەلەکانی ئیسپانیا وا دیارە پێویستیان بە لە سێدارەدانیش هەیە. یەکەمین کاری لە سێدارەدانمان لە سانتیاگۆ بینی لە هەمان ئەو حەفتەیەدا. بە پێی دادگاییکردنێکی کورت، - ئەوجارە ئەشکەنجەدانیشی لەگەڵدا بوو -

حـوکمی مـردن بە سـەر پیلانگێڕەکـانیش درا. چینـچیـا و دوو کـەسـی تر لە سێدارەدران و تەرمەکانیان لە سەر لووتکەی شاخی سانتا لۆسیا بۆ بەردەمی با و داڵە گۆشتخۆرە گەورەکانی شیلی فڕێدران. هەر لە ناو زیندانی سـەری چوارەمین کـەس لە پیلانگێڕەکـانیـان پەڕاندرا، چونکە دەیویست سـوود لە نازناوی خانەدانی وەربگرێت تا وەک خـەڵکە سادەکە بە سێدارەوە نەمرێت. لە بەرچاوی هەمـووان ئەوجارەش بالدیبیـا لە سـانچۆ دیلا ئۆس خـۆشـبـوو کـە هاندەری یەکەم بووە بۆ یاخیبوونەکەیان. ئەوجارەیان کە بە تەنیا لەگەڵ پێدرۆ بووم، لە دژی بڕیارەکـەی وەسـتـامـەوە، چونکە بەڵگەنامـەکانی پشـتـبـەسـتنی شـاهانە هـیچ بوونێکی نەمـابوو، دوای ئەوەی کـە دیلا ئۆس ئیـمـزای لەسـەر بەڵگەنامەکە کرد و بە ڕەسمی وازی لە پرۆسـەی داگیرکاری هێنا و پێدرۆ دی بالدیبیا بە شـەرعی بووە سـەرکردەی هەڵمـەتی داگیـرکاری شیلی. ئاخـر ئەو کـابرا لووتبـەرزە زۆر هـەراسـانی کـردبووین. هەرگـیـز نەمـدەزانـی کـە بۆچی بالدیبـیـا ئەوجـارەش سـەری ئەو کـابرایەی ڕزگـار کـرد. ئامـادە نـەبوو هۆکـارەکـەیم پێ بڵـێت، منیش زانیم کـە نابێت لە بەرامـبـەر پیـاوێکی ئەوها زیاتری لەسـەر بڕۆم، ئاخر ڕووداوە کارەساتبارەکان سروشتی ئەویان گۆڕیوە و بە ئاسانی تووڕە دەبێت و لەدەست خۆی نامێنێت، بۆیە من هەر ئەوەندەم بۆ هەبوو دەمی خۆم دابخەم.

***

لە نێو جوانترین سروشتی جیهان، لە دارستـانە ساردەکانی خـوارووی شـیلیـدا، لە نێـو بێـدەنگی ڕەگـەکـان و دار و لقـە بۆندارەکـان و لـە بەردەم ئامـادەیی گـڕی بورکـانەکـان و لووتکەی زنجـیـرە شـاخـەکـان، لە تـەک ئەو دەریاچانەی کە ڕەنگی زەمروودیان هەبوو و کەفی ڕووبارەکانیش بەفری تواوە بوون، هۆزەکـانی مـابۆچی لە ئاهەنگێکی ڕوحـیـدا، لە کـۆمـەڵی پیـرەکـان و سـەرۆک پشت و خێڵ و سـەرکردە و لۆنکۆ و سیـحـرباز و جـەنگاوەر و ژن و منداڵەکان، کۆبووبوونەوە.

خێڵـەکان وردە وردە دەهاتنە ناو دارستانەکە، بۆ پایە فرەوانەکەی سەرووی

ئەو سـەنگەرەی کـە پیـاوەکـان بـە لق و پۆپی داری ئەراوکـاریا و داری پیـرۆز لێوارەکانیان بزر کردبوو. هەندێ خێزان چەند حەفتەیەک لە بەر باران بەڕێوە هـاتبــوون بـۆ ئەوەی لـەو کــۆبـوونەوەیە بەشــداری بکـەن. ئەوانـەی کــە زوو گەیشـتبوون کوختی نـەوییـان دروست کردبوو کە لـەگەڵ سـروشـتەکـە جیـا نەدەکرایەوە، بە جۆرێک تا نەگەیشتایە کنی نەتدەبینی. بەڵام ئەوانەی درەنگ هاتبـوون، هـەر سـەرپێیی لە لقـەدار و گـەڵاکـان شـوێنی خـۆیان چا دەکـرد و ڕایەخـە خورییـەکانیـان لەسـەر ئەرزەکـە ڕادەخست. شـەوانەش خـواردنیـان ئامادە دەکرد و لە نێوان خۆیان دابەشیـان دەکرد و شەرابی چیچا و مودایان دەخـواردەوە، وەلێ زۆریشـیـان نەدەخـواردەوە تا خـۆیـان هیـلاک نەکـەن. ئەوانە هەموویان سەردانی یـەکتریان دەکرد و لە ڕێگەی چیرۆکی درێژ و بـە ڕیتمێکی ئاوازدارەوە هەواڵیـان دەگۆڕییـەوە. ئەوان چیـرۆکی هۆزەکـانیـان لە مێـشکی خۆیان هـەڵگرتبوو و نەوە دوای نەوە بۆ یەکتـریان دەگواستەوە. گرینگ ئەوەبوو قسـەکردن بڕانەوەی نەبێت. لە بەردەرگـەی  هـەر مـاڵێک ئاگردان بـە ئاگرەوە دەمایەوە و دووکەڵیش لەو تەمە بزر دەبوو کە لەگەڵ تاریک و ڕوونی بەیانییـان لە زەوییـەوە هـەڵدەسـتا. مـەقـەڵە بچـووکـەکـان لە تاریکایی دەسـووتان دیمەنی ڕەنگ شــیـریی بـەیانیـیـانی ڕووناک دەکـردەوە. گـەنجـەکـان لە ڕووبـارەکـان دەگەڕانـەوە کە لەوێ بە بەفـراو خۆیان شـۆری بوو و جەسـتە و ڕوخسـاریان بە دوو ڕەنگی کەشاوی بۆیە کردبوو: زەرد و شین.

سەرۆک خێڵەکان عەبای خوری نەخشاویان پۆشیبوو کە ڕەنگیـان شینی ئاســمــانی و ڕەش و ســپی بـوو تەوری بـەردینیــان بـە ســینگی خــۆیانەوە هەڵواسـیـبـوو کـە ئەوە سـومـبـڵی دەسـەڵاتەکـەیان بوو، هـەریەکـە و تاجـێکی لە پەڕامـووچەی باز و شینەشـاهـۆی لەسـەرنابوو. لەلایەکی تر ئەسـتێرەناسـەکـان داری بۆنداریان دەسـووتاند و – ڕوویی – واتە پـایەی ڕوحییـان ئامـادە دەکـرد تا بە هـۆی ئەوەوە لەگەڵ –  نەگینیچین – باسـی ڕوحی زەوی بکەن.

– وەک جـاران چۆرێک شــەرابی مـۆدایت پێـشکێش دەکـەین، بۆ ئەوەی ڕۆحی  ئەو زەوییــە تێــر بکەین کـە بـە دوای شــوێن پێی ئێــمــە کــەوتووە.

نەگینیچین خۆی شەرابی مۆدای و زەوی و کاریلە و باز و هەڵۆی دروست کردووە.

ژنەکان پرچیان بە داوەبەن بەستبووەوە، هی کچەکان بە بەنی شین و ژنە بە مێردەکانیش بە داوەبەنی سوور، بە نایابترین جلوبەرگ و خشڵ و ملوانکە خۆیان ڕازاندبووەوە، لەو لاوەش منداڵەکان بە جلی تایبەتی جەژنەوە کپ و بێدەنگ لە شێوەی نیوە بازنەیەک دانیشتبوون. پیاوەکانیش بە ڕیزە شانیان دابووە یەکتری و دەتگوت جەستەیەکن لە دار، قیت و سینگ بەرز، بە بازووی ماسوولکەدار و پرچە ڕەشیان بە تیلمە پەڕۆکیک گرێیان دابوو، چەکەکانیشیان بە دەستەوە بوو.

لەگەڵ یەکەمین گەزەنگی خۆرەتاو ئاهەنگ دەستی پێ کرد. جەنگاوەرەکان بە هاتوهاوارەوە بەسەر پایەکاندا غاریان دەدا و چەکەکانیشیان بەرز و نزم دەکردەوە. لەو ئانەدا ئامێری مۆسیقاکان ئاوازیان دەچڕی تا ڕوحە شەڕانگێزەکان لەو ناوە دەربکەن. ئەستێرەناسەکان چەند سەرێک ئاژەڵی گواناکۆیان هێنا و داوایان لێ کردن تا ژیانی خۆیان بکەنە قوربانی خوای مەزن، پاشان سەریانبڕین. کەمێک خوێنیان ڕشتە سەر ئەرزەکە و دڵی ئاژەڵە سەربڕاوەکانیان دەرهێنا و دوای ئەوەی دایانە بەر دووکەڵی گەلای توتن، پارچە پارچەیان کردن و بە سەرۆک خێڵەکانیان بەشییەوە، ئیتر بەو جۆرە هەموویان لە زەوی بوونە هاوبەش.

- ئەی نەگینیچینی ڕێزدار، ئەوە خوێنی پاک و بێگەردی مالاتەکانە، خوێنەکانی تۆ، ئەو خوێنەی کە بە ئێمەی دەدەی تا بە زیندوێتی بمێنین و بتوانین بجولێینەوە، ئەی خواوەندی باوک، لەبەرئەوەیە لێت دەپارێینەوە تا بەو خوێنە پیرۆزمان بکەیت.

ژنەکان گۆرانییەکی خەمبار و قووڵیان دەست پێ کرد، پیاوەکانیش بۆ سەماکردن هێدی و بەگرانی هاتنە ناوەڕاستی شانۆکە و بە پێخواسی لە سەر ڕیتمی نای و دەهۆڵەکان زەوییان دەکوتا.

- بۆ تۆش ئەی دایکی هەمووان، سلاوی ئێمەت پێشکێش بێت. خاک و

مرۆڤ لێک جیا ناکرێنەوە. هەر کارەساتێک تووشی زەوی بێت، مرۆڤەکانیش دەگرێتەوە. ئەی دایک ئێمە لە تۆ دەپاڕێینەوە کە درەختی سنۆبەرمان بدەیتێ تا خواریمان ڕاست بکاتەوە، دەپاڕێینەوە بۆ ئەوەی بارانمان بەسەردا ببارێنی تا تۆو و خورییەکانمان بۆگەنی نەبن، داواکارین کە زەمین نەلەرزێنی و گڕکانەکانیش بە سێلاوی ئاگرینیان ماڵاتەکانمان دەربەدەر نەکەن و منداڵەکانمان نەتۆقن.

هەروەها ژنەکانیش چوونە سەر شانۆ و لەگەڵ پیاوەکان کەوتنە سەما و وەک باڵندە گەورەکان لاباڵ و جەستەیان بادەدا و خۆیان دەلەرزاندەوە. لە هیکڕا هەموویان هەستیان بە کاریگەری خەوهێنەرانەی دەهۆڵ و نایە و ترپە ڕیتمدارەکانی پێیان لەسەر زەوی کرد کە بە هۆی دەرچوونی وزەی جەستەیان ئەرزەکەی تەڕ کردبوو. ئیتر یەک بە دوای یەک لە ناخەوە هاواریان دەکرد، پاشـــــان ئەوەندەی نەبرد ئەو دەنگە بووە هاوارێکی درێژ، – ئۆووووووم، ئووووووووم – کە لە دڵ و قەدپاڵی شاخ و نێو ڕەوەزەکانی دەنگی دەدایەوە تا ڕوح ببزوێنێ. ئاخر خۆ کەس توانای ئەوەی نییە لە سیحری ئەو ئووووووومە ڕزگاری بێت.

– ئەی خوای گەورەمان، ئێمە داواکارین کە لەسەر ئەو خاکە یارمەتیمان بدەیت، ئەگەر بەو حاڵە ڕازیت کە ئێمە تێیداین و تکامان وایە ڕاستەوخۆ گوێبیستمان بیت و بە تەنیا جێمان نەهێڵی و نەمانخەیتە تاریکی، هێز و تاقەت ببەخشییە بازوومان تا بتوانین بەرگری لە خاکی باو و باپیرانمان بکەین.

مۆسیقا و سەماکە وەستان. تیشکی خۆری چێشتەنگاوان لە لێواری هەورەکانەوە دەهاتە سەر زەوی و تەمەکەی بە ڕەنگی زێڕ بۆیە کرد. پیرترین سەرۆک خێڵ کە کەوڵی پڵنگی بۆما بە سەرشانەکانییەوە بوو، هاتە پێش، بۆ ئەوەی یەکەمین قسەکەری ئاهەنگەکە بێت. گەشتی هاتنی ئەو مانگێکی خایاندبوو بۆ ئەوەی بە نوێنەرایەتی خێڵەکەی بگاتە ئەوێ. پێویست بە پەلە پەل ناکات، لە کۆنترین ڕووداوی چیرۆکی دروستبوونەوە دەستی پێ کرد،

چۆن مـاری (کـای - کـای) دەریا و شـەپۆلەکـانی هەڵچـواند تا هەڕەشـەی قـووتدانی گـەلی مـابۆچی بکات، بەڵام مـاری ترینگ - ترینگ بە فـریایان دەکەوێ و ئەوانی بردبووە سەر لووتکەی بەرزترین ئەو چیایەی کە هـەر گەورە دەبوو و بەرز دەبووەوە، ئیتـر ڕزگـاری کـردبوون. باران بە لێـزمـە دەباری و ئەوانەی نەیانتـوانی بە سـەر چیاکـان هەڵگەڕێن لە ناو تۆفـاندا خنکان. دوای ئەوە ئاوەکە کشایەوە و ژن و پیاوەکان لە دۆڵ و دارستانەکان جێنشین بوون، بێ ئەوەی لە بیـر بکەن کـە درەخت و ڕووەک و ئاژەڵەکان بـرای ئەوانن و دەبێ چاوەدێرییـان بکەن و هـەر جـارێک لقی دارەکـانیـان بۆ سـەرگـرتنەوەی خـانووەکانیـان لێ بکردبایەوە، سـوپاسی دارەکـانیـان دەکـرد. وەختێ کـە بۆ مەبەستی خواردن ئاژەڵێکیان سەردەبڕی، داوای لێبووردنیان لێی دەکرد؛ قەت لە پێناوی کـوشتن نەیاندەکـوشتن. مـابۆچییـەکـان بە سـەربەسـتی لە خـاکی پیـرۆزدا دەژیان، ئەو کـاتەی ئینکا لە پێـرۆوە بۆیان هـاتن، هـەمـوو پێکەوە بەرگرییـان لە خـۆیان کرد و سـەرکەوتن و نەیاهێشت لە ڕووباری پیـۆ - پیـۆ بپەڕنەوە کە دایکی هەموو ڕووبارەکانە، وەلێ ئاوەکەی بە خوێن سوورهەڵگەڕا و مـانگ بە ڕەنگی سـوورەوە لە ئاسـمـانەوە وەسـتـا. لە دوای تێپـەڕبوونی ڕۆژگـارێک ئەوجارە ئیسـپـانییـەکان بە هەمـان ئەو ڕێگەیەدا هاتن کـە ئینکا پێیدا هاتبوون. ئەوانە زۆر و بۆگەنی بوون و لە دووری دوو ڕۆژە ڕێ دەتوانی بۆنیـان بکەیت. هـەروەها دزی گەورەبوون، نـە نیشـتـمـانیـان هەبوو نە خـاک، دەسـتیـان بەسـەر هەمـوو شـتێکدا دادەگرت کـە هی خـۆیان نەبووایە، هەتا بەسـەر ژنانیش و لە مـابۆچییەکانیان گەرەک بوو ببنە کۆیلەی ئەوان. لەسـەر جەنگاوەرەکان پێویست بوو دەریان بکەن، وەلێ زۆربەیان مردن، چونکە تیر و تەورەکـانیـان بەرگی کانزایی ئیـسپـانییـەکانیـان نـەدەبڕی، بەڵام ئەو دوژمنە تازانە دەیانتـوانی لە دوورەوە بە چەکـە دەنگدارەکـانیـان بیـانکوژن و یان هـەر سەگەکانیان تێ بەربدەن، لەگەڵ ئەوەش هەر دەریان کردن. ئاخر هوەینکاکان هەر لە خـۆیانەوە پاشـەکشـەیان کـرد چونکە تـرسنۆک بوون. چەند هاوین و چەند زسـتـانێکی تر بەسـەرچوون، هوەینـاکای تر هاتن و ئەوانە ویسـتـیـان

بمینێنەوە، – سەرۆکە تەمەندارەکە وای دەگوت – ئەوانە داریان دەبڕییەوە و خانوویان دروست دەکرد و وەچەیان دەنایەوە و ژنەکانی ئێمەیان سکپڕ دەکرد، بۆیە جۆرە منداڵێک هاتنە ژیان نە هوەینکایی بوون و نە لە ئێمەشیان دەکرد.

– ئەوەی لە بەرچاوانیش دیارە ئەوانە دەیانەوێ سەراپای خاکەکەمان داگیر بکەن، لە گرکانەکانەوە تا دەگاتە دەریا، لە بیابانەوە تا دەگاتە کۆتاییی جیهان و دەیانەوێ گوندێکی زۆر دروست بکەن. ئەوانە بێویژدان و دڵڕەقن، سەرکردەکەیان بالدیبیا زۆر حیلەبازە. من دەڵێم مابۆچی قەت پێشتر دوژمنی وەک ئەو ریشدارانە بە هێزی نەدیوە. ئەوانە ئێستا هۆزێکی بچووکن، وەلێ هی تر بە دوایانەوە دێن، چونکە خانووی باڵداریان هەیە و بە سەر ئاوەکاندا دەڕوات. ئێستاش من داوام لە هەمووتان ئەوەیە کە بڵێن داخوا چارمان چییە و چی بکەین.

سەرۆکێکی تر هاتە پێش و بە بازدانەوە چەکەکەی ڕادەوەشاند و هاواریکی درێژیی چریکاند. پاشان ڕای گەیاند کە ئامادەیە هێرش بکاتە سەر هوەینکا و بیانکوژێت و دڵیان هەڵلوشێ تا هێزی ئەوانیش بێنێتە بەرخۆی و ماڵیان بسووتێنێ و ژنەکانیان ببات. هەروەها گوتی هیچ چارەیەکمان نییە دەبێ ئەوانە هەمووی بکوژین. وەختێ لە قسەکانی بووەوە سێیەمین سەرۆک خێڵ هاتە پێش و لە ناوەڕاستی شانۆکە ڕاوەستا و ڕوونی کردەوە کە پێویستە گەلی مابۆچی هەمووی لە دژی ئەو دوژمنە یەک بگرێت و سەرۆکێکی تازە لە نێو سەرۆک خێڵەکان هەڵبژێرێت و بکەوێتە شەڕی ئەوانە.

– ئەی خوای گەورەمان نەگینیچین، داوات لێ دەکەین کە یارمەتیمان بدەیت تا بەسەر ئەو هوەینکایانەدا زاڵ بین، هەراسان و شەکەتیان بکەیت و وایان لێ بکەیت خەویان لێ نەکەوێ و خواردنیان پێ نەخورێت و ترسیان بخەیتە دڵ و ئێمەش بتوانین بە نهێنییان بکەوین و کەمینیان بۆ دانێینەوە و چەکەکانیان ببەین و بە کوتکەکانمان مێشکیان بهاڕین، ئێمە ئەوەمان لە تۆ دەوێ ئەی خوا.

سەرۆک خێڵی یەکەم دەستی بە قسە کردەوە و گوتی نابێ پەلە بکەین و پێویستە ئەو ململانێیە بە پشوودرێژی بکەین چونکە ئەو هوەینکایانە وەک گیایەکی پیس وانە هەرچەند بیبڕییەوە، سەرلەنوێ بە هێزتر شین دەبێتەوە؛ ئەو شەڕە دەبێتە شەڕی ئەوان و منداڵیان و نەوەکانی داهاتوویان. تا دەگەینە کۆتاییی شەڕەکە خوێنێکی زۆری مابۆچی و هوەینکا دەڕژێت. جەنگاوەرەکان ڕمەکانیان بەرز کردەوە و بە یەک دەنگ هاوارێکی درێژیان کرد جەنگ! جەنگ!. لەو کاتەدا باران لێی کردەوە و هەور بەری ئاسمانی بەردا و باز و شەهێنی مەزن دیارکەوتن و بە سەریاندا سووڕانەوە.

***

لە سەرەتای مانگی ئەیلولدا درکمان کرد کە زستانی یەکەممان لە شیلی بەسەرچووە. کەش و هەوا خۆشی کرد و ئەو شەتڵە نەمامانەی لە دارستانەکانەوە هێنابوومان و لە لێواری شەقامەکان چاندبوومان، چرۆ و لق و پۆپیان دەرکرد. ئەو مانگانەی پێشتر زۆر بە زەحمەتبوون بۆ ئێمە، نەک هەر تەنیا لەبەر پەلاماری مابۆچییەکان و پیلانەکانی سانچۆ دیلا ئۆس، بەڵکو لە بەر دابڕان و تەنیاییش دەماننالاند. ئێمە لە خۆمان دەپرسی کە داخوا دەبێ لە بەشەکانی تری جیهان چی ڕووی دابێت و ئایا ئیسپانییەکان هیچ زەوی تریان داگیر کردووە و هیچ شتی تازەیان داهێناوە، دەبێ باری ئیمپراتۆرە پیرۆزەکەمان چی بەسەر هاتبێت کە بە پێی ئەو هەواڵانەی کە دوو ساڵ بەر لە ئێستا دەگەیشتنە پێرۆ، ئەوەندەی نەمابوو شێت بێت. ئاخر شێتییەتی لەگەڵ خوێن بە نێو دەمارەکانی خانەوادەکەیدا دەسووڕێتەوە، ئەوەندە بەسە کە دایکە بەدبەختەکەی بیرکەوێتەوە کە چۆن شێتی تۆردیسییاس بووبوو. لە مانگی ئەیارەوە تا کۆتاییی ئاب ڕۆژ کورتە و هەر لە سەعات پێنجی ئێوارەوە دنیا تاریک دادێت و شەوەکانی ئەوەندە درێژن لە بڕانەوە نایەن. ئێواران تا چاومان بیدیتبایە هەر خەریکی کارکردن دەبووین، پاشان لە ژوورێکدا گۆشەگیرانە – خانەدانەکان، هندییەکان، سەگەکان، تا باڵندەکانی نێو کۆڵێتەکانیش – لە بەر مۆمێک یان دووان و بە دیار

ئاگردانەکەوە دادەنیشتین. هەر یەکەمان خۆی بە شتێکەوە خەریک دەکرد تا سەعاتە درێژەکانی شەو بڕوات. قەشەکە کۆرالێکی لە هندییەکانی یاناکۆنا دروست دەکرد تا بە هۆی گۆرانی چڕینەوە باوەڕیان بتەوتر بێت. ئەگێریش بە سەربردە سەیر و سەمەرەکانی خۆی لەگەڵ ژنان و گۆرانییە پڕ لە بوێری و گاڵتەجاڕییەکانی وەختی دەکوشتین. وەلێ ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا کە سەرەتا شەرمن و کڕ خۆی دەنواند، حەماسەتی هاتە جۆش و وەک حیکایەتخوانێکی بەهرەدار دیارکەوت. ئێمەش چەند کتێبێکی دیاریکراومان هەبوو و هەموومان ئەزبەر کردبوو، بەڵام کێرۆگا پاڵەوانی یەکێک لە چیرۆکەکانی وەردەگرت و لە چیرۆکێکی تری دەئاخنی و ئیتر کۆمەڵێک حیکایەتی تازەی لێ دروست دەکردن و کۆتاییان نەدەهات. جگە لە دوو کتێب ئەوانی تر هەمووی لە لیستی ڕەشی دادگاکانی پشکنین بوون، لەبەرئەوەی چیرۆکەکانی کێرۆگا زۆر بوێرانەتریش بوون لە هی نێو کتێبەکان بۆیە چێژدارتر و بە هەڕمێنتر بوون. هەروەها یاری کاغەزیشمان دەکرد و هەموو ئیسپانییەکان خەریکی ئەو کارە خراپە بوون بەتایبەتی حاکمی ڕێزدارمان کە بەخت هەمیشە یاوەری بوو و دەیبردەوە. بەڵام یاریمان لەسەر پارە نەدەکرد، بۆ ئەوەی شەڕ و گێچەڵ نەکەوێتەوە و لە بەرچاوی خزمەتکارەکانیش سووک و ڕیسوا دیار نەبین، ئەو نەدارییەش بشارینەوە کە تووشی بووبووین. هەندێک ئامێری فیهوەیلایان دەژەنی، یان شعریان دەهۆنییەوە، یاخۆ زۆر بە جۆشەوە گفتوگۆیان دەگۆڕییەوە. پیاوەکان شەڕ و جەربەزەییەکانی خۆیان لە بیر ناکەن. داوایان لە پێدرۆ دەکرد کە ڕووداوەکانی حاکم بێسکارۆیان بۆ بگێڕیتەوە؛ سەرباز و خزمەتکارەکانیش لەو فێڵەی حاکم بێزار نەدەبوون کاتێ سەرچەفی سپی پۆشیبووە بەر سەربازەکانی بۆ ئەوەی لە نێو بەفردا دیار نەبن.

سەرکردەکان هەندێ جار لە ماڵی ئێمەش کۆبوونەوەیان دەکرد و یاساکانی شاریان تاوتوێ دەکرد کە ئەمە بۆ حاکم مەسەلەیەکی بنچینەیی بوو. ئاخر پێدرۆ دەیویست کۆمەڵگەی شیلی لەسەر شەرعیەت و یاسا و ڕوحی خزمەتکردن لەلایەن بەرپرسەکانەوە دروست ببێت؛ پێداگری دەکرد کە نابێت

هیچ کەسێک لە بەرامبەر پلە و پایەکی گشتی کرێ وەرگرێت و بەتایبەتی خودی خۆی، چونکە خزمەتکردنی خەڵکەکە ئەرکی سەرشانە و شەرەفە. ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا لەو بارەیەوە لەگەڵی هاوڕابوو، وەلێ تەنیا ئەو دووانە باوەڕیان بەو نموونە بەرزە هەبوو. بالدیبیا دەیگوت: بە دابەشکردنی زەویوزاری هندییەکان بەسەر سەربازە لێهاتووەکانیان، لە ئایندەدا بەروبوومێکی زۆرمان دەستدەکەوێت و کێشەی بژێویمان نامێنێت، هەر چەندە ئێستا ئەو قسەیە وەک خەونێکی ڕووت وایە. هەروەها دەیگوت هەرکەسێک سەروەت و سامانی زۆر بێت، لە بەرامبەر گەلەکەیدا ئەرکیشی زۆر دەبێت.

بێزاری ورەی سەربازەکانی ڕووخاندبوو، چونکە جگە لە خۆڕاهێنان لە سەر چەک و چوونە لای ژنە ئەویندارەکانیان، هیچ شتێکی تر نەبوو خۆیانی پێ سەرقاڵ بکەن. بەڵام کارکردن لە دروستکردنی شار و پیشەسازی و ماڵات بەخێوکردن، هەمووی خرابوونە سەرشانی ژنەکان و هەندییە یاناکۆناکان. من ئەو کاتەم بە دەستەوە نەبوو کە هەموو کارەکانم بە تەواوی ڕاپەڕێنم: کاروباری ناو ماڵ و ئاوایی، چاوەدێری نەخۆشەکان، کشتوکاڵ، تەویڵەی ماڵات و کۆڵیتی پەلەوەرەکان، دەرس خوێندن لە لای قەشە گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ و فێربوونی زمانی مابۆدۆنگۆ لەگەڵ فیلیپ.

هەوای شێداری بەهار شەپۆلێک ئارامی لەگەڵ خۆی هێنا؛ ئەو ترسەمان لە دوای خۆمانەوە جێ هێشت کە چەتەکانی میشیمالۆنکۆ هەندێ وەخت بۆیان دروست دەکردین. ئێمە وامان هەست دەکرد کە لەوان بەهێزترین، هەرچەندە ژمارەی سەربازەکانمان لە دوای قەسابخانەکەی مارگا - مارگا و کۆنکۆن و لەسێدارەدانی چوار خائینەکە بووبووە سەد و بیست کەسێک. سانتیاگۆ بە ساغ و سەلامەتی لە قوڕ و لیتە و ڕەشەبای مانگەکانی زستانێ دەرچووبوو، ئەو کاتەی بە سەتڵ ئاومان لە ماڵەکان فڕێ دەدایە دەرێ؛ ئاخر خانووەکانمان بەرگەی لافاویان گرت و خەڵکەکەش بە سەلامەتی لێی دەرچوون. هەتا هندییەکانیشمان خۆیان کە بە ئارەقەکردنێکی ئاسایی دەمردن، توانیان بە بێ گرفتێکی زۆر لەو کەش و هەوا ناخۆشە پڕ لە ڕەشەبایە ڕزگاریان بێت.

کێڵگەکانمان کێڵا و نەمامەکانمان چاند کە بە خۆم لە سەرماوسۆڵی شەختە دەمپاراستن. ماڵاتەکان چاکران و بەچکەیان بەزگ کەوت، تەویلە و شوورەمان ئامادە کرد تا بەچکەی بەراز و لاما و جوانییە ئەسپ و ماینەکانی تێدا پەروەردە بکەین. بڕیارمان دا لەگەڵ کزربوونەوەی قوڕ و لیتە، جۆگە و کەناڵی ئاو ڕاکێشین بۆ ئاودێری، نەک هەر ئەوەندە بەڵکو نەخشەمان بۆ دروستکردنی پردێک کێشا لەسەر ڕووباری مابۆچۆ، بۆ ئەوەی شار و ئەو کێڵگانە بە یەکەوە ببەستێتەوە کە لە دواڕۆژدا لەو دەوروبەرە ڕێک دەخرێن؛ بەڵام بەر لە هەموو شتێک دەبووایە کەنێسەکە تەواو بکەین. خانووەکەی فرانسیسکۆ ئەگێری بووە دوو قات و هێشتا هەر بەرز دەبووەوە؛ ئێمە پێکەنینمان پێی دەهات، چونکە ئەو بە تەنیا هێندەی هەمووانی ژنە هندی هەبوو و لە هەموو پیاوەکانیش لووتبەرزتر بوو و دەیویست خانووەکەی لە کەنێسەکەش بەرزتر بێت، سەربازەکانیش بە گاڵتەوە دەیانگوت: ئەو باسکاییە وا دەزانێ لە خواش گەرەترە.

ئەو ژنانەی لە ماڵەکەی من کاریان دەکرد ئەو زستانەیان بە دوورمانکردن بەسەر برد و ژنەکانی تریان فێرە ئیشوکاری ناوماڵ دەکرد. قشتاڵییەکان وڕەیان بەرز بووبووەوە و وەختێ کراسە تازەکان و شەرواڵە بە پینە و چاکەتە دووراوەکانی خۆیان بینی زۆر شانازییان بە خۆیانەوە دەکرد. هەتا سانچۆ دیلا ئۆسیش لە زیندانەکەی وازی لە پیلانگێڕی هێنا. حاکم ڕای گەیاند کە بەو زووانە دەست بە دروستکردنەوەی کەشتییەکە دەکەن و دەگەڕێنەوە شۆرگەکانی زێڕ و بە دوای ئەو کانگە زیوەشدا دەگەڕێن کە کۆراکا ڤیتاکۆرا باسی لێوە دەکرد.

خۆشییەکانی ئەو بەهارە زۆری نەخایاند. ئاخر هەر لەگەڵ ڕۆژانی یەکەمی مانگی ئەیلول ئەو منداڵە هندییە - فیلیپ -، هەواڵی هاتنی جەنگاوەرە دوژمنەکانی بۆ ئەو دۆڵە، بۆمان هێنا و کە چۆن خەریکن سوپایەک کۆدەکەنەوە. سیسیلیا خزمەتکارەکانی خۆی ڕەوان کرد تا لە دروستیی ئەو هەواڵە بکۆڵنەوە، ئەوانیش ئەو خەبەرەی فیلیپیان پشتڕاست کردەوە و گوتیان

نزیکەی پێنج سەد کەس لە جەنگاوەرانە لە دووری پازدە تا بیست فەرسەخ لە سانتیاگۆ ئۆردوگایان دامەزراندووە. بالدیبیا دەستەیەک لە دڵسۆزترین ئەفسەرە ئازاکانی کۆکردەوە و بڕیاری دا بەر لەوەی ئەوان بەخۆکەون، جارێکی تر بە هەڵمەتێک دوژمنەکانی سزا بدات.

لە پێدرۆ پاڕامەوە گوتم: ئەی پێدرۆ تۆ بۆ ئەو هەڵمەتە مەچۆ. خەیاڵی زۆر خراپ بە مێشکمدا گوزەر دەکات.

– ئەی ئێنیس، تۆ هەمیشە لەو حاڵەتانەدا خەیاڵی خراپ بە مێشکت دادێت.

بەو ئاوازە باوکانەوە وەڵامی دامەوە کە زۆرم لەدڵ گران بوو، هەروەها گوتی: ئێمە لەوە ڕاهاتووین کە لەگەڵ هێزی سەد ئەوەندەی خۆمان شەڕ بکەین و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ پێنج سەد کەس لەوانە کارێکی ئاسانە و مایەی پێکەنینە.

– ڕەنگە هەر ئەوەندە نەبن و هیتریش لە پەنا و پەسیوان خۆیان حەشار دابێت.

– بە پشتیوانی خوا بەسەریاندا زاڵ دەبین و خۆت نیگەران مەکە.

چارەنووسی هێزەکەی خۆمانم هەڵەشە و ڕووخاو هاتە بەرچاو کە هەر لە بنچینەدا لاواز بوو. بەڵام من چیم هەتا ڕەخنە لە ستراتیجیەتی سەربازێکی وەک ئەو بکەم؟ هەرجارێک هەستی دروستم ئاگەدارم کردبمەوە و ویستبم لە بڕیارێکی سەربازی پەشیمانی بکەمەوە، لێم بێزار دەبوو و دواجار خۆی لێم تووڕە دەکرد. ئەوجارەیان لەگەڵی هاوڕا نەبووم، وەک چۆن پاشانیش هەروابووم، وەختێ نەخۆشی دروستکردنی شار و ئاوەدانکردنەوەی بە دانیشتووان لە سەریدابوو و نەشمانتوانی بەرگری لێ بکەین. ئەو لووتبەرزییەی بووە مایەی مردنی. ئاخر لە بیرمە جارێکیان پێی گوتم:– ژنان ناتوانن بیر لە کاری مەزن بکەنەوە و ئایندە بخەنە بەر زەینی خۆیان، ئەوان هەستی مێژوویان نییە و جگە لە کاروباری ماڵەوە بایەخ بە شتەکانی تر

نادەن -. وەلێ کاتێ کە لیستێک لەو کارانەم خستە بەر چاوی کە لەگەڵ ژنەکانی تر بەشداریم تێدا کردووە لە دروستکردنی شار و هەڵمەتی داگیرکردن، لە قسەکانی پاشەگەزبووەوە.

پێدرۆ ئەو شارەی لە ژێر پاسەوانی پەنجا سەرباز و سەد یاناکۆنا بە سەرکردایەتی باشترین ئەفسەرەکانی بەجێ هێشت: مۆنرۆی، بیاگرا، ئەگێری، کێرۆگا. لەگەڵ کازیوەی بەیانی بە خۆی و هێزە پەنجا سەربازەکەی و هەندێیە هاریکارەکان، لە نێو ئالاّ و دەنگی شەیپوور و تەقەی تفەنگ و هاتوهاواری خەڵک لە شار دەرچوون. ئەوان لە دەنگە دەنگ و هەرایەدا مەبەستیان بوو وا لە دوژمنان بگەیەن کە ژمارەیان زۆرە. لە سەربانی ماڵی ئەگێری کە بووبووە قوڵغی پاسەوانی ئەوانمان دەبینی کە لێمان دوور دەکەوتنەوە. ڕۆژێکی سامالّ و ساف بوو، ئەو شاخانەی بەفریان بە سەرەوە بوو و لە چواردەوری دۆڵەکە بوون، زۆر نێزیک خۆیان نیشان دەدا. ڕۆدریگۆ لە تەنیشت منەوە وەستابوو و هەوڵی دەدا نائارامییەکەی خۆی بشارێتەوە کە چیوای لە نیگەرانی من کەمتر نەبوو.

- ئەی دۆن ڕۆدریگۆ، ئەوانە نەدەبوو بڕۆن، ئاخر سانتیاگۆ بێ بەرگریکار ماوەتەوە.

بە بێباوەڕییەوە وەڵامی دامەوە: ئەی دۆنیا ئێنیس، حاکم خۆی باشتر دەزانێت چی دەکات، چاکتر وایە خۆت بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن دەربچیت، ئەوها وا دەزانن کە ئێمە لێیان ناترسین.

بەڕای من، ئەو ئەفسەرە لە دوای پێدرۆ، چاکترین پیاوی شارۆچکەکەمان بوو. لە هەمووان ئازاتر و ئەزموونداری شەڕ و ئازارکێشێکی بێدەنگ و بەوەفا و دەستپاک بوو؛ سەرەڕای ئەوانەش جێگەی بڕوای هەمووان بوو. خانووەکەی خۆی لە نزیک ماڵی ئێمەدا دروست دەکرد، بەڵام بە شەڕ و پەلامارەکانی هەندێیە شیلییەکانەوە سەرقاڵ بوو و ئەو کاتەی نەبوو کە خانووەکەی تەواو بکات کە لە چەند دینگەیەک و دوو لادیوار و چەندان پارچە قوماشی خیوەت و ساپیتەیەکی لە پووش پێک هاتبوو. خانووێکی ئەوەندە بۆ ژیان نەگونجاو بوو

زۆربەی کاتەکانی لە ماڵی ئێمە بەسەردەبرد، ئاخر ماڵی حاکم گەورترین و فرەوانترین ماڵی شارەکە بوو و هەموو کۆبوونەوەکان لەوێ ئەنجام دەدران. وا دەزانم ئەو هۆکارەی کە بووبووە مایەی سەرکەوتنی کۆمەڵایەتیمان، ئەو ئەرکانە بوون کە من دەمکێشان لە دروستکردنی خواردن و خواردنەوە بۆ هەر کەسێک کە ڕێی بە ماڵەکەمان کەوتبایە. ڕۆدریگۆ تاکە کەس بوو کە دۆستی ئەویندراری نەبوو و ژنە هندییەکانیشی ڕاو نەدەکرد تا سکپڕیان بکا. تاکە ژنە هاوڕێی - ئۆلالیا - ی کارەکەری سیسیلیا بوو کە ژنێکی جوان و جحێڵی هندییە کیچواییەکان بوو و لە کۆشکی ئینکا ئەتاواڵپا لە دایک بووبوو و وەک شاژنی ئینکا بە ویقار و بە هەیبەت خۆی نیشان دەدا. هەر لەگەڵ یەکەم ساتی هاتنە ڕیزی ڕۆدریگۆ بۆ هەڵمەتەکەمان ئەو ژنە ئەوی دەکەوێتە بەردڵ، ئەو ساتەی کە ڕۆدریگۆ بە پیسی و نەخۆشی و پرچی ئاڵۆزکاو و جلی دڕاوییەوە وەک تارمایی بە زیندوێتی لە جەنگەڵەکانی چۆنچۆ هاتەوە، هەر زوو لەگەڵ یەکەم بینینی پێی سەرسام بوو بەر لەوەی قژی بتاشێ و خۆی خاوین بکاتەوە. ژنە ئۆقرەی لەبەر بڕابوو و بە مەکر و نازەوە توانی دڵی ڕۆدریگۆ بۆ خۆی ڕاکێشێت، یەکسەر منی ئاگەدارکردەوە و مەسەلەکەی لەگەڵ باس کردم. منیش داوام لە سیسیلیا کرد تا لێی بگەڕێت کە لە خزمەتی ڕۆدریگۆدا بێت، بەو بیانووەی کە ئەو خزمەتکارێکی زۆری هەیە و ڕۆدریگۆی هەژاریش بە تەنیا و بێ کەسە و ئێسکی وشک بووەتەوە و ئەگەر یەکێک لە خەمیدا نەبێت و خزمەتی نەکات، ڕەنگە بمرێت. سیسیلیا بای ئەوەندە ژیر بوو کە ئەو بیانۆیانەی لەسەر ڕەت نەبێت، وەلێ کە زانی مەسەلە دڵ و ئەویندارییە، ئەمیش دلێ نەرم بوو و بواری بە ژنە دا بچێتە خزمەتی ڕۆدریگۆ، ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەو دوو کەسە پێکەوە دەژیان. پەیوەندی نێوانیان زۆر هەستیاربوو؛ ئاخر ڕۆدریگۆ بە ڕێز و ڕەفتاری باوکانەوە لە نێو سەرباز و دۆستە ئەویندارەکانیان، مامەڵەی لەگەڵ دەکرد. ئۆلالیاش کپ و بێدەنگ و خێرا داخوازییەکانی ڕۆدریگۆی جێبەجێ دەکرد. ژنێکی ملکەچ دیاربوو، وەلێ من لە ڕێی کاتالیناوە دەمزانی کە ژنێکی سۆزدار و میهرەبانە. من لە کاتێک

لەو بەرزییەوە دەمڕوانییە نیوەی هێزەکەمان کە لە شاری دووردەکەوتنەوە، لە خۆمم پرسی کە داخوا ڕۆدریگۆ لە نێو نوێندا دەبێ چۆن بێت و ئایا ئۆلالیا کامەرانی پێ دەخشێت! من شارەزاییم بە جەستەی ئەو هەبوو، چونکە وەختێ کە لە جەنگەڵەکانی چۆنچۆ بە نەخۆشی هاتەوە و ئەو کاتەی کە لە شەڕی هندییەکان بریندار بوو، من چارەسەریم دەکرد. ئەو هەرچەندە لاواز بوو وەلێ زۆر بەهێز بوو. من هەموو جەستەیم بەڕووتی نەدیتووە، لێ کاتالینا دەیگوت:- گەورەم دەبێ تۆش ئەندامی نێرینەی ئەو ببینیت -. ئاخر ژنە خزمەتکارەکان کە هیچ شتێکیان لێ ڕەت نابێت، دەڵێن ئەو تەواو ئامادەیە؛ وەلێ ئەگێری هەرچەندە دۆستێکی زۆری ئەویندار هەنە و خەریکی جەربەزەییە لەگەڵیان، بەڵام وا نییە.... باشە دەی ئەمە گرینگ نییە. بە بیرم دێت دڵم خورپەی کرد کاتێ بیرم لەو شتانە کردەوە کە لە ڕۆدریگۆوە گوێبیستی بووبووم و ڕەنگم وەک پەڕەی گوڵی لێ هات و سەرنجی ئەوی ڕاکێشا و لێی پرسیم: ئەی دۆنیا ئێنیس، ئایا هیچ شتێکت بەسەر هاتووە؟

بە پەلە خواحافیزیم لێی کرد و چوومە خوارێ تا کارەکانی ڕۆژانەم دەست پێ بکەم، ئەویش بە دوای کاری خۆیدا ڕۆیشت.

***

دوو ڕۆژ دوای ئەوە، لە شەوی یازدەی مانگی ئەیلولی ١٥٤١دا، ئەو مێژووەی کە هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە، هێزێکی میشیمالۆنکۆ و هاوپەیمانەکانی هێرشیان هێنایە سەر سانتیاگۆ. منیش وەک هەموو جارێ کە پێدرۆ لە ماڵ نەبێت خەوم لێ نەکەوت، بەڵکو هەر هەوڵیشم نەدا بخەوم و پاش ئەوەی خزمەتکارەکانم دەنارد تا بخەون، بۆ ئەوەی درەنگی بە ئیشوکاری دوورمان وەختەکە بەسەردەبەم. فیلیپیش وەک من خەوی نەدەهات؛ زۆر جار کە بەناو ماڵەکەدا دەسووڕامەوە و سەرم بە ژوورەکان دادەگرت، ئەو منداڵەم لە شوێنی وا دەبینی کە بیرت بۆی ناچێت؛ کپ و بێدەنگ و مات، بە دوو چاوی کراوەوە لە تاریکی دەڕوانی. دیاریکردنی شوێن و پێدانی نوێنێک لە پووش و پولاش بەو کوڕە هیچ سوودێکی نەبوو، چونکە لە هەموو شوێنێک

ڕادەکشا و هیچ سەرپۆشێکیشی بە خۆی دانەدەدا. سەعاتی پێش داهاتنی بەیانی بوو، هەستم بە دەنگی نیگەرانییەک کرد وەک گریەیەک لە گەدەم مابووەوە، لەو ساتەوەی کە پێدرۆ ڕۆیشتبوو. من کاتێکی زۆری ئەو شەوەم بە نوێژکردن بەسەر برد، نەک لەبەرئەوەی لە نقوومی دینداری بووبووم، بەڵکو لە ترسانم بوو. ئاخر قسەکردن لەگەڵ پاکیزە لەو کاتەی خۆم بە دەستی ئەوەوە گرتبوو، هەمیشە ئارامیم پێ دەبەخشیم، وەلێ ئەو شەوە درێژە نەیتوانی خەیاڵاتی بەدبینیم ئارام بکاتەوە کە ئازاری دەدام. شاڵێکم خستە سەر شانم و بە هاوڕێیەتی بەڵستار وەک سێبەری خۆم کەوتمە سووڕانەوە. بێدەنگی باڵی بەسەر ماڵەکەمدا کێشابوو. ئەوجارە فیلیپم نەدیتەوە، بەڵام ئەوە نائارامی نەکردم، چونکە ئەو لەوە ڕاهاتبوو کە لەگەڵ ئەسپەکان بخەوێت. چاوێکم بە گۆڕەپانەکەدا گێڕا و سەیری ئەو تیشکەم کرد کە لە سەربانی ماڵی ئەگێرییەوە دیاربوو و لەو شوێنەی کە سەربازێکیان بۆ پاسەوانی لێ دانابوو. بیرم کردەوە کە ڕەنگە ئەو سەربازە داماوە ئێستا لە ماندوێتی و ئەو هەموو سەعاتە پاسەوانییەی شەوێ بە تەنیا وەڕسبووبێت، بۆیە لەگەنێک شۆربام گەرم کردەوە و بۆیم برد.

– سوپاست دەکەم ئەی دۆنیا ئێنیس، تۆزێک لە لامان پشوو نادەیت؟

– من کەم دەخەوم. ئایا شتی تازە هەیە؟

– نا، شەوێکی ئارام بوو. وەک دەبینیت مانگ دنیای نەختێک ڕووناک کردووەتەوە.

– ئەدی ئەو ڕەشاییە چییە وا لە نزیک ڕووبارەکەوە دیارە؟

– ئەوە سێبەرە. ئەوە دەمێکە دەیبینم.

ماوەی چەند چرکەیەک لێی ڕامام و شتێکی سەیرم بەدی کرد، دەتگوت شەپۆلێکی تاریک لە ڕووبارەکەوە دێتە دەر و لەگەڵ شەپۆلێکی تری نێو دۆڵەکە بەیەکدەگەنەوە.

– ئەی کوڕی گەنج، ئەو سێبەرانە ئاسایی نین، وا بزانم خەبەری کێرۆگای

سەرکردە بدەین باشە، چونکە ئەو چاوی تیژە...

– ئاخر گەورەم، ناتوانم شوێنی پاسەوانییەکەم بەجێ بێڵم.

– من دەچمە لای.

بە بازدان هاتمە خوارەوە و سەگەشم بە دوامەوە بوو و بە پەلە بۆ ماڵی ڕۆدریگۆ غارم دا کە لەو بەری گۆڕەپانەکەوە بوو. هندییە پاسەوانەکەم بەئاگا هێنا کە لە سەرکۆسپەکە خەوی لێ کەوتبوو و فەرمانم پێی دا کە زوو سەرکردەم بۆ بانگ بکات. لە دوای دوو خولەک بینیم ڕۆدریگۆ بە نیوەی جلەکانییەوە هاتووە، وەلێ پۆستاڵەکەی لە پێیە و شمشێرەکەشی بە دەستەوەبوو. پێکەوە لە گۆڕەپانەکە پەڕینەوە سەرکەوتینە سەر بانەکەی ئەگێری.

– ئەی دۆنیا ئێنیس، هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەو سێبەرانە کۆمەڵی خەڵکن و بەرەو ئێرە دێن. سوێند دەخۆم کە ئەوانە هندینە و پاڵتۆی ڕەشیان لەبەر کردووە.

هاوارم کرد و باوەڕیشم نەدەکرد، ئاخر لەوکاتەدا من مەرکیز بێسکارام بیرکەوتەوە کە لە ناو بەفرەکە سەرچەفی سپییان پۆشیبوو تا لە ناو بەفرەکە دیار نەبن و گوتم: ئەوە چی دەڵێیت؟

ڕۆدریگۆ دی کێرۆگا ئیشارەتی ئاگەدارکردنەوەی لێ دا و لە ماوەی کەمتر لە بیست خولەک پەنجا سەربازەکەمان کە لەو ڕۆژانەدا هەموو کات لە ئامادەباشیدا بوون، لە گۆڕەپانەکە بە زرێ و خودە و چەکەکانیانەوە کۆبوونەوە. مۆنرۆی سوارچاکەکانی ڕێکخست – کە تەنیا سی و دوو ئەسپمان هەبوو – و کردنی بە دوو دەستە، یەکێکیان بە سەرکردایەتی خۆی و ئەوی تریش بە سەرکردایەتی ئەگێری. هەردووکیان بڕیاریان دا لە دەرەوە ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە، پێش ئەوەی ئەوان بگەنە ناو شار. بەڵام بیاگرا و کێرۆگا لەگەڵ تفەنگچی و هندییە هاریکارەکان بەرگریکردنی ناو شاریان گرتە ئەستۆ. من و قەشە و ژنەکانی تریش جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی

کـاتی شـەڕ و چارەسـەرکردنی بـرینداره‌کـانمان گـرتە ئەسـتۆی خـۆمـان. بە فەرمانی من خـوان گۆمیس، سیسیلیا و دووان لە باشترین ژنە شـیردەرەکانی و هەموو منداڵەکانی بردە ژێرزەمینەکەی ئێمە کە بۆ هەڵگرتنی خۆراک و بادە بەکارمـان دەهێنا و پەیکەری - گەورەمان پاکیزەی لێبووردەیی - دایە دەست ژنەکـەی و بە مـاچێکی درێژی نێو دەمی مـاڵئـاوایی لـێ کرد، پاشـان دەسـتی بەسەر کوڕەکەی داهێنا و بە تەختـەی دار دەرکی ژێرزەمینەکەی قـەپات کرد و بەردەرگەکـەی بە خـۆڵ کوتایەوە، ئاخر لەودەمە هیچ ڕێگەیەکی چاکتری بۆ پاراستنیان شک نەدەبرد، تەنیا ئەوە نەبێت بە زیندوێتی بیانشارێتەوە.

سـبـەینەی ڕۆژی یازدەی ئەیلول داهات. ئاسـمـان سـاف و بێگـەرد بوو، خۆری شـەرمنی بەهار دەوروبەری شاری ڕووناک کردەوە و لەو دەمەدا قیژەی ترسـهێنەر و هاواری هەزار کـەس لە خـەڵکی ڕەسـەنی شـیلی بەرز بووەوە و وەک شەپۆلێکی گەورە ڕوویان لە ئێمە کرد. ئێمە زانیمان کە بە تەڵەوەبووینە، ئاخـر ئـەو دڕندانە زۆر لەوە فـێـڵـبـازتربوون کـە ئێـمـە تێی گـەیشـتـبووین. کـۆبوونەوەی ئەو پێنج سـەد جـەنگاوەرەی کـە گـوایە هەڕەشـە لە سـانتیـاگـۆ دەکەن تەنیا فێڵێک بوو تا هێزەکەی ئێمە بکەنە دوو بەش و سەرنجی پێدرۆ بۆ ئەوێ ڕاکێشن، لە کاتێک هەزارانیان لە نێو دارستانەکان خۆیان حەشاردابوو و تاریکی شەویان قۆستەوە و بە پاڵتۆ ڕەشەکانیان لێمان نزیک کەوتنەوە.

مـۆنرۆی لە ئەگێری هاوڕێی پرسی: ژمارەی ئـەو هندییە هێرشبـەرانە چەند دەبێت؟

- هیچ شـتـێک نـامـانتـرسـێنـێ ئەی ئەڵۆنسـۆ! ئەوانە هەشت تا دە هەزار کەس دەبن...

هـەردوو دەسـتـەی سـوارچاکـەکـان خـێـرا بـەرەو ڕووی یەکـەمین سـەرایی هێرشبـەرەکان چوون و دەتگوت ڕەوە داڵێکی تووڕەن کە بە شـمشـێرەکانیـان سـەر و چوارپەلیـان پەلدەدان و بە سـمی ئەسپەکانیـان سینگیـان هەڵدەدڕین. لەگەڵ ئەوەش لە ماوەی کەمتر لە سـەعاتێک، سوارەکان ناچاربوون پاشـەکشـێ بکەن. لەو ئانەدا هەزاران هندی لە شـەقـامـەکانی سـانتیـاگـۆ غاریان دەدا و

هاوار و لووره لووریان بوو. هەندێک لە یاناکۆنا و ژنەکان کە پێش چەند مانگێک ڕۆدریگۆ مەشقی پێ کردبوون، خەریکی داگرتنەوەی فیشەک بوون تا بیدەنە دەست سەربازەکان و بەکاری بێنن، وەلێ ئەو کارە درێژخایەن و تاقەتپڕووکێن بوو و دوژمنیش گەیشتبووە ناومان. وا دەرکەوت کە دایکی ئەو منداڵانەی لەگەڵ سیسیلیا لە ژێرزەمینەکە بوون، زۆر لە سەربازە ئەزموونداره‌کان ئازاتر بوون، چونکە ئەوان بەرگرییان لە منداڵەکانی خۆیان دەکرد. بارانی تیرە ئاگردارەکان بە سەربانی ماڵەکاندا باری و هەرچەندە پووشەکان بە بارانی ئاب تەڕبووبوون، وەلێ زوو ئاگریان گرت. من درکم بەوە کرد کە دەبێ چەکەکان بدەینە دەست پیاوەکان و ئێمەی ژنانیش ئاگرەکان بکوژێنینەوە. ڕیزمان بەست و بە دەولکان ئاومان گواستەوە، بەڵام دیتمان ئەوەش سوودی نییە، چونکی تیرە ئاگردارەکان بەردەوام دەهاتنە خوارەوە و نەدبوو ئەو ئاوەی هەمانە هەمووی لە کوژانەوەی ئاگر بەکار بێنین، چونکە پیاوەکان لەبەر گەرما پێویستیان پێی دەبێت. ماڵەکانمان چۆڵ کرد و لە گۆڕەپانی چەک کۆبووینەوە.

لەو وەختەدا یەکەم کۆمەڵی بریندارەکانیان هێنا، هەندێکیان سەرباز و ژمارەیەکیش لە هندییە هاریکارەکان بوون. من و کاتالینا و ژنەکانی تر خۆمان ڕێکخست بۆ چارەسەرکردنیان و کەرەسەی برینپێچیمان پێ بوو: پارچە پەڕۆ، پارچە ڕەژوو، ئاو، ڕۆنی قرچاوە، بادە بۆ پاککردنەوەی برینەکان و مۆدای بۆ ئەوەی بریندارەکان بەرگەی تیمارکردن بگرن. بە ژنەکانی ترم گوت کە چەند مەنجەڵێک شۆربا و دێمکەکان پڕ لە ئاو و نان ئامادە بکەن، چونکە شەڕەکە زۆر دەخایەنێت. دووکەڵی سووتانی ساپیتەی ماڵەکان شاری داگیرکردبوو و وامان لێ هات نەتوانین هەناسە بکێشین و چاومان دەبرژایەوە. پیاوەکان بە برینداریی‌یەوە دەهاتنە لامان و خوێن لە جەستەیان دەهات، ئێمەش برینە دیارەکانمان چارەسەر دەکرد و هەندێک ئاو و شۆربامان دەدانێ، بەڵام ئەو کاتەمان نەبوو زرێکانیان لەبەر داکەنین تا بزانین لە ژێرەوە چ برینێکیان لە جەستەدایە. هەرکە دەکەوتنەوە سەرپێ، یەکسەر

دەچوونەوە شەڕ. نەمدەزانی سوارەکانمان چەند جار بەرەنگاری دوژمن بوونەتەوە؛ بەڵام مۆنرۆی هات و بڕیاری دا کە چی تر ناتوانن بەرگری لە هەموو شارەکە بکەن کە هەمووی کەوتووەتە ژێر دەستی هندییەکان و لە هەر چوارلاوە ئاگری گرتووە. بە کورتی ڕاوێژی لەگەڵ ئەگێری کرد و ڕێککەوتن لەگەڵ سوارەکان پاشاکشە بکەن و لە ناو گۆڕەپانەکە خۆیان قایم بکەن کە دۆن بێنیتۆی پیریش لەوێیە و برینەکانی لە سایەی جادووەکانی کاتالینا یەکی گرتبووەوە، بەڵام ئەوەندە لاواز بووبوو نەیدەتوانی ماوەیەکی زۆر لە سەر پێیەکانی بوەستێ. دوو تفەنگی پێ بوو و ژنێکی یاناکۆناش بۆ داگرتنەوەیان یارمەتی دەدا و لەو ڕۆژەدا چەندان کەسی لە دوژمن پێکابوو. ئەوەندەی تەقە کردبوو هەردوو ناولەپی بە گەرمی تفەنگەکانی سووتابوون.

***

لەو کاتەی کە من خەریکی چارەسەری برینداره‌کان بووم لە ماڵەوە، کۆمەڵێک لە هێرشبەرەکان توانییان بە سەر دیوارە قوڕەکەی حەوشەدا ئاوابن. کاتالینا بە هاوارێکی بەرز ئاگەداری کردینەوە، منیش چووم تا ببینم چی قەوماوە، وەلێ ئەوەندە دوورنەکەوتمەوە کە بینیم دوژمن وا لە نێزیکمەوەن بە جۆرێک دەمتوانی ددانەکانیان لەو دەموچاوە دڕندانە و بۆیەکراوانە، بژمێرم. لەو وەختەدا ڕۆدریگۆ و قەشە گۆنزالس کە ئەویش زرێی پۆشیبوو و شمشێرێکی لە دەست بوو، بە پەلە ڕووبەڕوویان بوونەوە، چونکە ئەرکی سەرشانیان بوو بەرگری لە ماڵەکەی من بکەن کە پڕبوو لە بریندار و سیسیلیا و منداڵەکانیش لە ژێرزەمینەکەیدانە. هەندێ لە هێرشبەرەکان بەرەنگاری ڕۆدریگۆ و گۆنزالس بوونەوە، وەلێ هەندێکی تر مەبەستیان بوو ئاگر لە دانەوێڵە و ماڵاتەکانمان بەربدەن. ئەو ڕەفتارەی ئەوان بە ئاگای هێنامەوە کە دەبێ چی بکەم. ئاخر ئەوەندە بە پەروەردەکردنی ئەو ئاژەڵانەوە ماندوو بووبووم، هەر دەتگوت ئەو منداڵانەنە کە لە بوونیان بێبەش بوویمە. بە قیژەیەک کە لە ناخەوەم دەرچوو بەرنگاری دوژمنەکان بوومەوە هەرچەندە ئەو زرێیەشم لەبەر نەبوو کە پێدرۆ پێشکێشی کردبووم، چونکە  بە پۆشینی لە

جـوله دەكـەوتم و نەمـدەتوانی خـزمـەتی بریندارەكـان بكەم. وا بزانم پرچم تێكئاڵۆزكابوو و كـەف لە دەمم دەهاتە دەرێ و جـوێنم پێـیـان دەدا، وەك ئەو بوونەوەرە ئەفسانەییە وابووم كە ڕوخساری ژنانـەیە و جەستـەشی وەك داڵە گـۆشـتـخـۆرەكـانە. لەوە دەچوو دیمەنێكی ترسـهـێنەرم هەبێت، چونكە هێرشبەرەكان كە چاویان پێم كەوت یەكسـەر ساتێك وەسـتان، پاشـان چەند هەنگاوێك كشانەوە و واقیـان وڕمابوو. نەمزانی لەبەرچی بە كۆتكێك كەللەی سەری منیان نەهاڕی. دەیانگوت میشیمـالۆنكۆ فەرمـانی پێ داون كە دەسـتم لێ نـەدەن، چونكە منی بـۆ خـۆی گـەرەك بووە. وەلـێ ئەوانە تـەنیـا چیـرۆكی دروسـتكراوی خەڵك بوون بۆ لێكدانەوەی ئەو مەسـەلەیەی كە لێكنەدەدرایەوە.

لەو ساتەدا ڕۆدریگۆ بە شـمشێرەكەی وەك باڵی پانكە لەسـەری خۆی بایدەدا، هاواری كـرد تا خـۆم ڕزگـار بكەم، هـەر لەودەمـە سـەگـەكەم بینی دەیمڕاند و كـەڵبـەكـانی گـڕكـردبووەوە كـە قـەت لە باری ئاسـاییـدا وای نـەدەكـرد. هێرشبەرەكان كشـانەوە و بەڵستاریش بە دوایانەوە بوو و منیش لە حەوشـەدا لە نێو تەرمی مـاڵاتەكانم خەم و پەژارە دای گرتبووم. ڕۆدریگۆ قۆڵێ گرتم تا ناچارم بكات لەگەڵی بڕۆم، وەلێ كەڵەشـێرە پەڕ سـووتاوەكەمـانم بینی هەوڵێ دەدا بكەوێتە سـەر قاچەكانی. بێ ئەوەی بیری لێ بكەمەوە دامێنی كراسـەكەم گـرتەوە و كـەڵەشـێـرەكـەم خـسـتـە ناوی. تۆزێك لەولاتر دوو مـریشـك كـە بە دووكەڵ گێژ بووبوون، هەردووكیانم گرت و خستمنە كن كەڵەشێرەكە. كاتالینا هات و بە دوای مندا دەگەڕا، وەختێ كە بینی من خەریكی چ كارێكم، یارمەتی دام و توانیمـان ئەو پەلەوەرانە و جوتێك بەراز و تەنیـا دوو گۆلە گەنم ڕزگـار بكەین و لە جێگەیـەكی پڕ لە ئەمانمان دانان، ڕۆدریگۆ و قەشـەش گەڕابوونەوە گـۆڕەپان بۆ شـەڕەكـردن لەگـەڵ ئـەوانی تر. من و كـاتالینا و چەند ژنێكی تر بایەخمـان بەو بریندارانە دەدا كە بە ژمارەیەكی زۆر دەیانهێنایە خەسـتەخانە سەرپێییەكەی ماڵەكەم. ئۆلالیا بن باڵی سەربازێكی برینداری گرتبوو و بۆ لای ئێمـەی دەهێنا كە خوێن لە هەموو جەستەی دەچۆڕایەوە. بیرم كـردەوە: خوایە ئەوە ڕزگـاربوونـی نیـیـە. بەڵام كـە خـودەكـەمـان لەسـەری كـردەوە بینیـمـان

برینێکی قووڵی لە نێوچەوانیدا هەیە، وەلێ ئێسکەکەی نەشکاوە، بەڵکو تەنیا نەختێ قووڵ بووە. کاتالینا و ژنەکانی تر برینەکەیان داخ کرد و پاشان دەموچاوی سەربازەکەیان شۆری و هەندێک ئاومان دایێ تا بیخواتەوە، بەڵام تەنیا چرکەیەکیش نەیانتوانی ڕای گرن تا ئیستراحەت بکات. بە شڕی و مشەوەشی و نیمچە کوێرییەوە چۆوە گۆڕەپانەکە، ئاخر پێڵووی چاوەکانی بە شێوەیەکی ترسناک ئەستوور بووبوون. من لەو ئانەدا خەریکی دەرهێنانی تیرێک بووم لە ملی یەکێ لە سەربازەکان کە ناوی لۆپێس بوو و پێشتر هەمیشە بە تانەلێدانەوە مامەڵەی لەگەڵم دەکرد، بەتایبەتی لە دوای ڕووداوەکەی ئیسکۆبار. ئەو بەدبەختە ڕەنگی هەڵبزڕکابوو و تیرەکە ئەوەندە زۆر ڕووچووبووە ملی نەمدەتوانی بەبێ فرەوانکردنی برینەکە دەری بێنم. منیش بیرم کردەوە کە داخوا دەتوانم ئەوجەربەزەییە بکەم لە کاتێک ئەو سەربازە داماوە بە شەرمەوە هاوار هاواری بوو. درکم کرد کە ناتوانم هیچی بۆ بکەم و بانگی قەشەم کرد کە ئەویش بەپەلە هات تا دوا گفتی سەرەمەرگی لێ وەرگرێت. برینداریکی زۆر لەسەر ئەرزەکە کەوتبوون و نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە گۆڕەپانی شەڕ؛ ئەوانە لانی کەم بیست کەس دەبوون و زۆربەیان لە یاناکۆناکان بوون. قوماش و پەڕۆکی پێچانەوەی برینمان نەما، کاتالیناش ئەو چەرچەفانەی هێنا کە شەوانی بێکاری زستانێ دووریبوومان، پاشان بە ناچاری تەنوورەکانمان دەکردە تیلم و دواجاریش تاکە کراسە جوانەکەی من. لەو دەمەدا سانچۆ دیلا ئۆس سەربازێکی بووراوەی هەڵگرتبوو و بۆ کنەمەی هێنا و لە بەر پێی منی دانا. من و ئەو خائینە خێرا نیگامان گۆڕییەوە و وا دەزانم لە خراپەکاری ڕابردووی یەکترمان بووری. هاتوهاواری ئەو سەربازانەی برینەکانیان بە پەنگر و ئاسنی سوورکراوە داخ دەکرا، تێکەڵ بە حیلەی ئەسپەکان دەبوو، چونکە سەرکارەکە هەرچۆنی بۆی کرابایە وڵاخە بریندارەکانی چارەسەر دەکرد. لەسەر گڵی بتەوی خاکەکەش خوێنی مەسیحی و ئاژەڵەکان تێکەڵ بە یەکتر بووبوون.

ئەگێری بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە لە بەردەرگە پەیدابوو و لە تەوقی

سەرییەوە تا بنی پێی خوێن بوو و خەبەری داینێ کە هەموو ماڵەکان چۆل بکەین تەنیا ئەوانە نەبێت کە لە گۆڕەپانەکەوە نزیکن کە دەبووایە لەوێ تا دوا تنۆکی خوێنمان بەرگری لە خۆمان بکەین.

بە دەنگێکی بەرزەوە گوتم: ئەی سەرکردە وەرە خوارێ با برینەکەت تیمار بکەم!

ئەویش قیژاندی: ئەی دۆنیا ئێنیس، هیچ برینێک لە جەستەمدا نییە! ئاو بۆ پیاوەکانی نێو گۆڕەپانەکە ببەن!

پاشان لەسەر پشتی ئەسپەکەی خۆی لار کردەوە و بۆی دەرچوو و دیتم ئەسپەکەشی لە دواوەڕا بریدارە و خوێنی لێ دەچۆڕێتەوە.

فەرمانم بە هەندێ لە ژنەکاندا کە ئاو و نان هەڵگرن و بۆ ئەو پیاوانەی ببەن کە لە بەیانییەوە بە بێ وەستان دەجەنگن، من و کاتالیناش چووین زرێیەکە لە تەرمی لۆپێس داکەنین و هەر بە خوێنەوە زرێ و خودەکەم لەبەرکرد و شمشێرەکەی لۆپێسم دەستکردێ، چونکە هی خۆمم نەدۆزییەوە، پاشان چوومە گۆڕەپانەکە. خۆر نەختێ لە تاقی ئاسمان سەرنشێو و پێدەچوو کات وەختی سەعات سێ و چواری پاش نیوەڕۆ بێت؛ حسێبم کرد ئەوە دە سەعاتە لە شەڕداین. سەیرێکی دەوروبەرم کرد دیتم سانتیاگۆ یەک پارچە ئاگری گرتووە و ڕزگاربوونی نییە و کاری ئەو چەند مانگە دووردرێژە بە بەلاش چوو، ئەوە کۆتایی خەونی جێنیشینبوونمان بوو لەو دۆڵە. لەو کاتەدا مۆنرۆی و بیاگرا لەگەڵ ئەو سەربازانەی کە نەکوژرابوون، گەڕانەوە دواوە تا بەسەر پشتی ئەسپەکانیانەوە لە گۆڕەپانەکە شەڕ بکەن کە پیاوەکانی تر لە شانبەشانی یەکتر بەرگرییان دەکرد و لە هەموو لایەک هێرشیان بۆ دەهات. تەنیا کەنێسە و خانووەکەی ئەگێری بە پێوە مابوون کە حەوت سەرۆک خێڵە هندییە دیلەکانمان تێدا زیندانی کردبوو. دۆن بێنیتۆ کە دەموچاوی بە دووکەڵی باروود ڕەشهەڵگەڕابوو، لەسەر کورسییەکەی بە بەرنامە تەقەی دەکرد و تا سێرەی نەگرتبایە پەنجەی نەدەهێنایێ، هەردەتگوت ڕاوی کەو دەکات. ئەو ژنەی کە تفەنگەکەشی بۆ دادەگرتەوە بەبێ جولە لە بەرپێیەکانی

لەسەر چیچکان دانیشتبوو و پاشان ئۆلالیا شوێنی گرتەوە. من هەستم کرد کە ئەو ژنە جحێڵە بە درێژاییی ئەو وەختە هەر لە گۆڕەپانەکە بووە تا لە بەرچاوی ڕۆدریگۆی خۆشەویستی بزر نەبێت.

***

بەرزتر لە دەنگی تفەنگ و حیلەی ئەسپەکان و وەڕینی سەگەکان و دەنگە دەنگی جەنگ، زۆر بە ڕوونی گوێبیستی حەوت دیلەکە بووم کە بە هاوارکردنەوە جەنگاوەرەکانی خۆیان ئاگەدار دەکردەوە. نازانم ئەو وەختە چیم بەسەرهات. زۆرم بیر لەو یازدەی ئەیلولە دەکردەوە تا لە ڕووداوەکان حاڵی بم، وەلێ وا دەزانم کەس ناتوانێ بە وردی باسی ئەوە بکات کە چی ڕووی داوە، ئاخر هەرکەسە و لە ڕوانگەی خۆیەوە بە جۆرێک ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە. دووکەڵێکی زۆر چڕبوو و پەشێوییەکی ترسناک و هاتوهاوار گوێیان کەڕ دەکرد. ئێمە شپرزە ببووین و بەرگریمان لە ژیانی خۆمان دەکرد و بە خوێن و سۆزەوە شێت ببووین و نایەتەوە بیرم کە ئەو ڕۆژە چۆن هەڵسوکەوتم کردووە، بۆیە بەو کەسانە بڕوا دەکەم کە دەیگێڕنەوە. من بە دڵنیاییەوە دێتەوە بیرم کە تەنیا ساتێکیش چییە ترس دای نەگرتم، چونکە تووڕەیی بە تەواوی پڕی کردبووم.

سەیری ئەو خانووەم کرد کە دەنگی هاواری دیلەکانی لێوە دێت. هەرچەندە دووکەڵەکە دنیای تاریک کردبوو، لێ مێردەکەی خۆم بە تەواوی ناسییەوە، خوان دی مەلەگە، ئەو کەسەی کە وەختێ لە کۆسکۆ بووم بیرم لێی دەکردەوە. دیتم ئەو کابرایە خۆی بەدەرگەکە گرتووە و بە دوو چاوی خەمبارەوە کە دەتگوت ڕوحێکی سەرسام و ئازاردراوە لە من دەڕوانێت. بە دەست ئیشارەتی بۆ کردم وەک بڵێی بانگم بکات. لە بەینی سەرباز و ئەسپەکان ڕێی خۆم کردەوە. قەبارەی ئەو کارەساتەشم لە بەشێکی مێشکمدا لێک دەدایەوە و بە بەشێکی تریش گوێڕایەڵی فەرمانی مێردە مردووەکەم بووم. زیندانەکە تەنیا ژوورێکی سەرپێی بوو لە قاتی یەکەمی ماڵەکەی ئەگێری و دەرگەکەشی لە چەند تەختەدارێک دروست کرابوو و بە کاریتەیەکیش لە دەرەوەڕا گاڵەدرابوو

کە دوو سەربازی گەنج پاسەوانییان لێی دەکرد و فەرمانیان پێ بوو کە تا مردن بەرگری لە دیلەکان بکەن، چونکە تاکە وەرەقەی دەستمان بوون بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ دوژمن. هیچ نەسەنگرامەوە تا مۆڵەتیان لێ وەربگرم زۆر ئاسایی بە جارێک هەردووکیانم دایە لاو بە دەستێک کاریتە پشتبەستە قورسەکەم بەرز کردەوە و خوان دی مەلەگە یارمەتی دام. هەردوو پاسەوانەکە بە دوای مندا هاتنە ژوورەوە بێ ئەوەی نیازی ئەوەیان هەبێت پێشم لێ بگرن و بشزانن کە من چ مەبەستێکم هەیە. تریسکەی ئاگر و دووکەڵ لە درزەکانەوە دەهاتە ژوورەوە و هەواکەی خنکێنەر بوو و تۆزێکی مەیلەو سوور لە خاکەکە بەرز دەبووەوە و دیمەنەکەی لێڵ و تەماوی کردبوو، وەلێ من هەر حەوت دیلە کۆتکراوەکەم دیت کە بە ستوندە ئەستوورەکەوە بەسترابوونەوە. ئەوانە ئەوەندەی زنجیرەکان بواری دەدان وەک شەیتان هەوڵیان دەدا و پڕ بە سینەیان هاواریان دەکرد و بانگی پیاوەکانی خۆیان دەکرد. کاتێ دیتیان من لەگەڵ تارمایییە خوێناوییەکەی خوان چوومەتە ژوورێ، هەموویان بێدەنگ بوون.

بە دەنگێک کە قەت نەدەناسرایەوە فەرمانم بە هەردوو سەربازەکە دا: هەموویان بکوژن!

بێدەنگی بەسەر دیلەکان و پاسەوانەکاندا زاڵ بوو.

– گەورەم چۆن بیانکوژین؟ ئاخر ئەوانە لەلایەن حاکمەوە دەستبەسەرن!

– دەڵێم بیانکوژن!

سەربازێکیان بە ترسەوە پرسی: چۆن داوامان لێ دەکەیت ئەو کارە بکەین؟

– هەر ئەوها!

بە هەردوو دەستم شمشێرە قورسەکەم بەرز کردەوە بە هەموو هێزی تووڕەیی خۆم لە ملی نزیکترین سەرۆک خێڵم دا سەریم خستە ئەو گۆڕە. لەگەڵ هێزی لێدانەکە بەربوومەوە سەر زەوی و سێلاوی خوێن بەرەو

دەموچاوم هات و سەرکەکەش لە بەر پێم غلۆربووەوە. بەڵام چاکم بە بیر نایێ دواتر چیم کردووە. یەکێ لە پاسەوانەکان پێی گوتم کە بە هەمان شێوە سەری دیلەکانی تریشم پەلداوە، وەلێ پاسەوانەکەی تر دەیگوت بەو جۆرە نەبووە، بەڵکو خۆی و هاورێکەی ئەرکەکەیان تەواو کردووە. ئەمە گرینگ نییە و داواکارم خوا بمبوورێت. سەری یەکێکیانم بە قژەکەیەوە گرت و سەرکەشانە بەرەو گۆڕەپانەکە هەنگاوم نا، بە سەر گونییە خۆڵەکانی سەرنگەرەکە کەوتم و تا هێزم تێدابوو سەرکەکەم هەڵدا. هاوارێکی تووڕە لە قووڵایی زەوی بەرز بووەوە و لە سەراپای جەستەم چووە ژووریٚ و وەک شریقەی برووسک لە سینەم هاتە دەریٚ. سەرکەکە بە هەوادا دەسووڕا و ڕۆیشت لە نێو کۆمەڵی هندییەکان کەوتەوە سەر زەوی. نەوەستام تا بزانم کاردانەوەی ئەوە چی دەبێت، بەڵکو یەکسەر گەڕامەوە زیندانەکە و دوو سەرکی تریشم هێنا و ئەوانیشم فڕێدایە گۆڕەپانەکەی بەرامبەر، وا بزانم پاسەوانەکان چوار سەرکەکەی تریشیان هێنا، لێ لەوەیان زۆر دڵنیا نیم، چونکە ڕەنگە ئەوانەیش هەر خۆم هێنابم. تەنیا شتێک لە بیرم مابێت ئەوەیە کە بازووم هێزی ئەوەی تێدابوو دووریان تێ هەڵدەم. بەر لەوەی دوا سەر بۆ ئاسمان هەڵدەم، بێدەنگییەکی سەیر باڵی بەسەر گۆڕەپانەکە کێشا، کات وەستا، دووکەڵەکە ڕەوییەوە، ئەو هندییانەمان بینی کە زمان لە دەمیاندا نەمابوو و ترس بە سەریاندا زاڵ بووبوو، ئیتر کەوتنە پاشەکشێ. هەنگاوێک، دوو هەنگاو، سێ هەنگاو، پاشان بە ڕاکردن لە گۆڕەپانەکە چوونەدەرێ و ئەو شەقامانەیان چۆل کرد کە دەستیان بەسەر داگرتبوو.

کاتێکی لە بن نەهاتوو تێپەڕی، یا ڕەنگە هەر چرکەیەکیش بێت، بە جارێک پەژارە دای گرتم و ئێسقانم وەک کەرە خاوبووەوە، ئەو وەختە لەو کابووسە بە ئاگاهاتم و درکم بەو مەترسییە کرد کە ئەنجامم دابوو. کەسانی دەوروبەرم چۆنم دەبینن ئاوا خۆمم بینی: شەیتانێکی قژ ئاڵۆزکاو، هەموو جەستەی لە خوێن هەڵاتووە و لە بەر زۆر هاوارکردن دەنگی نووساوە. چۆکم خاوبووبوونەوە هەستم دەکرد بازوویێک لە ناوقەدم ئاڵاوە و ڕۆدریگۆ لە

ئەرزەکـە بەرزم دەکـاتەوە و بـە ڕەقـایی زرێیـەکـەیەوە تـوندم دەکـات و لە نێـو سەرسامییەکی قووڵی بێدەنگدا بۆ گۆڕەپانەکە دەمبات.

***

سـانتیـاگۆ دی ئیسـتریمادۆرای تـازە ڕزگاری بوو و جگـە لە تەختـەداری سـووتـاو و کـەلوپـارچە شـتـێکی تری تێدا نەمـا. کـەنێـسـەکـە تەنیـا چەند ئەستوندەیەکی مـابووەوە؛ مـاڵەکەی منیش تەنیا چوار دیواری ڕەشی مـابوو؛ لێ خانووەکەی ئەگێری شتێکی وای بەرسەر نەهاتبوو و وەک خۆی مابووەوە. ئێمە چوار سەربازمان لێ کوژرابوو و ئەوانی تریش هـەمووی برینـدار بووبوون و برینی هـەندێکیـان جێگەی مـەترسـی بوو. یاناکۆناکان زۆربەیان لەو جەنگەدا کـوژران و پێنـج بریندارێشـیـان لە ئـەنجـامـی هەوکـردن و خـوێنبـەربوونی برینـەکـانیـان لـە ڕۆژەکـانـی دواتر مـردن. ژن و منداڵەکـان هـەمـوویان بە سـەلامـەتی دەرچوون، چونکە هێرشبـەرەکان شـوێنی ئەوانیان نەدۆزیبـووەوە. زیانەکـانی خـۆمـانم لـە تیـاچـوونی ئەسـپ و سـەگـەکـان حسـێب نەکـرد، بەڵام مـاڵاتەکـان هیـچیـان قـووتار نەبوون تەنیـا ئەو دوو مـریشـک و کەڵەشـێر و دوو بەرازە نەبێت کە لەگەڵ کاتالینا ڕزگارمـان کردبوون. لە دانەوێڵـەش شـتێکی وامان نەمابوو... تەنیا چوار گۆلم گەنم.

ڕۆدریگۆ دی کـێـرۆگـاش وەک بـاقی خـەڵکەکـە وای زەندەکـرد کـە من لەم جـەنگەدا شـێت بوویمە و هیچ چـارەسـەرێکیـشم نیـیـە. لە باوەشـی کـردم و گەیاندمییە تەنیشت کاولگەکەی خۆم کە خەستەخانە سەرپێیەکە هێشتا لەوێ کاری دەکرد و بە وریاییەوە لەسـەر ئەرزەکەی دانام. ئەو وەختەی بە ماچێکی نێوچەوانم ماڵئـاوایی لێ کردم، لە ڕوخساریدا شوێنەواری خـەم و سوێبوونەوە بەدی دەکرا، پاشان گەڕایەوە گۆڕەپانەکە. کاتالینا و ژنێکی تر زرێ و خودە و جلە بەخـوێنەکـەیان لەبـەر داکـەناندم بـەڵکو بـرینـەکـەم بدۆزنەوە! بـە ئاو و لیـفکەیەک کـە لە بژی ئەسپ دروست کـرابوو، پاکـیـان کـردمـەوە. هـیچ پارچە پەڕۆک نـەمـابوو و ناچاریـان کـردم نیـو فنجـان شـەراب بخـۆمـەوە. لەگـەڵ ڕشـانەوەم شلەیەکی مـەیلەو سـوور لە دەمم هـاتەوە، دەتگوت پێشـتـرخـوێنی

ئەوانی ترم قووت داوە و دەیهێنمەوە.

دەنگە دەنگی سەعاتە دووروودرێژەکانی شەڕ بە بێدەنگییەکی مەترسیدار گۆڕدرا. پیاوەکان لە جولە کەوتبوون، لە شوێنی خۆیان بە دوای یەکدا کەوتبوون و شەلاڵی خوێن بووبوون، جەستەیان لە تەپوتۆز و خۆڵەمێش هەلاتبوو، تا ئەو وەختەی ژنەکان هاتنەدەر و ئاویان دانێ و زرێکانیان لەبەریان داکەناند و یارمەتییان دان تا هەستنەوە سەر پێ. قەشەکەمان بە ناو گۆڕەپانەکەدا گەڕا و نیشانەی خاچی لەسەر تەوێڵی مردووەکان دەکرد و چاوی دادەخستن. پاشان بریندارەکانی یەک لە دوای یەک بە شان هەڵدەگرت و دەیگەیاندنە خەستەخانە سەرپێییەکە. بەلام ئەسپەکە ڕەسەنەکەی فرانسیسکۆ ئەگێری کە بە برینێکی قووڵ بریندار بووبوو، تەنیا بە هێزی ئیرادەوە لەسەر قاچە لەرزۆکەکانی وەستابوو تا ئەو کاتەی بە کۆمەڵێک ژن توانییان سوارەکەی سەرپشتی داگرنە خوارێ؛ ئا لەو ئانەدا ئەسپی داماو سەری شۆڕ بووەوە و بەر لەوەی بەربێتەوە سەر زەوی گیانی دەرچوو. ئەگێری چەند برینێکی لە لەشیدابوو کە زۆر قووڵ نەبوون و لەشیی ئەوها کورش و وشک هەلاتبوو کە بە هیچ جۆرێک نەدەکرا زرێیەکەی لەبەری دامالن و هەتا چەکەکانیشی، بۆیە دەبووایە بۆ ماوەی زێتر لە نیو سەعاتێک لە گۆشەیەک لێی گەڕین تا هێزی بێتەوەبەر و بتوانێ بجولێ. دواجار ئاسنگەرەکە بە ناچاری حەربەکەی بە مشارێک لە دوولاوە بڕییەوە تا لە دەستە قرماوەکەی بیهێنێتە دەر و پاشان بە یارمەتی لەگەڵ ژنەکان زرێکەشی لەبەرداکەنی. بە هۆی گەورەیی کەلەشی ئەگێری و وشکهەلاتنی کە دەتگوت پەیکەرێکی برۆنزییە، ئەو کارەیان زۆر بە زەحمەت ئەنجام دا. بەلام مۆنرۆی و بیاگرا کە باری تەندروستییان لە هەموو سەرکردەکان باشتربوو، حەماسەتی بەرەنگاربوونەوەیان هەر دەجۆشا و خەیاڵیان بۆ ئەوە چوو کە هەندێ سەرباز کۆبکەنەوە و بە دوای دوژمن بکەون، وەلێ نە ئەسپێکیان دەستکەوت بتوانێ هەنگاوێک بچێتە پێش و نە سەربازێکی ساغیش مابوو لانی کەم بریندار نەبووبێت.

خـوان گۆمـێس بە درێژایی ئەو ڕۆژە وەک شـێر دەجـەنگا و هزریشـی هـەر لەلای سـیـسـیلیـا و کـوڕەکـەی بـوو کـە لـە ژێرزەمـینەکـەی ئێـمـە خـۆیان شـاردبووەوە. هـەرکـە شـەڕەکـە کۆتـایی هـات یەکسـەر چوو سـەری دەروازەی ژێرزەمـینـەکـەی هـەڵبگرێت، بـە چەنگان گڵـەکـەی سـەری لادەدا، چونکە هیچ خاکەناسێکی نەدۆزییەوە، ئاخر هێرشبـەرەکان هەموویان بردبوو. بە هـەمـوو تاقـەتی خـۆی تەخـتـەدارەکـانی لادا و گـۆڕەکـەی کـردەوە، سـەیری کـرد بۆشاییەکی ڕەش و تاریک و مات دیارە.

بە بارێکی ترسەوە هاواری کرد: سیسیلیا، سیسیلیا.

ئەو وەخـتـە لە بنی ئـەو تاریکاییـیـەکـە دەنگی ژنەکـەی هات: هـا ئەوە تۆی خوان، ئێمە وا خەریکە هەست بە بێزاری دەکەین.

هەرسێ ژنـەکـە لەگـەڵ منداڵەکـان مـاوەی دوازدە سـەعـات لەو ژێرزەمـینە تاریک و کەم هـەوا و بە بێ ئاو مابوونەوە و نەشیاندەزانی لەسەرەوە چ باسـە و چی ڕوو دەدات. سـیـسـیلیـا هـەردوو ژنە شـیـردەرەکـانی تێگەیاندبوو کـە لەو ڕۆژەدا بە نۆرە شـیـر بدەنە منداڵەکان و خۆشـی تەورێکی لە دەست گرتبـوو و ئامـادەبوو بەرگرییـان لێ بکات. لە سـایەی پایەدارمـان پاکیـزەی لێبووردەیی، هیچ دووکـەڵیـان بۆ نـەچووبوو، خۆ ڕەنگە لەبەر ئەوەبێت کـە دەروازەی چوونە ژوورەوەکەی باش بزر کرابێت، ئاخر خوان گۆمـیس کە بە خـاکەناسـان خۆڵی دەخستە سەری وای لێ کردبوو کەس هـەست نەکات ژێرەکەی بۆشە.

مـۆنڕۆ و بیـاگـرا هـەر بەو شـــەوە بڕیاریـان دا هـەواڵبـەرێک بۆ لای پێـدرۆ ڕەوان بکـەن تا لە کـارەسـەتەکـەی بگـەیەنن، بەڵام سـیـسـیلیـا کـە تـازە لە ژێرزەمینەکە هـاتبووە دەرێ و هـەر وەک جاران جـوان و شـۆخ بوو، زەینی دایێ کە هیچ هەواڵبـەرێک ناتوانـێ لە دوای جێبەجیکردنی ئـەو ئەرکە بە زیندوێتی دەرچێت، چونکە ئەو دۆڵە پڕبوو لە هندییـە دوژمنـەکان، وەلـێ سـەرکـردەکـان لەوە ڕانەهـاتوون کـە گـوێ لە ژنان بگرن، قسـەکانی ئەویان پشـتگوێ خـست.
ئەو وەختـە خـوان گۆمێس هـاتە قسـە و گوتی: داوا لە بەڕێزتان دەکەم کە گوێ لە ژنەکـەم بگرن. ئاخـر تۆڕی زانیـارییەکانی ئەو هـەمـیشـە سـوودێکی زۆرمـان

پێ دەبەخشیت.

ڕۆدریگۆ کە تازە هەردوو برینەکەیمان بە داخکردن چارەسەر کردبوو و لە بەر بێ خوێنی زۆر هیلاک و ماندوو دیاربوو، گوتی: ئەی دۆنیا سیسیلیا، پێشنیازەکەی تۆ چییە؟

- من دەڵێم تەنیا پیاوێک ناتوانێت بە ناو دوژمندا ڕەت بێ و ....

بیاگرا بە گاڵتەوە قسەکەی پێ بڕی و گوتی: کەواتە تۆ پێشنیازمان بۆ دەکەیت بە کۆترێکی نامەبەر خەبەرەکە ڕەوانکەین وا نییە؟

شاژنی ئینکا دووبارەی کردەوە: نەخێر، بەڵکو بەهۆی ژنەوە، نەک تەنیا ژنێک، بەڵکو بە چەند ژنێکدا ڕەوانی بکەن. من لەو دۆڵە ژمارەیەکی زۆر لە ژنانی کیچوایی دەناسم و ئەوان هەواڵەکە بە قسە یەک بۆ ئەوی تر دەیگوازنەوە تا دەگاتە حاکم و خێراتریش لە سەدان کۆتری نامەبەر.

لەبەرئەوەی کاتی ئەوەیان نەبوو زیاتری لەسەر بڕۆن، بڕیاریان دا بە هەردوو شێوەکە نامە ڕەوان بکەن: بەو ڕێگەیەی کە سیسیلیا پێشنیازی کردبوو و ڕەوانکردنی هندییەکی یاناکۆنای لەشسووک لە چەشنی کەروێشک کە بتوانێ بە شەوێک دۆڵەکە ببڕێت و خۆی بگەیەنێتە پێدرۆ. بە داخەوە دەیڵێم کە ئەو خزمەتکارە دڵسۆزە دەکەوێتە دەست دوژمن و وەختی بەیانی بە لێدانی کوتکێک کوشتبوویان. چاکتروایە بیر لە چارەنووسی ئەو نەکەینەوە کە ئەگەر بکەوتایە دەست میشیمالۆنکۆ داخوا چی بەسەر دەهات؛ ئاخر گومانی تێدا نییە ئێستا سەرۆک تووڕەیە لەوەی هێزەکەی تێکشکاوە و ناتوانێت هیچ بیانوویەک بدۆزێتەوە بۆ مابۆچییەکانی خواروو کە چۆن بە چەند ڕیشدارێکی کەم توانیان هەشت هەزار جەنگاوەری ئەوان ببەزێنن. ئێ خۆ ناکرێت بڵێت ژنە سیحربازێک هات و سەری سەرۆک خێڵەکانی وەک کاڵەک بە هەوادا فڕێ دەدا. ئاخر ئەو وەختە بەترسنۆک ناوزەدی دەکەن کە ئەوە گرانترین قسەیە بە جەنگاوەرێک بگوترێ. ئەو وەختە ناویشی ناچێتە ناو ئەو داستانانەی کە لە نێو خێڵەکان ڕێک دەخرێن و لەسەر زاران دەگوترێنەوە، مەگەر بە گاڵتەیەکی

نەخواستراوەوە شتی لەسەر بڵێنەوە.

ئەو ڕێگەیەی کە سیسیلیا پێشنیازی کردبوو سەرکەوتنی بە دەستهێنا و لە ماوەی بیست و شەش سەعات خەبەر گەیشتە پێدرۆ. هەواڵەکە لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر بە درێژایی و پانایی دۆڵەکە فڕی و دارستان و کێوەکانی بڕی و گەیشتە بالدیبیا کە ئەو کاتە بێهوودە بە دوای میشیمالۆنکۆدا دەگەڕا و نەیدەزانی فێڵی لێ کراوە.

وەختێ ڕۆدریگۆ بە ناو وێرانەکانی سانتیاگۆدا گەڕا و لیستێکی لە بارەی زیانەکانەوە ئامادە کرد و دایە مۆنرۆی، سەردانی منیشی کرد. لە جیاتی ئەو کەسە پیس و پۆخڵ و شێتە تووڕەیە ببینێ کە کە لە خەستەخانە سەرپێیەکە بەجێی هێشتبوو، کەچی منی بە خاوێنی و پڕهۆش و زیندووی وەک جاران ئاسایی بینییەوە و خەریکی چارەسەرکردنی بریندارەکان بووم. زمانی تێکئالا و گریان قوڕگی گرتبوو و گوتی: دۆنیا ئێنیس!... سوپاس بۆ خوا...

منیش وەڵامیم دایەوە: زرێکانت داکەنە با برینەکانت تیمار بکەین.

– من وام زانی تۆ... ئەی خوایە! ئەی دۆنیا ئێنیس تۆ بووی ئەو شارەت ڕزگار کرد. تۆ بووی وات کرد دڕندەکان ڕابکەن...

– وا مەڵێ. ئاخر ئەوە ناهەقییە بەرامبەر ئەو پیاوانەی کە ئازایانە دەجەنگان و بۆ ئەو ژنانەش کە یارمەتییان دان.

– سەرکەکان... دەیانگوت ئەو سەرکانە وەختێ لە ئاسمان دەهاتنە خوارەوە سەیری هندییەکانیان دەکرد، ئەوانیش باوەڕیان وابوو کە ئەمە نیشانەی بەدبەختییە، بۆیە کشانەوە و هەڵاتن.

– من نازانم باسی چی دەکەیت ئەی ڕۆدریگۆ، تۆ تەواو هەڵەی. یاڵڵا کاتالینا یارمەتی بدە تا زرێکەی داکەنێت.

***

لەو چەند سەعاتەدا توانیم ڕەفتارەکانی خۆم هەڵسەنگێنم. ئاخر بە درێژاییی ئەو شەوە و سبەینەی ڕۆژی دواتریش بێ وەستان بریندارەکانم

چارەسەردەکردن و هەوڵم دەدا لە نێو خانووە سووتاوەکان تا پێم دەکرێت ئەوانەش ڕزگار بکەم کە لە دەستم دێت، وەلێ بە لایەکی هزرم گفتوگۆم لەگەڵ ژنە پاکیزەی گەورەمان دەکرد و لێی دەپاڕامەوە کە لە پێناوی بووردنی ئەو تاوانانەی کە ئەنجام دەدەرێن کاریگەری بنوێنێ. نیوەکەی تری هزریشم هەر لە لای پێدرۆ بوو. وام پێ چاکبوو خەیاڵ لە کاردانەوەی ئەو نەکەمەوە لەو وەختەی کە چاوی بە وێرانبوونی سانتیاگۆ دەکەوێت و دەزانێت کە حەوت دەستبەسەرەکەی نەماوە و ئێمە لە ژێر ڕەحمەتی دوژمنین و هیچ شتێکمان نەماوە گفتوگۆی لەگەڵ ئەوان لەسەر بکەین. چۆن پاساو بۆ ئەو ڕەفتارانەی خۆم بێنمەوە کە ئەنجامم داون و ڕوونیان کەمەوە کە خۆم بە تەواوی تێیان ناگەم؟ ئەگەر پێی بڵێم کە من شێت بووبووم و هیچ شتێکم لە ڕووداوەکان نایەتەوە بیر، ئەوا بیانوویەکی پووچە و سەرناگرێت؛ هەروەها من شەرم لەو دیمەن قێزەونانەی خۆم دەکەمەوە کە لە بەرچاوی سەرباز و ئەفسەرەکانی ئەودا پێیەوە دیاربووم. پاش ئەوە لە دوای سەعات دووی نیوەڕۆی ڕۆژی دوازدەی ئەیلول، ئەوەندە ماندوو و هیلاک بووبووم، خەو بردمییەوە و چەند سەعاتێک لەسەر ئەرزەکە ڕاکشام و لە تەک بەڵستارەوە نووستم کە لە بەیانییەوە بە ڕاکێش ڕاکێش بە قاچی شکاوەوە خۆی گەیاندبووە کنە من و خوێن بە لاجانگیدا دەهاتە خوارێ. ئەو سێ ڕۆژەی دواتر وەک چرکەساتێکی خێرا ڕەتبوون و لەگەڵ ئەوانی تر و خۆڵ و دار و بەردە ڕووخاوەکانمان نەدەهێشت و ئاگرەکامان دەکوژاندەوە و گۆڕەپانەکەمان ڕێک دەخست. ئاخر ئەوە تاکە شوێنێک بوو کە دەمانتوانی لەوێوە لە هێرشێکی تردا بەرگری لە خۆمان بکەین و بە دووریشمان نەدەزانی لە پڕێکا پەلامارمان بدەنەوە. من و کاتالینا ڕۆیشتین و لە کەلێن و درزە سووتاو و خۆڵەمێشەکانی زەوییە کێڵراوەکان بە دوای شتێکدا دەگەڕاین کە بۆ خواردن بشێت و بیخەینە ناو شۆربایەکە. دوای ئەوەی ئەسپەکەی ئەگێریمان لە دەستچوو، بڕێکی زۆر کەم خۆراکمان مابوو؛ ئێمە گەڕابووینەوە ڕۆژگاری مەنجەڵە هاوبەشەکان، تەنیا لەوە جیاوازبوو کە ئەو مەنجەڵانە جگە لە گیا و ئاو و سەلکی هەندێ ڕووەک

کە لە زەویدا دەرمان دەهێنا، شتێکی تری تێدا نەبوو.

ڕۆژی چوارەم پێدرۆ لەگەڵ دەستەیەک کە لە چواردە سوار پێکهاتبوو، گەیشتەوەجێ و سەربازە پیادەکانیش بە پەلە و خێرا ڕۆیشتنەوە بە دوایانەوە بوون. حاکم بە سواری ئەسپە شاهاناکەیەوە چووە ناو ئەو وێرانەیەی کە پێمان دەگوت شار. بە چاوخشانێک قەبارەی زیانەکانی مەزەندە کرد. بە شەقامەکاندا ڕۆیشت، هێشتا لەوێ دووکەڵ بەرز دەبووەوە وەک هێماکردنێک بۆ شوێنی خانووە کۆنەکان. چووە گۆڕەپانەکە و لەوێ چاوی بەو ژمارە کەمەی خەڵکەکە کەوت کە شڕ و برسی و تۆقیو دیاربوون و ئەو بریندارانەشی بینی کە پارچە پەڕۆکی پیس برینەکانیان پێچرابووەوە و سەرنجی ئەفسەرە بێ سەروبەرەکانی دا کە ئەوەندەی یاناکۆناکان نائومێد دیاربوون و خەریکی بە تەنگەوەهاتنی خەڵک بوون. یەکێ لە پاسەوانەکان فووی لە بووقەکەی کرد؛ ئەوانەی تاقەتیان هەبوو هەستانەوە سەر پێ و لە تەک یەکتری ڕیزبوون تا سڵاوی سەرکردەی گشتی بسێننەوە. من لە دواوە مامەوە و لە نێو قوماشی خیوەت خۆم نیمچە حەشاردابوو. لەوێوە پێدرۆم بینی و ڕوحم بە خۆشەیستی و خەمباری و هیلاکی هاتە جۆش. لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە لەسەر پشتی ئەسپەکەی دابەزی و بە پێیان ڕۆیشت، بەرلەوەی دەست لە ملی هاوڕێکانی بکات، چاوێکی بە سەر وێرانییەکەدا گێڕا، بە ڕوخسارێکی ڕەنگپەڕیوەوە بە دوای مندا دەگەڕا. هەنگاوێک چوومە پێش بۆ ئەوەی بمبینێ و بزانێت کە هەروا لە ژیاندا ماوم. وەختێک نیگاکانمان لێک گیربوون و ئەویش ئاکار و ڕەنگی ڕوخساری گۆڕا. بە هەمان ئەو دەنگەی کە عەقڵانییەت و دەسەڵات دەنوێنێ و کەس ناتوانێ لە ڕووی بوەستێ، ڕووی لە سەربازەکان کرد تا ستایشی ئازایەتی یەک بە یەکەیان بکات، بەتایبەتی ئەوانەی لە ئانی بەرگریکردندا کوژران، هەروەها سوپاسی بۆ خواناسی سانتیاگۆ نارد کە ئەو خەڵکانەی پاراستووە. گرینگ نییە شار وای لێ هاتووە، چونکە هێشتا دەست و دڵی بەهێز ماون بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی. پێویستە سەرلەنوێ دەستپێکەینەوە و گوتی ئەمە نابێتە هۆی بێزاری و نائومێدی، بەڵکو دەبێتە

سەرچاوەی خولّقاندنی ورە بۆ ئیسپانییە ئازاکان کە هەرگیز کۆڵدان ناناسن و بۆ ئەو یاناکۆنا دڵسۆزانەش کە هاریکارمانن. شمشێرەکەی بەرز کردەوە هاواری کرد:" خواناسی سانتیاگۆ، دەبا ئیسپانیا یەکگرتووبێت". هەموو پیاوەکانی بە جارێک وەڵامیان دایەوە:" خواناسی سانتیاگۆ، دەبا ئیسپانیا یەکگرتووبێت"، بەڵام نەبرەیەکی نائومێدانە لە دەنگیانەوە بەدی دەکرا.

بۆ شەوەکەی، لە کاتێک ئێمە لەسەر ئەرزەکە پاڵکەوتبووین، هیچ نوێنمان نەبوو جگە لە بەتانییەکی پۆخڵ و پارچە قوماشێکی خیوەت کە بەسەر خۆمان دادابوو، لەماندوێتییان لە باوەشی پێدرۆ لە پرمەی گریانم دا. ئەو بە چەند جۆرێک چیرۆکی ئەو جەنگەی گوێ لێ بووبوو و بیستبووی کە من چ رۆڵێکم هەبووە و بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە من لێی دەترسام، شانازیکردنی خۆی بۆ من دەربڕی، وەک خۆی گوتەنی، هەر وەک چۆن هەموو سەربازانی سانتیاگۆ شانازییان پێوە دەکردم؛ ئاخر ئەگەر وام نەکردایە، رەنگە هەموو بکەوتبایناتە چارەنووسێکی نادیار. هیچ گومانم لەوە نەبوو کە ئەو چیرۆکە ئازایەتییەیان بە زیادەوە بۆ ئەویان گێڕابووەوە و ئیتر ئەفسانەکە وا بڵاو بووەوە کە من شارەکەم رزگار کردووە. ئەو وەختەی لەگەڵ پێدرۆ بە تەنیا مااینەوە بەو جۆرە لێی پرسیم: ئایا راستە کە تۆ سەر حەوت سەرۆک خێڵەکەت بە دەستی خۆت سەربڕیوە؟

منیش بە راست و دروستی وەڵامیم دایەوە: من نازانم.

پێدرۆ پێشتر قەت منی بە گریانەوە نەبینیبوو، چونکە من ژنێکی گرینۆک نەبووم و بە ئاسانی چاوەکانم فرمێسکیان هەڵنەدەڕشت، وەلێ یەکەم جار دڵنەوایی نەدامەوە، تەنیا چەند گاڵتەیەکی شیرینی لەگەڵ کردم وەک جارانی تر. ئەو رۆژە ئاکاری دەموچاوی دەتگوت لە بەرد هەڵکەندراوە و دەمی رەقهەڵگەرابوو و چاوەکانیشی لە ئاسمان کردبوو. منیش بە گریانەوە گوتم: ئەی پێدرۆ من زۆر دەترسم.

– لە مردن؟

– لە هەمـوو شـتـێک تەنیا لـە مـردن نەبێت، چـونکە سـاڵانێکی زۆرم لە بەردەم ماوە تا دەگەمە پیرێتی.

بە لالووتییـەوە بەو سـوعبـەتە پێکەنی کە هـەمـوو جارێک لە نێـوان خـۆمـان دەمانکرد کە گوایە من چەند مـێردێک لە گـۆڕدەنێم و هـەر بـە بێوەژنەکی تەڕ و سەرنجڕاکێش دەمینێمەوە.

– پیاوەکان دەیانەوێ بگەڕێینەوە پێرۆ، وەلێ کەسیـان تا ئێسـتا جەسـارەت ناکەن ئەوەی بڵێن، نەبادا ترسنۆک دیاربن، ئاخـر ئەوان وا هـەست دەکەن کە دۆڕاون.

– ئەدی تۆ، چیت دەوێ ئەی پێدرۆ؟

بێ ئەوەی دوو جـار بیـری لێ بکاتەوە گـوتی: دەمـەوێ لەگـەڵ تۆدا شـیلی دروست بکەم.

– کەواتە وا دەکەین.

– بەڵێ ئەوە دەکەین ئەی ئێنیسی ڕوحم...

بیـــرهاتنەوەی ڕابردووی هـەرە دوورم زۆر بەهـێـــزە و دەتوانم هەنگاو بـە هەنگاو وردەکـاری ئەو ڕووداوانەی بیـست تا سـی سـاڵی یەکـەم بگێڕمـەوە لە دوای جێنشینبوونمان لە شـیلی، لێ ئەو وەختـەم نەماوە، چونکە چارەنووس، ئەو دایکە مـیـهـرەبانە، بانگم دەکات و دەیـەوێ بە دوای کـەوم تا دواجـار لە باوەشی ڕۆدریگۆ بحەسێمەوە. تارمـاییەکانی ڕابردوو دەوریانداوم. خوان دی مەلەگە، پێدرۆ دی بالدیبیا، کاتالینا، سیبستـیان ڕۆمێرۆ، دایکم و داپیرەم لە بلاسینشیا و تارمـاییـەکی زۆری تریش، شـێوەی زۆر بتـەوتر وەردەگرێ و لە ڕێڕەوەکـانی مـاڵەکـەمدا گوێم لە چرپەی دەنگیـانە. دەبێ ئەو حـەوت سـەرۆک خێڵە بە شـێوەیەکی هەمیشـەیی لە ئاسمـان یان لە دۆزەخ بگیرسێنەوە، چونکە قەت بۆ ئەشکەنجەدانم نەهاتوون.

من نەخـرفـاوم وەک چۆن پیـرەکـان ئاسـایی وایان بەسـەردێت، ئاخـر من هێشـتا بە تاقەتم و سەریشم لە نێوان هەردوو شانمدا چەسپاوە، وەلێ یەکێک

لە پێیەکانم دەخەمە ئەودیوی ژیان، بۆیە ئەوەی من دەیبینم و گوێم لێی دەبێت کەسێکی تر نایبینێ و نایبیستێ. تۆ ئەی ئیزابێل کاتێ ئاوا دەدوێم نیگەران دەبیت؛ ئامۆژگاریشم دەکەیت تا نوێژ بکەم، چونکە نوێژکردن وەک تۆ دەڵێی، ڕوح ئارام دەکاتەوە. من ڕوحم ئارامە و لە مردنیش ناترسم، بەڵکو قەت لێی نەترساوم، هەتا ئەو کاتانەش کە ترسان حیکمەتێکی تێدا هەبووە، جا چۆن ئێستا بترسم. من لە حەقی خۆم زێتر ژیاوم و تۆش تەنیا کەسێکی کە بوویە مایەی مانەوەی من لەو دنیایە. من پێی لێ دەنێم کە هەست بە هیچ کەمایەتییەک ناکەم وەختێ نەوەکانی خۆم دەبینم گەورە دەبن و زەحمەت دەکێشن، پێم چاکترە یادەوەری پێکەنینە منداڵانەکەیان لەگەڵ خۆم هەڵگرم. من وەک خوو پێوەگرتن نوێژان دەکەم نەک بۆ چارەسەرکردنی خەمەکانم. قەت بێ بروا نەبوومە، وەلێ لەگەڵ بەسەرچوونی ساڵەکان، پەیوەندییەکانم لەگەڵ خوا گۆڕانیان بەسەرداد‌ێت. هەندێ جار بێ بیرکردنەوە بە نەگینیچین بانگی دەکەم و پاکیزەی بەزەیی و خاکی پیرۆزی دایکی باوەڕدارە مابۆچییەکانم لێ تێکەڵ دەبێت. بەڵام ئەوەندەی جاران خۆم بە کاسۆلۆکی دەزانم - جا با خوا ڕزگارم بکات! -، گرینگ ئەوەیە مەسیحییەتەکەم نەختێ فرەوان بووە وەک ئەو جلوبەرگە خورییانەی کە زۆر لەبەر دەکرێن. من تەنیا چەند حەفتەیەکی کەمم لە ژیاندا ماوە، ئەوەی چاک دەزانم، چونکە دڵم هەندێ جار لە بیری دەچێت لێ بدات، ئیتر تووشی سەرەسووڕەم دەکات و دەکەومە سەر زەوی و ئیشتیای خواردنم نامێنێت. ئەوە ڕاست نییە کە من هەوڵم دابێت بە برسێتی کۆتایی بە ژیانی خۆم بێنم، تەنیا بۆ ئەوەی تۆی پێ هەراسان بکەم، وەک ئەوەی تۆ تاوانبارم دەکەیت ئەی کچەکەم، بەڵکو لەبەر ئەوەیە نان ناخۆم چونکە تامی خواردنەکان لە دەمی من هەمووی وەک هی ئاردی لێ هاتووە و ناتوانم قووتیان بدەم، بۆیە تەنیا چەند قومێک شیر دەخۆمەوە. زۆر لەڕولاواز بوویمە و وەک پەیکەرێکی ئێسقان دیارم کە بە پێست داپۆشرابێت، وەک ئەوانەی ڕۆژگاری گرانی و برسێتی. تاکە جیاوازی ئەوەیە من ئەو کات گەنج بووم. پیری لاواز مایەی بەزەیی پێهاتنەوەیە، هەردوو گوێچکەکانم زۆر گەورەبوونە و

تەنیا بە شنە بایەک لە سەر دەم دەکەومە سەر زەوی.. پێویستە ئەو چیرۆکە کورت بکەمەوە، دەنا مردووێکی زۆر زیندانیی ناو نووسینەکەم دەبن. مردووەکان، هەموو پیاوە ئەویندارەکانم لە مردووەکانن، ئەوەش باجی تەمەن درێژییە وەک ئەوەی من ژیام.

# بەشی پێنجەم

## ساڵە کارەساتبارەکان، ١٥٤٣ – ١٥٤٩

لە دوای وێرانبوونی سانتیاگۆ، ئەنجوومەنی شارەوانی بۆ بڕیاردان لەسەر چارەنووسی ئەو کۆمەڵە ئاوارە بچووکەمان کە هەڕەشەی لە ناوچوونی لەسەر هەبوو، کۆبوونەوە. بەر لەوەی بیری گەڕانەوە بۆ کۆسکۆ زاڵبێت کە زۆربەیان پشتگیرییان لێی دەکرد، پێدرۆ هەیبەتی دەسەڵاتەکەی داسەپاند و زنجیرەیەک مەرجی خستە پاڵ کە زۆر زەحمەت بوو پێیان جێبەجێ بکرێت، بۆ ئەوەی بوو بمانهێڵێتەوە. فەرمانی دا کە یەکەم جار دەبێ داوای یارمەتی لە پێرۆ بکەین، پاشان شوورەیەک لە دەوری سانتیاگۆ دروست بکەین کە بتوانێ چەشنی شارە ئەوروپییەکان بەرپەچی هێرشی دوژمنان بداتەوە. هەروەها دووبارەی کردەوە کە شتەکانی تر دوایێ خۆیان چارەسەر دەبن و پێویستە بڕوامان بە ئایندە هەبێت و زێڕ و زیو و زەویشمان دەبێت و هندییەکانیشمان بەسەر دابەش دەکرێت تا کاری تێدا بکەن. هندی؟ نازانم باسی چ جۆرە هندییەکی دەکرد، ئاخر هندییەکانی شیلی هیچ نیشانەیەکی ملکەچییان پێوە دیار نەبوو.

پێدرۆ فەرمانی خۆی دایە ڕۆدریگۆ کە زێڕەکانیان کۆبکاتەوە، لە پارچەی پارە کەمەکانەوە کە هەندێ لە سەربازەکان پاشەکەوتیان کردبوو و لە نێو پێڵاوەکانیان دەیانشاردەوە، هەتا ئەو کەڵەشێرە زێڕینەی کەنێسە و ئەو بڕە زێڕە کەمەش کە لە کانگەی مارگا – مارگا دەریان هێنابوو، ئەوانەشیان هەمووی کۆکردەوە و گشتیان دایە ئاسنگەرەکە، ئەویش هەمووی تواندەوە و زرێیەکی کامڵ و لغاوێک و دوو ڕکێبی ئەسپ و دوو مامزە و نەخشی

شمشێریکی لێ دروست کرد. ئیتر ئەوانەی هەموو بە زێری ساف ڕازاندەوە بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکەکەی پێ ڕاکێشێ و شیلییان لە بەرچاو شیرین بکات. سەرکردەی ئازا ئەڵەنسۆ دی مۆنرۆیان بە ڕێگەی بیاباندا لەگەڵ پێنج سەربازی تر و شەش ئەسپی ساغ بۆ پێرۆ ڕەوان کرد. قەشە گۆنزالس مارمۆلیخۆ پیرۆزی کردن و ئێمەش لەگەڵ بەڕێکردنیان بە خەفەتەوە ماڵئاواییمان لێ کردن، چونکە نەماندەزانی داخوا جارێکی تر دەیانبینینەوە یان نا.

سەبارەت بە ئێمە ساڵانێکی پڕ لە دەردەسەری دەستی پێ کرد، حەز دەکەم لە بیری خۆمی ببەمەوە، هەروەک چۆن حەز دەکەم مردنی پێدرۆشم لە بیر بچێتەوە، بەڵام ناتوانین حوکم بە ئاراستەی بیرکردنەوە و کابووسەکان بکەین. دەستەیەک لە سەربازەکانمان بە نۆبەت شەو و ڕۆژ پاسەوانییان دەکرد و ئەوانی تریش بوونە جووتیار و پیشەوەری بینا دروستکردن، زەوییان دەکێڵا و خانووەکانیان چادەکردەوە و شوورەکەیان بەرز دەکردەوە تا پارێزگاری لە شار بکات. ئێمەی ژنانیش شانبەشانی سەرباز و یاناکۆناکان ئیشمان دەکرد. جلوبەرگێکی کەممان هەبوو، چونکە زۆربەیان سووتابوون؛ پیاوەکان لە ناوقەدەوە وەک خەڵکەکەی ئەوێ بەرگیان دەپۆشی. ژنەکان شەرمیان لە بیر نەما و بە کراسەوە دەسووڕانەوە. ئەو دوو زستانە زۆر سارد و سۆڵ بوون، جگە لە من و کاتالینا، هەموو تووشی نەخۆشی بوون، چونکە هەروەک قەشە گۆنزالس بە سەرسوڕمانەوە دەیگوت کە ئێمە پێستمان وەک هی هێستر وایە. جگە لە هەندێ بەروبوومی ئاقاری ئەو دۆڵە، خۆراکمان نەمابوو: سنۆبەر، هەندێ بەروبوومی تاڵ، ڕەگی هەندێ ڕووەک کە بەشەر و ئەسپ و ماڵات وەک یەک دەیانخوارد. بەڵام ئەو دانەوێڵەیەی کە لە سووتان ڕزگاری بووبوو، ئەوا بۆ دووبارە چاندنەوە بەکارمان هێنا و ئیتر ساڵی دواتر ڕوبەیەک گەنممان دەستکەوت، دیسان چاندمانەوە، بە جۆرێک تا ساڵی سێیەم ئەوجا نانمان لێ دروست کرد. نان خۆراکی ڕوح، چەند تامەزرۆی بووین! ئەو وەختەی شتێکمان نەما تا سەرنجی کۆراکا بیتاکۆرا ڕاکێشێت تا

لەگەڵیان بیگۆڕینەوە، پشتیان تێکردین و ئیتر گەنمەشامی و فاسولیامان لێ بزربوو کە پێشتر بێ بەرامبەرلێمان وەردەگرتن. دەبووایە لە ناچاری سەربازەکانمان بەسەر گوندەکاندا بدەن و گەنم و پەلەوەڕ و بەتانی و هەرچییەکیان دەستکەوێت وەک ڕێگر بیدزن و بیهێنن. وا بزانم تیرەی بیتاکۆرا لە کیچواکان کەلوپەلە پێویستییەکانیان نەدەشاردەوە، بەڵام هندییە مابۆچییەکان بە دەستی خۆیان دەغڵودانەکانی خۆیان ئاگر تێبەردا و ئامادەبوون خۆشیان لەگەڵ ئێمە لە برسان بمرێن. ئیتر بە گوشاری برسێتی دانیشتووانی گوندەکان بەرەو خواروو پەرتەیان لێ کرد. ئەو دۆڵەی کە پێشتر لە چالاکی جمەی دەهات، هیچ خێزانێکی لێ نەما، وەلێ جەنگاوەرەکانیان نەڕۆیشتن. میشیمالۆنکۆ و هێزەکەی لە پەلاماردانمان نەدەوەستان و هەموو دەمێک ئامادەبوون بە خێراییی برووسک هێرشمان بکەنە سەر و پاشان لە دارستانەکە خۆیان بزر بکەنەوە. ئەوانە بەردەوام دەغڵودانی ئێمەیان دەسووتاند و ماڵاتەکانیان دەکوشتین، ئەگەر بەبێ پاسەوانی چەکدار دەرچووینایە لەناویاندەبردین بە جۆرێک لە ناو شوورەی سانتیاگۆدا بووینە زیندانی. نەمدەزانی میشیمالۆنکۆ چۆن خواردن بۆ پیاوەکانی پەیدا دەکات، ئاخر ئەوان وازیان لە کشتوکاڵ هێنابوو. فیلیپ، ئەو منداڵە مابۆچییە لە وەڵامی مندا دەیگوت:" ئەوان بە خواردنێکی کەم ژیان دەبەنە سەر، دەتوانن بە چەنگە سنۆبەرێک چەند مانگێک بژین". هەروەها دەیگوت ئەوان جۆرکێک بە ملیانەوە دەکەن و گۆلێک دەنکە سنۆبەری سوورکراوەی تێدایە و بۆ ماوەی حەفتەیەک پێی دەژین.

حاکم بە خۆڕاگری و گەشبینییەکەی خۆی کە قەت لاواز نەدەبوون، خەڵکە بێتاقەت و نەخۆشەکانی ناچار دەکرد زەوی بکێڵن و خشت ببڕن و شوورەی بتەو دروست بکەن و سەنگەر لە دەرەوەی شار لێ بدەن و ڕاهێنان لەسەر شەڕ بکەن و دەیان کاری تریشی پێ دەسپاردن، دووبارەی دەکردەوە کە تەمبەڵی ورەی مرۆڤ زێتر تێک دەشکێنێ. ئەمەیان ڕاستبوو، ئاخر کەس لە نێو ئێمەدا نەبوو لە دەست بێزاری و نائومێدی ڕزگاری بێت، ئەگەر کاتی

ئەوەی هەبووایە بیر لە چارەنووسی خۆی بکاتەوە، بەڵام ئەو کاتەمان نەبوو، چونکە هیلاکی لە بەیانییەوە بۆ ئێواران تا دنیا تاریک دادەهات کارکردن بەردەوام بوو. ئەگەر بوارمان هەبووایە هەندێک بە نوێژکردنەوە خەریک دەبووین کە ئەو وەختەشمان نەبوو. خشت بە خشت دیواری شوورەکە بە دەوری سەنتیاگودا بەرز دەبووەوە تا گەیشتە دوو بەژن، بە تەختەی داریش کەنیسە و خانووەکان کەوتنەوە سەرپێ. من و ژنەکانیش ئەوجلانەمان پینەدەکردەوە کە نەدەبوو چیتر بیانشۆرین، تا لە ناو ئاودا داوەکانی هەڵنەوەشێنەوە. هەروەها جلی پۆشتەمان لەبەرنەدەکرد تەنیا لە بۆنە تایبەتەکان نەبێت. خۆ ئەو بۆنانەش هەبوون و هەموو وەختێکمان هەر خەم و حەسرەتکێشان نەبوو. ئێمە لە بۆنە ئاینییەکان و زەماوەند و هەندێ جاریش لە کەشی تەعمیدکردن، ئاهەنگمان دەگێڕا. چەند ناخۆشە ڕوخساری خەمبارانەی ئەو خەڵکە ببینیت و سەرنجیان بەدەیت کە چاویان چۆن بە چاڵدا چووە و دەست و پەنجەکانیان وەک ڕنۆکیان لێ هاتووە و نائومێدی بەسەریاندا زاڵە. من زۆر لاواز بووبووم، هەتا وەختێک کە لە سەرپشت لە سەرجێگە پاڵدەکەوتم، ئیسکی دەندە و چەڵەمە و کەفەڵم بەرز دیاردەکەوتن و دەمتوانی هەست بە ئەندامەکانی ناوەوەی جەستەم بکەم کە تەنیا بە پێستێک داپۆشرابوون. لە دەرەوەڕا ڕەق هەڵگەڕابووم و جەستەم وشک بووبووەوە، وەلێ دڵم لە جاران نەرمونیانتر بووبوو. هەستم بە خۆشەویستییەکی دایکانە دەکرد بەرامبەر ئەو خەڵکە داماوانە و خەونم بەوە دەبینی مەمکەکانم پڕ لە شیربن و هەموویان تێرکەم. پاشان ڕۆژانێک داهات برسێتیم لە بیر کرد و لەگەڵ ئەو هەستانەش ڕاهاتم کە هەندێ جار بە خاوی و سووکی تووشی هەڵبزرکانی دەکردم. لەو ساتانەی هەڵبزرکاندا بەرازی سوورکراوەم نەدەبینی بە سێوێک لە دەمی و گیزەرێک لە دواوەی ڕازابێتەوە، وەک هەندێ سەرباز کە هەمیشە قسە و باسیان لەسەر ئەو شتانە بوو، بەڵکو من چەندان دیمەنی ئاڵۆزاویم دەبینی کە بە تەم دەوریان گیرابوو و مردووش تێیاندا پیاسەیان دەکرد. بە هزرمدا هات کە بە پێداگرتن لەسەر پاک و خاوێنی مامەڵە لەگەڵ

ئەو کلۆڵییەدا بکەم، چونکە ئاوێکی زۆرمان هەبوو. ململانێیەکی توندم لەگەڵ کێچ و ئەسپێ و مێشوولە و پیسی دەست پێ کرد، بەڵام ئەوە بووە مایەی بزربوونی جرج و سیسرکە و زیندەوەری تر کە بۆ هەندێ شت سوودیان هەبوو؛ بۆیە وازمان لە بەکارهێنانی سابوون هێنا.

برسێتی شتێکی سەیرە، تاقەتت لەبەر ناهێڵێ و خاو و خەمبارمان دەکات، وەلێ هۆشت دەکاتەوە و ئارەزووی سێکست دەجولێنێ. ئەو پیاوانەی وەک پەیکەری ئێسکیان لێ هاتبوو و نیمچە رووتبوون ئارەزوویان هەڵدەستا و بە دوای ژناندا دەگەڕان کە ئەوان لەبرسان دەمردن و سکیشیان پڕ دەبوو. لە ماوەی برسێتیدا ژمارەیەک منداڵ لە دایک بوون، وەلێ زۆربەیان نەیانتوانی لە ژیاندا بمینێنەوە، سەرەڕای ئەوەش ژمارەیەک منداڵی تر مردن کە پێشتر هەمانبوو، ئەوانەیش کە مابوونەوە ئێسک و دەندەیان لەو گۆڕە بوو و سکیان ئاوسابوو و چاویان وەک هی پیر و کەنەفتەکانی لێ هاتبوو. ئامادەکردنی شۆربای هاوبەش بۆ ئیسپانییەکان کارێکی ئەوەندە خەتەرناک بوو کە چیوای لە خەتەری هێرشە کتوپڕەکانی میشیمالۆنکۆ کەمتر نەبوو. لە مەنجەڵێکی گەورە ئاومان دەکولاند هەندێ گیا و ئەو خۆراکە ڕووەکیانەمان دەخستە ناوی کە لە دۆڵەکەدا هەبوون – تاجی چیا و گەڵای مێو و بۆلدۆ و مایتین – پاشان لەو خۆراکە یەدەگەی خۆمان هەندێکمان تێ دەکرد: گۆلێک گەنمەشامی یان فاسولیا، کە ئەویش بەرەو تەواوبوون دەچوو، لەگەڵ پەتاتە و ئەو سەلکانەی لە دارستاندا دەمانکرد و هەر جۆرە کەپەکێک کە دەستمان بکەوتایە: ڕەگی ڕووەک و جرج و کرم و شتی تریش. بە فەرمانی خوان گۆمێس کە فەرمانبەری دادگابوو لە شارە بچووکەکەمان، دوو سەربازی چەکدار لە بەردەستی مندابوون تا شەو و ڕۆژ پاسەوانی لە خۆراکە کەمەکەمان بکەن کە لە ژێرزەمین و مەتبەخەکە دامان نابوو، لەگەڵ ئەوەش جارویار چەنگێک گەنمەشامی یان هەندێک پەتاتە دیارنەدەما. من لە ئاست ئەو دزییە دڵتەزێنانە خۆم بێدەنگ دەکرد، چونکە گۆمێس بە قامچی سزای خزمەتکارەکانی دەدا، کە ئەمەش باری دەروونی ئێمەی زێتر ئاڵۆز دەکرد. ئێمە بەشی خۆمان خەم و

خەفەت هەبوو و پێویستمان بە خەمی تر نەبوو. گەدەی خۆمان بە نەعناع و زەیزەفوونی کولاو فریو دەدا. ئەگەر یەکێ لە ماڵەتەکانمان بمردایە لاشەکەیمان هەمووی بەکار دەهێنا: بە پێستەکەی خۆمان دادەپۆشی، بە بەزەکەی مۆممان دروست دەکرد، هەناویمان لە مەنجەڵ دەکرد و سمەکانمان بۆ دروستکردنی کەرەسەی ئیش بەکار دەهێنا و ئێسقانەکانیشمان لە شۆربا دەکرد بۆ ئەوەی تامی خۆش بکات و جار دوای جار لەگەڵ شۆرباکە دەکولا تاوەختێک دەتوایەوە و دەبووە خۆڵەمێش. هەندێ پارچە چەرمی وشکمان دەکولاند دەماندایە دەست منداڵەکان تا بیمژێت و برسێتییەکەی لەبیر بکات. ئەو بەچکە ئاژەڵانەی لەو ساڵەدا بوون، هەرکە لە شیردەبوونەوە یەکسەر دەمانخستنە ناو مەنجەڵ، چونکە ئەوەندە خۆراکەمان نەبوو ئەو هەموو سەگە بەخێو بکەین، وەلێ هەموو هەوڵێکمان ئەوەبوو سەگەکانی ترمان نەتۆپن، چونکێ هێلّی یەکەمی بەرگری بوون لە بەرامبەر هێرشی دانیشتووانی ڕەسەنی ئەوێ، ئیتر بەو جۆرە سەگە بەوەفاکەم بەڵستار ڕزگاری بوو.

فیلیپ هەر لەخۆیەوە دیقەتێکی بەهرەدارانەی لە تیرهاوێشتن هەبوو، چاوی لە هەر کوێیەک بکردایە تیرەکەی بۆ ئەوێ دەچوو. ئەو کوڕە بەردەوام ئامادە بوو بچێتە ڕاو، ئاسنگەرەکەمان چەند تیرێکی بۆ دروست کرد کە نووکیان لە ئاسن بوو و زۆر لە سەرە بەردینەکانی کاراتر بوون. هەموو جارێک کە دەچووە ڕاو کەروێشک و چۆلەکەی ڕاو دەکرد، هەتا جارجارە پشیلە کێویشی لە ناو شاخەکان ڕاو دەکرد. ئەو تاکە کەس بوو کە بوێرێ بە تەنیا دەربچێت و لە دەوروبەری شاردا بسووڕێتەوە و بە ناو دارستانەکەدا بگەڕێ و لە بەرچاوی دوژمنیش دیار نەبێت. بەڵام سەربازەکان بە کۆمەڵ دەردەچوون، وەلێ نەیاندەتوانی فیلێکیش ڕاوبکەن ئەگەر فیل لە جیهانی تازە بوونی هەبێت. کەچی فیلیپ بەو جەربەزەییە هەموو جارێک باوەشێک ئالیکی بۆ ماڵاتەکانیش دەهێنا و لە سایەی ئەودا ئەسپەکانمان توانیان لەسەر قاچیان بوەستن هەرچەندە لەڕولاوازیش بووبوون.

شەرمێ دەکەم ئەوەی بگێڕمەوە، وەلێ گومانم هەیە کە لە هەندێ حاڵەتدا لە

ناو یاناکۆناکان و هەندێک لە پیاوە بێئومێدەکانی ئێمەش گۆشتی بەشەریشیان دەخوارد، هەر وەک ئەوە لە دوای سێزدە ساڵ لە ناو هندییە مابۆچییەکانیش ڕووی دا، ئەو وەختەی برسێتی و قاتوقڕی هەموو خاکی شیلی گرتبووەوە. ئیسپانییەکان ئەو برسێتییەیان قۆستەوە و توانیان بەو هۆیەوە مابۆچییەکان ملکەچ بکەن و بیانکەنە مەسیحی، ئاخر هیچ شتێک لە خواردنی گۆشتی بەشەر دڕندانەتر نییە؛ وەلێ مابۆچییەکان بەر لە هاتنی ئێمە هەرگیز کاری وایان نەکردبوو. هەندێ جار کە ئەویش زۆر بە دەگمەن بووە، جەرگی دوژمنیان دەرهێناوە و خواردوویانە تا هێز و ئازایەتییان پێ ببەخشێت، لێ ئەوەیان وەک کەشێک کردووە و نەبووەتە خوویان. شەڕی ئەراوکانییە بووە مایەی بڵاوبوونەوەی برسێتی، کەس بەری بە کشتوکاڵەوە نەمابوو، چونکە هەردوو لا ئاگریان لە تەبارەی یەکتری بەردەدا و ماڵاتەکانی یەکتریشیان دەکوشت. دوای ئەوە وشکەساڵی بەسەرداهات و نەخۆشی شیفالۆنگۆ - واتە کولێرە - بڵاو بووەوە کە بووە هۆی مردنی خەڵکانێکی یەکجار زۆر. گەورەترن سزادان لە کارەساتی بۆقەکان بوو کە بە لیکاوێکی بۆگەنی ئەو خاکەیان ژەهراوی کردبوو. لەو ماوە ترسناکەدا ئیسپانییەکان کە ژمارەمان زۆر کەم بووبووەوە، ئەو شتانەیان دەخوارد کە لەگەڵ مابۆچییەکان لەسەری بە شەڕدەهاتن، بەڵام ئەوانە ژمارەیان بە هەزاران کەس بوو لەو کێڵگە ڕووتانەدا بەڕوویاندا دەهاتنەوە، ئاخر برسێتی وای لێیان کردبوو گۆشتی یەکتر بخۆن. گومانی تێدا نییە کە خوا ئەوەی لە بەرچاو دەگرێت کە ئەو کارەیان لەخۆشی خۆیان نەبووە بەڵکو لە برسێتییان بووە. یەکێک لە هەواڵنووسەکان لەوانەی لە هەڵمەتەکانی ساڵی ١٥٥٥ دا بەشداری کردبوو، نووسیویەتی و دەڵێ: هندییەکان دەچوون گۆشتی بەشەریان دەکڕی وەک چۆن گۆشتی ئاژەڵی لامایان دەکڕی ئاوا. ئەوە برسێتی بوو... ئەو کەسەی برسێتیشی نەدیبێ بۆی نییە حوکم لەسەر ئەو شتانە بدات. ڕۆدریگۆ بۆی گێڕامەوە کە هندییەکان لە نێو دۆزەخی دارستانە گەرمەکانی چۆنچۆدا گۆشتی هاوڕێکانی خۆیان دەخوارد، وەلێ باسی ئەوەی نەدەکرد کە داخوا

ئیسپانییەکانیش گوناهی وایان کردووە یان نا. بەڵام کاتالینا پێی گوتم کە بیراکۆچا لە مرۆڤەکانی تر جیاوازنین و هەندێکیان مردووییان لە گۆڕ دەردەهێنا تا گۆشتی ڕانەکانی ببرژێنن و بیخۆن. ئەوانە هندییەکانیشیان بۆ هەمان مەبەست ڕاو دەکرد. وەختێ پێدرۆم لەوە ئاگەدارکردەوە، ناچاری کردم بێدەنگ بم و هەموو جەستەی لە تووڕەیییان دەلەرزی، چونکە ئەو پێی وابوو کە مرۆڤی مەسیحی ناشێ کارە قێزەونانە بکات؛ ئەوکاتە بە ناچاری بە بیریم هێنایەوە کە ئەمیش لە سایەی من دەتوانێ کەمێک شتی باشتر لەو خەڵکە بخوات لەو شارە، بۆیە واچاکە ئەویش خۆی کرکات. ئەوەندە بەسە ئەو خۆشییە شێتانەیە ببینێت وەختێ یەکێک لە قەراخ ڕووباری مابۆچۆ مشکێک ڕاو دەکات، ئەوجا دەزانیت خواردنی گۆشتی مرۆڤیش ئاسایییە.

***

فیلیپ یان فیلیپۆ، هەروەک ئاوا ناوی ئەو کوڕە مابۆچییەیان دەهێنا، بووە سێبەری پێدرۆ و هەموو کەسی شارەکە دەیانناسی. پاداشتی بەختی باش بۆ ئەو سەربازانەبوو کە بە شێوازی ئەو لە لاساییکردنەوەی ڕەفتار و دەنگی حاکم چێژیان وەردەگرت و نیازیشیان گاڵتەکردن نەبوو، بەڵکو بە هۆی سەرسوڕمان و ڕێزلێنانەوە بوو. پێدرۆ وای نیشان دەدا کە تێبینی ئەو شتانە ناکات، وەلێ من دەمزانی کە ئەو منداڵە بێدەنگە هان دەدات تا زوو بە خزمەتییەوە بچێت. فیلیپ بە لم زرێیەکەی وا لێ کردبوو بریقەی دەدایەوە، شمشێرەکەی وەک ئاو تیژکردبوو، بە ڕۆن پۆستاڵەکانی چەوردەکردن، بەر لەو کارانەش زۆر بایەخی بە ئەسپەکەی دەدا، هەر دەتگوت برای ئەسپەکەیە. پێدرۆ بەو سادەیییە مامەڵەی لەگەڵی دەکرد کە مرۆڤ لەگەڵ سەگێکی بەوەفا دەیکات؛ ئاخر ئەو پێویستی بە قسەکردن نەبوو، چونکە فیلیپ لە هەستەوە ئارەزووەکانی گەورەکەی پێدەزانی. پێدرۆ فەرمانی بە یەکێک لە سەربازەکان دا بۆ ئەوەی فیلیپی فێرە بەکارهێنانی تفەنگ بکات، تا لەو کاتانەی کە لە ماڵەوە نین بەرگری لە ژنەکان بکات. من بەوە زۆر تووڕەبووم، چونکە هەر من بووم تاکو ئێستا بەو ئەرکە هەڵدەستام و نەک هەر بەرگریکردن لە ژنەکان،

بەڵکو لە پیاوەکانیش. فیلیپ منداڵکارێکی کڕ و هێمن بوو، دەیتوانی چەند سەعاتێک، وەک سۆفییەکی پیر، بە بێ جوڵە لە شوێنی خۆی هەڵنەستێت. خەڵکەکە لە بارەی ئەوەوە دەیانگوت: ئەو کوڕە وەک هەموو هاوڕەگەزەکانی تەمبەڵە. منیش بە بیانووی فێربوونی زمانی مابۆدۆنگۆ – کە ئەمە ئەرکێک بوو نەدەکرا چاوپۆشی لێ بکات، چونکە ئەو ڕقی لە من بوو کە ژنم –، هەموو ئەو شتانە شارەزابووم کە لە بارەی هندییەکانەوە دەمزانی. لە نەزەری ئەواندا، خاکی پیرۆز بەروبوومت پێ دەدا و خەڵکیش بای ئەوەندەی لێ دەبەن کە پێویستیانە و سوپاسی دەکەن. ئەوان زێتر لە پێویستیی خۆیان نابەن و شتەکان داناکەن؛ کارکردنیش لە تێگەیشتنی ئەواندا ئەرکێکی قورسە، چونکی ئایندە بوونی نییە. زێڕ چ سوودێکی هەیە؟ زەوی هی کەس نییە و هەروەها دەریاش؛ تەنیا بیرکردنەوە لە بە خاوەنبوونیان یان دابەشکردنیان پێکەنینی دەهێنایە فیلیپ. هەروەها مرۆڤەکانیش هی هیچ کەسێک نینە. ئاخر تاقمی هوەینکا – ئیسپانی – چۆن دەتوانن خەڵک بکڕن و بیفرۆشنەوە وەک ئەوەی موڵکی خۆیان بێت؟ هەندێجار ئەو کوڕە بۆ ماوەی سێ ڕۆژان هیچ قسەیەکی نەدەکرد و بە تەنیا و بە بێ خۆراک ژیانی بەسەر دەبرد، کە لێت دەپرسی لەبەرچی وایە، هەمان وەڵامی دەدایەوە: هەندێ لە ڕۆژەکان خۆشن و هەندێکیشیان خەماوین. هەموو کەسێکیش گەورەی بێدەنگییەکەی خۆیەتی.

ئەو کوڕە پەیوەندی لەگەڵ کاتالینا زۆر خراپ بوو، چونکە ئەو ژنە بڕوای پێی نەدەکرد، بەڵام هەردووکیان خەونەکانیان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە. هەردووکیان پێیان وابوو کە دەرگەکان هەمیشە لە نێوان هەردوو نیوەکەی ژیاندا، ڕۆژانە و شەوانە، کراوەنە و لە نێو خەونەکانیشەوە خواوەند لە گەڵیاندا بەردەوامی هەیە. هەروەها دووبارەیان دەکردەوە کە گوێڕایەڵ نەبوون بە ناوەڕۆکی خەونەکان دەبێتە هۆی نەگبەتی. فیلیپ قەت نەیدەهێشت کاتالینا بە هێلکە شەیتانۆکە و مۆرو بەختی بۆ بگرێتەوە چونکە لە بەرامبەریدا هەستی بە ترسێکی جادووگەرانە دەکرد، هەروەک چۆن گیایە

پزیشکییەکانی ئەویشی تام نەدەکرد.

خزمەتکارەکان بۆیان نەبوو سواری ئەسپ بىن، ئەگینا بە لێدانی قامچی سزا دەدران، وەلێ فیلیپ لەو یاسایە بەدەر بوو. لەبەرئەوەی زۆربەی ئەسپەکان ئەو ئالیکی دەدانێ، بە زمانی مابۆدۆنگۆ بە گوێیانی دەچرپاند و زۆر بە ئاسانی دەستەمۆی دەکردن. وەک قەرەجێک فێری سواری ئەسپ بووبوو، جەربەزەییەکانی ئەو کاریگەرییەکی زۆریان بە سەر ئەو شارە خامۆشەدا هەبوو. وەختێ خۆی بە ئەسپەکەوە دەنووساند وات دەزانی بەشێکە لەو ولاخە، بێ ئەوەی ئەسپەکەی ناچار بکات دەیزانی لەسەر ڕیتمی ئەو بجولێتەوە. زین و ڕکێبی بەکار نەدەهێنا و بە ڕاگوشینێکی سووکی ڕانەکانی ئەسپەکەی ئاراستە دەکرد و جڵەوەکەی بە دەمی دەگرت تا دەستی ئاوەڵا بێت بۆ بەکارهێنانی تیروکەوانەکەی. لە بای غارێ خۆی دەخستە سەر پشتی ئەسپەکە و خۆی دەسووڕاندەوە، بە جۆرێک چاوی دەبڕییە کەرخی کلکی. هەندێ جار بە هەردوو بازوو و قاچەکانی خۆی دەگرت و سینگی بە زگی ئەسپەکەوە دەنووساند. پیاوەکان دەورەیان لێی دەدا و هەرچەند هەوڵیان دەدا نەیاندەتوانی وەک ئەو بکەن. ئەو کوڕە جاری وا هەبوو چەند ڕۆژێک بزر دەبوو و دەچووە ڕاوێ؛ وەختی کە مەزەندەت بۆ ئەوە دەچوو کە ڕەنگە نەمابێت و لە شوێنێک بە دەستی میشیمالۆنکۆ سەری نابێتەوە، کەچی ساغ و سەلیم بەدیار دەکەوتەوە و هێشوویەک چۆلەکەی بە کۆڵەوە بوو تا شۆربا بێتامەکەمانی ئێمەی پێ خۆش بکات. ئەو وەختانەی بزر دەبوو، پێدرۆ هەستی بە ناڕەحەتی دەکرد؛ چەندان جار بە قامچی هەڕەشەی لێ دەکرد تا بێ مۆڵەتی ئەو خۆی بزر نەکات، بەڵام قەت هەڕەشەکانی جێبەجێ نەدەکرد، چونکە ڕاوەکانی ئەو بۆ ئێمە سوودێکی زۆری هەبوو. ئەو دارە خوێناوییەی کە سزادانی قامچی لێدانی لەسەر ئەنجام دەدرا، لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەوە چەقابوو، وەلێ وا دیاربوو بۆ فیلیپ نەدەبووە مایەی هیچ ترسێک. ئەو وەختە لە چاو هاوڕەگەزەکانی زۆر لاواز و کەڵەگەت بوو. جەستەی تەنیا ئێسک و ماسوولکە بوو و لە ئاکاریدا ژیری بەدی دەکرا و چاوەکانی تیژبوون.

دەیتوانی بە شانی کێشێکی وا هەڵگرێت کە بە کەسێکی تەواو پێگەیشتوو نەکرێت. گاڵتەی بە ئازار و مردن دەهات و سەربازەکان زۆر بە تواناداری ئەو لە سەر خۆڕاگری سەرسام بوون، هەندێکیان هەر بۆ کات بەڕێکردن بە ئەنقست تاقییان دەکردەوە. من ناچاربووم نەهێڵم وای لێ بکەن کە بە دەستی ڕووت پشکۆی گەشاوە هەڵگرێت، یان درکی بە بیبەر لە جەستەی ڕاکەن. زستانان و هاوینان چەندان سەعات لە ئاوە سەهۆڵاوییەکەی ڕووباری مابۆچۆ مەلەی دەکرد. ئەو بۆی ڕوونکردینەوە کە ئاوی سەهۆڵاوی دڵ زیندوو دەکاتەوە، بۆیە دایکانی مابۆچی هەرکە کۆرپەیان دەبێت یەکسەر لە ئاوی هەڵدەکێشن. ئیسپانییەکانیش وەک چۆن لە ئاگر ڕادەکەن ئاواش لە ئاوی سارد، لەسەر شوورەکە دادەنیشتن و سەیریان دەکرد کە چۆن مەلە دەکات و لەسەر زۆرمانەوەی لە ناو ئاوەکەدا گرۆیان دەکرد. هەندێ جار ئەوەندە زۆر لە ناو ئەو ئاوە ساردە دەمایەوە، وەختێ کە سەیرکەران نرخی گرۆیەکەیان دەدایە براوەکان، فیلیپ بە ساغی سەری دەردەهێنا و دەکەوتەوە مەلە.

ناخۆشترین شت کە لەو ساڵانەدا چەشتمان، دووری وڵات و تەنیایی بوو. ئێمە چاوەڕێی بەدەنگەوەهاتن بووین بێ ئەوەی بزانین داخوا کەسێک دێت یان نا، چونکە هەموو شتێک بە هەوڵەکانی مۆنرۆی ئەفسەرەوە بەندبوو. هەتا تۆڕی هەواڵگرییەکانی سیسیلیاش نەیدەتوانی هەواڵێکی مۆنرۆی و پێنج پیاوە ئازاکەی بزانن. بەڵام ئێمە بەتەمای خەیاڵ لە خۆمان نەگەڕابووین، چونکە ڕۆیشتنی ئەو چەند کەسە بە نێو هندییە دوژمنەکانمان و پاشان بڕینی ئەو بیابانە تا دەگەنە مەبەستی خۆیان، وەک موعجیزەیەک وابوو کە نەیەتە جێ. پێدرۆ هەموو جارێ پێی دەگوتم کە موعجیزەی ڕاستەقینە ئەوەیە مۆنرۆی لە پێرۆ یارمەتی بە دەست بێنێ، ئاخر لەوێ کەسێک نییە حەز بکات سامانی خۆی لە شیلی بخاتە کار. ڕازاندنەوەی ئەسپەکەی بە زێڕ تەنیا پیاوە خۆتێهەڵقورتێنەکان دەوروژێنێ، وەلێ کار لە سیاسی و بازرگانەکان ناکات. ئێمە دنیامان بۆ چەند دۆنمە ئەرزێکی ناو شوورە لە قوڕ دروستکراوەکە لێ تەنگ بووبووەوە لەگەڵ هەمان ئەو دەموچاوە ماندووانە و ڕۆژانیش تێ

دەپەڕین و هەواڵێکمان پێ نەدەگەیشت. هەموو ڕۆژەکان وەک یەک دووبارە دەبوونەوە و سوارەکانمان ناوە ناوە بە دوای پەیداکردنی خۆراک و بۆ بەربەچدانەوەی پەلاماری هندییەکان دەردەچوون. هەروەها خەریکی نوێژکردن و پرسە و نوێژی مردووان دەبووین. هەتا کۆنوێژەکانیش تا ڕادەیەکی زۆر کەمکرانەوە، چونکە تەنیا نیو بوتڵ بادەمان مابوو بۆ پیرۆزکردن و بەکارهێنانی لەو کۆنوێژانەدا. بەڵێ ئێمە ئاومان زۆر بوو، وەختێک کە هندییەکان نەیاندەهێشت بچینە سەر ڕووبارەکە، یان جۆگە ئاوەکانیان لەسەر دەگرتینەوە، ئێمە بیرمان هەڵدەکەند. هیچ پێویستییمان بە بەهرەی من نەبوو بۆ دۆزینەوەی شوێنی ئاوی ژێر زەوی، چونکە لە هەر شوێنێک بیرت هەڵکەندبووایە دەگەیشتە ئاو. هەروەها بە هۆی نەبوونی کاغەز بۆ تۆمارکردنی کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی و بڕیارەکانی دادگا، پارچەی پێستمان بەکار دەهێنا، وەلێ لە کەمتەرخەمی خۆمان سەگەکان ئەو پارچە پێستانەیان خوارد، بۆیە تەنیا چەند تۆمارێکی ڕەسمی کەممان هەیە کە ئەو برسێتی و نەهامەتییانەی ئەو چەند ساڵە بگرێتەخۆ کە چەشتبوومان.

هەر چاوەڕوانی و چاوەڕوانی، ڕۆژەکانمان ئاوا بەسەردەچوون. بە دەست و تفەنگی سوارەوە چاوەڕێی هندییەکان بووین. چاوەڕێ بووین جرجەکان بە تەڵەوەبن، چاوەڕێی هەواڵێکی مۆنرۆی بووین. ئێمە لەو شارەدا دیل کرابووین، هەرچوار دەورمان دوژمن بوو و لە برسانا دەمردین. وەلێ لەگەڵ هەموو ئەوانەش لە کاتی ئەو هەژاری و نەکبەتییەدا جۆرێک لە نەفسبەرزیمان هەبوو. لە کاتی ئاهەنگەکاندا سەربازەکان زرێکانیان لەسەر پێستی ڕووت لەبەردەکرد، یان جەستەی خۆیان بە پێستی کەروێشک و جرج لە ئاسن و زرێ دەپاراست، چونکە جلیان نەبوو تا لە ژێر زرێکان بیپۆشن. لەگەڵ ئەوەشدا قەڵغان و زرێکانیان هەمیشە وەک زیو دەبریسکانەوە. تاکە پۆشاکی قەشەش کە لەکن گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ بوو، ئەویش لە بەر پیسی و پینە پینەیی و زۆری دورمانەکانی ڕەقهەڵاتبوو، بەڵام لە کاتی کۆنوێژەکاندا پارچەیەک چەرچەفی نەخشێنراویان لەسەر ڕادەخست کە لە سووتان قوتار

کرابوو. منیش وەکو سیسیلیا و باقی ژنی سەرکردەکان هیچ جلێکی خانمانەم نەبوو، بەڵام ئێمە هەموو ژنەکان چەندان سەعات بە داهێنانی پرچمانەوە خەریک دەبووین و لێومان بە بەری دارێک وەک پەڕی گوڵ سوور دەکرد کە تامێکی تاڵی هەبوو، بە گوێرەی قسەی سیسیلیا ئەو ڕووەکە ژەهراویش بوو، لێ کەسێکمان پێی نەمردین، بەڵام تووشی زگچوونێکی ترسناکی کردین. ئێمە هەمیشە بە زمانێکی گاڵتەئامێزەوە باسی ناخۆشییەکانی ژیانی خۆمانمان دەکرد، چونکە بێزاری و دڵپەستی نیشانەی بێهێزی و سووکی بوو. هندییە هاریکارەکان لەو جۆرە سوعبەتانە نەدەگەیشتن، وەک سەگی پێکراو دەڕۆیشتن و خەونیان بە گەڕانەوە دەبینی بۆ پێرۆ. هەندێک لە ژنەکانیان ڕایان کرد و خۆیان دایە دەستی مابۆچییەکان، ئاخر لانی کەم ئەوان برسی نەبوون، ئیتر هیچیان نەگەڕانەوە لای ئێمە. بەڵام بۆ ئەوەی هیچ ژنێکی تر چاو لەوان نەکات و بڕوات، خەبەرێکمان بڵاوکردەوە کە گوایە هندییە مابۆچییەکان گۆشتی ئەو ژنانەیان خواردووە، هەرچەندە فیلیپ دەیگوت مابۆچییەکان بەردەوام ئامادەنە ژنێکی تر بخەنە نێو خێزانەکانیان.

لە کاتێکدا کە بیرم لە مردنی ئەو جەنگاوەرانە دەکردەوە کە لە جەنگەکان بەجێ دەمێنن، بە زمانی مابۆدۆنگۆ لێیم پرسی: مابۆچییەکان وەختێ پیاوێکیان بمرێت ژنەکەی چی بەسەر دێت؟

– ئاوای لەگەڵ دەجولێنەوە کە پێویستە لەگەڵی بجولێنەوە: جگە لە دایک، هەموویان دەبنە میراتی کوڕە گەورەکەیان.

ئەوجارە بە سوعبەت پێم گوت: ئەدی چڵمن، تۆ بەتەمانیت ژن بێنیت؟

زۆر بە بایەخەوە وەڵامی دامەوە: ئاخر ئێستا بۆ ژن هەڵگرتن کاتێکی گونجاو نییە.

لە داوونەریتی مابۆچیدا، هەروەک بۆیان دەگێڕامەوە، زاوا بە یارمەتی برا و هاوڕێکانی ئەو کچە هەڵدەگرێت کە ئارەزووی دەکات. هەندێ جاریش

کۆمەڵێک گەنج بەسەر ماڵی کچەکە دادەدەن و دایک و باوکی پەلبەست دەکەن، کچەی بەکۆڵ هەڵدەگرن لە کاتێک کە قاچەکانی بە هەوادا ڕادەوەشێنێ، پاشان ئەگەر کچەکە بە کوڕە ڕازی بوو، ئەوا قەرەبووی زەرەرەکان دەکەنەوە و زاوا چەند سەر مالات و شتی تر دەداتە ماڵی خەزووری، ئیتر بەوجۆرە هاوسەرگیرییەکە دەبێتە ڕەسمی. پیاو دەتوانێ چەند ژنێکی هەبێت، وەلێ پێویستە شتی وەک یەکیان بۆ دابین بکات و بە یەکسانی مامەڵەیان لەگەڵ بکات. زۆر جار پیاوێک دوو خوشکان یان زێتر پێکەوە دێنێت تا جیاوازییان لە نێواندا نەکات.

قەشە گۆنزالس عادەتی بوو لە دەرسەکانی من بۆ فێربوونی زمانی مابۆدۆنگۆ ئامادە دەبوو، هەموو جارێ بۆ فیلیپی ڕوون دەکردەوە کە ئەوە بەڵگەیەکی سەلمێنەرە شەیتان لە نێو ڕۆڵەکانی مابۆچیدا هەیە، بۆیە ئەگەر دواجار ڕازی نەبن بە ئاوی پیرۆز خۆیان پاک بکەنەوە، ئەوا جەستەیان لەسەر پشکۆی دۆزەخ دەبرژێت. فیلیپ لێی پرسی کە داخوا شەیتان لە نێو ئیپسانییەکانیشدا هەیە یان نا، ئاخر ئەوان بە دەرزەن ژنی هندییەکان دەبەن و لە بەرامبەریدا هیچ مالاتێکیش نادەنە دایک و باوکیان کە پێویستە بیدەن، سەرەڕای ئەوەش لێیان دەدەن و بەیەکسانی ڕەفتاریان لەگەڵ ناکەن، هەر کاتێکیش ئارەزوو بکەن بە هیتر دەیانگۆڕنەوە. لەوانە ئیسپانییەکان لە دۆزەخدا لەگەڵ مابۆچییەکان بەیەک بگەنەوە و لەوێش بۆ هەتا هەتایە بکەونەوە کوشتنی یەکتری، ئەمەیان مسۆگەرە. لە دوای ئەو قسانەی فیلیپ بۆ ئەوەی لە بەردەم ڕیشی قەشەی پیرۆز پێکەنینم دەرنەچێت، خۆم پێنەگیرا و چوومە ژوورەکەی تر.

من و پێدرۆ بۆ کاری پووخت و دروست خەڵق بووبووین، نەک بۆ زەغەلی و پاڵدانەوە. بۆیە پێداگرتن لەسەر درێژەپێدانی ژیان لە ڕۆژێکی تردا و هێشتنەوەی خەڵکەکە بە ورەیەکی بەرزەوە، بەردەوام چالاکی دەدایە جەستە و هزرمان. ئێمە لێ نەدەگەڕاین تووشی وەرسبوون بێین، تەنیا ئەو کاتانە نەبێت کە پێکەوە تەنیا دەبووین؛ وەلێ ئەمەش زۆر درێژەی نەدەکێشا، چونکە

هەر زوو دەکەوتینە گاڵتەپێکردنی خۆمان. پێم دەگوت: پێم خۆشە لێرە لەگەڵ تۆ گۆشتی جرج بجووم نەک لە کۆشکەکانی مەدرید جلێکی نایاب بپۆشم.

ئەویش وەڵامی دەدامەوە: واباشترە بڵێیت وەک حاکمێک ئێرەم پێ چاکترە لەوەی حەلوای جۆ و شەکر لە بلاسینشیا دروست بکەم.

ئیتر لە نێو جێگە دەستەملانێی یەکتر دەبووین و وەک دوو منداڵ دەماندایە پێکەنین. ئێمە لەو ماوەیەدا لە جاران تەباتر نەبووین و وەک جاران بە هەوەسەوە خەریکی ئەوینداری نەدەبووین. وەختێک کە بیرم لە پێدرۆ دەکردەوە، ئەو چرکەساتانەم دەقۆستەوە؛ دەمەوێ ئاوا بیری بخەمەوە، هەروەک ئەوەی تەمەنی چل و چەند ساڵێک بێت، برسی و هیلاک، بەڵام ورەیەکی بەرز و خاوەن ئیرادە و خەیاڵێکی زۆر. هەندێ جار ئارەزووم دەکرد بیری بخەمەوە کە عاشقە، وەلێ ئەمەیان پێویست نەبوو، چونکە ئەو هەمیشە عاشق بوو هەتا دوای جیابوونەوەشمان. دەزانم وەختی کە لە سەرەمەرگ بوو خەیاڵی هەر لە لای من بوو. ئاخر لە ساڵێ مردنی ئەودا، ساڵی ١٥٥٣ من لە سانتیاگۆ بووم و ئەویش لە دووری فەرسەخێکی زۆر، لە تۆکاپێل دەجەنگا، وەلێ دەمزانی وا ڕوح دەدا و دەمرێت. وەختێکیش کە خەبەری مردنی ئەویان دامێ کە چەند حەفتەیەکی پێ چووبوو، دانە فرمێسکێکیش لە چاوەکانم نەهاتە خوارێ. ئاخر چاوەکانم وشکیان کردبوو.

***

لە ناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکەمدا، دوو ساڵ لە دوای ڕۆیشتنی مۆنرۆی سەرکردە بۆ ئەو ئەرکە پڕ لە مەترسییەی بۆی چووبوو. لە کاتێک ئێمە بە بۆنەی جەژنەکانی سەری ساڵ، خۆمان بۆ ئاهەنگێکی سادە ئامادە دەکرد، بە وتنەوەی سرود و وتاری سەرپێیی، پیاوێکی بێ تاقەت و تۆزاوی هاتە بەر دەروازەکانی سانتیاگۆ، وەلێ لێی نەگەڕان بێتە ناو شاری، چونکە پاسەوانەکان سەرەتا نەیانناسیبووەوە. ئەوە یەکێک بوو لە هندییە هاریکارەکان؛ دوو ڕۆژبوو هەر بە غار ڕێی بڕیبوو و بە دزی و بە نێو دارستانەکانە پڕ لە خەڵکە دوژمنەکان خۆی گەیاندبووە شاری. یەکێک بوو لەو

کۆمەڵە کەسەی کە پێدرۆ لەسەر کەناری دەریا دای نابوون بەو ئومێدەی کە یارمەتیمان لە پێرۆەوە بۆ بێت. ئەو پیاوانە کۆمەڵێک ئاگردانیان لە بەرزاییە بەردینەکانی سەر کەنار ئامادە کردبوو تا ئەگەر کەشتییەک لە قووڵایی ئاسۆ بەدیارکەوت، ئاگریان تێ بەردەن. دواجار ئەو پاسەوانانەی کە ماوەیەکی یەکجار زۆر بوو چاوەدێری سەر رووی دەریایان دەکرد، کەشتییەکی چارۆکەداریان بینیبوو، بە دڵێکی پڕ لە خۆشییەوە هێمای پێویستیان کرد. ئیتر ئەو کەشتییە کە برادەرێکی کۆنی پێدرۆ رابەرایەتی دەکرد، بەو یارمەتییانەوە هات کە چاوەڕێی بووین.

هندییە هاریکارەکە کە لە تێنوێتییان تاقەتی لەبەر بڕابوو، گوتی: ئەی گەورەم، ڕابەری کەشتییەکە فەرمانی پێدام کە پێت بڵێم هەندێک پیاو و ئەسپ ڕەوانی ئەوێ بکەیت تا بارەکان بۆ ئێرە بگوازنەوە.

پێدرۆ بە خۆی و ژمارەیەک لە سەرکردەکان سواری ئەسپەکانیان بوون و بەرە و کەنار کەوتنە ڕێ. زۆر گرانە وەسفی ئەو خۆشییە بکەیت کە لە شاردا بڵاو بووەوە. ئاخر ئەو هەستکردنە مەزنە بە کرانەوە وای لەو سەربازە دڵپەستانە کرد لە پرمەی گریان بدەن. مژدەکە ئەوەندە کاریگەر بوو بە جۆرێک کەس ئاگای لە قەشە نەبوو وەختی داوای کرد نوێژی سوپاسگوزاری دابەستن. خەڵکەکە گشتی بە سەر شوورەکە کەوتن چاویان لە ڕێگاکە بوو، بەڵام ئێمە دەمانزانی کە ئەو میوانانە چەند ڕۆژێکیان پێویستە تا دەگەنە شاری سانتیاگۆ. گەشتیارانی نێو کەشتییەکە، وەختێ پێدرۆ و سەربازەکانی لە کەنار بە دیارکەوتن و پاشانیش کە هاتنە شاری و ئێمەیان لە پێشوازی خۆیان بینی، دەربڕینێکی ترسبارانە بە دەموچاویانەوە دیاربوو. لەو سەرنجەی ئەوانەوە تێگەیشتین کە ئێمە تا چ ڕادەیەک کلۆڵ و شپرزە بووینە. ئێمە لەوە ڕاهاتبووین کە یەکتری بەو لاوازی و پیسی و پۆخڵییە ببینین، وەلێ کاتێ زانیمان کە ئێمە شیاوی بەزەیی پێ هاتنەوەین، زۆرمان شەرم لە خۆ دەکردەوە. هەرچەندە ئێمە تا پێمان کرا خۆمان ڕازاند بووەوە و سانتیاگۆش لە بەرچاومان لە بەر تیشکی پرشەنگداری هاوینە زۆر جوان دیاربوو، بەڵام

میوانەکان زۆر پەرۆشی ئێمەبوون، هەتا هەندێکیان هەوڵیان دا جلوبەرگی خۆیان پێشکێشی پێدرۆ و ئەفسەرەکانی تر بکەن، لە کاتێک ئەو جل بەخشینە لە نێو ئیسپانییەکاندا بە گەورەترین سووکایەتی دادەنرا.

ئەو شتانەی کە پێمان نەکرا نرخەکەی بدەین، بە قەرز لە سەرمان تۆمار کرا. پێدرۆ بووە کەفیلی ئەوانی تر، چونکە هیچ پارچە زێڕێکمان نەبوو بیدەینە نرخەکەیان. ئەو بازرگانانەی کە لە پێرۆوە هاتبوون و کەشتییەکەیان بە کرێ گرتبوو، بەمە ڕازیبوون کە شتەکانیان بە نرخێکی سێ ئەوەندەی نرخی خۆی بە قەرز بدەنە ئێمە و دڵنیاش بوون کە قەرزەکانیان نافەوتێ، چونکی قسەی پێدرۆ لە دیدی ئەواندا تەواو زامنی ئەوە بوو. لە نێویاندا ئەو بازرگانەشی تێدابوو کە لە شاری کۆسکۆ، بۆ مەبەستی خەرجییەکانی هەڵمەتەکە، پارەی بە قەرز دابووە پێدرۆ بە مەرجێ زیادەی بێتەسەرێ، هاتبوو قەرزەکەی دووچەندە وەربگرێتەوە، بەڵام کە باری ئەوانی بینی ناچاربوو لەگەڵ بگاتە ڕێککەوتنێکی دادپەروەرانە، پاش ئەوەی درکی کرد کە بەو شێوەیە نەبێت ناگاتەوە ماڵەکەی خۆی. پێدرۆ، لە باری کەشتییەکەدا سێ کراسی کەتان و یەکێکی گرانبەهای خوری و چەندان دەستە جلی ناوماڵ و فستانێکی حەریر و پێڵاوێکی ژنانە و جووتێک پۆستاڵی کارکردن و سابوونێک و کرێمێکی دەموچاو و شووشەیەک گوڵاوی بۆ کڕیم... ئەو شتە شادی بەخشانەی کە قەت بڕوام نەدەکرد جارێکی تر بیانبینم.

ئەو کەسەی کەشتییەکەی ڕەوان کردبوو، مۆنرۆی سەرکردە بوو. لە کاتێکدا ئێمە لە سانتیاگۆ بەرگەی ئەو هەموو ناخۆشییەمان دەگرت، مۆنرۆ و هەر پێنج هاوڕێکەی توانیبوویان بگەنە کۆبیابۆ و لەوێ بە دەستی هندییەکان گیرابوون و چوار سەربازییان لێ دەکوژرێت، بەڵام مۆنرۆ و هاوڕێیەکی بە سواری ئەسپە زێڕینەکەیەوە بەخت یاوەریان دەبێ و لە ژیاندا مانەوە؛ ئەوان سەربازێک قووتاری کردبوون کە لە دەستی دادگا لە پێرۆ هەڵاتبوو و چەند ساڵێک بوو لە شیلی دەژیا. ئەو سەربازە هەردوو گوێیەکانی لەسەر دزی لە دەستدابوو، جا لە شەرمان پەیوەندی بە هیچ ئیسپانییەکەوە نەمابوو و ڕووی

کردبووە ناو خەڵکە ڕەسەنەکەی ئەوێ و لەگەڵ ئەوان دەژیا. دەست بڕین کە سزایەک بوو بۆ ئەو کەسانەی دزی دەکەن، ئەو سزایە هەر لە کاتی ڕۆژگاری ئیسلامەکانەوە لە ئیسپانیادا باو بووە. بەڵام ئەگەر دزەکە سەربازبووایە، ئەوا وایان پێ باشبوو لووتی یان گوێی ببڕن، بۆ ئەوەی بتوانێت بەشداری جەنگ بکات. ئیتر ئەوەبوو سەربازی گوێ بڕاو نەیهێشت هندییەکان ئەو سەرکردەیە بکوژن، چونکە کە سەیری ئەسپە زێڕینەکەی ئەوی کردبوو وای زانیبوو زۆر دەوڵەمەندە و هەر بەوجۆرە یاوەرەکەشی لە مردن ڕزگارکردبوو. مۆنرۆی پیاوێکی نەرم و قسە خۆشبوو بە جۆرێک هندییەکان ئەوەندە لەگەڵی بە نەرمی دەجولانەوە حسێبی دیلیان بۆی نەدەکرد، بەڵکو وەک هاوڕێیەک ڕەفتاریان لەگەڵی دەکرد. لە دوای چوار مانگ لەو دیلێتییە خۆشەدا، بە خۆی و یاوەرەکەی توانیان بە سواری ئەسپێک خۆ بدزنەوە و ڕاکەن وەلێ بەبێ تاقمە زێڕە ئیمپراتۆرییەکە. هەروەها دەڵێن مۆنرۆی لەو ماوەیەدا کەوتووەتە داوی خۆشەویستی کچی سەرۆک هۆزەکە و بە زگپڕی جێی هێشتووە، بەڵام ئەو کارە ڕەنگە لە لای سەرکردە هەر شانازیکردن بێت بەخۆوە یان بەشێک بێت لە هۆنینەوەی خەیاڵی خەڵک وەک ئەو چیرۆکە خورافییانەی کە لە نێوان خۆماندا دەیگێڕینەوە. گرینگ ئەوەیە مۆنرۆی توانی خۆی بگەیەنێتە پێرۆ، کۆمەکیش دەستبخات و بازرگانەکان هان بدات و کەشتییەک بەرەو شیلی بەڕێ بخات، پاشان بە خۆی و حەفتا کەسەوە بەڕێی وشکایی گەڕایەوە شیلی و دوای چەند مانگێک لە هاتنی کەشتییەکە گەیشتنە جێ. ئەڵەنسۆ دی مۆنرۆی پۆشتە و بەوەفا و ئازا و مەزن، دوای دوو ساڵ لە بارودۆخێکی نادیاردا مرد. هەندێک دەڵێن بە ژەهر مرد و هەندێکی تریش دەڵێن بە پەتا یان بە پێوەدانی جاڵجاڵۆکە مردبوو، هەندێکیش بڕوایان وایە کە ئێستاش بە زیندوێتی لە ئیسپانیا دەسووڕێتەوە کە بە کڕی و بێدەنگی لە دوای درێژەکێشانی شەڕەکان گەڕابووەوە ئەوێ.

کەشتییەکە سەرباز و خۆراک و بادە و چەک و زەخیرە و جلوبەرگ و کەلوپەل و ئاژەڵیماڵیی بۆ هێنابووین، واتە ئەو گەنجینانەی خەونمان

پێیانەوە دەدیت، وەلێ گرینگترین شت پەیوەندیکردنمان بوو بە جیهانی پێشکەوتوو؛ ئاخر ئێمە چی تر بە تەنیا لە دوورترین گۆشەی ئەو هەسارەیە نەماینەوە. هەروەها پێنج ژن لە هاوسەرەکان و خزمەکانی سەربازەکان هاتنە ئەوێ و بۆ یەکەم جار لە بەجێهێشتنی کۆسکۆوە توانیم بەراوردی خۆم لەگەڵ ژنانی تر لە هاونیشتمانییەکانم بکەم و زانیم کە چەندە گۆڕانم بەسەردا هاتووە. بڕیارم دا چی تر پۆستاڵ و جلی پیاوە نەپۆشم و پرچیشم نەکەمە کەزی و بە کراوەیی لەمەودوا قەشەنگتر شانەی بکەم و دەموچاویشم بەو کرێمەی کە پێدرۆ پێشکێشی کردبووم، چەور بکەم؛ بە کورتییەکەی بایەخ بە جوانیی ژنانەم بدەم کە ساڵانێک بوو پشتگوێم خستبوو. گەشبینی دڵ و دەروونی خەڵکەکەی گرتەوە و هەستمان کرد کە دەتوانین ڕووبەڕووی میشیمالۆنکۆ ببینەوە، نەک هەر ئەو بەڵکو شەیتانیش ئەگەر بییەوێ لە سانتیاگۆ نێزیک ببێتەوە. گومانی تێدا نییە کە ئەو کاسیکییە لە دوورەوە درکی بەوە کردبوو، چونکە چی تر پەلاماری شاری نەدا، هەرچەندە چارەمان نەبوو بەردەوام لە دەوروبەری شار بەرەنگاریان دەبووینەوە و بۆ شوێنەکانی خۆیان ڕاومان دەنان. لە هەر یەکێک لەو شەڕانە ژمارەیەکی زۆر لە هندییەکان دەکوژران، بەڵام دەمانپرسی داخوا ئەو هەموو هندییە لە کوێوە دێن و تەواو نابن.

بالدیبیا بەڵێنەکانی خۆی بەرامبەر بە من و هەندێک لە سەرکردەکان جێبەجێ کرد. بە دوای خەڵکە ڕەسەنەکەی ئەوێیدا ڕەوان کرد کە بێنەوە دۆڵەکە کە پێش هاتنی ئێمە لەوێ دەژیان. ئاخر ئەو کێڵگانە بەبێ ئەو خەڵکانەی ئەوێ کە دەبێ بیکێڵن، هیچ سوودێکی نەبوو. ئی تر هندییەکی زۆر کە بە هۆی شەڕ و تالانی ڕیشدارەکان هەڵاتبوون، گەڕانەوە. ئا بەو جۆرە ورده ورده پێش دەکەوتین، حاکم توانی کۆراکا بیتاکۆرای بێنێتە ڕایێ تا خەڵکانێکی زۆرمان لە هندییە کیچواکان بداتێ، چونکە ئەوان تواناداتربوون بۆ ئەوەی لەگەڵ هندییەکانی شیلی کار بکەن. بە هاتنی ئەو هندییە تازانە پێدرۆ توانی کانگەی مارگا - مارگا و ئەوانی تریش بخاتەوە کار. هیچ کارێک

له کارکردنی له نێو ئەو کانگانە ناخۆشتر نەبوو. من بە چاوی خۆم سەدان پیاو و سەدانم ژنم دەدیتن کە هەندێکیان سکپڕ بوون و هەندێکیشیان منداڵەکانیان بە کوڵەوە بوو، تا ناوقەدیان لە ناو ئاوی ڕووبارەکەدابوو و لمەکانیان دەشووشتەوە بۆ ئەوەی زێڕی تێدا بدۆزنەوە، ئەوانە لە خۆرهەڵاتنەوە تا ئاوابوونی لە ژێر قامچی چاودێرەکان و توندوتیژیی سەربازەکان کاریان دەکرد و تووشی جۆرەها نەخۆشی بووبوون.

***

ئەمڕۆکە وەختێ لە نێو جێگەکەم هاتمە دەرێ، یەکەم جار بوو لە تەمەنی درێژم تاقەتم لێ ببڕێ. ئەو هەستە زۆر غەریبە کە ببینی جەستەت لە کۆتابووندایە و هزریشت هێشتا پرۆژەی نوێ دادەهێنێ. بە یارمەتی کارەکەرەکانم جلەکانم کردە بەرم تا وەک ڕۆژانی تر لە کۆنوێژدا بوەستم، چونکە من پێم خۆشبوو بچم سڵاو لە - پاکیزەی لێبووردەیی گەورەمان - بکەم کە ئێستاکە بووەتە گەورەی کەنیسەکەی خۆی. تاجە زێڕینەکەم خستە سەری کە بە بەردی زەمرووت نەخشێنرابوو؛ ئاخر ئێمە لەمێژبوو هاوڕێی یەکتری بووین. من وام پێ چاک بوو بچمە کۆنوێژی یەکەمی بەیانییان کە تایبەتبوو بە هەژار و سەربازەکان، چونکە تیشکی کەنیسە لەو ساتەدا وا دیارە ڕاستەوخۆ لە ئاسمانەوە دێت. خۆری سبەینە لە پەنجەرە بەرزەکانەوە دێتە ژوورێ و تیشکەکەی وەک ڕم ڕێڕەوەکەی ناوەندی دەبڕی، و پەیکەرە پیرۆزەکان لە شوێنی خۆیان ڕووناک دەکاتەوە. هەروەها هەندێ جار ئەو ڕوحانەش ڕووناک دەکردەوە کە لە دەورمدا بوون و لە پەنا ستوونەکان خۆیان شاردبووەوە. ئەمەیان ساتێکی ئارام بوو و بۆ نوێژکردن لەباربوو. هیچ شتێک لەو ساتە شاراوەتر نییە کە نان و بادەی تێدا دەبێتە جەستە و خوێنی مەسیح. من ئەو موعجیزەیەم لە تەمەنی درێژی خۆم هەزاران جار بینیوە، وەلێ هێشتاکە وەک ڕۆژی یەکەم سەرسامم دەکا و دەمورووژێنێ. من ناتوانم وازی لێ بێنم، ئاخر من هەرجارێک کە نانی قوربانی وەردەگرم، دەست بە گریان دەکەم. جا لەبەرئەوەی هێشتا دەتوانم بجولێمەوە، دەچمە کەنیسە و

واز لە ئەرکەکانم ناهێنم: خەستەخانە، هەژارەکان، دێری قەشەژنە ئۆگستینەکان، دروستکردنی خانوو، هەڵسووڕاندنی کاروباری موڵکەکانم و تۆمارکردنی هەواڵ و ئەو ڕووداوانەی کە ڕەنگە زۆر درێژە بکێشن.

من هێشتا هەست دەکەم کە بەرامبەر پیرێتی چەکم دانەداوە، هەرچەندە پێی لێ دەنێم کە عەقڵم شاش بووە و شتانم زوو لە بیر دەچنەوە، ئەگەر دوو جاران بیریان لێ نەکەمەوە، ناتوانم کارەکانم وەک کە پێشتر دەمکردن، ئەوها بە چاکی ڕایان پەڕێنم؛ کات ناتوانێت ناچاری خۆبەدەستەوەدانم بکات، لەگەڵ ئەوەش وازم لە عادەتە کۆنەکانی خۆم لە خۆشۆرین و پۆشینی جلی جوان، نەهێناوە؛ من دەمەوێ تا لە ژیاندابم هەر تەڕوبڕ بم، بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕۆدریگۆ وەختێ کە لەو دنیا پێکدەگەینەوە هەر پاک و پۆشتە بمبینێت. حەفتا ساڵ تەمەن بۆ من تەنێکی درێژ نییە.. ڕەنگە ئەگەر دڵم بەرگە بگرێت تا دە ساڵی تریش بژیم، ئەو وەختە دیسان شوو دەکەمەوە، چونکە بۆ ئەوەی بژیێم پێویستە ئەویندار بم. من بڕوام وایە کە ڕۆدریگۆ لەوە دەگات. ئەگەر ئەوم لەگەڵ بووایە بە شێنەیی و بێدەنگی تا لە ژیاندا ماباین پێکەوە چێژمان وەردەگرت. وا دەزانم ئەو شتەی کە ئەو زۆر لێی دەترسێت ئەوەیە ئەگەر لەو تەمەنە ئەویندار بکات، خۆی وەک گاڵتەجاڕێک بێتە بەرچاو، چونکە پیاوان لەو بارەیەوە نەختێ لووتیان بەرزە؛ بەڵام خۆشەویستی و کاری ئەوینداری زۆر شێوازی هەیە، من هەندێ شێوازی تازەم داهێنابوو بۆ ئەوەی درێژە بە ڕابواردن و دەستگەمەی خۆمان بدەین، هەتا لە پیرێتیشدا، وەک ئەوەی لە کاتی گەنجێتی دەمانکرد ئاوا. من بیری دەستەکان و بۆن و بەرامەی و شانە پانەکانی و پرچە نەرمەکەی لا ملانی و خشانی ڕیشەکەی و بەرکەوتنی هەناسەی بە گوێچکەکانم دەکەم لەو وەختانەی بە تاریکی پێکەوە دەبووین. هەست بە تامەزرۆیی لە باوەشگرتنی ئەو دەکەم، نەک بۆ جووتبوون لەگەڵی، تا ئەو ڕادەیەی کە هەندێ جار ناتوانم لە خۆشییاندا هاوار لە گەروومدا بخنکێنم. تۆ لە کوێی ئەی ڕۆدریگۆ؟ چەندە بیرت دەکەم!

ئەو بەیانییە جلەکانم کردەبەرم و چوومە شەقامەکە، هەرچەندە هەستم بە

ماندوویتی دڵ و ئێسقانم دەکرد، ئاخر ئەمڕۆ سێشەممەیە و پێویستە بۆ ئەو شوێنە بڕۆم کە مارینا ئۆرتێس دی گایتی لێی دەژی. خزمەتکارەکانم لەسەر کورسییەکەمەوە هەڵیان گرتوومە، چونکە مارینا لە نێزیک ئێمە دەژی و پێویست بە گالیسکە ناکات. لەو مەملەکەتە شانازیکردن بەخۆوە کارێکی جوان نییە، دەترسم خۆ بە مەزن زانین بەو گالیسکەیەی کە ڕۆدریگۆ بە دیاری پێی دابووم، گوناه بێت. مارینا چەند ساڵێک لە من بچووکترە، وەلێ وا دەزانم لە چاو ئەو هێشتا کچۆڵەیەکی بچووکم. ئاخر ئەگەر لەبەر زمان شڕی، خوا بۆم بە گوناه نەنووسێت، ئەو قەڵەو و ڕاڕا و ناشیرین بووە.

تۆ ئەی ئیزابێل هەر جارێک ئەوها بدوێم بە پێکەنینەوە ئاوا ئامۆژگاریم دەکەیت: کچێ دایە ئاگەداری دەمت بە و بزانە چی دەڵێیت.

لەگەڵ ئەوەش من وا دەزانم تۆ لە چەنەبازییەکانی من چێژ وەردەگریت؛ هەروەها من ئەو مافەم هەیە ئەو شتانە بڵێم کە کەسانی تر جەسارەت ناکەن بیانبێژن. لۆچەکانی ڕوخساری مارینا و شۆڕبوونەوەیان جۆرێک لە ڕەزامەندیم پێ دەبەخشن، وەلێ لە دژی ئەو هەستە نابەجێیە دەوەستمەوە، چونکە نامەوێ کاتێکی زیاتر لە گوناهشۆریدا بمێنمەوە. من قەت بە خەڵکە بێتواناکان و ئەوانەی کەسێتییان لاوازە لە وێنەی مارینا، سەرسام نەبوومە. ئەوانە بەزەییم دەورووژێنن. هەتا ئەو خزمانەشی کە لە ئیسپانیاوە لەگەڵ ئەو هێنابووم و پاشان بوونە خەڵکی سانتیاگۆ، تەواو لە بیریان چووەتەوە. من زۆر خەتای ئەوان ناگرم، چونکە ئەو ژنە بەڕێز و میهرەبانە زۆر بێزارە، بەڵام بەوە چاکە کە هەژار و نەدار ناژیت، بەڵکو وەک بێوەژنێکی شکۆدار دەژیت، هەرچەندە ئەوەیان شوێنی ئەوەی بۆ ناگرنەوە کە بەدبەختەی ژنێکی ئاوارەیە. دەبێ بە تەنیابوونی ئەو ژنە بەدبەختە چۆن بێت کە بە شەیداییەوە چاوەڕێی سەردانەکەی من دەکات؟ خۆ ئەگەر نەختێ دواکەوم ڕەنگە بە گریانەوە ببینم. کە دانیشتین هەردووکمان پێکەوە چوکلێت دەخۆین و منیش باوێشکەکانی خۆم دەشارمەوە، ئیتر دەکەوینە باسی ئەو مەسەلەیەی کە بە هەردووکمانەوە پێوەستە، ئەویش پێدرۆ دی بالدیبیایە.

مارینا، ئەوە بۆ بیست و پێنج ساڵ دەچێت لە شیلی دەژی. لە ساڵی ١٥٥٤ هاتووەتە ئێرە و ئامادەیە ڕۆڵی خۆی وەک هاوسەری حاکم وەربگرێت و هەموو ئەو کەسانەی خانەوادەکەی و دەوروبەری و ئەو مەراییکەرانەی لەگەڵدایە کە چاویان بڕیوەتە سەروەت و سامانی پێدرۆ و دەسەڵاتەکەی، دوای ئەوەی پاشای ئیسپانیا نازناوی مەرکیز و ویسامی سانتیاگۆی پێ بەخشی. بەڵام مارینا وەختێ گەیشتە جێ هەر هۆیەکی لەخۆ زانی کە بێوەژن کەوتووە. ئاخر بەر لە چەند مانگێک لە هاتنی مێردەکەی بە دەستی هندییە مابۆچییەکان کوژرابوو کە هێشتا مەسەلەی پێدانی نازناو و ویسامەکەی لەلایەن پاشاوە پێ نەگەیشتبوو. سەیرتر لەوەش گەنجینەکەی پێدرۆ کە زۆر دەنگوباسی لەسەر بڵاو بووبووەوە تەنیا تۆز و با بوو. حاکم تۆمەتی دەوڵەمەندییەکی بێ سنوور و گلدانەوەی زۆرترین و بە پیتترین زەوی و بەکارهێنانی سوپایەک لە هندییەکان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی، درابووە پاڵ، وەلێ پاشان دەرکەوت کە لە هەموو سەرکردەکانی تر هەژارترە، بەڕادەیەک ناچابوو خانووەکەی لە گۆڕەپانی چەک بفرۆشێت تا قەرزەکانی پێ بداتەوە، نەک هەر ئەوە بەڵکو ئەنجوومەنی شارەوانی مووچەیەکی خانەنشینی وەک ڕێزدانێک بۆ مارینا نەبڕییەوە کە هاوسەری شەرعی داگیرکەری شیلی بوو. ئەوە نەسەلماندنێکی باوە لەو هەرێمەدا، بەڵکو ناوێکی تایبەتیشی پێ دەڵێن - وەفاداری بۆ شیلی -. من لەسەرم پێویست بوو کە خانووێکی بۆ بکڕم و خەرجییەکانیشی لە ئەستۆ بگرم، بۆ ئەوەی تارماییی پێدرۆ گوێچکەکانم ڕانەکێشێ. لە خۆشبەختی خۆمدا هێشتا دەمتوانی بە ئەنجامدانی هەندێ کار لەخۆباییبوونی خۆم دامرکێنمەوە، وەک دروستکردنی دامەزراوە و دابێنکردنی گۆڕێک لە کەنیسە تا لەوێ بمشارنەوە و خۆشەویستی خەڵکەکە بۆ خۆم ڕاکێشم و سامانێکی باش بۆ کچەکەم بە میرات بەجێ بێڵم و دەستی یارمەتیش بۆ هاوسەری کۆنە ئەویندارەکەم درێژ بکەم. ئەوڕۆکە بایەخی ئەوە چییە کە ئێمە ڕۆژێ لە ڕۆژان هەوێی یەکتری بووینە؟

من تازە بە ئاگادێم کە لاپەڕەیەکی زۆرم نووسیوەتەوە، بێ ئەوەی هێما بۆ

ئەوە بکەم کــە لـەبەرچی ئەو زەوییــانە تەنیــا شــانشــینێکە لە ئەمــریکا.
ئیـمپـڕاتۆری پیـرۆزمـان کـارلۆسی پێنـجـەم ئارەزووی وابوو کـە کوڕەکـەی -
فیلیپی - لەگەڵ ماری ستیوارد، شاژنی ئینگلتەرە ببنە هاوسەر. ئەمەیان لە
چ ساڵێک ڕووی دا؟ وا دەزانم لەو ساڵە بوو کە پێدرۆ گیانی لەدەست دا. ئەو
ئەمـیـرە گـەنجـە پێـویسـتی بە نازناوی پاشـایی هـەبوو تاکـو بتـوانێت ئەو
هاوسەرگیرییە بکات، بەڵام لەبەرئەوەی باوکی بیری لەوە نەدەکردەوە کورسی
شاهانەی بۆ چۆل بکات، بۆیە بڕیاری دا شیلی ببێتە شانشین و فیلیپیش
بکرێتـە پاشـای کە ئەوەش بۆ چارەنووسی ئێمە باش نەبوو، بـەڵام نازناوێکی
پێ بەخشین.

بە هـەمـان ئەو کەشتییەی کە مارینا پێی هاتبوو - کە ئەو وەختە تەمـەنی
چل و دوو ساڵ دەبوو، چاوەکانیشی نەختێ کزبووبوون وەلێ جوان بوو، ئەو
جـۆرە جـوانییـەی کـە قـژ زەردە پێگەیشـتـووەکـان پێی ناسـراون -، دانێل
بیلالکاسار و کچـە خوشکەکەم "کۆنستـانسـا" لەگـەڵی هاتبوون کـە من لە
سـاڵی١٥٣٨ وە مـاڵئـاوییم لێ کـردبوون. من وام دەزانی جـارێکی تر کـچـە
خوشکەکەم نابینمەوە کە لە جیاتی ئەوەی ببێتە قەشەژن، بە پەلە لە تەمـەنی
پازدە ساڵیدا مێردی بە هەواڵنووسەکە کرد کە لە ناو کەشتییەکە لە خشتەی
بردبوو. ئەو شـتـە لە ناکاوە لەسـەر ئێـمـە زۆر گـەورە کەوتەوە، چونکە من پێم
وابوو دارسـتـانە چڕەکە ئەوانی قووت داوە و نەمـاون. ئەوانیش قـەت بیـریان
لەوە نەدەکردەوە کە من ڕۆژێ لە ڕۆژان شـانشینێک دروست دەکەم. ئەوان دوو
ساڵ لە شیلی مانەوە تا لە دوورەوە لێکۆڵینەوە لەسـەر ڕابردووی مابۆچییەکان
و داوونەریتیـان بکەن، چونکە نەدەکرا بچنـە ناویان لە کـاتێک جـەنگ لەوپەڕی
توندی دابوو. بیلالکاساریش دەیگوت مابۆچییەکان بە هەندێک گەلی ئاسیایی
دەچن کـە لە گـەشـتـەکانیدا بۆ ئەوێ بینیـویەتی. ئەو بە جـەنگاوەری مـەزنی
دادەنان و سـەرسـوڕمـانی خـۆی بەوان نەدەشـاردەوە، هـەروەک پاشـان ئەو
شاعیرە داستانی شیعری لەسەر ئەراوکانیا دەهۆنییەوە. ئایا پێشتر من ناوی
ئەو شاعیرەم هێنابوو؟ ڕەنگە لە بیرم نەمابێت، وەلێ کاتەکە درەنگە بۆ ئەوەی

بگەڕێمەوە و گرینگی بە کارەکانی بدەم. ئەو شاعیرە ناوی ئێرسەییا بوو. جا وەختێک ئەو ژن و مێردە زانییان کە ناتوانن لە هندییە مابۆچییەکان نێزیک ببنەوە تا ڕاستەوخۆ وێنەیان بکێشن و پرسیاریان لێ بکەن، بۆیە لە گەشتکردنیان لە جیهاندا بەردەوام بوون. ئەوان دوو هاوبەشی تەواوکەری یەکتری بوون لە کارە زانستییەکانیان، هەردووکیان بە هەمان وزە و حەماسەتەوە کاریان دەکرد و بۆ دۆزینەوەی شتە شاراوەکان، ژیانی خۆیان دەخستە سەر لێواری مردن.

دانێل بیلالساکار بیرۆکەی دامەزراندنی دامەزراوەیەکی فێربوونی لە مێشکم چەسپاندبوو، چونکە پێی وابوو کە ناکرێت وڵاتی شیلی بە ئاوەدانییەکی پێشکەوتوو دابنرێ لە کاتێک کە ژمارەی خوێندەوارەکانی لە پەنجەی دەستێک زیاتر نابێت. ئەو مەسەلەیەم ڕووبەڕووی قەشە گۆنزالس کردەوە لەگەڵ ئەو پێکەوە ماوەی چەند ساڵێک هەوڵمان دا تا قوتابخانە بکەینەوە، بەڵام کەسێک بایەخی بە پرۆژەکەی ئێمە نەدا. ئای لەو خەڵکە نەزانە! دەترسن لەوەی کە ئەگەر خەڵک فێری خوێندنەوە بێت، ئیتر بیردەکەنەوە، لە بیرکردەونەش بۆ یاخیبوون کە هەر تاڵە موویەکی سادەیان بەینە.

ئەمرۆکە هەروەک گوتم بۆ من ڕۆژێکی خۆش نەبوو. ئاخر لە جیاتی ئەوەی بایەخ بە چیرۆکی ژیانم بدەم، بە شێواوی دەسووڕێمەوە. هەر ڕۆژە و ناخۆشییەکی زێترم پێویستە بۆ تێڕامانی ئەو ژیانە، چونکە بیرم بڵاوە! هاتوهاوارێکی توند لەو ماڵەدایە، لەگەڵ ئەوەش تۆ دەڵێی ئێرە هێمنترین ماڵی سانتیاگۆیە.

شەوی ڕابردوو پێت گوتم: ئەوە تەنیا هزری تۆیە ئەی دایکی بەڕێزم، دەنا ئێرە هیچ دەنگەدەنگێکی لێ نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لێرە ڕۆحەکان ئازار دەکێشن.

- بەڵێ، دەقاودەق ئەوەم مەبەستە ئەی ئیزابێل.

تۆ وەک باوکت وای، هەم کارا و هەم ژیریشی، جا لەبەر ئەوە هەست بەوانە ناکەیت کە بەبێ مۆڵەت لە ژوورەکانی خانووەکەم تێدەپەڕن. لەگەڵ چوونە ناو ساڵم ئەو پەردەیەی کە ئەم جیهانە لەوی تر جیادەکاتەوە تەنک دەبێت و هەست بە بینینی ئەو شتانە دەکەم کە نابینرێن. بڕوام وایە تۆ لە دوای مردنی من ئەو شوێنە تازە دەکەیتەوە، کەلوپەلە کۆنەکانی دەبەخشییە خەڵکانی تر و دیوارەکان دووبارە گەچکاری دەکەیتەوە. بەڵام پێویستە لە بیرت بێت کە بەڵێنت پێم داوە ئەو لاپەڕانەی لە پێناوی تۆ و نەوەی تۆدا نووسیومن، پارێزگارییان لێ بکەیت. ئەگەر پێت باشبوو بیاندە دەست "قەشەکانی برایانی بەزەیی" یان ئەو قەشە دۆمەنیکیانەی کە بە هەندێ خزمەت قەرزاری منن. لە بیرت نەچێ من پارەیەکی زۆر بۆ خەرجییەکانی مارینا ئۆرتیس دی گایتی بەجێ دێڵم هەتا لە ژیاندا ماوە، هەروەها تێرکردنی زگی ئەو هەژارانە لە بیرمەکە کە ڕۆژانە لەوە ڕاهاتوون خۆراکی خۆیان لە دەرگەی ئەو ماڵە وەردەگرن. وا دەزانم پێشتر ئەو شتانەم پێت گوتووە، بۆیە داوای بووردن دەکەم کە دووبارەیان دەکەمەوە. ئەی ئیزابێل، من بڕوای تەواوم هەیە کە تۆ ئەو داواکارییانەی من جێبەجێ دەکەی، چونکە تۆش وەک باوکت وای: دڵڕاستی و قسەی خۆت لەکن پیرۆزە.

***

هەر لەگەڵ پەیوەندیکردنمان بە پێرۆ و گەیشتنی زەخیرە و شتومەک و خەڵکێک کە دەیانویست ئەزموون وەربگرن، بارودۆخی شارەکەمان گۆڕا. لە سایەی کەشتییە چارۆکەدارەکان کە دەهاتن و دەچوون، توانیمان ئەو شتانە ڕاسپێرین کە بۆ پێشکەوتن پێویستمان پێیان هەبوو. بالدیبیا ئاسن و زەخیرەی شەڕ و تۆپی کڕی، منیش ڕام سپارد کە نەمامی درەخت و تۆومان لە ئیسپانیاوە بۆ بێنن کە لە کەشوهەوای شیلی بە چاکترین شێوە شین دەبوون. هەروەها داوامان کرد مەڕ و بزن و ماڵاتی ترمان بۆ بێت. لە ڕێگەی هەڵەوە هەشت مانگا و دوازدە گامێشیان بۆ ڕەوانکردم؛ کە هەر تەنیا گامێشێک بەسبوو. ئەگێری دەیویست ئەو هەڵەیە بقۆزێتەوە و یەکەم مەیدانی

زۆرانبـازی کەڵەگـاکـان بکاتەوە، بەڵام مـاڵاتەکان کـە لەو ڕێیـە دوورەی دەریا گەیشتنە جێ، زۆر لاواز بووبوون و بە کەڵکی قۆچانێ نەدەهاتن. وەلێ سوودی ئەو گامێشانـە شوێنی خۆی گرت، دە سەرمان بۆ کێڵانی زەوی و گواستنەوە بەکار هێنا، دووەکەی تریش لە خزمـەتی مانگاکاندا بوون بە باشترین شێوە، تا وای لێهات ئێستاکە ژمارەیەکی زۆرمان مـاڵات هەیە، هەر لە پاوانەکانی کـۆبیـابۆوە بگرە تا دەگـاتە دۆڵی مـابۆچی. ئاشـێک و تەندوورێکی نانی گشتیمـان دروست کرد و بووینە خاوەنی باخچە و مشاری داربڕین، شـوێنی خـشـتـبڕینمـان دیارکـرد و هۆڵێکمـان ئامادە کـرد بۆ پێـست خـۆشکردن و دروستکردنی فـەخووری و حـەیزەران و مـۆم و زین و کـەلوپەلی ناومـاڵ. دوو بەرگدروومـان هەبوو لەگـەڵ دوو نووسـەری گـشـتی و پزیشـکێک کە بەکـەڵکی هیـچ نەدەهات، وەلێ پزیشکێکی ئاژەڵی زۆر باشـمـان هەبوو. لەگـەڵ ئەو هەنگاوە بە پەلانەی ئاوەدانکردنەوەی شـار، ئەو دۆڵە درەخـتی تێـدا نـەمـا، چونکە لە دروسـتکردنی بینایە و خـانوودا زۆر ئازابووین. ناتوانم بڵێم کـە ژیانمان خۆشبوو، وەلێ چیتر بێ خۆراک نەمـاین، بە جۆرێک ياناکۆناکانیش قـەڵەو بووبوون و لە ڕاپەڕاندنی کـاردا تەوەزەل بووبوون . هەروەها تووشی هیچ کێشـەیەکی ئاڵۆز نەبووبووین جگە لە کارەساتەکەی مشکان کە هندییە جـادووگـەرەکـان بە هوونـەری چەپەڵ دروسـتـیـان کـرد بۆ ئەوەی تەنگ بە مەسیحییەکان هەڵچنن. بە هۆی ئەو مشکانەوە نەماندەتوانی پارێزگاری لە دانەوێڵـە و مـاڵ و جلەکـانمان بکەین، چونکە بێجگە لە کـانزاکـان، هـەمـوو شتێکیان دەخوارد. سیسیلیا چارەسـەرێکی ئەو کارەساتەی خستـەڕوو کە لە پێرۆ کاریان پێ دەکرد: لە هەر مـاڵێک گۆزەیەکمان دانا تا نیوەی ئاومـان تێ کرد، بۆ سبەینەکەی بینیمان هەموو ئەو گۆزانە نێزیکەی پێنج سەد مشکیان تێدا خنکاوە، وەلێ کارەسـاتەکـە کۆتایی نەهات تا ئەو کـاتەی سیـسیـلیا بە سیحرەکەی کیچوای زانی و سیحری شیلییەکانی بە تاڵ کردەوە.

بالدیبـیـا بە پێی فـەرمـانی پاشـا، تکای لە سـەربازەکـانی دەکـرد کـە هاوسـەرەکـانیـان لە ئیـسـپـانیـاوە بێننە ئێرە و هەندێکیـان فـەرمـانەکـەیان

جێبەجێ کرد، وەلێ زۆربەیان ژیانیان لەگەڵ ژنە گەنجە ئەویندارە هندییەکان پێ خۆشتربوو لەوەی لەگەڵ ژنێکی بە تەمەنی ئیسپانی بژین. لەو شارەی ئێمە تا دەهات ئەو منداڵانە زۆر دەبوون کە باوکی خۆیان نەدەناسی. ئەو ژنە ئیسپانییانەی کە دەهاتنە سۆراغی مێردەکانیان دەبووایە چاوی خۆیان بنووقێنن و بەو واقیعەی ئێرە ڕازیبن کە لە بناخەدا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو حاڵەتانەی ناو ئیسپانیا نەبوو. ئاخر تاکو ئێستاش لە شیلی وا باوە کە ماڵی گەورەکان ژن و منداڵە شەرعییەکانی لێ دەژین و ماڵە بچووکەکانی تریش بۆ ژنە ئەویندار و ئەو منداڵانەن کە بەهۆی زیناوە پەیدا بوونە. ڕەنگە من تەنیا ژنێک بم کە ئەو حاڵەتەم لە مێردەکەم قبوڵ نەکردبێت، بەڵام دەشێ لە پشتی منەوە هەموو شتێکی کردبێت کە من نایزانم.

سانتیاگۆ وەک پایتەختی شانشین ڕاگەیاندرا، دانیشتووانی لە زۆربووندابوون و ئارامی و ئاسایش بەرقەرار بوو؛ هندییەکانی میشیمالۆنکۆ دوور لە ئێمە مانەوە، ئەمەش بواری ئەوەی پێداین کە گەشتەکانمان ڕێک بخەین و لە گوندەکان سەیرانی بەزم و خواردن دروست بکەین و لەسەر لێوارەکانی ڕووباری مابۆچۆ ئاهەنگی ڕاوەماسی بگێڕین کە پێشتر ناوچەیەکی قەدەغەکراو بوو بۆ ئێمە. ڕۆژانی جەژنمان بۆ ڕێزگرتنی خواپەرستەکان تەرخان کرد، ڕۆژێکی ترمان بۆ یاری و بەزم و مۆسیقا دانا کە ئیسپانی و هندی و زنجییەکان و دووڕەگەزەکان پێکەوە بەشدارییان دەکرد. شەڕە کەڵەشێرمان ساز دەکرد و پێشبڕکێمان بە سەگەکان دەکرد و بە تۆپی دارین یاریمان دەکرد. پێدرۆش کە یاریزانێکی بە حەماسەت بوو هەر خەریکی یارییەکانی کاغەزێن بوو لە ماڵەکەی خۆمان. تاکە جیاوازییەک کە هەبوو ئەوەبوو کە گرۆیەکان خەیاڵی بوون، چونکە کەسێکیان قرشێکی لە باخەڵ نەبوو، وەلێ سەلەمکارەکان بە تەواوی ئەو قەرزانەیان تۆمار دەکردن، لەگەڵ ئەوەش هەموو دەیانزنی کە قەت نادرێنەوە.

ئەو کاتەی پۆستە لە نێوان ئیسپانیا و پێرۆ جێگیربوو، لەوساوە دەمانتوانی نامە بنێرین و بگاتە دەستیشمان، گەیشتنی ئەو نامانە لە ساڵێک

دووانی زێتر نەبرد. پێدرۆ دەستی کردە نووسینی نامەی پێویست بۆ ئیمپڕاتۆر کالۆسی پێنجەم. لە نامەکاندا لە بارەی شیلی و ئەو هەژارییەی کە تووشمان بووبوو و خەرجی و قەرزەکانی و شێوازی فەرمانڕەوایی دادپەروەرانەی خۆی دەدوا. هەروەها باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن هندییەکی زۆر دەمرن و ئەم زۆری پێناخۆشە و لە کێڵگە و کانگەکانیش کەموکوڕییان لە هێزی کاردا هەیە. داوای لە ئیمپڕاتۆر کرد کە نازناوێکی پێ ببەخشێت، چونکە حاکمەکان شایەنی ئەوەن وەری بگرن. بەڵام ئەو داواکارییە ڕەوایانەی پێدرۆ هەمووی بێ وەڵام مانەوە. ئەو سەرباز و خەڵک و کەشتی و چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی و ناسینی کردەوەکانی لە پاشا گەرەک بوو. هەموو جارێ لە ناو هۆڵەکە پیاسەی دەکرد بە زمانێکی تەڕ نامەکانی بە دەنگێکی فەرماندەرانە بۆم دەخوێندەوە و منیش هیچم نەدەگوت. ئاخر چۆن ڕای خۆم لە بارەی نامە گۆڕینەوەکانی ئەو دەبڕم کە لەگەڵ گەورەترین و بە دەسەڵاتترین پاشای زەوی ئەنجامی دەدا، ئەو قەیسەرە پیرۆزەی وەک بالدیبیا دەیگوت، کە قەت نابەزێت. بەڵام تێبینیم دەکرد کە ئەویندارەکەم گۆڕانی بەسەردا هاتووە، دیارە چێژی دەسەڵات هزریان گۆڕیوە و لەخۆبایی بووە. لە نامەکانیدا هێما بۆ کانگە زێڕە دەوڵەمەندەکان دەکات کە لە ڕاستیدا زێتر لە خەیاڵەوە نێزیک بوون. ئەوە چێژێک بوو بۆ ڕاکێشانی ئیسپانییەکان تا بێنە شیلی و ئاوەدانی بکەنەوە، چونکە تەنیا ئەو و ڕۆدریگۆ دەیازانی کە سەروەت و سامانی ڕاستەقینەی شیلی زێڕ و زیو نییە، بەڵکو ئاو و هەوا خۆشەکەی و خاکە بە پیتەکەیەتی کە وات لێ دەکەن لەوێ بگیرسێیتەوە و بەردەوامیی بە ژیان بدەیت؛ بەڵام باقی ئیسپانیاییەکانی تر هێشتا هەر خەونیان بە زوو دەوڵەمەندبوون و گەڕانەوە بۆ ئیسپانیا دەبینی.

لە پێناوی ئاڵوگۆڕێکی ئاسان لەگەڵ پێرۆدا، بالدیبیا بڕیاری دروستکردنی شارێکی تری لە باکووری شیلی دا بە ناوی شاری "سیرینا". هەروەها فەرمانی دا کە بەندەرێک بە ناوی بالبارایسۆ لە نێزیک شاری سانتیاگۆ دروست بکەن. پاشان بە نیازی مل پێ کەچکردنی مابۆچییەکان ئاوڕی لە

ڕووباری پیۆ - پیۆ دایەوە. فیلیپ بۆی ڕوونکردمەوە کە ئەو ڕووبارە پیرۆزە، چونکە ڕۆیشتنی سروشتییانەی ئاو ڕێک دەخات و بە ساردییەکەشی توورەیی گڕکانەکان ئارام دەکاتەوە و لە سایەی ئەوەوە ڕووەکەکان شین دەبن لە درەختە بەرز و گەلا گەورەکانەوە تا دەگاتە قەوزە نادیار و ڕوونەکان. بە پێی ئەو بەڵگەنامانەی کە بێسارۆ دابوویە بالدیبیا، دەسەلاتی حاکم تا تەنگەی ماجەلانی دەگرتەوە، وەلێ کەسێک نەبوو بزانێت داخوا ئەو تەنگە بەناوبانگە چەند لێرەوە دوورە کە ئۆقیانووسی خۆرهەلاتی بە هی خۆرئاواوە دەبەستەوە. لەو ڕۆژانەدا کەشتییەک لە پێرۆوە بە ڕێبەرایەتی گەنجێکی ئیتاڵی کە ناوی باستینی بوو گەیشتە جێ، پێدرۆش نازناوی ئەمیراڵی پێبەخشی و دۆزینەوەی خوارووی پێ ڕاسپارد. لە گەشتەکەی باستینی بە ڕۆخ کەناردا، چەندان دیمەنی جوان و دڵڕفێنی لە دارستانی چڕ و قووڵ و دوورگەی بچووک و ناوچەی بەستەڵەک بینی، وەلێ ئەو تەنگەیەی نەبینی کە وادیاربوو هێشتا زۆر دوورترە لەوەی کە باسی بۆ کرابوو. لەوان ڕۆژاندا هەواڵی زۆر خراپمان لە پێرۆوە بۆ دەهات، بە جۆرێک باری سیاسی بۆ حاڵەتێکی کارەساتبار گۆڕابوو؛ ئەوان دووبارە تووشی شەڕی ناوخۆ بووبوونەوە. گۆنزالۆ بێسارۆ کە یەکێک بوو لە برایەکانی حاکمە مردووەکەی ئەوێ، لە یاخیبوونێکی ئاشکرادا لە دژی ئیمپڕاتۆرمان، دەستی بە سەر دەسەلاتدا گرتبوو، ئیتر گەندەڵی و خیانەت و حوکمی پێشوەخت لەو ویلایەتە بلاو بووبووەوە، ئەمەش بووبووە هۆی ئەوەی کە ئیمپڕاتۆر کارلۆسی پێنجەم ناچاربێت قەشەی دڵڕەق - لاگاسکا - ڕەوان بکات تا یاسا بۆ وڵاتەکە بگێڕیتەوە.

من بۆ ڕوونکردنەوەی کێشەکانی شاری شاهان لەو قۆناغە مەرەکەب بەکارنابەم، چونکە من خۆشم تێی نەگەیشتم، وەلێ ناوی لاگاسکا دێنم چونکە ئەو پیاوە ئاینییە بە دەموچاوی خوریکەدارییەوە، بڕیارێکی وای دا کە پاشان ڕێڕەوی ژیانی منیشی گۆڕی.

پێدرۆ زۆر تامەزرۆ بوو نەک بۆ داگیرکردنی خاکێکی زیاتری شیلی کە هندییە مابۆچییەکان تا ڕادەی مردن بەرگرییان لێ دەکرد، بەڵکو دەیویست

بەشـداری ڕووداوەکانی پێـرۆش بکات و لەگەڵ شـارسـتـانـیـیـەتیش پەیوەندی دروست بکات، ئاخـر ئەوە هەشت سـاڵ بوو لە ناوەندەکـانی بڕیار دوور کەوتبووەوە و حەزی دەکرد بە نهێنی گەشتێک بۆ باکوور بکات و لەوێ چاوی بە سەرکردە سەربازییەکان بکەوێ و بازرگانی و کڕین و فرۆشتن و دەست پێ بکات و خۆی وەک داگیرکەری شیلی بناسێنێ و شمشێرەکەی لە خزمەتی پاشا و لە دژی گۆزالۆ بێسارۆی یاخیبوو بخاتە کار. ئایا لە من بێزار بووە؟ ڕەنگە: وەلێ ئەو وەختە گومانم دەکرد و لە خۆشەویستییە سروشتییەکەی بۆ من دڵنیا بووم کە وەک باران بەسەرمدا دەباری. خۆ ئەگەر هەستیشم بە نیگەرانییەکەی کردبێت، وام لێک دەدایەوە کە لەوانە کەمێک لە ژیانی ئاسیی و دانیشتن وەڕسبووبێت، چونکێ ڕەفتارەکانی ڕۆژگاری ڕابردوومان بەسەرچوون، ئەو کاتەی شمشێرەکانمان شەو و ڕۆژ لە دەست بوو و ئێستاکە بوار بۆ ژیانێکی پڕ لە بێکاری ئیستراحەتتر کراوەتەوە.

شەوێکیان بێ ئەوەی مەبەستی ناو دڵی خۆیم پێ بڵێت، گوتی: ئێمە پێویستمان بە سەرباز هەیە تا لە خوارووی شیلی شەڕمان بۆ بکات و پێویستمان بە چەندان خانەوادەش هەیە تا خاکەکانی تری شیلی ئاوەدان بکەنەوە، وەلێ لە پێرۆ نوێنەرەکەی من پشتگوێ دەخەن.

منیش تەنیا بۆ ئەوەی قسەیەک بکەم، بێ ئەوەی بزانم کە ئەو بڕیاری خۆی داوە، گوتم: ئایا مەبەستت ئەوەیە کە خۆت بچیتە ئەوێ؟ من ئاگەدارت دەکەمەوە کە تەنیا ڕۆژێک ئێرە بەجێبێڵی بارودۆخەکە دەبێتە کارەسات. خۆ دەزانیت کە دیلا ئۆسی هاوڕێت چی لە بن سەریدا هەیە.

– بیاگرای لە شوێنی خۆم دادەنێم، ئەویش کەسێکی بەهێز و جەسوورە.

– باشە لە پێرۆ چۆن خەڵک بڕوا پێ دێنیت بۆ ئێرە بێن؟ خۆ ئەوانە هەموو وەک تۆ پیاوی نموونەیی نین. ئاخر پیاوەکان بۆ ئەو شوێنە دەچن کە سەروەت و سامانی لێ بێت نەک پیاوەتی و جوامێری.

– دەیبینی کە چۆن ئەوە دەکەم.

ئەمە بیرۆکەی خۆی بوو و من هیچ پەیوەندییەکم پێیەوە نەبوو. پێدرۆ بە دەهۆڵ و دەنگی بەرزەوە ڕایگەیاند کە کەشتیی باستینی ڕەوانی پێرۆ دەکات و هەرکەسێکیش ئارەزوو دەکات بچێت، دەتوانێ زێڕەکانیشی لەگەڵ خۆی ببات. ئەو هەواڵە حەماسەتێکی سەرشێتانەی وروژاند، بە جۆرێک بۆ ماوەی چەند حەفتەیەک لە سانتیاگۆ جگە لەو بابەتە قسەیەکی تر لە گۆڕێ نەما. من دەچم! سامانەکەم دەبەمەوە ئیسپانیا!، ئەمە خەونی هەموو ئەوانەبوو کە لە کیشوەرە کۆنەکەوە بۆ جیهانی تازە هاتبوون: گەڕانەوەیەکی دەوڵەمەندانە. بەڵام وەختێ کە هاتنە سەر تۆمارکردنی ناوی گەشتیارەکان، تەنیا شازدە کەس خۆیان بۆ ئەو گەشتە یەکلا کردەوە و کەلوپەلەکەنیان بە نرخێکی هەرزان فرۆشت و بارگەیان پێچایەوە و زێڕەکانیان کۆکردەوە و ئامادەی ڕۆیشتن بوون. یەکێک لەوانە ڕێنیشاندەری ڕوحی قەشە گۆنزالس بوو کە ئەو وەختە تەمەنی لە شەستی ئاوای کردبوو و چەندان شێوازی داهێنا بۆ کۆکردنەوەی سەرجەمی سامانە ڕاستەقینەکەی کە گوایە دەیەوێ لە خزمەتی خوا خەرجی بکات. هەروەها خاتوو دیاس کە ژنێکی ئیسپانی بوو و بەر لە دوو ساڵ بە کەشتییەک هاتبووە شیلی، لە نێو گەشتیارەکاندا بوو، کە وەک ژنێک تەنیا کەم شتێکی نەبوو. ئاخر ئێمە دەمانزانی کە ئەو ژنە پیاوە و جلی ژنانی پۆشیوە. کاتالینا پێی گوتم کە ئەو ژنە لە نێو قاچەکانیدا ئەندامی نێرینەی هەیە. منیش لێیم پرسی: ئای چ جۆرە هزرێک بە مێشکتدا دێت! ئاخر بۆچی پیاوێک قایل دەبێت جلی ژنانە بپۆشێت؟

ئەویش بۆی ڕوونکردمەوە: ئاخر گەورەم ئەمە لە پێناوی ئەوەیە پارەی پیاوەکانی تر بدزێت...

با چی تر غەیبەت و قسەی بێمانا نەکەین.

لە ڕۆژی دیاریکراودا گەشتیارەکان سواری کەشتییەکە بوون و سەندووقە بۆرەکانیان لە شوێنی تایبەت دانا کە بە چاوچنۆکییەوە زێڕەکانیان تێدا هەڵگرتبوون. لەو ساتەدا پێدرۆ و چەند سەرکردەیەکی تر لە سەر کەنار دیارکەوتن و چەند خزمەتکارێکیان لەگەڵدابوو بۆ ئەوەی داوەتی

ماڵئاواییکردن بۆ ئامادەبووان ساز بکەن. ماسی و سەدەفی بە تامیان لە دەریا دەرهێنا و لەگەڵ بادە لە شوێنی تایبەتیی حاکمدا خواردیان. چەتری لە قوماشی ئەستووریان لەسەر لەکە هەڵدا و وەک پاشایان ئەو ژەمەیان خوارد و لەگەڵ گوتارە کاریگەرەکان دەگریان، بەتایبەتی گوتاری ئەو ژنەی کە ئەندامی نێرینەی هەبوو کە بە سۆز و مەکرەوە قسانی دەکرد. بالدیبیا پێیانی ڕاگەیاند کە هەر گەشتیارێک پێویستە بڕی زێڕەکەی خۆی دیار بکات، تا لە داهاتوودا تووشی گیرەوکێشە نەبن لەو بارەیەوە هەڵسوکەوتێکی ژیرانەی کرد کە هەمووان پێیان باش بوو. وەختێ کە نووسەرەکە بە دڵسۆزییەوە ئەو ژمارانەی تۆمار دەکردن کە گەشتیارەکان پێیان دەدا، بالدیبیا بە خۆی و پێنج دەریاوانی ترەوە سواری تاکە بەلەمەکەی بوو و بە ئاراستەی کەشتییەکە ڕۆیشتن کە ژمارەیەک لە دڵسۆزترین هاوڕێکانی لەوێ چاوەڕێیان دەکرد و دەیویست لە کێشەی پێرۆ خۆی بخاتە خزمەتی پاشا. وەختێ گەشتیارە بێئاگاکان بەم فێڵەیان زانی وەختبوو لە تووڕەییان شەق ببەن و هەندێکیان بە دوای بەلەمەکەدا خۆیان بە ئاودادا، وەلێ هەر تەنیا یەکێکیان توانی بیانگاتێ ئەویش بە لێدانی سەوڵێک وەختبوو ملی بپەڕێ. دەتوانم وێنای نائومێدبوونی ئەو بێدەسەڵاتانە بکەم وەختێ کە دەیانبینی کەشتییەکە چارۆکەکانی هەڵدەدا و بەرەو باکوور ملدەنێ و هەموو سەروەت و سامانی دنیایی ئەوانیشی هەڵگرتووە.

بیاگرای سەرکردە و ئازا کە هیچ شێنەیی نەدەزانی، دەبوو شوێنی بالدیبیا بگرێتەوە، چونکە جێگرەوەی حاکم بوو. سەرەڕای ئەوەش دەبووایە لەسەر کەناری دەریا ڕووبەڕووی شارنشینە تووڕەکان ببێتەوە. بە دیمەنە بەهێزەکەی و ڕووە سووره چەسپاوەکەی نێو پیاوانی و ئاماژە گرژباوەکانی و بەو دەستەی کە دەسکی شمشێرەکەی گرتبوو، توانی ئارامی یاسا بخاتەوە ڕیزی خەڵکەکە. بۆی ڕوونکردنەوە کە بالدیبیا بۆ پێرۆ چووە تا بەرگری لە پاشای مەزنیان بکات و بە کۆمەکەوە بۆ شیلی بگەڕێتەوە، بۆیە ناچاربووە بەو کارە هەڵسێت، بەڵام بەڵێنی داوە کە هەرچی لە کانگەی مارگا - مارگا لە بەشی

خۆی بردوویّتی، بیگەڕێنیّتەوە.

پاشان کۆتاییی قسەکانی بەم شیّوەیە هیّنا: ئەوەی بەو شتانە ڕازییە ئەوا کاریّکی چاک دەکات، ئەوشی کە ڕازی نییە با لەگەڵ من یەکلای بکاتەوە.

ئەو قسانەی دڵی هیچ کەسیّکی ئارام نەکردەوە.

من دەتوانم لە پاکانانەکانی پیّدرۆ بۆ ئەو فیّڵە تیّ بگەم کە دەیگوت ئەمە تاکە چارەسەرە بۆ کیّشەی شیلی، بیّگومان ئەمەش بە سروشتی ڕاستەقینەی ئەو نامۆ بوو. ئەو هەموو ئەو زیانانەی کە لەو حەڤدە کەسە بیّتاوانە کەوتن لە لایەکی تەرازووی دانا و پیّویستیی بەردەوامبوون و بۆ پیّشەوەبردنی داگیرکردنی تەواوی وڵاتی شیلی و بەرژەوەندی هەزاران کەسیشی لەلای دووەم دانا. خۆ ئەگەر پرسیّکی بە من کردبایە، منیش بە تەواوی پشتگیریم دەکرد، هەرچەندە بە شیّوازیّکی نەرمتر کارەکانم جیّبەجیّ دەکرد و هاوڕێیەتیشم دەکرد، وەلیّ جگە لە هەرسیّ یاریدەرەکەی ئەو نهیّنییەی لای کەس نەدرکاند. ئایا دەبیّ بیری بۆ ئەوە چووبیّت کە من بە زۆربلّیّیی پلانەکەی لیّ تیّک دەدەم؟ نەخیّر، ئاخر لە نیّو ئەو ساڵانەی کە پیّکەوە بەسەرمان بردبوون، بۆیم سەلماندبوو کە چەند نهیّنیپاریّزم و چەند بە توندییەوە بەرگری لە ژیان و بەرژەوەندییەکانی ئەو دەکەم، وەلیّ ڕەنگە لەوە ترسابیّت کە نەهیّڵم ئەو سەفەرە بکات. وەختیّ کە ڕۆیشت تەنیا چەند شتیّکی کەمی لە پیّداویستییەکان لەگەڵ خۆی برد، چونکە ئەگەر بە تەواوی کەلوپەلی خۆی بپیّچابایەوە، منیش لە مەبەستەکەی دەگەیشتم، هەر بۆیە بیّ ماڵئاواییکردن بەجیّی هیّشتم، هەروەک چۆن میّردی یەکەمیشم، خوان دی مەلەگەش هەر وای کرد.

***

فیّڵەکەی بالدیبیا لە ژیّر هەر پەردەیەکدا بیّت، جگە لە فیّڵکردن شتیّکی تر نەبوو، وەلیّ بۆ سانچۆ دیلا ئۆس دیارییەک بوو لە ئاسمانەوە بۆی هاتبووە خواریّ کە دەیتوانی ئەو وەختە بە تاوانیّکی دیاریکراو تاوانباری بکات: خەڵکی بەوە لەخشتەبرد کە پیّدرۆ بەرهەمی چەند ساڵەی کار و ماندووبوونی

سەربازەکانی دزیوە و پێویستە لەسەر ئەم کارەی بکوژرێت.

کاتێ کە زانیم پێدرۆ رۆیشتووە، وام هەست دەکرد کە من قوربانی یەکەمی ئەو خیانەتەم کە لە شارنشینە لە خشتەبراوەکانی کردووە. یەکەم جارم بوو لە ژیانم بەسەرخۆمدا زاڵ نەبم و لە ماوەی رۆژێکدا هەموو ئەو شتانەم تێکوپێک شکاند کە لە دەوروبەرمدا بوون و بە هەموو دەنگی خۆم هاوارم لێ هەستا: ئەوجا دەزانن من کێم، من ئێنیس سوارێسم و رێگە بە هیچ کەسێک نادەم وەک کەچە پەرۆک فرێم بدات، لەبەر ئەوە من حاکمی راستەقینەی شیلیم و هەموو لایەک دەزانن کە قەرزداری منن و ئەگەر من نەبوومایە ئەو شارە گواوییە چی بەسەر دەهات. ئاخر من بە دەستەکانی خۆم ئەو کەناڵانەم هەڵکەند و نەخۆش و بریندارەکانم چارەسەر دەکرد. هەر من بووم دەمچاند و بەرهەمم دەهێنا و چێشتم ئامادە دەکرد تا لە برسان نەمرن؛ وەک ئەوەی ئەو شتانە بەس نەبێت، دەستم دەدایە چەک و وەک ئازاترین سەرباز شەڕم دەکرد. پێدرۆش وادیارە بە ژیانی خۆی قەرزداری منە، خۆشم ویست و خزمەتیم کرد و کامەرانیم پێی بەخشی، کەسێک نییە بە قەدەر من ئەو بناسێت و وەک من ئارەزووەکانی ئەو هەڵگرێت و چەندان شتی بێمانای تریش.

ئیتر هەر ئەو قسانەم دەکرد تا ئەو وەختەی کاتالینا و ژنەکانی تر هاتن و لە چوارپایەکە منیان بەستەوە و چوون داوای فریاگوزارییان کرد. من هەر لە جوێندان و نەفرەتکردن نەدەوەستام و شەیتان چووبووە خوێنمەوە. لەو کاتەدا خوان دی مەلەگە لە دواوەی چوارپاکە دانیشتبوو و گاڵتەی پێم دەکرد. دوای کەمێک گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ بەپەلە هات. زۆر خەفەتبار بووبوو، چونکە تەمەندارترین لەخشتەبراو بوو و وای دەزانی کە قەت ناتوانێت قەرەبووی زیانەکانی بکاتەوە. بەڵام پاشان نەک هەر مولْک و سوودەکانی وەرگرتەوە، بەڵکو پاش چەند ساڵێک، کاتێ کە مرد دەوڵەمەندترین پیاوی شیلی بوو. چۆن توانی ئەو هەموو سەروەتە کۆ بکاتەوە؟ ئەوە نهێنییەکی بزرە. وا دەزانم من بووم ئەو کەسەی لە پێکەوەنانی بەشێک لەو سامانە یارمەتیم دا، ئاخر بە

هاوبەشی ئەسپمان بەخێو دەکرد کە ئەو کارە هەر لە سەرەتای هاتنمان بۆ شیلی بە بیرمدا هات. قەشەکە گەیشتە ماڵەکەم و ئامادەبوو لە کەشێکی تایبەتدا ئەو شەیتانە لە جەستەم دەرکات؛ بەڵام وەختێ زانی کە ئەو دەردەی تووشم بووە لەو بێزارییە توندەوەیە کە خۆشەویستەکەم تووڕەی کردوومە، بە ڕشاندنی ئاوی پیرۆز بەسەرمدا و خوێندنی چەند پاڕانەوەیەک: «ئەی مەریەمەی پیرۆز» و دووبارەکردنەوەی بۆ چەند جارێک وازی لێ هێنام، ئەمەش چارەسەرییەک بوو کە ئارامیی بۆم گێڕایەوە.

ڕۆژی دواتر سیسیلیا هاتە سەردانم. ئەو کاتە دایکی چەند کوڕێک بوو، وەلێ وەک شازادەیەکی ئێنکا، دایکایەتی هیچ ئاسەوارێکی لە دیمەن و ڕووخساری جێ نەهێشتبوو. ئەو ژنە کاری هەواڵگری و باری کەسێتی خۆی وەک هاوسەری فەرمانبەری قەزایی، خوان گۆمێس، زۆر پێ چاک بوو. دەیزانی لەو ئاوەدانییە چی ڕوو دەدات، هەتا ئەو نۆبەتە ڕقهەڵسانەی بەم دواییەی منیش. لەسەر چوارپاکە منی بینی کە هێشتا تەواو بارتێکچوونی ڕۆژی پێشوو بەری نەدابووم.

لە جیاتی سڵاو سەندنەوە گوتم: ئەی سیسیلیا، پێدرۆی وا لێ دەکەم باجی ئەو ڕەفتارەی خۆی بدات.

– ئەی ئێنیس، من خەبەری خۆشم بۆ تۆ پێیە، تۆ ناچاری ئەوە نابیت تۆڵەی لێ بکەیتەوە، چونکە خەڵکی تر هەنە لە جیاتی تۆ تۆڵەی لێ بکەنەوە.

– چیت گوت؟

– بێئومێدەکان کە لە سانتیاگۆ زۆرن، پلانی ئەوەیان داڕشتووە کە پێدرۆی لە بەرامبەر دادگای پاشایەتی لە پێرۆ تۆمەتبار بکەن. جا ئەگەر سەریشی لەسەر سەکۆی سێدارە نەبڕن، ئەوا لانی کەم تا ماوە دەکەوێتە بەندیخانە. ئەی ئێنیس، تۆ سەیری خۆت بکە چەندە بەختەوەری!

هاوارم کرد و لەسەر چوارپایەکە بازم دا تا جلەکانم بپۆشم و گوتم: ئەمە تەگبیری سانچۆ دیلا ئۆسە!

- چما تۆ پێت وابوو کە ئەو گەمژەیە خزمەتێکی وا گەورەت پێشکێش بکات؟ دیلا ئۆس نامەیەکی ڕەوان کردووە و تێیدا داوای لابردنی پێدرۆی کردووە و خەڵکێکی زۆری ئەو شارە ئیمزایان لە سەری کردووە. زۆربەی خەڵکەکە دەیانەوێ لە دەست پێدرۆ ڕزگاریان بێت و دیلا ئۆس لە شوێنی ئەو ببێتە حاکم.

لە کاتێک قەیتانی پۆستاڵەکەم قایم دەکرد بە منگە منگەوە گوتم: ئەو گەمەیە هەرگیز سەرناگرێت!

بەر لە مانگێک لەمە، ئەو شەڕخوازە هەوڵی دا بالدیبیا بکوژێت. وەک هەموو پلانەکانی کە بە مێشکیدا دەهاتن، ئەوجارەش پلانەکەی هەمەلایەنە بوو: وا خۆی نیشان دەدا کە زۆر نەخۆشە و لە نێو جێگە خۆی دەخست و دەیگوت لە سەرەمەرگم و دەمەوێ ماڵئاوایی لە دۆست و دوژمنانم بکەم کە یەکێک لەوانە بالدیبیا بوو. یەکێکی لە پیاوەکانی خۆی تێگەیاندبوو کە بە خەنجەرەوە لە پشت پەردەکە بوەستێت و لەو دەمەی پێدرۆ خۆی دەچەمێنێتەوە تا گوێ لە چرپە و دەنگی کزی ئەو بگرێت، لە پشتڕا دەستی لێ بوەشێنێ. ئەو وردەکارییە گاڵتەجاڕییانە و شانازی پێوەکردنەی هیچیان بۆ دیلا ئۆس نەهێشتەوە، چونکە من بەبێ خۆماندووکردن بە تەڵەکەبازییەکانی ئەوم دەزانی. من ئەوکاتە جارێکی تریش پێدرۆم لەو فێڵانە ئاگەدارکردەوە، وەلێ یەکەم جار بە قاقاوە پێکەنی و پێی باوەڕ نەکردم. بەڵام لە دواییدا ڕازیبوو کە بە قووڵی لەو شتە بکۆڵێتەوە. لێکۆڵینەوەکان دەریانخست کە دیلا ئۆس تاوانبارە و بۆ جاری دووەم یان سێیەم بڕیاری لە سێدارەدانی دەرچوو کە بە تەواوی ژمارەکەیم لەبیر نەماوە. لەگەڵ ئەوەش لە دواچرکەدا پێدرۆ لێی خۆشبوو تا پارێزگاری لە داوونەریت بکات.

جلەکانم لەبەرکرد، بە لێبووردنەوە ماڵئاواییم لە سیسیلیا کرد و بەپەلە خۆم گەیاندە بیاگرا تا قسەی لەگەڵ بکەم و قسەکانی شازادەی بخەمە بەرگوێ و دڵنیای بکەمەوە کە ئەگەر دیلا ئۆس لە هەوڵەکانی سەرکەوێت، ئەوا هاوڕێ دڵسۆزەکانی پێدرۆ یەکەم کەس دەبن کە سەریان دەپەڕێندرێت و

ئەویش بەر لە هەمووان.

فرانسیسکۆ بیاگرا دەیویست زیاتر زانیاری دەستکەوێت و لە تووڕەییيان ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو.

– ئەی دادە ئێنیس، هیچ بەڵگەیەکت پێیە؟

– نەخێر ئەوانە هەر قسە و باسی خەڵکە، ئەی فرانسیسکۆ.

– ئەوەندەم بەسە.

خێرا چوو پیلانگێڕەکە بگرێت و فەرمانی دا عەسرەکەی هەمان ڕۆژ لە سێدارەی بدەن، بێ ئەوەی بواری ئەوەی بداتێ کە لە بەرامبەر قەشەدا پێ لە تاوانەکەی بنێت. پاشان بڕیاری دا بە پرچ سەری دیلا ئۆس لە دەست بگرێ و بە ناو شاردا بگێڕێ پێش ئەوەی سەری ڕمەکەی تێچەقێنێت تا ببێتە دەرسێک بۆ یاخیبووەکان، وەک ئەوەی پێشتریش هەروا باوبوو. چەند سەری پەڕیندراوم بەم چەشنە دیوە لە ژیانم؟ هەرگیز ناتوانم بیانژمێرم. بیاگرا بە دوای پیلانگێڕەکان تردا نەچوو کە وەک مشک لە ماڵەکانیان خۆیان شاردبووەوە، چونکە دەبووایە خەڵکەکە هەمووی بگرێت.، ئاخر ناڕەزایی لە دژی پێدرۆ هەموو شاری سانتیاگۆی گرتبووەوە. ئیتر بەو جۆرە ئەو سەرکردەیە لە تەنیا شەوێکدا سنووری بۆ پەتای شەڕی ناوەخۆ دانا و لە هەمان کات لەو زێرووە خوێنمژە ڕزگار بووین کە خۆی لە دیلا ئۆس دەنواند.

***

بالدیبیا بە هۆی وەستانی لە چەند شوێنێک لە چاوەڕوانی پێگەیشتنی هەواڵی سانتیاگۆ، مانگێکی پێچوو ئەوجا گەیشتە کایاو؛ دەیویست دڵنیابێت کە بیاگرا بە شێوەیەکی ڕێکوپێک کارەکان هەڵدەسووڕێنێ و پشتی دەگرێت. بە یاخیبوونەکەی دیلا ئۆسی زانی، چونکە یەکێک لە هەواڵبەرەکان توانی ئەو خەبەرە ناخۆشەی پێ بگەیەنێت، بەڵام حەزی نەدەکرد بەرپرسی ڕاستەوخۆی کۆتاییی ژیانی ئەو بێت، چونکە ڕەنگە ئەوە لەگەڵ دادوەری تووشی کێشەی بکات. زۆر دڵی بەوە خۆشبوو کە جێگرە دڵسۆزەکەی بە شێوازی خۆی

گرفتەکان چارەسەر دەکات، هەرچەندە بەو ڕووداوە نەختێ شلەژاو و پەست دیاربوو، ئاخر دەیزانی کە ئەو دوژمنەی پەیوەندی لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی نێو حەرەمسەرای کارلۆسی پێنجەم هەیە.

پێدرۆ لە شاری سیریناوە ئەنگوستیلەیەکی زێڕی سەیری بە هۆی سوارێکەوە بە پەلە بۆ ڕەوان کردم تا بیبوورم. نامەکەم دڕاند و ئەنگوستیلەکەم پێشکێشی کاتالینا کرد بەمەرجێک لە بەرچاومی بزر بکات، چونکە کە چاوم پێی دەکەوت خوێنم هەڵدەچوو.

لە ڕێگەی چوونە باکووردا حاکم لەگەڵ دەستەیەک لە دە سوار کۆبووەوە و بە سوود وەرگرتن لە زێڕی لە خشتەبراوەکانی سانتیاگۆ، زرێ و چەک و ئەسپی دایە سوارەکان و لەگەڵ ئەواندا ڕۆیشت بۆ ئەوەی بچێتە ژێر ئاڵای قەشە لاگاسکا کە نوێنەری دروستی پاشای ئیسپانیا بوو لە پێرۆ. بۆ بەیەکگەیشتنی لەگەڵ سوپای لاگاسکا، لەسەر خانەدانەکان پێویست بوو بگەنە لووتکە سەهۆڵبەندەکانی چیای ئەندێز و بە زۆر ئەسپەکەی ڕووەو ئەوێ باژوا، چونکە بە هۆی نەبوونی هەوا لەو بەرزاییانە ئەسپەکە تاقەتی نەدەما، سوارەکانیش پەردەی گوێیان دەدڕا و لە چەند کونێکی جەستەیانەوە خوێن دەهاتە دەرێ. ئەوان دەیانزانی کە لاگاسکا هیچ شارەزاییەکی لە بارەی کاری سەربازییەوە نییە، هەرچەندە پیاوێکی بە هێز و بە ئیرادەیە و بەرەنگاری سوپایەکی بەهێز دەبێتەوە کە سەرکردەکەی کەسێکی ئازا و ئەزموونداره. لەگەڵ ئەوەی دەتوانین جەنەراڵ گۆنزالۆ بێسارۆ بە هەر توومەتێک تاوانبار بکەین جگە لەوەی کە ناتوانین بڵێین پیاوێکی ترسنۆک و بێ دەسەڵاتە. هێزەکانی لاگاسکا کە لەو سەفەرەی نێو زنجیرە شاخەکان نەخۆشی تاقەتی لەبەر بڕیبوون و سەرماش پەکیانی خستبوو، سەرەڕای ئەوەش سەرکەوتنی دوژمنان ترساندبوونی، بۆیە بالدیبیا و دە ئەفسەرەکەی، وەک ئەوەی فریشتەیەکی تۆڵەسێنەربن ئەوها پێشوازی لێ کردن.

لاگاسکا وەک موعجیزەیەک بۆ بەتەنگەوەهاتنی و ڕۆڵی ئەوان بۆ یەکلاکردنەوەی شەڕەکە لەو جوامێرانەی دەڕوانی. یەک بە یەک دەستی لەملی

دەکردن و بە سوپاسەوە بالدیبیای بە سەرکردایەتی سوپایەکەی دانا کە داگیرکەری ئەفسانەیی شیلییە و کردییە سەرکردەی مەیدانی. هێزەکە یەکسەر هەندێک بڕوا و متمانەی بۆ گەڕایەوە و لەوە دڵنیابوو کە بە سەرکردایەتی ئەو پیاوە سەرکەوتنی مسۆگەرە. بالدیبیا بە وشەی ورد و واتادار ورەی سەربازەکانی بەرز کردەوە کە لە ئەزموونی چەند ساڵەی وەری گرتبوون، پاشان هێز و تەقەمەنی سەربازەکانی هەڵسەنگاند. وەختێک کە زانی لە بەردەم ئەرکێکی قورس دایە، هەستی بە گەڕانەوەی گەنجێتی کرد و ئەفسەرەکانی لە دروستکردنی سانتیاگۆوە تا ئەو ڕۆژە قەت ئەوها بەو ورەبەرزییەوە نەیاندیبوو.

بۆ چوونە ناو شاری کۆسکۆ دەبووایە ڕووبەڕووی سوپای گۆنزالۆ بێسارۆ ببنەوە. بالدیبیا ئەو باریک و تەنگە ڕێیانەی ئینکای گرتەبەر کە بەسەر هەڵدێرەکانەوە بوو و وەک ڕێچکە گرتنی مێرووله بە نێو ملە شاخە وەنەوشەییە ترسناکەکاندا بەرەوپێش دەچوون: بەرد، بەفر، لووتکەی ونبوونی نێو هەور، با و داڵی هەڵۆ. هەندێ جار لە نێو قڵێشی بەردەکاندا ڕەگی دارت دەبینی بووەتە بەرد کە پیاوەکان دەستیان پێوەدەگرت تا ساتێک لە هەورازبڕیندا بحەسێنەوە. قاچی ئەسپەکان لەسەر تاشە بەردەکان دەخزان و سەربازەکان ناچاردەبوون بە باڵەکانیانەوە هاوسەنگیان بکەن تا هەڵنەدێرێن. دیمەنەکە ترسناک و هەڕەشەدار بوو. ئەوە جیهانی ڕووناکی و گەشانەوە و تاریکایی هەسارەکان بوو. با و سەرماوسۆڵ لە بەیەککگەیشتی پەناگە شاخییەکاندا چەندان وێنەی شەیتانیان داتاشیبوو؛ بەفری بەندکراوی نێو شەقە بەردینەکان بە ڕەنگی بەیان دەدرەوشانەوە. سبەینان خۆر بە کزی و ساردی هەڵدێت و لووتکەکان بە هێڵی پرتەقاڵی و سوور دەنەخشێنێ؛ ئێوارانیش لە هیکرا ڕووناکی نامێنێت، هەروەک چۆن سبەینان لە پڕێکا شەوق دەداتەوە، ئیتر ئەو لووتکانە لە تاریکییەکی ئەنگوستەچاودا بزر دەبن. شەوەکانی ئەوێ جاویدانی دیارن و نابڕێنەوە و کەسێک ناتوانێ لەو تاریکییەدا ڕێ بکات. پیاو و ماڵاتەکان لەسەر لێواری هەڵدێرەکان خۆیان

کورش دەکەنەوە و دەلەرزن.

هەروەها بۆ ئەوەی پەتای بەرزاییەکان سووک بێت و پیاوەکان نەختێک تاقەتیان بێتەوە بەر، بالدیبیا فەرمانی پێدان کە گەڵای کۆکا بجوون، هەروەک چۆن هندییەکانی کیچوا لەوەتەی هەنە وا دەکەن. وەختێک کە زانییان گۆنزالۆ بێسارۆ پردە هەڵواسراوەکانی تێک داوە بۆ ئەوەی نەتوانن رووبار و کۆندڕ و هەڵدێرەکان ببڕن، فەرمانی بە یاناکۆناکان دا لە رووەکەکانی ئەوێ پەت بهۆننەوە کە ئەوان بە خێراییەکی زۆر سەرسوڕهێنەر ئەو کارەیان ئەنجام دەدا. لەگەڵ کۆمەڵێک لە پیاوە ئازاکان لە کاتی تەمومژێکی چڕی زنجیرە شاخەکاندا کە چاو چاوی نەدەبینی، بەرەو پێشەوە چوون تا گەیشتنە یەکێک لەو پردانەی کە بێسارۆ تێکی دابوو. فەرمانی دایە هندییەکان کە هەر شەش پەت بە یەکەوە بهۆننەوە بە شێوەی کیچوایەکان پردی هەڵواسراوی لێ دروست بکەن. رۆژی دواتر لاگاسکا بە خۆی و هێزەکەیەوە گەیشتە ئەوێ و دیتی گرفتەکە چارەسەرکراوە. ئیتر نێزیکەی هەزار سەرباز و پەنجا ئەسپ و ژمارەیەکی زۆر لە هندییە هاریکارەکان و چەکی قورس بە جۆلانێ لەسەر پردی پەتە هەڵواسراوەکەی سەر ئەو هەڵدێرە قووڵە لە نێو ورشەورشی با پەڕیندرانەوە ئەوبەری. بالدیبیا دەبوو سەربازە ماندووەکان ناچار بکات کە ماوەی دوو فەرسەخ بەسەر ئەو شاخە سەختەدا سەرکەون و تەقەمەنی بە کۆڵ هەڵگرن و تۆپەکانیش بە پەت ڕاکێشنە ئەو شوێنەی کە دیاری کردبوو، بۆ ئەوەی بەرەنگاری بێسارۆ بێتەوە. کاتی لە چەسپکردنی چەکەکان لە شوێنە ستراتیجییەکان بوونەوە، دوو رۆژ مۆڵەتی دایە سەربازەکان تا بحەسێنەوە و تاقەتیان بێتەوە بەر، بەخۆیشی شوێنی تۆپەکان و تفەنگچییەکانی دەپشکنی و یەک یەک لەگەڵ سەربازەکان دەدوا و زانیاری دەدانێ و پلانی شەڕەکەی ئامادە دەکرد. وادێتە بەرخەیاڵم بە سواری ئەسپەکەیەوە دەیبینم کە زرێیە تازەکەی لەبەردایە و بە چوستی و بە گەرمییەوە دیت و دەچێت، پێشوەخت حسێبی جولانەوەی دوژمن دەکات و وەک یاریزانێکی چاکی شەترەنج خۆی بۆ هێرش ئامادە دەکات. ئێستا ئەو گەنجێتی بەسەرچووە و تەمەنی چل و

هەشت ساڵە و نەختێک لە جاران قەڵەوتر بووە. هێشتا شوێن برینی ڕانی بێزاری دەکەن. بەڵام هەروا دەتوانێت دوو ڕۆژان بەسەر یەکەوە لەسەر پشتی ئەسپەکەی دانەبەزێت و ئیستراحەتیش نەکات. من دەزانم لەو ساتانەدا وا هەست دەکات کە قەت نابەزێت. ئەوەندە سەرکەوتنی خۆی لەکن مسۆگەربوو تا ئەو ڕادەیەی بەڵێنی دایە لاگاسکا کە لەو شەڕەدا زیانەکانیان دەبێ لە سێ سەرباز کەمتر بێت، هەرواش دەرچوو و بەڵێنەکەی خۆی گەیاندە جێ.

هەرکە تۆپەکان لە نێو شاخەکانەوە یەکەم لرمەیان لێ هەستا، لایەنگرانی بێسارۆ درکیان کرد کە ئەوان لە بەرانبەر ژەنەراڵێکی مەزندا دەجەنگن. ئەوەندەی نەبرد ژمارەیەکی زۆر لەو سەربازانەی کە لە دژی پاشا حەزیان لە شەڕ نەبوو، ڕیزەکانی بێسارۆیان جێ هێشت و خۆیان گەیاندەوە ڕیزی هێزەکانی لاگاسکا. دەگێڕنەوە کە سەرکردەی مەیدانی هێزەکانی بێسارۆ کە ڕێوییێکی پیری پڕ لە ئەوزموونی چەند ساڵەی شەڕبوو، یەکسەر هەستی کرد کە لە دژی کێ دەجەنگێ. دەڵێن ئەو سەرکردەیە دەیگوت: لەو جیهانەدا تەنیا یەک ژەنەراڵ هەیە بتوانێت ئەو ستراتیجە بەکار بێنێت، ئەویش دۆن پێدرۆ بالدیبیای داگیرکەری شیلییە.

دوژمنەکەی وازی لێی نەهێنا و ئاگربەستیشی قبوڵ نەکرد. دوای چەند سەعاتێک لە شەڕ و کوشتار و زیانی گەورە، بێسارۆ ناچارما خۆی بداتە دەست و شمشێرەکەی بداتە بالدیبیا. لە دوای چەند ڕۆژێکی کەم لە شاری کۆسکۆ سەریان پەڕاند و سەرکردە پیرە مەیدانییەکەشی لەگەڵدا بوو.

لاگاسکا ئەرکی خۆی لە دامرکاندنەوەی یاخیبوونەکە بەجێ هێنا و پێرۆی گەڕاندەوە ژێر سایەی کارلۆسی پێنجەم؛ لەسەری پێویست بوو شوێنی بێسارۆ بگرێتەوە و هەموو دەسەڵاتە فرەوانەکەی ئەو بگرێتە دەست. هەروەها ئەو لە سەرکەوتنەکەی قەرزداری بالدیبیایە و یەکەم شت فەرمانی دا کە بکرێتە حاکمی شیلی، کە ئەم نازناوە خەڵکی سانتیاگۆش پێیان بەخشیبوو و تاجی شاهانە تا ئەو وەختە بە ڕەسمی نەیچەسپاندبوو. هەروەها دەسەڵاتی ئەوەی دایێ کە خەڵک بکاتە سەرباز و بیانباتە شیلی، بەڵام بە مەرجێک ئەو

کەسانەی تێدا نەبێت کە بەشداری یاخیبوونەکەی بێسارۆیان کردووە یان هندی پێرۆیین.

ئایا پێدرۆ وەختێ لە شەقامەکانی کۆسکۆ سەرکەوتووانە هەنگاو داوێ، منی لە بیرە؟ یان تەڕ و جوان و لەخۆبایی تەنیا هەر بیر لە خۆی دەکاتەوە؟ من هەزاران جار دەمپرسی کە داخوا لەبەرچی لەو گەشتە منی لەگەڵ خۆی نەبرد. ئەگەر وای بکردایە چارەنووسمان تەواو جیاواز دەبوو. ئەو بۆ ئەرکێکی سەربازی چووە، ئەمەیان ڕاستە، وەلێ من چۆن لە کاتی ئاشتیدا هاوڕێی بووم ئاواش لە جەنگدا لە تەکیا بووم، دەبێ شەرم لە من بکات؟ دڵدار و خۆشویست و دۆستی ئەویندار. من لە شیلی دۆنیا ئێنیس سیوارێسی حاکم بووم و کەسێک بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئێمە هاوسەری شەرعی یەکتری نینە. من خۆشم ئەوەم لە بیر نەبوو. گومانی تێدا نییە کە ئێستا لە کۆسکۆ و لە شاری شاهاندا ژنان دەوری پێدرۆیان گرتووە. ئاخر ئەو پاڵەوانی ڕەهای شەڕی ناوخۆیە و داگیرکەری شیلی و گەورەیەتی، ڕەنگە دەوڵەمەند بێت و هێشتا سەرنجان بۆ خۆی ڕاکێشێت و ژنان ئارەزووی نێو باوەشی بکەن. هەروەها قسەی ئەوە هەبوو کە پیلانێک بۆ کوشتنی لاگاسکای توند و بەدەمار لە گۆڕێدابێت و بالدیبیای لە شوێن دابنێن، وەلێ کەس نەبوو بوێرێ ڕاستەوخۆ قسە لەسەر شتێکی وا بکات، چونکە قسەیەکی لەو بابەتە وەک سووکایەتیکردن بە شەرەفی ئەو وابوو، ئاخر شمشێرەکەی بنەماڵەی بالدیبیا هەمیشە بە دڵسۆزییەوە لە خزمەتی پاشادا بووە و قەت بەڕوویاندا هەڵناگەڕێتەوە و لاگاسکاش نوێنەری پاشایە.

من لەو تەمەنەدا هیچ بە حەقی نازانم بیر لەو ژنانە بکەمەوە کە پێدرۆ دەچێتە نێو جێگەیان، بەتایبەتی کە خۆشم ویژدانم ئەوەندە پاک نییە: ئاخر لەو ماوەیەدا منیش دۆستایەتی ئەوینداریم لەگەڵ ڕۆدریگۆ دەستپێکردووە. دەبێ ئەوەش بڵێم کە هەموو دەستپێشخەرییەکان لە منەوە بووە و ئەو هیچ هەڵوێستێکی نەنواندووە کە وا نیشان بدات لە ئارەزووە شاراوەکانی من دەگات. من دەمزانی کە ڕۆدریگۆ قەت خیانەت لە پێدرۆی هاوڕێی ناکات،

وەلێ پارێزگاریم لەسەر ئەو خۆشەویستییەی نێوانیان دەکرد، وەک چۆن ئەویش وای دەکرد. دەبێ من بە هۆی دڵشکانەوە ڕووم بۆ ڕۆدریگۆ وەرگێڕابێت تا تۆڵەی ئەوە لە پێدرۆ بکەمەوە کە وازی لێم هێناوە؟ من نایزانم، هەر ئەوەندەیە وەک دوو دەستگیرانی ناسک لەگەڵ ڕۆدریگۆ خۆشەویستی دەگۆڕینەوە بە هەستێکی قووڵ و پڕ لە جۆش، قەت بە وشە دەرمان نەبڕیوە، بەڵکو بە هێما و نیگای چاوەکانمان. ئەمە لەلایەن منەوە سۆزێکی هەڵچوو نەبوو وەک ئەوەی لە بەرامبەر خوان دی مەلەگە یان پێدرۆ هەستم پێ دەکرد، بەڵکو ئەمەیان ئارەزوویەکی شاراوەبوو کە وای لێ دەکردم لە ڕۆدریگۆوە نێزیک بم و هاوبەشی ژیانی بم و بایەخی پێ بدەم. سانتیاگۆ شارێکی بچووک بوو و نەدەکرا ئەو نهێنییە بشاریتەوە، وەلێ نێوبانگی ڕۆدریگۆ پاک و بێگەرد بوو، بۆیە کەس هەوڵی نەدەدا قسەمان لەسەر بکات، هەرچەندە ڕۆژانە یەکترمان دەبینی لەو کاتانەی بە شەڕەوە خەریک نەبووایە. ئێمە لە بیانوومان کەم نەبوو، ئاخر لە پرۆژەی دروستکردنی کەنێسە و خانوو و گۆڕستان و خەستەخانە یارمەتی دەدام و هەر من بەرپرسیارێتی چاودێریکردنی کچەکەیم گرتبووە ئەستۆی خۆم.

تۆ ئەی ئیزابێل، ئەمەت بە بیرنایەت، چونکە تەمەنت تەنیا سێ ساڵان دەبوو. هەر لەو ساڵەدا دایکت ئێولالیا لە کارەساتەکەی تیفۆ کۆچی دوایی کرد، ئەو دایکەی کە زۆری خۆشدەویستی، هەروەک ڕۆدریگۆشی خۆش دەویست. باوکت دەستی گرتی و بۆ ماڵەکەی منی هێنای و پێی گوتم: «ئەی دۆنیا ئینیس، تکام وایە چەند ڕۆژێک ئاگەداری کچەکەم بیت، چونکێ من ناچارم بڕۆم حێسبی خۆم لەگەڵ هەندێ لەو دڕندانە یەکلا بکەمەوە، وەلێ زوو دەگەڕێمەوە».

تۆ ئەو وەختە منداڵێکی کڕ و بتەو boوویت، ڕوخسارت وەک هی لاما وابوو، چاوەکانیشت بە برژانگە درێژەکانییەوە بە هەمان شێوە شیرن بوون و دەبڕی زیندوێتی دەنواند. پرچیشت بە دووکەزی چەسپ وەک گوێچکەی ئاژەڵ بە لاسەرتەوە بوون. ئەو پێستەت کە وەک ڕەنگی کرامیلا وایە لە دایکتەوە بۆت

مـاوەتەوە و لە بـاوکـیـشـتـەوە ئەو ئاکـارە ئۆسـتکراتیـانـەت بۆ مـاوەتەوە.. تێکەڵەیـەکی قـەشـەنگە. مـن تۆم بەبیـردێتـەوە لەو سـاتەی لە دەرگـەی مـاڵەکـەم هـاتییە ژووریٚ و ئەسپێکی دارینت لە باوەش کردبوو کە ڕۆدریگۆ بۆی دروست کردبووی.

تۆ لەو وەختـەوە قـەت نەگـەڕایتـەوە لای باوکت، بـە بڕوبیـانووی هـەمـەجـۆر لە کنە خۆمم هێشتییەوە تا من و ڕۆدریگۆ بووینە هاوسـەری یەکتری، ئەو وەختە بوویتـە کـچی شـەرعـی خـۆم. هـەمـوو جـاریٚ ڕەخنەیان لیٚ دەگـرتم چونکە وەک کەسێکی پێگەیشتوو هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکردی. دەیانگوت من بە ناشیرینی بەخێوت دەکەم؛ جا ئەو هـەڵویسـتە پڕ لە شـەرمـەزارییەی زمان خـراپەکان بێنە بەرزەینت وەختیٚ ئەنجامەکەی دیارکەوت.

***

لە مـاوەی ئەو نۆ سـاڵەی کە لە شـیلی بەسـەرم برد، تووشـی چەندان جـەنگی گەورە بووین، ئەمـە جگە لەوەی ئەوەندە لەلایەن هندییەکانی شیلییەوە پەلامار دەدراین کـە لە ژمـارە نەدەهـاتـن، بەڵام ئێـمـە هـەر بەوەندە نەوەسـتـایان کـە بە تەواوی بگیـرسێینەوە، بەڵکو چەنـدان شـاری تری تازەمـان دروست کـرد. ئێـمـە بڕوامان وابوو کـە لە ئەماندا دەژین، وەلیٚ دانیشـتووانی شیلی هـەرگیز بوونی ئێـمـەیان لەسـەر خـاکی خـۆیان پیٚ قـبـوڵ نەدەکـرا، هـەر وەک لە سـاڵانی دواتر ئەوەمان بۆ ڕوونبووەوە. هندییەکانی میشیمالۆنکۆ لە باکوورەوە چەند سـاڵێک بوو خـۆیـان بۆ یاخیـبوونێکی فرەوان ئامـادە کردبوو، بەڵام نەوێـران وەک سـاڵی ١٥٤١ هێرش بکـەنەوە سـەر شـاری سـانتیـاگۆ: بەڵام ئەوان لە بەرامـبـەر ئەوەدا هێرشـەکانیان بۆ سـەر شـارە بچووکەکانی باکوور چڕکردەوە کە ئیسپانییەکان لەویٚ نیمـچە دابڕاو بوون.

لە هـاوینی سـاڵی ١٥٤٩ دا دۆن بێنیـتـۆ، دوای ئەوەی چەنـد سـەدەفـێکی گەنیبووی دەریایی خواردبوو، بە هۆی نەخۆشـییەک لە زگیدا مـرد. ئەو کابرایە خـۆشـەویسـتی هـەمـووان بـوو و بە بەتریرکی شـارەکـەمـان دادەنا. ئێـمـە کـە گەیشـتینە دۆڵی مـابۆچۆ، بە هـانـدانی خـەیاڵەکـانی ئەو پیرە سـەربازە بوو کـە

شێلی بە بەهەشت دەچواند. ئەو هەمیشە بە جوامێری و دڵسۆزییەکی نموونەیییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ مندا دەکرد، لەبەر ئەوە زۆر هەستم بە نائومێدی کرد کە نەمتوانی لە سەرەمەرگیدا، هیچ یارمەتییەکی بدەم. ئاخر ئەو لە نێو باوەشی مندا مرد، لە حەژمەتی ئازاری جەستەی، خۆی دووقەد کردبووەوە و هەتا مۆخی ئێسقانەکانی ژەهراوی بووبوون. ئێمە لەگەرمەی مراسیمی ناشتنی تەرمەکەی بووین کە هەموو دانیشتووان بەشدارییان تێدا کرد، وەختێ دوو سەرباز لە سانتیاگۆوە بە جلی شڕەوە دیارکەوتن و لە ماندوویێتییان چیوای نەمابوو بەرببنەوە، یەکێکیان برینداریکی خەتەر بوو. ئەوانە لە سیریناوە هاتبوون، لە ترسی هندییەکان، بە ڕۆژ خۆیان دەشاردەوە و بە شەوانیش دەڕۆیشتن. گوتیان شەوێکیان تاکە پاسەوانی شاری سیرینای بچووک و تازە ئاوەدان، کەسی ئاگەدار نەکردەوە و کۆمەڵی هندییەکان بەسەر شارەکەیان دادا. ئیسپانییەکان نەیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن و لە ماوەی چەند سەعاتێکی کەم هیچ شتێک لە سیرینا نەما. هێرشبەرەکان تا ڕادەی کوشتن ئەشکەنجەی ژن و پیاوەکانیان دەدا، سەری منداڵەکانیان بە بەرد دادەدا و مێشکیان دەپرژاندن، ماڵەکانیان کردبوونە خۆڵەمێش. لە نێو ئەو هەراو ئاژاوەیەدا ئەو دوو سەربازە توانیبوویان دەربازبن و بە دەردەسەرییەکی زۆرەوە ئەو هەواڵە تۆقێنەرەیان گەیاندبووە سانتیاگۆ. پێیان گوتین کە ئەوە یاخیبوونێکی گشتگیر و سەرتاسەرییە، هۆزەکان بە تەواوی خۆیان بۆ شەڕ ساز داوە و دەیانەوێ گشت شوێنەکانی ئیسپانییەکان وێران بکەن.

ترس و تۆقین باڵی بەسەر دانیشتووانی سانتیاگۆ داگرت؛ ئێمە لە خەیاڵی خۆماندا دەستەی دڕندەکانمان دەبینی کە لە سەنگەرەکەی دەوری شار دەپەڕنەوە و بە شوورەکەیدا هەڵدەگەڕێن بە ڕقێکی شەیتانانەوە لە ناومان دەبەن. ئێمە جارێکی تریش خۆمان بە چەند بەشێک بینییەوە، هەندێک لە سەربازەکان بۆ شارە بچووکەکانی باکوور دانرابوون، بالدیبیاش بە خۆی و ژمارەیەک لە سەرکردەکان و چەک و تەقەمەنییەکانیان هێشتا نەگەیشتبوونە

جێ. لە لایەکی تر هەرگیز نەدەکرا بەرگری لە کێڵگە و کانگە چۆلکراوەکان بکەیت، لە کاتێک خەڵکەکە هەمووی ڕووی لە سانتیاگۆ کردبوو. ژنە نائومێدەکان خۆیان لە کەنیسەدا نابوو تا شەو و ڕۆژ نوێژ بکەن، بەڵام پیاوەکان، بە پیرەکانیشەوە خۆیان بۆ بەرگری ئامادە کردبوو.

ئەنجوومەنی شارەوانی بڕیاری دا کە بیاگرا لەگەڵ شەست کەسی تر بچێتە باکوور ڕووبەڕووی هندییەکان ببێتەوە، بەرلەوەی ئەوان خۆیان ڕێکبخەن و هێرش بێننە سەر سانتیاگۆ. ئەگێریش مایەوە تا بەرپرسیارێتی بەگریکردن لە شار بگرێتە ئەستۆ و خوان گۆمێسیش ئەرکی کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر شەڕ پێ سپێردرا بە بەکارهێنانی هەر شێوازێک کە خۆی پێی باش بێت، ئەمەش بەو مانایە بوو کە بە ئەشکەنجەدانی گومانلێکراوەکان قسەیان لێ دەربێنێت. هاواری ئەو هندییانەی خرانە ژێر ئەشکەنجە زیاتر دەماری گرژ دەکردین و ئارامی لەبەر دەبڕین. پاڕانەوە پڕ لە بەزەییەکانی من و بەڵگەکانم بەوەی کە ئەشکەنجەدان نامانگەیەنێتە ڕاستییەکان، هیچ سوودێکیان نەبوو، چونکە زیندانییەکان ئەو قسانەیان دەکرد کە ئەشکەنجەدەرەکان دەیان ویست گوێبیستی بن. لەو کاتەدا ڕق و ترس و ئارەزووی تۆڵەکردنەوە ئەوەندە زۆر بوو تا ڕادەیەک خەڵک لەگەڵ هەواڵی هەڵمەتەکانی بیاگرا بۆ سزادانی هندییەکان، ئاهەنگیان دەگێڕا کە لە بێویژدانی و ناشیرینیدا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ڕەفتاری دڕندە وەحشییەکان نەبوو. ئاخر بە شێوازە دڕندانەکەی خۆی توانی لە ماوەی کەمتر لە سێ مانگ، یاخیبوونی هندییەکان دامرکێنێتەوە و دانیشتووانی ڕەسەنی ئەوێ ببەزێنێت و سانتیاگۆش لە هێرشی دوژمنان دوور بخاتەوە. هەروەها توانی ڕێککەوتنی ئاشتی بەسەر سەرۆک خێڵەکان بسەپێنێ، وەلێ کەس باوەڕی وانەبوو کە ئەم ئاگربەستە هەمیشەیی بێت؛ تاکە هیوامان ئەوەبوو کە حاکم لەگەڵ ئەفسەرەکانی بە زووترین کات بگەڕێنەوە و ژمارەیەک سەربازیش لە پێرۆ لەگەڵ خۆی بێنێت.

چەند مانگێک لە دوای هەڵمەتە سەربازییەکەی بیاگرا، ئەنجوومەنی

شارەوانی فرانسیسکۆ ئەگێرییان ناردە باکوور تا ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی شارەکانی ئەوێ بگرێتە ئەستۆ و دۆست و هاوپەیمان پەیدا بکات، وەلێ ئەو سەرکردە باسکییە خۆی دایە دەست سروشتی توندڕەوانەی خۆی، بێویژدانانە هەڵی دەکووتایە سەر گوندی هندییەکان و لە ناوی دەبردن، نێرەکانی کۆدەکردەوە لە منداڵەوە تا پیر لە نێو کۆمەڵی داردا ئاگری تێ بەردەدان و بە زیندوێتی دەیسووتاندن. ئیتر بەو جۆرە چیوای نەمابوو دانیشتووانی ڕەسەنی ئەوێ قڕانیان پێ بکا. هەروەک خۆی بە پێکەنینەوە دەیگێڕایەوە و دەیگوت لەسەرمان پێویستە بێوەژنەکانیان سکپڕ بکەین تا ئاوەدانی بخەینەوە وڵات. لەو بارەیەوە چی تر ناڵێم، چونکە دەترسم ئەو لاپەڕانە ئەوەندەیان کاری دڵڕەقانە تێدایە زۆرتر بن لەوەی ڕوحی مەسیحییەت بیانبەخشێت. لە جیهانی تازەدا کەس نەبوو لەوە بکۆڵێتەوە کە سنوورێک بۆ توندوتیژی دابنرێ. چی بڵێم؟ ئەو شێوە توندوتیژییەی کە ئەگێری بەکاری دێنێت، لە هەموو شوێن و کاتێکدا هەبووە. هیچ شتێک ناگۆڕێت، ئێمەی بەشەر جار لە جار و بۆ هەتا هەتایە خراپەکارییەکان دووبارە دەکەینەوە. ئەمەیان لە وڵاتی هند ڕووی دەدا، لە کاتێک کارلۆسی پێنجەم لە ئیسپانیا یاسای تازەی دەردەکرد کە گوایە هندییەکان هاووڵاتی تاجی شاهانەی ئیسپانیان و ڕاسپێردراوەکانی خۆی ئاگەدار دەکردەوە کە نابێ بەزۆر کار بەو هندییانە بکەن یان ئازاری جەستەییان بدەن و پێویستە بە نووسین گرێبەستیان لەگەڵ بکرێت و دەستا و دەست کرێی ڕۆژانەیان بدرێتێ. هەروەها پێویستە ئیسپانییەکان بە کردەوەی جوان لە دانیشتووانی ڕەسەنی ئەوێ نێزیک ببنەوە و بە قسەی بە پێز و ڕێزەوە داوایان لێ بکەن کە خوای مەسیحییەکان و پاشاکەیان قبوڵ بکەن و دەستبەرداری زەوییەکانیان بن و خۆیان بخەنە ژێر فەرمانی تازە گەورەکانیان. ئەمە و زۆر لە یاسای باشی تریش وەک مەرەکەبی سەرکاغەز مانەوە. ئەگێری لەو بارەیەوە دەیگوت: «دەبێ شێتایەتی پاشاکەمان لەوە گەورەتربێت کە ئێمە دامان نابوو، ئەگەر وا تێبگات کە یاساکانی بۆ جێبەجێکردن دەشێت». ئەگێری ڕاستی دەکرد. ئاخر

ئەو کاتەی نامۆکان هاتنە ئیسپانیا و ویستیان ئاین و داوونەریتی خۆیان بەسەریاندا بسەپێن، خەڵکەکە چیان کرد؟ بێگومان تا مردن هەر شەڕیان کردن.

لەو کاتەدا پێدرۆ توانی ژمارەیەک زۆر سەرباز کۆ بکاتەوە لە پێرۆ و بە ڕێگەی بیابانی ئەتاکاما سەفەری گەڕانەوەی دەست پێ کرد. دوای چەند حەفتەیەک لە ڕۆیشتن، نێردراوێک لە لاگاسکاوە زۆر بە خێرایی گەیشتە کاروانەکەیان و پێی ڕاگەیاند کە بگەڕێتەوە شاری شاهان، چونکە داوایەکی زۆری لە دژ بەرز کراوەتەوە. بالدیبیا بە ناچاری هێزەکەی بە سەرکردایەتی چەند ئەفسەرێک بەجێ هێشت و گەڕایەوە شاری شاهان تا بچێتە بەردەم دادگا. ئەو یارمەتییانەی کە پێشکێشی پاشا و لاگاسکای کردبوو لە پێناوی تێکشکانی گۆنزالۆ بێسارۆ و گەڕاندنەوەی ئاشتی بۆ پێرۆ، هیچ سوودێکیان نەبوو و لەگەڵ ئەوانەش دادگاییان کرد.

بالدیبیا، سەرەڕای ئەو دوژمنە زۆرانەی کە لە پێرۆ پەیدای کردبوون، چەندان بەدگۆ و بووختانکەر لە شیلییەوە چووبوون تا بە خراپە لەسەری بخوێن و هەرەسی پێ بینن. زیاتر لە پەنجا تۆمەتی درابوونە پاڵ، بەڵام تەنیا ئەوانەم لەبیر ماوە کە گرینگن و پێوەندییان بە خۆمەوە هەیە. بەوە تاوانباریان کردبوو کە لە خۆیەوە بەبێ ڕێگەپێدانی فرانسیسکۆ بێسارۆ خۆی کردووەتە حاکم کە ئەو نازناوی جێگری حاکمی پێ بەخشیبوو؛ هەروەها بە فەرمانی ئەو سانچۆ دیلا ئۆس و خەڵکی تری بێگوناه کوژراون، وەک ئیسکۆبار کە بە بیانووی پاراستنی شەرەفەوە حوکمی دا. جگە لەمانەش موڵک و ماڵی شارنشینانی دزیوە، بەڵام نەیانگوت زۆربەی ئەو قەرزانەی لە بەرهەمی کانگەی مارگا - مارگا داوەتەوە، هەر وەک بەڵێنی پێ دابوون. هەروەها گوتیان بالدیبیا دەستی بەسەر باشترین زەوی و هەزاران هندیدا گرتووە، بێ ئەوەی بڵێن خەرجییەکانی شار هەمووی لە ئەستۆی ئەو بووە و پارە دەداتە سەربازەکان و قەرزی بێ سوودیش دەداتە خەڵک، بە کورتی نەیانگوت ئەو کابرایە بە ماڵی خۆی سەروەت بۆ شیلی کۆدەکاتەوە، چونکە قەت ڕۆژێک لە

ڕۆژان ڕەزیل و چاوچنۆک نەبووە. دیسان ئەوەشیان خستبووە سەر کە سەروەت و سامانێکی زۆری داوەتە ژنێک بە ناوی ئێنیس سواریس کە لە کەش و ماڵێکی پڕ لە شووڕەیی لەگەڵی دەژی بێ ئەوەی هاوسەری بێت. ئەوەی پاشان زیاتر تووڕەی دەکردم، وەختی بە وردەکاری پێم زانی، ئەوەبوو هەندێک لەو گەمژانە گوتبوویان کە گوایە من چۆنم بووێ ئاوا پێدرۆی هەڵدەسووڕێنم و هەرکەسێک بیەوێ شتێکی لە حاکم دەستکەوێت دەبێ بەرتیل بداتە ئەو ژنە دۆستەی.

من لە داگیرکردنی شیلی زۆرم خەفەت و ماندوێتی چەشت و هەموو ژیانی خۆم بۆ دامەزراندنی ئەو شانشینە تەرخان کرد و ئێستا بواری ئەوە نییە ئەو شتانە بڵێم کە بە دەست و تاقەت و ماندووبوونی من هاتوونەتە بەرهەم، پاشان هەموو شتێک لە دەفتەرەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی تۆمارکراون، ئەوەی گومانی لە قسەکانم هەبێت دەتوانێت بچێت سەیرێکیان بکات. ئەوەیان ڕاستە کە پێدرۆ وەک ڕێزلێنان هەندێ زەوی بە پیت و چەند هندییەکی دابووە من تا لە نێو کێڵگەکانم کاربکەن و ئەمەش ڕقی خەڵکێکی نەفس نزم و بیرتەسکی هەستاندبوو، وەلێ ئەوەیان ڕاست نەبوو کە من ئەوانەم بە هۆی نوێنەوە پەیدا کردبێت. سەروەتەکەم بۆیە گەشەی کردبوو، چونکە من بە چاکی و بەو حیکمەتەوە هەڵم دەسووڕاند کە لە دایکمەوە بۆم مابووەوە، دەبا ڕوحی ئەو بە ئاشتی بنوێت، کە دەیگوت: ئەوەندەی خەرجی دەکەیت با کەمتربێت لەوەی دێتە دەستت. ئەمە فەلسەفەی ئەوبوو بۆ ماڵداری. بەڵام پێدرۆ و ڕۆدریگۆ قەت بایەخیان بە کاروباری موڵکەکانیان نەدەدا، چونکە خۆیان بە خانەدانی ئیسپانیایی دەزانی؛ بۆیە پێدرۆ بە هەژاری مرد و ڕۆدریگۆش لە سایەی من بە دەوڵەمەندی دەژیا.

هەرچەندە لاگاسکا سۆزی بەرامبەر تاوانبارەکە هەبوو کە زۆر خۆی بەقەرزاری ئەو دەزانی، وەلێ تا کۆتایی لە دادگاییکردنی بەردەوام بوو. لە پێرۆ هیچ بابەتێکی تر قسەی لەسەر نەدەکرا و جگە لە ناوی من، ناوی هیچ کەسێک بەسەر زارانەوە نەبوو: ئەو ژنە سیحربازێکی چەپەڵە، خواردنەوەی

وای هەبوو پیاوی شێت دەکرد، لە ئیسپانیاش سۆزانی بووە و پاشان لە کارتاخیناش هەروا. بە خواردنەوەی خوێنی منداڵە تازەبووەکان پارێزگاری لەسەر زیندوێتی و چالاکی خۆی دەکات.

ئەمەو دەیان شتی ناشیرینی تریشیان دابووە پاڵم کە شەرم دەکەم بیانڵێم. پێدرۆ لە بەردەم دادگا بێگوناهی خۆی سەلماند و یەک بە یەک ئەو تۆمەتانەی هەڵوەشاندەوە و ئەو کەسەی کە لە کۆتاییدا دۆڕاو بوو، من بووم. لاگاسکا دووبارە ئەوی بە حاکم دانایەوە و هەموو نازناو و ڕێزەکانی بۆ گێڕایەوە، تەنیا داوای ئەوەی لێ کردبوو کە تا دەکرێ زوو قەرزەکانی بداتەوە؛ وەلێ لە بارەی منەوە ئەوا ئەو قەشەیە – کە حەقی وایە لە ناو مەنجەڵە گەورەکانی دۆزەخدا بیکوڵێنن – بڕیارێکی زۆر دڵڕەقانەی دا. فەرمانی دایە حاکم کە هەموو موڵک و ماڵەکەم ببا و بەسەر سەرکردەکانی دابەش بکات و دوای جیابوونەوەش یەکسەر ڕەوانی پێرۆ یان ئیسپانیام بکاتەوە کە لەوێ بواری ئەوەم دەبێت لە یەکێ لە دێرەکان خۆم لە گوناهەکانم پاک بکەمەوە.

***

پێدرۆ ماوەی ساڵ و نیوێک نەهاتەوە، پاشان بە دوو سەد سەربازەوە لە پێرۆ گەڕایەوە و کە هەشتایان بە سواری کەشتی و ئەوانی تر بە ڕێگەی وشکایی هاتنەوە. وەختێ کە زانیم هاتووەتەوە تووشی گەرموگوڕی چالاکی بووم بە ڕادەیەک کارەکەرەکانم لەگەڵی تووشی شێتبوون بووبوون. وام لێ کردبوون هەموویان خانووەکەم گەچکاری بکەنەوە و چی پەردە هەیە بیشۆن و گوڵ لە نێو مەرکانەکاندا بچنن و ئەو شیرنەمەنییانە ئامادە بکەن کە پێدرۆ حەزی لێ دەکردن، و چەرچەفە تازە بدوورن و بنەخشێنن. هاوین بوو، تازە لە باخچەکانی دەوروبەری شار میوە و سەوزەی ئیپسانیمان بەرهەم دەهێنا، وەلێ تامیان خۆشتربوو. من لەگەڵ کاتالینا ئەو جۆرە مورەبا و حەلوایانەمان دروست دەکرد کە پێدرۆ حەزی لێ دەکردن. یەکەم جارم بوو لە دوای ئەو هەموو ساڵە گرینگی بە دیمەنی خۆم بدەم، هەتا کراس و تەنوورەی جوانم بۆ خۆم دووریبوو بۆ ئەوەی وەک بووکێک پێشوازی لێ بکەم. تەمەنم لە چل

ساڵیدابوو، وەلێ وام هەست دەکرد گەنج و سەرنجڕاکێشم، ڕەنگە لەبەر ئەوەبێت کە هێشتا جەستەم نەشێوابوو وەک ئەو ژنانەی کە منداڵیان نەبووە، هەروەها لە بەر ئەوەی خۆم لە چاوە شەرمنەکانی ڕۆدریگۆ دەبینییەوە؛ وەلێ دەترسم لۆچە وردەکانی دەوری چاوم و دەمارەکانی بەلەکم و دەستە پێستڕەقەکانی نێو کارم سەرنجی پێدرۆ ڕاکێشن. بڕیارم دا چی تر سەرزەنشتی نەکەم، ئەوەی ڕووی دا ڕووی دا. من ئارەزووی پێکهاتنەوەم دەکرد لەگەڵی و دەمویست بگەڕێینەوە ئەو ڕۆژگارانەی کە وەک دوو عاشقی نێو داستانەکان بووین. زۆرمان مێژووی هاوبەش پێکەوە هەیە، دەیان ساڵی خەبات و خۆشەویستی ناکرێ لە هیچ و خۆڕایی بڕوات. ڕۆدریگۆم لە خەیاڵی خۆم دەرهاوێشت، ئاخر ئەو خەیاڵێکی بێ سوود و خەتەرناکە. چوومە سەردانی سیسیلیا تا بە نهێنی مانەوەی جوانییەکەی بزانم کە لە سانتیاگۆ زۆر بووختانی بۆ هەڵدەبەستریێ، چونکە جوانییەکەی ئەو ژنە، بە پێچەوانەی هەموو دنیا، بەڕاستی سەرسوڕهێنەر بوو، لەگەڵ بەسەرچوونی ساڵان جوانییەکەی تازە دەبووەوە.

خانووەکەی خوان و سیسیلیا زۆر لە خانووەکەی ئێمە بچووکتر و سادەتر بوو، وەلێ بە کەلوپەلی نایاب و شتی جوانی پێرۆیی ڕازێنرابووەوە، کە هەندێکیان لە کۆشکی کۆنی ئەتاوالباوە هێنرابوون. چەند چێنە مافووری خورییان لەسەر یەکتر لە ئەرزەکە ڕاخستبوو کە هەمووی ڕەنگاوڕەنگ بوون و وێنە و شێوەی ئینکاییان لەسەر نەخشێنرابوو. کە بە سەریدا دەڕۆیشتی پێت لە ناوی بزر دەبوو. ناو ماڵەکە بۆنی توێکڵ و شەرابی شۆکۆلاتەی لێ دەهات کە ئەو خۆی پەیدای دەکردن، بەڵام ئێمە تەنیا گیای خۆماڵیمان بەکار دەهێنا. ئەو لە منداڵییەوە لە کۆشکی ئەتاوالبا لەو شەرابە ڕاهاتبوو، بۆیە لە کاتی وێرانییەکەی سانتیاگۆ کە ئێمە لە برسان دەمانناڵاند، ئەو بۆ نان نەدەگریا ، بەڵکو بۆ خواردنەوەی شەرابی شۆکۆلاتە بوو. پێش ئەوەی ئێمەی ئیسپانی بگەینە ئێرە، تەنیا خانەوادەی حاکم و قەشە و سەربازە پلەدارەکان ئەو شەرابەیان دەخواردەوە، بەڵام ئێمە زوو لەگەڵی ڕاهاتین. ئێمە لەسەر دۆشەک

دادەنیشتین و کارەکەرەکانیشی شەرابی پڕ لە بۆن و بەرامەیان لە بەرداخی زیوین دەهێنا کە بە زەخرەفەی کیچایی نەخشێنرابوون. هەرچەندە سیسیلیا هەمیشە جلی ئیسپانی لەبەردەکرد، وەلێ لە پشت دەرگەی ماڵەکەیەوە بەرگی حەرەمسەرای ئینکای دەپۆشی، چونکە بۆ ئیستراحەتکردن گونجاوتر بوون: تەنوورەیەکی شۆڕ تا سەرپێیەکانی و دیژداشەیەکی نەخشێنراو لە ناوقەدەوە بە پشتێنێکی ڕەنگاوڕەنگی گەش خۆی دەبەستا. پێخواس بوو و نەمدەتوانی بەراوردی ئەو دوو پێیە ووردەی وەک شازادەیەک بە پێیە دڕەکانی ژنە جووتیارێکی وەک خۆم بکەم. قژی بەرەڵا کردبوو و بە دوو قردێلەی زێڕ ڕازاندبوویەوە کە لە خانەوادەکەی بۆی مابوونەوە و لەگەڵ کەلوپەکانی بە ڕێگەیەکی نهێنی و نادیار لە پێرۆ بۆیان ڕەوانی شیلی کردبوو.

وەختێ کە گومانەکانی خۆمم لەکنی درکاند وریای کردمەوە: ئەگەر پێدرۆ سەیری لۆچەکانی دەموچاوت بکات، مانای وایە چی تر تۆی خۆشناوێت.

نەمدەزانی داخوا قسەکانی تەنیا پێشبینی بوون یان ئەو ژنە بە شارەوەترین نهێنی دەزانێت و ئاگای لەو شتانەشە کە خۆم نایانزانم. بۆ ئەوەی قایلم بکات هەندێک مەرهەم و گیراوە و گوڵاوی دامێ، منیش ماوەی چەند ڕۆژێک بەکارم هێنان، لە کاتێکدا زۆر بە نائارامییەوە چاوەڕێی هاتنەوەی ئەویندارەکەم بووم. لەگەڵ ئەوەش حەفتەیەک بەسەرچوو و پاشان هی تریش هاتن و ڕابردن، وەلێ پێدرۆ هەر بەدەرنەکەوت و نەگەڕایەوە سانتیاگۆ. لەسەر پشتی ئەو کەشتییە دەژیا کە لە بەندەری کۆنکۆندا لەنگەری گرتبوو و بە هۆی نوێنەرەکانییەوە کاروباری فەرمانڕەوایی هەڵدەسووڕاند کە نامەکانی ئەویان پێ بوو، بەڵام هیچ یەکێک لەو نامانە بۆ من ئاراستە نەکرابوو. هەرگیز تێ نەدەگەیشتم چی ڕوو دەدات، من لە گومانی نێوان تووڕەیی و هیوادا مابوومەوە و لەوە دەترسام چی تر خۆشی نەوێم و چاوەڕێی بچووکترین ئیشارەتی دڵنەرمی ئەو بووم. داوام لە کاتالینا کرد بەختم بگرێتەوە، بەڵام ئەمجارەیان هێلکە شەیتانۆکەکە هیچ شتێکی ئاشکرا نەکرد، یاخۆ نەدەوێرا ڕاستییەکەی ئەو شتەم پێ بڵێت کە بینیویەتی. ڕۆژ و

حەفتەکان بەسەردەچوون و هیچ خەبەرێکم لە پێدرۆوە بۆ نەهات؛ خواردنم پێنەدەخورا و خەو نەدەچووە چاوەکانم. بە ڕۆژ تا هیلاک دەبووم هەر کارم دەکرد و شەوانیش وەک گا بە نێو ڕێڕەو و ژوورەکاندا دەسووڕامەوە و بە لێدانی پاژنەی پێیەکانم بە داخ و کەسەرەوە، بریسکەم لە عەردی بەرز دەکردەوە. نەدەگریام، چونکە لە ناخڕا هەستم بە پەژارە نەدەکرد، بەڵکو بە تووڕەبوون. نوێژیشم نەدەکرد، چونکە دەمبینی پاکیزەی لێبووردەیی لە کێشەکەم ناگات. هەزار جار ئەو بیرۆکەیە بە مێشکمدا هات کە بچمە سەردانی پێدرۆ لەسەر کەشتییەکە بۆ ئەوەی بە یەک جار تێبگەم داخوا نیازی چی هەیە - ئەمە دوو ڕۆژە ڕێ بوو بە سواری ئەسپ -، لێ نەوێرام بچم، چونکە غەریزەم ئاگەداری کردمەوە کە لە بارودۆخی وادا بەرەوڕووی نەبمەوە. وا دەزانم هەستم بە نەگبەتییەکانی خۆم کرد، وەلێ خۆبەزلزانین نەیهێشت لە شێوەی وشەدا دای بڕێژم. نەمدەویست کەسێک بە ڕیسوایی بمبینێت، بەتایبەتی ڕۆدریگۆ کە بەوە باشبوو قەت پرسیارێکی لەو بارەیەوە لێ نەکردم.

***

دواجار، لە عەسرێی ڕۆژێکی زۆر گەرمدا، قەشە گۆنزالس هاتە ماڵەکەم کە لە ماندوێتییان دیمەنی زۆر شپرزە دیاربوو؛ لە ماوەی پێنج ڕۆژدا چووبووە پالپارایسۆ و گەڕابووەوە، پاشەڵی بە هۆی زۆر سواربوونی ئەسپەوە پووچ بووبووەوە. بە بەرداخێک لە باشترین بادە، پێشوازیم لێی کرد؛ زۆر شەیدابووم، چونکە دەمزانی هەواڵێکی بۆ من پێیە. دەبێ پێدرۆ لە ڕێگەدا بێت؟ ئایا دەیەوێ بچمە کنی؟ گۆنزالس بواری نەدام چی تر پرسیاران بکەم، نامەیەکی داخراوی دایەدەستم، سەری نەوی کرد و چووە هۆڵەکە بادەکەی بخواتەوە بۆ ئەوەی من نامەکە بخوێنمەوە. پێدرۆ بە چەند وشەیەکی کەم و سنووردار بڕیارەکەی لاگاسکای بۆ ڕوون کردمەوە. ڕێز و سایشی خۆی بۆ دووبارە کردمەوە بێ ئەوەی ناوی خۆشەویستی بێنێت و داوای لێم کردبوو کە جوان گوێ لە گونزالس بگرم. ئیتر پاڵەوانی هەڵمەتەکانی فلاند و ئیتاڵیا و یاخیبوونەکەی پیرۆ و داگیرکەری شیلی و ئازاترین سەربازی جیهانی تازە و

ناوادارترینیان لە خۆی ڕانەدیت بەرەورووم بێتەوە، بۆیە ماوەی دوو مانگان خۆی لە ناو کەشتییەکە شاردەوە. دەبێ چی بەسەر هاتبێت؟ هەرگیز خەیاڵم بۆ ئەو هۆکارانە نەدەچوو کە وایان لێ کردبوو خۆی لە من دووربگرێت. ڕەنگە من بۆ سیحربازێکی سەرشێت یاخۆ بۆ ژنێکی نێر گۆڕابم؛ لەوانە زۆر لە هەقی خۆی زێتر بڕوام بە هێزی خۆشەویستییەکەمان کردبێت، تا ڕادەیەک من قەت بیرم لەوە نەدەکردەوە کە داخوا پێدرۆ منی خۆشدەوێت یان نا، چونکە من ئەوەم بە ڕاستییەکی ئەوها وەرگرتبوو کە گفتوگۆی هەڵنەدەگرت. نەخێر، دواجار کاری خۆم یەکلا کردەوە: تاوان تاوانی من نییە، ئەوە من نیم کە گۆڕاوە، بەڵکو ئەوە. ئاخر ئەو وەختێ هەستی دەکرد وا پیر دەبێت، ترسا و دەیویست بگەڕێتەوە تا ببێتەوە ئەو سەربازە پاڵەوان و عاشقە گەنجەکەی جاران. من چاکی دەناسم و ناتوانێ دووبارە لە تەک منا خۆی بنوێنێتەوە یان بە بەرگێکی تازە تێهەڵچێتەوە. بۆ ئەو زۆر زەحمەتە کە لاوازی و پیربوونی خۆی لە بەردەم مندا بشارێتەوە، جا لەبەرئەوەی ناتوانێت فێڵیشم لێ بکات، لێم دوورکەوتووەتەوە.

نامەکەم دایە دەست قەشە گونزالس و گوتم: ئەی باوکە، ئەگەر ناوەڕۆکەکەیم بۆ بخوێنیتەوە و پێم بڵێیت مەبەستی چییە.

– کچەکەم، ناوەڕۆکەکەی دەزانم، حاکم شەرەفی بڕواپێبوونی پێ داوم و داوای ئامۆژگاری لێ کردوومە.

– کەواتە ئەو قسە قۆڕانە بیرۆکەی تۆیە وا نییە؟

– نا ئەی دۆنیا ئێنیس، ئەوە فەرمانی لاگاسکایە کە بالاترین دەسەلاتە نوێنەرایەتی پاشای ئیسپانیا و کەنیسە بکات لە جیهانی تازە. بەڵگەنامەکان لە کنە منن و دەتوانیت چاوێکیان پێدا بخشێنیت. پێکەوەژیانت لەگەڵ پێدرۆ کارەساتێکی پڕ لە شوورەیی ناوەتەوە.

– ئێستا، وەختێ کە پێویستتان پێم نەما، خۆشەویستی من بۆ پێدرۆ بووەتە شەرمەزاری، بەلام کاتێک کە لە "بیابان" ئاوم بۆتان دەدۆزییەوە و

چارەسەری نەخۆشەکانم دەکرد و مردووەکانم دەناشت و سانتیاگۆم لەدەست هندییەکان دەپاراست، ئەو وەختە ژنە خواناسێکی پیرۆز بووم.

– من دەزانم هەستی تۆ چۆنە کچەکەم...

– نا باوکە، تۆ ناتوانیت هەستی من وێنا بکەیت. ئەوە گاڵتەجارییەکی شەیتانانەیە کە ژنە ئەویندارەکە بە تەنیا تاوانبار بێت، هەتا ئەگەر مێردیشی نەبێت و پیاوە عاشقەکەش هاوسەری خۆی هەبێت. بێویژدانی و کەمیی لاگاسکام پێ ئاساییە، چونکە ئەو دواجار قەشەیە؛ بەڵام من سەرم لە پێدرۆ سوڕماوە.

– ئەی ئێنیس، ئەو هیچ چارەی تری نەبوو.

– سەبارەت بە پیاوی جوامێر و شیرحەڵاڵ، هەمیشە ڕێگەچارە زۆرن وەختێ کە کار دەگاتە سەر شەرەف و نامووس. ئەی باوک، من ئاگەدارت دەکەمەوە کە شیلی بەجێ ناهێڵم، چونکە من ئەو وڵاتەم گرتووە و ئاوەدانم کردووەتەوە.

– وریا بە دۆنیا ئێنیس نەکەویتە داوی لووتبەرزییەوە! وا بزانم حەز ناکەیت دادگای پشکنین بێت و بە ڕێگەی خۆی ئەو کێشەیە چارەسەر بکات.

لە کاتێک کە بە ناوهێنانی دادگای پشکنین هەستم بە مووچرک دەکرد، پرسیم: ئایا هەڕەشەم لێ دەکەیت؟

– کچەکەم، من هیچ نیازێکم نییە هەڕەشەت لێ بکەم، تەنیا داوایەکی حاکمم پێیە کە پێشنیازی کردووە تا لە شیلی بمێنییتەوە.

– ئەو پێشنیازە چییە؟

– دەتوانی شوو بکەیت... – قەشە لە کاتێک لەسەر کورسییەکەی خۆی نووشتاندبووەوە و سەری خۆی دەخوراند توانی ئەم قسەیە بکات. پاشان گوتی: ئەمە تەنیا ڕێگەیەکە بۆ ئەوەی لە شیلی بمێنییەوە، چەندان پیاویش هەنە کە خۆیان بە بەختەوەر دەزانن ئەگەر ژنێکی لە چەشنی تۆ شوویان پێ بکات بە تایبەتی کە ئەو هەموو موڵک و سامانەت هەیە، جا ئەگەر ئەو

مۆڵکانەت بە ناوی پیاوەکەت بکەیت ئەوا دەستیان بەسەردا ناگیرێت.

ماوەیەک قورگم گیرا و دەنگم نەهاتە دەرەوە، قەت بڕوام نەدەکرد کە ئەو چارەسەرە خوار و نارێکەم بخاتە ڕوو، ئەوەیان دوا شت بوو کە بە مێشکمدا بێت.

– حاکم دەیەوێ یارمەتیت بدات، هەرچەندە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە وازت لێ بێنێت، ئەدی نایبینی ڕەفتارەکانی چەند پیاوانەیە و نیشانەی خۆشەویستی و دڵسۆزییە؟

بە دەستەکانی باوەشێنەی لە خۆی دەکرد و مێشوولەی هاوینەی لەخۆ دەردەکرد، منیش بە ناو هۆڵەکەدا بە هەنگاوی گەورە ئەمسەر ئەوسەرم دەکرد و هەوڵم دەدا خۆم ئارام بکەمەوە. ئەو بیرۆکەیە بەرهەمی سرووشێکی کتوپڕ نەبوو، بەڵکو پێدرۆ پێشنیازی کردبووە بەردەمی لاگاسکا و ئەویش ڕازی بووبوو. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە چارەنووسی من لە پشتمەوە دەدرێت. ئەو خیانەتەی پێدرۆم زۆر خەتەرناک هاتە بەرچاو و شەپۆلێک ڕق لە چەشنی ئاوی زەلکاو لە سەرمەوە تا پێیەکانم بە جەستەمدا هات و هەستم بە تاڵی دەمم کرد. حەزم دەکرد لەو ساتەدا بە دەستە ڕووتەکانم قەشە بکوژم، دەبووایە تەواو خۆم ماندوو بکەم تا درک بەوە بکەم کە ئەو تەنیا هەڵگری نامەکەیە و بەس؛ ئەوەی کە پێویستە تۆڵەی لێ بکرێتەوە پێدرۆیە نەک ئەو پیرە هەژارە کە لە ترسی پاکێتی خۆی وەک قەشەیەک ئارەقەی کردووە. لە هیکڕا هەستم بە لێدانێک کرد دەتگوت بە خەنجەر لە سینەیان داوم، هەناسەم بڕا و لە شوێنی خۆم کەوتمە لەرزین. دڵم وەک ئەسپێکی چەمووش کەوتە هەڵپە کە قەت ئەوهام بەسەر نەهاتبوو. خوێنی جەستەم هەمووی لە لاجانگم کۆببووەوە و قاچەکانم خاوبوونەوە و بەرچاوم تاریک بوو. کە کەوتم توانیم خۆم بە کورسییەکە بگرمەوە، ئەگەر نا بەردەبوومەوە سەر ئەرزەکە، چەند چرکەیەک بێهۆش کەوتم، پاشان ئەوەندەی نەبرد هۆشم هاتەوەبەر و دیتم سەرم بە چۆکەکانم کردووە، ئیتر لەو حاڵەتە مامەوە تا لێدانی دڵم ئاسایی بووەوە و هەناسەسواریم پێوە دیار نەما. ئەو بوورانەوەی خۆمم بۆ

تووڕەیی و گەرمییەکە گێڕایەوە_ بێ ئەوەی هیچ گومانم هەبێ لەوەی کە دڵم تێکشکاوە و دەبێ سی ساڵی تر بەو دەردەوە بناڵم.

کاتێ لە خۆم ڕادیت قسان بکەم لە مارمۆلیخۆم پرسی: وا بزانم پێدرۆ کە بەردەوام حەز دەکات یارمەتیم بدات، خۆی بەوەش هەراسان کردووە بەڵکو مێردێکم بۆ بدۆزێتەوە، وا نییە؟

- حاکم دوو ناوی لە مێشکدایە...

- بە پێدرۆ بڵێ کە من بەو مەرجانەی ئەو ڕازیمە و بە خۆم مێردی ئایندەی خۆم دەستنیشان دەکەم، چونکە من دەمەوێ لە ڕێگەی خۆشەویستییەوە شوو بکەم و لەمەیان بەختەوەر بم.

- ئێنیس، دیسان ئاگەدارت دەکەمەوە کە نەکەی لووتبەرزانە هەڵەیەکی گەورە بکەیت.

- ئەی باوکە، شتێک هەیە ڕاستییەکەیم پێ بڵێ، ئایا ڕاستە دەڵێن پێدرۆ دوو ژنە ئەویندارى لەگەڵ خۆی هێناوە؟

گۆنزالۆ وەڵامی نەدامەوە کە ئەوە نیشانەی دروستی ئەو قسانە بوون کە خەڵک دەیانکردن. پێدرۆ ژنێکی چل ساڵی بە دوو ژنی بیست ساڵی گۆڕیبووەوە، کە ئەوانیش هەردووکیان ئیسپانی بوون: ماریا دی ئێنسیۆ و کارەکەرەکەی خوانا خێمینز بوون کە وەک دەیانگوت، پێدرۆ دەچووە نێو جێگەی ئەویش. ئەو کارەکەرە بە هونەری جادووگەرانەی خۆی هەردووکیانی دەستەمۆ کردبوو و هەڵی دەسووڕاندن. جادووگەری؟ ئاخر ئەو قسانەیان لەسەر منیش دەکرد. هەندێ جار ئەوەندە بەسە کە ئارەقەی نێوچەوانی پیاوێکی ماندوو بسڕیتەوە بۆ ئەوەی لە دەستاوی ئەو دەستە بخوات کە ئەوت پێ لاواندووەتەوە. ئەمەیان سیحر و جادووگەری پێ ناوێت کە یەکێکمان بە وەفا و کەیف خۆش بێت و گوێ بگرێت - یان لانی کەم وا خۆی نیشان بدات -، خواردنی بەتام ئامادە بکات و لە ژێرەوەش چاوەدێری پیاوەکە بکات تا لە ڕەفتاری گەوجانەی دوور بخاتەوە و لەگەڵ هەر جووتبوونێکیش وا بکات

ئەوپەڕی چێـژ وەربگرێت لەگـەڵ دەیان شـتی سـادەی تریش. دەتوانم ئەمـانە هەمـووی بە دوو ڕستـە کورت بکەمـەوە: دەستـێکی ئاسنین و دەسـتکێشـێک لە حەریر.

لە بیرمە وەختێ پێدرۆ باسی ئەو کراسەی نووستنی بۆ کردم کە شەقەڵێکی لە شێوەی خاچی هەبوو و مارینای هاوسەری دەیپۆشی، لێ من بەڵێنم دابوو کە جەستـەی خۆم لەو پیاوە نەشارمەوە کە لە نێو جیگەکەمـە، ئەو بەڵێنەشم گەیاندە جێ و تا دواین ڕۆژی کە لەگەڵ ڕۆدریگۆش بێشەرمانە ئەوها ڕەفتارم کرد و بەجۆرێک قەت تێبینی ئەوەی نەکرد کە گۆشت و پێستم پیربوونە وەک هەر بەساڵاچوویەکی تر. ئەو پیاوانەی دەستیان گەیشتبێتە من هەموویان سادە بوون: وەک ژنێکی جوان و قەشەنگ ڕەفتارم لەگەڵیان دەکرد و ئەوانیش بڕوایان دەکرد. من ئێستا تەنیام و کەسێکم نییە بە ئەویندار ی بەختەوەری بکەم، بەڵام دەتوانم بڵێم کە پێدرۆ بە درێژایی ئەو کاتانەی لەگـەڵ من ڕای دەبووارد، بەختـەوەر بـوو ، هەروەها ڕۆدریگۆش ئاوا، هەتا ئەو وەختـانەی کە نەخۆشییەکەی لێ نەدەگەڕا ئەو دەستپێشـخەر بێت. ئیزابێل بمبەخشـە، دەزانم تۆ ئەو دێرە نـەختێ تێکشـێواوانە دەخـوێنیتـەوە، وەلێ بۆ تۆ واچاکـە بیانزانیت. خۆت بە قسەی قەشـەکان نیگەران مەکە، چونکە ئەوان هیچ شتێک لەو بارەیەوە نازانن.

***

سانتیاگۆ بووە شارێکی وا نێزیکەی پێنج سەد کەسی لێ دەژیا و زۆر خێرا دەنگوباسی تێدا بڵاو دەبووەوە، بۆیە بڕیارم دا چی تر کاتی خـۆم بـە فـێـڕۆ نەدەم. چەند ڕۆژێک لە دوای ئـەو قسـانەی لەگـەڵ قـەشـە کردبووم، دڵم هـەر بە توندی لێی دەدا . کاتالینا ئاوی کۆچایۆیۆی بۆ ئامادە کردم کە ئەمـە جۆرێکە لە قـەوزەی وشکەوەبووی دەریـا، دوای ئەوەی لە شـەوێک پێشـتر لـە ناو ئاوی دەنا . ئەوە سی ساڵە هـەرکە لە خەو هەڵدەستم ئەو شلە لینجە دەخۆمەوە و لە تامـە ناخـۆشـەکـەی ڕاهاتوومـە و لە سـایەی ئەودا هەروا زیندوومـە. ڕۆژی یەکشەمەی دواتر جوانترین جلم پۆشی. ئەوجا ئەی ئیزابێل، دەستی تۆم گرت

کە چەند مانگێک بوو لەگەڵ من دەژیای، لەو وەختەی کە خەڵک لە نوێژ دەهاتنەوە، لە گۆڕەپانەکە بەرەو ماڵی ڕۆدریگۆ پەڕینەوە، مەبەستم بوو هەموو خەڵک بمبینێ کە دەچمە ئەوێ. کاتالیناشمان لەگەڵدا بوو کە شاڵێکی ڕەشی بەخۆی دادابوو و بە زمانی کیچوایی لەبەرخۆیەوە قسەی سیحراوی دەکرد، چونکە لەو حاڵەتانەدا لە دوعای مەسیحییان کاریگەرتر بوو. هەروەها بە دوای ئێمەدا بەڵستاری پیرە سەگیش گەیشتە تەکمان. پیاوێکی هندی دەرگەی لێ کردمەوە و منی بردە هۆڵەکە و هاوڕێکانیشم لە پەنایە خۆڵاوییەکە مانەوە کە بە جیقنەی مریشک داپۆشرابوو. سەیرێکی دەوروبەری خۆمم کرد و زانیم کە کارێکی زۆرم لە پێشدایە تا ئەو عەمبارە سەربازییە، ئەو دیوارە ڕووت و ناشیرینە بکەمە شوێنێک کە شایەنی ئەوە بێت لێی بژیت. تێبینیم کرد کە ڕۆدریگۆ چوارپایەکی گونجاویشی نییە لە سەری بخەوێ و لەسەر قەرەوێڵە سەربازییەکە دەنوێت؛ تۆ مافی خۆت بوو ئەی ئیزابێل کە زوو لەگەڵ ناوماڵ و شێوە ژیانی من ڕاهاتی. دەبووایە ئەو کەلوپەلە ناشیرینانەی لە دار و سۆڵ دروست کرابوون بگۆڕین و دیوارەکان گەچکاری بکرێنەوە و ئەو شتانە بکڕین تا عەرد و دیوارەکانی پێ بشارینەوە. هەروەها دەبوو ڕێڕەوی سێبەردار و بەرهەتاویش دروست بکەین و نەمامی دار و گوڵ بنێژین. دەبوو نافوورەی ئاویش لە حەوشەکە دامەزرێنین و ساپیتە لە پووش دروستکراوەکان بە قەرمید بگۆڕین؛ بە کورتییەکەی ئیشی چەند ساڵێکم لەو ماڵە هەبوو خۆمی پێوە خەریک بکەم. من ئەو جۆرە ئیشوکارانەم بە دڵە. لە دوای چەند چرکەساتێک، لە پڕێکا ڕۆدریگۆ هاتە ژوورەوە. من پێشتر قەت سەردانی ئەوم نەکردبوو، ئەو جلەی کە ڕۆژی یەکشەممان دەیپۆشی، دایکەنی و شەرواڵێکی تەسک و کراسێکی سپی لەبەرکرد کە کەرخی سینگی کرابووەوە و لە بەرچاوم گەنج دیاربوو، لەو کاتەدا بیرێک بە مێشکمدا هات کە ڕابکەم و بچمە دەرێ. ئەو پیاوە بە چەند ساڵ لە من بچووکترە؟

– بەیانیت باش ئەی دۆنیا ئینیس. ئایا شتێک ڕووی داوە؟ ئیزابێل چۆنە؟

ڕاستەوخۆ قسەی دڵی خۆم کرد، چونکێ لەو بارودۆخەدا نەدەکرا بە پێچ

و پەنا بدوێم: ئەی ڕۆدریگۆ، بۆ ئەوە هاتوومە پێشنیازی هاوسەرگیریت بخەمە بەردەم جانازانم تۆ ڕات چییە؟

دەبێ ئەوەی بڵێم، لەسەر شەرەفی کێرۆگا، پێشنیازەکەی منی وەک کۆمیدیا وەرگرت. ڕوخساری گەشبووەوە و دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە هاوارێکی هندییانەی درێژی لێ هەستا کە لە پیاوێکی وەک ئەو ڕەچاو نەدەکرا. هەموو ئەو شتانەم پێی گوت کە لەگەڵ لاگاسکا کرابوون لە پێرۆ و ئەو چارەسەرەی کە پێدرۆ دای ناوە؛ ئاخر هەموو سەرکردەکان قسەیان لەسەر کردبوو بە تایبەتی ئەوانەی ژنیان نەبوو. ڕەنگە بیری لەوە کردبێتەوە ئەو یەکێک دەبێت لەوانەی من هەڵی دەبژێرم، بەڵام ئەوەندە سادەبوو کە ڕێگەی بەخۆی نەدەدا لەو بڕوایەی دڵنیا بێت. من بەتەمابووم مەرجی هاوسەرگیرییەکەی بۆ شەرح بکەم، وەلێ بواری نەدام قسان بکەم و یەکسەر لە باوەشیگرتم و لە شوێنی خۆم بەرزی کردمەوە کەوتە مژینی لێوەکانم، ئەودەمە منیش تێگەیشتم کە ئەوە بۆ ساڵێک دەچێت چاوەڕێی ئەو چرکەساتە دەکەم. بە هەردوو دەستەکانم یەخەی کراسەکەیم گرت و بە سۆز و شەوقەوە بە ماچێک وەڵامیم دایەوە کە لەمێژبوو لە ناخەوە بە حەسرەتی بووم، ئەو سۆزەی کە جاران بۆ پێدرۆ هەڵم گرتبوو و دەیویست بەر لەوەی گەنجێتیم بەسەربچێت، بژێیتەوە. بە ئارەزوویەکی بەجۆشەوە هەستم بە دەستەکانی دەکرد کە لە ناوقەد و ملم دەئاڵێن و تاڵی قژم شانە دەکەن و هەستم بە لێوەکانی دەکرد کە ڕوخسار و گەردنم بەسەردەکەنەوە و بۆنی نێرانە و چرپەی دەنگی بە ناوهێنانی من مەستیان دەکردم. بەڵێ ئەو ساتانە وام هەست دەکرد کە لێوان لێوم لە بەختەوەری. چۆن دەکرێت لە یەک ساتەوەختدا لە هەستکردنم بە دەردی فەرامۆشکراوی بۆ کامەرانییەک بگۆڕێم کە هەست بکەم خۆشەویست و ئەوینداری یەکێکم؟ دەبێ لەو ڕۆژگارانەدا من زۆر گۆڕانم بەسەردا هاتبێت... لەو ساتەدا سوێندم خوارد کە دەبێ تا مردن دڵسۆز و وەفاداربم بۆ ڕۆدریگۆ، هەر بۆیە نەک هەر ملکەچی ئەو تەواوی بەڵێنە بووم، بەڵکو بە درێژاییی سی ساڵان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاترم خۆشدەویست. بۆم

ئاشکرابوو کە خۆشویستنی ئەو زۆر ئاسانە؛ ئاخر ئەو هەمیشە پیاوێکی بەڕێز و جوامێر بوو و هەمووکەس وای دەناسی، بەڵام باشترین پیاویش هەندێ کەموکووڕی هەیە کە تەنیا لە کاتی زۆر نێزیکبوونەوە لێی بەدیار دەکەون، بەڵام ڕۆدریگۆ ئەو پیاوە جوامێر و ئەو سەربازە ئازایە و ئەو دۆست و مێردە دڵسۆزە، وانەبوو. قەت هەوڵی نەدەدا پێدرۆی لەبیر بکەم، بەڵکو ڕێزی بۆی هەبوو و خۆشی دەویست، هەتا یارمەتیشی دام یادەوەرییەکانی بپارێزم بۆ ئەوەی خەڵکی شیلی ڕێزی لێ بگرن کە مافی خۆی بوو، شان بەشانی ئەوەش هەمیشە ئامادەسازبوو منی خۆشبووێ و گەیشتە ئەو مەبەستە.

وەختێ لە دەستەملانەی یەکتری تێربووین و هەناسەمان هاتەوە بەر، چوومە دەرێ و هەندێ ڕێنوێنیم دایە کاتالینا، ڕۆدریگۆش چوو هەواڵی کچەکەی بپرسێت. لە دوای نیو سەعات، دەستەیەک لە هندییەکان سەندووقی کەلوپەلەکانم و جێنوێژ و پەیکەرەکەی ژنەپاکیزەی میهرەبانیان گواستەوە ماڵی ڕۆدریگۆ، لە کاتێکدا دانیشتووانی سانتیاگۆ کە لە گۆڕەپانی چەک لە دوای کۆنوێژدا چاوەڕێیان دەکرد، دەستخۆشییان لێ دەکردین. دوو حەفتانم مۆڵەت وەرگرت تا بۆ ئاهەنگی زەماوەندەکەمان خۆم ئامادە بکەم، چونکە نەمدەویست ئەو زەماوەندە بە بێدەنگی تێپەڕێت. لەو ماوە کورتەدا نەدەکرا ماڵ برازێنینەوە، بەڵام خووی خۆمان دایە چاندنی نەمامی دار لە حەوشەکەمان و کەوانەی گوڵینمان ئامادە دەکرد و چەترمان هەڵدەواسی و سفرەی درێژمان بۆ داوەتەکە دادەنا. باوکە گۆنزالۆ دی مارمۆلیخۆ لە کەنیسە تازە دروستکراوەکە بە ئامادەبوونی خەڵکانێکی زۆر لە سپیپێست و ڕەشپێست و هندی و دووڕەگەزەکان، لێکی مارە کردین. کراسی سپی بووکێنی سیسیلیامان هێنایە سەر قەدەری من، چونکە لەودەمە بواری ئەوەمان نەبوو بنێرین قووماشمان بۆ بێت و یەکێکی تازە بدوورین. سیسیلیا گوتی: «ئەی ئێنیس، بە کراسی سپییەوە شوو بکە، چونکە ڕۆدریگۆ شایەنی ئەوەیە ببیتە یەکەم خۆشەویستی ئەو». بەڕاستی هەقی بەدەستبوو وا بڵێت. ئاهەنگەکە بە ڕێوڕەسمێکی خۆش و گۆرانی چڕین بەڕێوەچوو، پاشان ژەمە

خواردنێکمان دانا کە هەمووی بە هەڵبژاردنی خۆم بوو: کولێرە، گۆشتی باڵندە، حەلوای گەنمەشامی، پەتاتای بە قیمە، فاسوولیا و بیبەر، بەرخ و کارژۆڵەی برژاو، سەوزەی باخچەکەی خۆم و ئەو شیرنەمەنییانەی کە پێشتر بۆ هاتنی پێدرۆم ئامادە کردبوو. لەگەڵ ئەو داوەتە بادەیەکی زۆرم دانا کە لە ژێرزەمینەکەی پێدرۆ بێ پەروا دەرم هێنان، چونکە هی منیش بوون. ئەو ڕۆژە دەرگەی ماڵەکەی ڕۆدریگۆ والابوو و هەموو کەس بۆی هەبوو لەگەڵمان بخوا و ئاهەنگ بگێڕێ. لە نێو ئاپۆڕەکەدا دەیان منداڵی دووڕەگەز و هندیی ڕایان دەکرد. پیرەکانی شاریش لەسەر ئەو کورسییانە دانیشتبوون کە لە شێوەی نیوە بازنە ڕیزکرابوون. کاتالینا دەیگوت ئەو ڕۆژە سێ سەد کەس لە ماڵی ئێمە نانیان خواردووە، هەرچەندە ئەو لەو حسێبانە زۆر ورد نەبوو، چونکە ڕەنگە ئامادەبووان لەو ژمارەیەش زۆرتر بووبن. ئەی ئیزابێل، ڕۆژی دواتر من و ڕۆدریگۆ لەگەڵ تۆ و دەستەیەک لە یاناکۆناکان چووینە کێڵگەکەی من بۆ ئەوەی چەند حەفتەیەک لەوێ بەسەربەرین. هەروەها چەند سەربازێکیش یاوەرمان بوون تا لە پەلاماری هندییە شیلییەکان پاسەوانیمان لێ بکەن کە لە هێرشکردنە سەر گەشتیارە بێئاگاکان ڕاهاتبوون. بەڵام کاتالینا و ئەو کارەکەرە دڵسۆزانەی کە لە کۆسکۆوە لەگەڵ خۆم هێنابووم، لە ماڵەکەی ڕۆدریگۆ مانەوە تا بە باشترین شێوە ڕێکی بخەن. تا ئەو کاتە ئەوجا بالدیبیا جەسارەتی کرد بە خۆی و دۆستە ئەویندارەکەی لە کەشتییەکە دابەزن و بێنە سەر وشکایی، پاشان گەڕابووەوە سانتیاگۆ و بینیبووی کە شارێکی پاک و ڕێکوپێک و پڕ لە ئازووقەیە و هیچ ئاسەوارێکی منیشی لێ دیار نییە.

# بەشی شەشەم

## جەنگی شیلی، ١٥٤٩ - ١٥٥٣

لە دواین بەشی ئەو چیرۆکە تێبینی دەکرێ کە دەست و خەتم گۆڕاوە. لە مانگەکانی یەکەمیندا بە دەستی خۆم دەمنووسی، وەلێ ئێستا لە پاش نووسینی چەند دێڕێکی کەم ماندوو دەبم، بۆیە وا باشترە کە تۆ لە جیاتی من بینووسیت، چونکە خەتەکەم بە شوێنپێی جاڵجاڵۆکە دەچێت، بەڵام ئیزابێل، دەست و خەتی تۆ خۆش و جوانە. تۆ مەرەکەبی لە ڕەنگی ژەنگت پێ جوانە کە ئەوەش شتێکی تازەیە و لە ئیسپانیاوە دێت و من بە زەحمەت بۆم دەخوێندرێتەوە. وەلێ لەبەرئەوەی تۆ بەو یارمەتیدانە چاکەیەکم لەگەڵ دەکەیت، منیش ناتوانم ناچارت بکەم کە بە مەرەکەبی ڕەش بنووسیت. کچەکەم ئەگەر بە پرسیارە زۆرەکانت گەمارۆم نەدەیت، ئەوا زوو کارەکەمان دەچێتە پێشێ. من بە گوێگرتن لە تۆ دڵخۆش دەبم، ئاخر تۆ بە قشتاڵییەکی لەسەر شێوەزاری شیلییانەی نەغمەدار و ڕەوان قسان دەکەیت. من و ڕۆدریگۆ ناتوانین ناچارت بکەین لەفزی پیتەکانی "خێ و سێ"ە ڕەسەنەکان فێر ببیت. قەشە گۆنزالۆ ئاوا دەدوا کە بە ئەسڵ خەڵکی سیڤیلیایە و لە مێژە مردووە، ئایا بە بەبیرت دێت؟ ئەو پیرە پیاوە داماوە وەک ئەوەی باپیرت بێت، ئاوا تۆی خۆش دەویست. ئەو وەختە بەخۆی دەیگوت تەمەنم حەفتا و حەفت ساڵە، هەرچەندە بە ڕیشە سپییەکە و ئەو خەیاڵبلاوییەی کە بەم دواییە کردی لە بارەی نێزیکبوونەوەی کۆتایی دنیا، وەک بەتریرێکی تەوراتی دیاربوو کە لە سەدی ئاواکردبێت. یەکێک لە کارە پڕ لە خێرەکانی ئەو بۆ بازرگانیکردن، بەخێوکردنی ئەسپ بوو کە منیش لەگەڵی هاوبەش بووم. ئێمە ڕەگەزی تازەمان تاقی دەکردەوە و دواجار ئاژەڵی بەهێز و جوان و چوستمان بەرهەم

هێنا، جوانە ئەسپ و مایینی شیلی ئێستا لە هەموو ئەو کیشوەرە بەناوبانگە، چونکە وەک ئەسپی عەرەبی ڕێک و ملکەچن و لەوانیش بەهێزترن. مەتران و کاتالینای میهرەبانیش لە هەمان ساڵدا مردن. ئەو پیاوە بە نەخۆشی سییەکان مرد و هیچ دەوایەکی گیایی چارەیان نەکرد. بەڵام کاتالینا لە زەمینلەرزەکە پارچە قەرمیدێک لە ئاسمانەوە هاتەخوارێ و بە پشتەسەری کەوت و کوشتی. لێدانێکی وابوو بە جۆرێک نەیتوانی لەگەڵیدا سەرنجی زەمینلەرزەکە بدات. هەر لەو ماوەیەدا بیاگراش مرد، ئەو پیاوە ئەوەندە لە گوناهەکانی خۆی دەترسا، بە شێوەیەک بەرگی قەشە فرانسیسکۆی لەبەرکردبوو. بۆ ماوەیەکی کەم بە حاکمی شیلی دانرا و وەک یەکێک لە ئازاترین سەربازە جەربەزەکان ناوی دەمینێتەوە، وەلێ لەبەر ڕەزیلی ڕێزی لەلای هیچ کەسێک نەبوو، ئاخر ڕەزیلی کەموکووڕییەکی وایە، ئێمەی ئیسپانی کە بە سەخاوەت ناسراوین، لە بەرامبەریدا هەمیشە هەست بە ڕیسوایی دەکەین.

کچەکەم، کاتی ئەوەم نییە درێژدادڕی بکەم، چونکە ئەگەر پەلە نەکەین ئەوا ئەو کارە کەموکووڕی تێ دەکەوێ و تەواو نابێت. هەروەها کەسیش نییە تاقەتی خوێندنەوەی سەدان لاپەڕەی هەبێت تا ببینێت کە ئەو چیرۆکە کۆتاییەکی ڕوونی نییە. کۆتاییی ئەو چیرۆکە چییە؟ من وا دەزانم کۆتاییەکەی مردنی منە، هەرچەند هەناسەیەکم لە ژیاندا هەبێت، ئەوا بیرەوەریم زۆر دەبن بۆ پڕکردنەوەی چەندان لاپەڕە. زۆر شت لە ژیانی مندا هەنە شایەنی گێڕانەوە بن، دەبووایە زوو بکەومە نووسینەوەی ئەو بیرەوەرییانە، وەلێ چی بکەم هەمیشە سەرقاڵ بووم: ئاخر دروستکردنی شارێک و پێشخستنی کارێکی زۆری پێویستە. من تا دوای مردنی ڕۆدریگۆ دەستم بە نووسین نەکرد، پاش ئەوەی خەمباری ئارەزووی بە ئەنجامگەیاندنی شتەکانی تری لێسەندمەوە کە پێشتر پێم وابوو کاری بەپەلە و پێویستن. بەبێ ئەو هەموو شەوەکانم بە شەونخوونی بەڕێ کرد و خەوزڕانیش بارێکی گونجاوە بۆ نووسین. من دەپرسم ئاخۆ مێردەکەم لە کوێیە، ئایا لە شوێنێک

چاوەڕوانی من دەکات، یا ئەوەتا لێرەیە لەو ماڵە، لە سێبەردا سەیرم دەکات، بە بێدەنگی دەمپارێزێت، هەر وەک لە ژیاندا وای دەکرد. ئەو مردنە چۆنە؟ لە لایەکەی تردا چی هەیە؟ ئایا ئەوێش شەو و بێدەنگییە؟ من وا بە خەیاڵمدا دێت کە مردن وەک دەرچوونی تیرێکە لە تاریکیدا بە ئاراستەی قووڵایی ئاسمان، بۆشاییەکی بێکۆتایی، کە لەوێ پێویستە یەک بە یەک بە دوای خۆشەویستەکانمدا بگەڕێم. من ئێستا سەرم لە خۆم سوڕماوە، لە کاتێک کە زۆر بیر لە مردن دەکەمەوە، هێشتاش هەست بەو ئارەزووی هێنانەدیی پرۆژەکانم و ڕازیکردنی حەزەکانم دەکەم. ئەوە ڕەنگە لە نەفسبەرزیمەوە بێت... هەروەک پێدرۆ دەیگوت ، ئارەزووی بەجێهێشتنی ئاسەوار و یادەوەری لەلایەن منەوە. من وا خەیاڵ دەکەم کە ئێمە لەو ژیانە دا هەرچەند پەلەش بکەین ناگەین بە هیچ شوێنێک؛ بەڵکو هەنگاو بە هەنگاو بەرەو مردن دەچین. لەبەر ئەوە لە گێڕانەوەکەمان بەردەوام دەبین، تا ئەو شوێنەی ڕۆژەکان ڕزگارمان دەکەن، بەتایبەتی کە من ڕووداو و کارەساتێکی زۆرم بینیوە.

لە دوای شووکردنم بە ڕۆدریگۆ، بڕیارم دا لە پێدرۆ دووربکەومەوە، لانی کەم لە سەرەتادا، بۆ ئەوەی لەو ڕق و کینەیە ڕزگاربم کە شوێنی ئەو خۆشەویستییەی گرتبووەوە کە دە ساڵی ڕەبەق لەگەڵی ژیام. وام لێ هات پێشتر چەندەم خۆشدەویست، ئەوەندەم ڕق لێی دەبووەوە، حەزم دەکرد بە قەدەر ئەوەی پێشتر ئەوم پاراستبوو، ئەوەندە بریندار بکەمەوە. کەموکوڕییەکانی لە بەرچاوم گەورە دەبوون و وەک خانەدانێک نەدەهاتە بەرزەینم، بەڵکو وەک کەسێکی چاوچنۆکی ڕەزیل دیاربوو. پێشانەکە بەهێز و توند و سەرڕاست بوو، وەلێ ئێستا قەڵەو و تەڵەکەباز و دڵڕەقە. من تەنیا لە لای کاتالینا قسەی دڵی خۆم دەکرد، چونکە ئەو ڕقەی من بەرامبەر خۆشەویستە کۆنەکەم خەجاڵەتی دەکردم. توانیم لە ڕۆدریگۆی بشارمەوە کە دڵپاکی ئەو وای کرد تێبینی ئەو هەستە گلاوانەی من نەکات. ئاخر ئەو کە لە پڕوپووچی دووربوو وای دەزانی هەموو کەسێک وەک ئەوە. خۆ ئەگەر دەرنەکەوتنی منی لەکن سەیریش بێت لەو کاتانەی پێدرۆ دەهاتە ناو شاری

سـانتـيـاگـۆ، ئەوا قـەت بەرووی هەڵنەدەدام. من خـۆم بە ڕێکخـسـتنەوەی خـانووەکـەی لادێمـانەوە خـەریک دەکـرد و هەوڵم دەدا بە بیـانووی چاندن و ناشتنی گوڵ و بەخێوکردنی ئەسپ و هێستر زۆرترین کات لەوێ بمینێمەوە، هەرچەنده لە ناخەوە هەستم بە بێزاریش دەکرد و ئارەزووی گەڕانەوەم بۆ کارەکەم دەکرد لە خەستەخانە. ڕۆدریگۆ هەموو حەفتەیەک لە شارەوە دەهاتە لادێ و بەغار ئەسپەکەی لێدەخوڕی تا من و کچەکەی ببینێت. ئاووهەوای لادێ و کاری جەستەیی و هاوڕێیەتی تۆ ئەی ئیزابێل، لەگەڵ نەرمەلۆقەی پیرە بەڵستار، ئەوانە هەموو یارمەتییان دەدام. لەو ماوەیەدا زۆرتر نوێژم دەکرد و پەیکەری ژنە پاکیزەی لێبووردەیی گەورەمانم دەبردە باخچەکە و لە ژێر سێبەری درەختێک بە دیارییەوە دادەنیشتم و باسی خەم و حەسرەتاکانی خۆمم بۆی دەکرد. ئەوبوو وای لێم کرد کە دڵ وەک سەندووقێک ببینم، ئەگەر پڕی پیسایی بێت ئەوا شوێنێکی بۆ شتەکانی تر لێ نابێتەوە. ئێ ئەگەر دڵیشم پڕ لە تاڵی بێت ئەوا ناتوانم ڕۆدریگۆ و کچەکەیم خۆشبوێت، ئیتر پاکیزەی لێبووردەیی ئەوها وریای کردمەوە. ڕقیش، هەروەک کاتالینا دەیگوت، ڕەنگی پێستت زەرهەڵدەگەڕێنی و بۆنێکی ناخۆشی لێ پەیدا دەکات، لەبەر ئەوە من لە هەمووان زێتر ئاوی پاککردنی بەدەنم دەخواردەوە. بە نوێژکردن و خواردنەوەی ئاوی سازگار لە ماوەی دوو مانگان لە ڕق لێبوونەوەی پێدرۆ پاک بوومەوە. شەوێکیان لە خەونمدا چرنووکی بازم لێ ڕوابوو و چاوەکانی پێدرۆم پێ دەردەهێنا. ئەمە خەونێکی خۆش و زیندەگی بەخش بوو. وەختێ واگاهاتم هەستم کرد تۆڵەی خۆم کردووەتەوە. کاتی بەیانی نێو جێگەکەم بەجێ هێشت و ئیتر چی تر هەستم بە ئێشی مل و لاشانەکانم نەدەکرد کە حەفتەیەک بوو ئازاریان دەدام، دیارە گـرانایی ڕق و کـینەی بێ سـوود بەریدابووم. دەنگی واگـاهێنەرم گـوێ لێ دەبوون؛ کـەڵەشـێـر، سـەگ، دەنگ گـەسکی دەست بێستانچییەکانی نێو تەلارەکە، دەنگی کارەکەرەکان. سبەینەیەکی گەرم و ڕۆشن بوو، بە پێخواسی چوومە حەوشەکە و شنەی با دەچووە ژێر کراسی نووستنم و پێستی دەلاواندم. ڕۆدریگۆم بیرهاتەوە و ئارەزووی جووتبوون

لەگەڵیدا وەک سەردەمی گەنجایەتیم دەیبزواندم، وەختێ بە ڕاکردن دەچوومە نێو باخچەکانی بلاسینشیا تا لەگەڵ خوان دی مەلەگە کاری ئەویندارى بکەم. پڕ بە سییەکانم باوێشکم دا وەک پشیلە بە پەلە ڕۆیشتم و ڕووشم لە خۆر بوو. فەرمانم دا زوو ئەسپەکانم بۆ زینکەن تا لە هەمان ڕۆژ لەگەڵ تۆدا پێکەوە بگەڕێینەوە سانتیاگۆ و جگە جلی بەرم و چەکی دەستم، هیچ کەلوپەلێکم لەگەڵ خۆم نەبرد. ڕۆدریگۆ لە ترسی ڕێگرە هندییەکانی ئەو دۆڵە نەیدەهێشت بێ پاسەوانی لە ماڵ دوورکەوینەوە، بەڵام ئێمە گوێمان پێنەدا و دەرچووین. ئەوبوو بەخت یاوەرمان بوو و لەگەڵ ئاوابوونی خۆر گەیشتینە سانتیاگۆ بێ ئەوەی هیچ بخۆین. وەختێ پاسەوانەکانی شار تۆزی ژێر ناڵی ئەسپەکانی ئێمەیان دیت، لە تاوەرەکانەوە خەڵکیان ئاگەدارکردەوە. ڕۆدریگۆ بە تووڕەییەوە هاتە پێشوازیم، چونکە لەوە دەترسا کارەساتێکمان بەسەرهاتبێت، وەلێ من خۆم فڕێدایە خوارێ و دەستم لە ملی کرد و ماچم کرد، پاشان دەستیم گرت و بۆ نێو جێگە ڕام کێشا. لەو شەوەدا خۆشەویستی ڕاستەقینە لە نێوانماندا چەکەرەی کرد، وەلێ ئەوەی ئەوانەی پێشتر تەنیا خۆڕاهێنان بوون. لە چەند مانگی داهاتوودا چاکتر یەکتریمان ناسی و چێژمان پێک دەبەخشی. خۆشەویستیم بۆ ڕۆدریگۆ زۆر لەو ئارەزووانەم جیاوازبوون کە بۆ خوان دی مەلەگە هەستم پێ دەکرد. هەروەها جیاوازیشبوو لەو سۆزەی کە بەرامبەر بە پێدرۆ هەمبوو. ئەمەیان هەستێکی کامڵ و پێگەیی و شادیبەخش بوو، هیچ ناکۆکییەکمان نەبوو و لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگار بتەوتر دەبوو تا وای لێ هات بێ ئەو ئارامم نەدەگرت و نەمدەتوانی بژیم. گەشتەکانم بۆ لادێ کۆتایی هات و تەنیا لە کاتی چوونی ئەو بۆ شەڕ نەبێت، دەنا قەت لێکدانەبڕاین. ئەو پیاوە لە بەرامبەر خەڵکدا زۆر توند پێوەست بەکارەکەی بوو، لە ماڵەوەش ناسک و بەسۆز بوو؛ ڕێنوێنی هەردووکمانی دەکرد. ئێمە هی ئەو بووین، ئایا ئەو شتانەت بەبیر دێت ئیزابێل؟ ئیتر بەو جۆرە بەختگرتنەوە سیحرییەکەی کاتالینا ڕاست دەرچوو وەختێ کە پێی گوتم: تۆ دەبیتە هی ئەو. لە ماوەی ئەو سێ ساڵەی کە پێکەوە

ژیاین، ڕۆدریگۆ ڕۆژێک چییە ڕووخۆشییەکەی خۆی بزر نەکرد جا هەر کاریگەرییەکی دەرەوەی لەسەر بووایە. لەبارەی کاروباری شەڕ و فەرمانڕەوایی و سیاسەت و مەترسییەکانی و خەمەکانی قسەی لەگەڵ دەکردم، بێ ئەوەی ئەمانە کاربکەنە سەر پەیوەندییەکانمان. بڕوای بە دیدو بۆچوونی من دەکرد و هەمیشە ڕای وەردەگرتم و گوێی لە ئامۆژگارییەکانم دەگرت. هیچ پێویستم بە بە فڕوفێڵ و بادانەوە نەبوو بۆ ئەوەی خۆم لە تووڕەبوونی بپارێزم وەک ئەوەی لەگەڵ بالدیبیا تووشی دەبووم، هەموو پیاوەکانیش هەر ئاوان وەختێ کارەکە بە دەسەڵاتیانەوە پێوەست بێت زوو تووڕە دەبن.

کچەکەم ئیزابێل، وا بزانم تۆ پێت خۆش نییە لەو بارەیەوە بدوێم، وەلێ من ناتوانم پشتگوێیان بخەم، چونکە بەشێکن لە خەسڵەتەکانی باوکت و پێویستە بیانزانیت. ئاخر بەرلەوەی من ببمە هاوسەری ئەو، وای دەزانی گەنجێتی و تاقەت بەسن بۆ ئەوەی کاری ئەویندای ئەنجام بدەیت، کە ئەمە هەڵەیەکی زۆر باوە. وەختێ یەکەم جار هاتە نێو جێگەم سەرم لێی سوڕمابوو و هەروەک گەنجێکی تەمەن پازدە ساڵە پەلە پەلی دەکرد. من ئەو ڕەفتارەی ئەوم بۆ ئەوە گێڕایەوە کە لە مێژبوو بە بێدەنگی منی بەدڵداچووبوو و نائومێدانە بۆ ماوەی نۆ ساڵ چاوەڕێم بوو، هەروەک پاشان خۆیشی ئەوەی سەلماند، وەلێ ئەو شێوازەی لە جووتبوون لە شەوانی دواتر نەگۆڕا. من وام زەنکرد کە ئیولالیای دایکت هیچ شتێکی فێر نەکردبوو، هەرچەندە زۆریشی خۆشدەویست، بۆیە من ئەرکی فێرکردنی ئەوم بۆ چۆنییەتی لاواندنەوەی ژن، خستە ئەستۆی خۆم و دەتوانیت کە بێنییە بەرچاوت کە چەند بە چێژێکی زۆرەوە ئەوم فێر دەکرد، دوای ئەوەی لە ڕق و کینەی پێدرۆ ڕزگارم بووبوو. پێشتریش وەختێ لە کۆسکۆ یەکترمان ناسی هەمان شتم لەگەڵی کرد. شارەزاییم بە سەرکردە ئیسپانییەکان سنووردارە، لێ دەتوانم پێت بڵێم من ئەوانەم دۆزییەوە کە ئەزموونێکی کەمیان لە ئەویندای هەبوو، بەڵام ئامادەبوون فێربن. کچم، پێ مەکەنە، ئەوەی دەیڵێم ڕاستە. من بۆیە ئەو قسانەت بۆ دەگێڕمەوە بەڵکەم

سوودێکیان لێ وەربگریت. من نازانم پەیوەندیت لەگەڵ مێردەکەت چۆنە، وەلێ ئەگەر گومانت لا دروست بووە، ئامۆژگاریت دەکەم کە لەگەڵ مندا باسی بکەیت، چونکە لە پاش مردنی من کەسێک نادۆزیتەوە ئەو شتانەی لەکن هەڵڕێژی. پیاوەکان وەک سەگ و ئەسپ وانە و پێویستە فێریان بکەیت و رایان بهێنیت، بەڵام لە ژنانیش ڕێژەیەکی زۆر کەم دەتوانن بەم ئەرکە هەڵسن، ئاخر ئەوانیش هیچی لێ نازانن و مامۆستایەکی وەک خوان دی مەلەگەیان نەبووە فێریان بکات، سەرەڕای ئەوەش زۆربەیان تووشی وەسوەسە بووینە، دەتۆ کراسەکە فەتحەدارەکەی نووستنی مارینا ئۆرتیز دی گایتی بە بیر خۆت بێنەوە. بەوجۆرە ئەو نەزانینە چەندبارە دەبێتەوە و بەسەر ئەو ئەوینداریيەدا زاڵ دەبێت کە لەسەر پاکترین نیاز دامەزراوە.

لە دوای گەڕانەوەم بۆ سانتیاگۆ و دەست پێ کردنم بەو چێژانەی کە لە ڕۆدریگۆ وەرم دەگرت، ئەوەندەی نەبرد کە سبەینەیەکیان لە دەنگی شەیپووری یەکێ لە پاسەوانەکان شار بەخەبەر هات. چیان بینی! سەری ئەسپێک نووکی ئەو ڕمەی تێچەقێنراوە کە پێشتر بە درێژایی چەندان ساڵ سەری ژمارەیەک مرۆڤی پێوەکرابوو. کاتێ لە نێزیکەوە پشکنییان دیارکەوت کە سەری ئەسپە سوڵتانە، واتە چاکترین ئەسپی حاکم. دەنگی هاوارێکی ترسبار و کپکراو لە سینەی هەمووان مایەوە. هاتوچۆ لە ناو سانتیاگۆ قەدەغە کرا بۆ ئەوەی کەس دزی نەکات و هیچ هندییەک یا زنجی یا. دووڕەگەزێک لە ژێر هەڕەشەی لێدانی سەد قامچی لەسەر گۆشتی ڕووت و بەستنەوەیان بە ستوونەکەی نێو گۆڕەپانەکە، نەیاندەتوانی شەوان بگەڕێن. هەمان سزا بۆ ئەو کەسانەش دانرا ئەگەر بێ مۆڵەت ئاهەنگ بگێڕن یان سەرخۆش بن یا گرەو لەسەر یاری قومار بکەن، چونکە ئەمە تەنیا سووکایەتییەک بوو بە نەجیبزادەکان. قەدەغەکردنی هاتوچۆ واتە دوورخستنەوەی هەموو دانیشتووانی شار لە بازنەی تۆمەتبارکردن، بەڵام کەسێک بیری بۆ ئەوە نەدەچوو لەو کارە قێزەونەدا، تاوانبارەکە لە ئیسپانییەکان بێت. بالدیبیا فەرمانی بە فەرمانبەرە قەزاییەکە دا کە گومانی لە هەر کەسێک بوو، ئەشکەنجەی بەرامبەر بەکار

بێنێت، بۆ ئەوەی ئەو کارە پڕ لە ڕیسواییە ئاشکرا بکرێت.

***

هەرچەندە من لە دەردی ڕقەکانم بۆ پێدرۆ چاک بوو‌بوومەوە، وەلێ پێم باش نەبوو بیبینم تەنیا ئەگەر زۆر پێویست بووایە. بە هەرحاڵ ئێمە زۆر یەکتریمان دەبینی، چونکە شاری سانتیاگۆ بچووک بوو و ماڵەکانیشمان لێک نێزیک بوون، بەڵام لە هەمان چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان پێکەوە بەشداریمان نەدەکرد و دۆستەکانمان پێکەوە داوەتیان نەدەکردین. کاتێکیش لە کەنێسە یان لە بازاڕ بەیەکگەیشتباین، بە چەمانەوە و ڕێزنواندن سڵاومان دەگۆڕییەوە و هیچی تر نا. لەگەڵ ئەوەش هیچ گۆڕانێک بەسەر پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ڕۆدریگۆ نەهاتبوو و بەردەوام جێگەی بڕوای ئەو بوو، ڕۆدریگۆش بە دڵسۆزی و وەفاداری وەڵامی ئەوی دەدایەوە. بەڵام بێگومان من بووبوومە ئامانجی تانە و تەشەرەکی پیس.

ڕۆژێکیان سیسیلیا پێی گوتم: ئەی ئینیس، بۆ ئەو خەڵکە ئەوەندە کەم و چەنەبازن؟

منیش بۆیم ڕوون کردەوە: ئەوان پێیان ناخۆشە کە من ڕۆڵی ئەویندارێکی تووڕهەڵدراو نابینم و لە شوێنی ئەوەدا ڕۆڵی هاوسەرێکی بەختەوەر دەبینم. ئەوانە دڵیان بەوە خۆشدەبێت کە ژنە بە ئیرادە و بەهێزەکانی وەک من و تۆ بە زەلیلی ببینن.

سیسیلیا بە پێکەنینەوە گوتی: من شایەنی ئەوەنیم بە تۆ بەراورد بکرێم، چونکە من ئەو سروشتە بە هێزەی وەک تۆم نییە.

منیش پێم گوت: هێزی سروشتی دیارییەکە بە نێرەکان بەخشراوە و لە ڕەگەزی ئێمەی مێیینەدا کەمە. ئاخر ژنە بەهێزەکان هاوسەنگی ئەو جیهانە دەخەنە مەترسییەوە کە پیاوی لەکن چاکترە، بۆیە تەنگیان پێهەڵدەچن و هەوڵ دەدەن وێرانیان بکەن. بەڵام ڕەگەزی مێ وەک سیسرکە وایە، ئەگەر یەکێکیان پانکەنەوە هی تر لە گۆشەکان دێنە دەرێ.

بەڵام سەبارەت بە ماریا دی ئێنسیۆ، بەبیرم دێ کە دراوسێیە کۆنەکان هیچیان بەخێریان نەدەهێنا، هەرچەندە ئیسپانیایی بوو و دۆستی ئەوینی حاکمیش بوو. هەموویان تەنیا وەک کابانی نێو ماڵ هەڵسوکەوتیان لەگەڵی دەکرد. بەڵام ژنەکەی تر، خوانا خێمینس، ئەوا گاڵتەیان پێی دەکرد و لە پاشملە دەیانگوت ماریای گەورەی بە هەندێ کاری نێو جێگەی ڕاهێناوە کە خۆیشی بێزی لێ دەبێتەوە. ئەگەر ئەوەی دەیڵێن ڕاست بێت، من لەو کارە ناپەسندانە دەپرسم کە پێدرۆ تووشی ئەوی کردووە، ئەو پیاوەی کە ڕەوشتی هەستیار و ڕێک و ڕاستەوخۆی هەبوو و هیچ بایەخێکی بەو کتێبە بچووکە فەڕەنسییانە نەدەدا کە فرانسیسکۆ دی ئەگێری لە بارەی ناوازەیی بڵاوی دەکردنەوە، تەنیا لە کاتی ئەو لاوە کلۆڵە "ئێسکۆبار" نەبێت، وەختێ بە مەبەستی پاکانەکردنی لەو تاوانەی ئەنجامی دابوو، ویستی وەک سۆزانییەک ڕیسوام بکات. بەو بۆنەیەوە با لەو لاپەڕانەدا ئەوەش بڵێم کە ئێسکۆبار نەگەیشتبووە پێرۆ، وەلێ لە تێنوانیش نەمردبوو. من پاش ساڵانێکی زۆر زانیم ئەو هندییە گەنجەی کە هاوڕێیەتی کردبوو، بە ڕێگەی نهێنی بردبوویە ئاوەدانییەکانی ماڵی باوکی لە نێو زنجیرەی لووتکەی کێوەکان و هەتا ئەمڕۆکەش هەردووکیان لە ژیاندانە. پێش ئەوەی بەرەو بیابان بکەونە ڕێ ، ئێسکۆبار بەڵێنی بە قەشە گۆنزالۆ دابوو کە ئەگەر بە ساغی بگاتە پێرۆ لەوێ دەبێتە قەشە، چونکە خوا یەکەم جار وەختێک کە لە سێدارە ڕزگاری کرد و بە پەنجە ئاماژەی بۆ کرد، پاشان لە بیابانیش هەر بەو شێوەیە. وەلێ بەڵێنەکەی نەگەیاندە جێ و لە بەرامبەر ئەوەدا چەند ژنێک لە کیچواییەکان بوونە هاوسەری و چەندا منداڵی دووڕەگەزی لێیان هەبوو، ئیتر بەو جۆرە بە شێوازی خۆی ئاینی پیرۆزی بڵاو دەکردەوە.

ئەگەر بێینەوە سەر باسی ئەو دوو ژنە ئەویندارەی پێدرۆش کە لە کۆسکۆوە هێنابوونی، من لە کاتالینا گوێبیست بووبووم کە ئەوانە لە گیای قەنەفر، جۆرە شەرابێکی بۆ ئامادە دەکەن. ڕەنگە پێدرۆ لەوە بترسێت کە وزەی نێرایەتی نەمێنێت، کە گرینگییەکەی لە دیدی ئەودا هیچ لە ئازایەتییەکەی

وەک سەربازێک، کەمترنییە، بۆیە ئەو شەرابە دەخواتەوە و دوو ژنان بۆ وورووژاندنی خۆی بەکار دێنێت. لەگەڵ ئەوەی نەگەیشتبووە ئەو تەمەنەی کە وزەی نێرایەتی ڕوو لە کەمی بکات، وەلێ تەندروستییەکەی هەڕەشەی لێ دەکرد و کۆنە برینەکانی هاتبوونەوە ژان. چارەنووسی ئەو دوو ژنە پڕ لە مەترسی بوو. هەر لە دوای مردنی بالدیبیا، خوانا خێمینس هیچ شوێنەوارێکی نەما. دەیانگوت هندییە مابۆچییەکان لە کەمینێکدا فڕاندوویانە. ماریا دی ئێنسیۆش بووە ژنێکی تووڕە و توند و خەریکی ئەشکەنجەدانی کارەکەرە هندییەکانی بوو. دەگێڕنەوە کە ئێسقانی ئەو کارەکەرە بەدبەختانە لەو ماڵدا شاردراونەتەوە کە ئێستا بووەتە موڵکی ئەنجوومەنی شارەوانی. شەوان دەنگی ئاهوناڵەیان دەهات، وەلێ ئەمە چیرۆکێکی ترە و کات یارمەتی ئەوەم نادات بگێڕمەوە.

ماریا و خوانام لە دووری خۆم هێشتەوە. هەرگیز نەمدەویست قسەیان لەگەڵ بکەم؛ بەڵام ڕۆژێکیان پێدرۆ لەسەر پشتی ئەسپەکەی گلا و لاقێکی شکا؛ لەبەرئەوەی کەسی لە من باشتر نەبوو بۆ چارەسەرکردنی، بە ناچاری بانگیان کردم. ئەوە یەکەم جارم بوو چوومە ئەو ماڵەی کە پێشان ماڵی خۆم بوو و بە دەستی خۆم دروستم کردبوو. هەرچەندە هەمان کەلوپەلی ناوماڵی تێدابوو، بەڵام نەمناسییەوە. خوانا پێشوازی لێ کردم کە ژنێکی باڵا کوڵ بوو وەلێ جوانی لێ دەباری و ئاکاری نەرمونیان بوو. بە ڕێزنواندنێکی کارەکەرانەوە نووشتایەوە و بەخێری هێنام و بۆ ئەو ژوورەی بردم کە کاتی خۆی لەگەڵ پێدرۆ دابەشمان کردبوو. ماریام بینی دەگریێ و پارچە پەڕۆکی تەڕ لەسەر تەوێڵی ئەو نەخۆشە دادەنێ کە مردنی لە ژیانی نێزیکترە. ماریا بە گریانێکی پڕ لە جۆش و ترسەوە بۆم هات تا دەستم ماچ بکات - ئاخر ئەگەر پێدرۆ بمرێت ئەوا چارەنووسی ئەو زۆر نادیار دەبێت -، بەڵام من بەنەرمی ئەوم وەلانا بۆ ئەوەی تووڕە نەبێت و لە چوارپاکە نێزیک بوومەوە. کە چەرچەفەکەم هەڵدایەوە دیتم قاچەکەی بووەتە دوو کەرت. بیرم کردەوە کە باشترین شت ئەوەیە پێش ئەوەی قاچی هەو بکاو بۆگەنی بێت، لەسەر

چۆکییەوە بیبڕینەوە، بەڵام هەمیشە لەو جۆرە نەشتەرگەرییە دەترسام و هەستیشم نەدەکرد کە من توانای ئەوەم هەبێت ئەو کارە لەگەڵ جەستەیەک بکەم کە سەردەمانێک خۆشم ویستووە.

خۆم بە گەورەژنی پاکیزە سپارد و بۆ چارەسەری ئامادەبووم بە چاکترین شێوە. لەو نەشتەرگەرییەکەدا بەیتارەکە و ئاسنگەرەکە یارمەتییان دەدام، ئاخر دەرکەوت کە پزیشکەکە تەنیا سەرخۆشێکە و سوودی لێ وەرناگیرێت. شکانی قاچی لەو بابەتانە چاکردنەوەیان زۆر زەحمەت بوو. دەبووایە ئێسقانەکە بە هەستپێکردنی دەست و پەنجەکانم دەستنیشان بکەم. ئەوەبوو وەک موعجیزەیەک توانیم درزی شکانەکە بخەمەوە شوێنی خۆی. کاتالیناش بە دەرمانە سیحراوییەکانی خۆی کە لەگەڵ بادە تێکەڵی کردبوو، نەیدەهێشت پێدرۆ بێتەوە هۆش و هەست بە ئازار بکات، بەڵام ئەو لە بێئاگاییشدا هەر دەیناڵاند؛ بۆیە دەبووایە لە هەر نۆرەیەکی چارەسەردا بە چەند پیاوێک بەرزەفتی بکەن. بەبێ ڕق و دڵپیسی کارەکەی خۆم ئەنجام دا و هەوڵم دەدا تا دەکرێت کەمتر ئازاری پێ بگات، هەرچەندە ئەوەیان هەرگیز نەدەکرا. دەبێ ئەو ڕاستییەش بڵێم کە دانپێنانی ئەوم قەت بە بیردا نەدەهات. پێدرۆ زۆر جار وای دەزانی لەبەر ئێش و ئازار دەمرێت، بە ڕادەیەک وەسیەتنامەکەی بە قەشە گۆنزالس نووسییەوە و مۆری کرد و فەرمانی دا لە ئەنجوومەنی شارەوانی لە پشت سێ دەرگەی گاڵەدراو هەڵی گرن. وەختێک لە دوای مردنی کردیانەوە ئەو ڕاسپاردەیەی تێدابوو: ڕۆدریگۆ لە دوای ئەو بکرێتە حاکم.

من دانی پیادەنێم کە ئەو ژنە ئەویندارانە زۆر گرینگییان بە پێدرۆ دەدا، بەهۆی ئەو بایەخپێدانەشیان توانی کەمێک بکەوێتەوە سەرپێ و بڕوات، هەرچەندە دەبووایە ئەو ژیانەی ماویەتی بە شەلەیی بەڕێی بکات.

***

خوان گۆمێس پێویستی بە ئەشکەنجەدانی هیچ کەسێک نەبوو تا ئەو تاوانبارە بدۆزێتەوە کە ئەسپە سوڵتانی کوشتووە، هەر تەنیا نیو سەعات لە دوای ئەوە زانرا کە تاوانبارەکە فیلیپە. سەرەتا باوەڕم نەدەکرد، چونکە ئەو

لاوە مابۆچییە تا ڕادەی پەرستن گیرۆدەی ئەو ئەسپە بووبوو. جارێکیان کە هندییەکان لە شەڕی مارگا - مارگا ئەو ئەسپەیان بریندار کردبوو، ماوەی چەند حەفتەیەک فیلیپ ئەرکی چاکبوونەوەی خستبووە ئەستۆی خۆی. لەگەڵی دەنووست و بە دەستەکانی خۆی خۆراکی خۆی دەدایێ و دەیشوشت و دەرمانی دەکرد تا ئەسپەکە هاتەوە سەرخۆ و چاکبووەوە. خۆشەویستی نێوان فیلیپ و ئەسپەکە بەو جۆرە بوو، هەندێ جار پێدرۆ زۆریشی پێ ناخۆشبوو، وەلێ وای پێ باشبوو دەست نەخاتە کارەکانی ئەو لاوە، چونکە کەس نەبوو بەقەدەر ئەو بایەخ بە ئەسپە سوڵتان بدات. شارەزایی و لێزانینی ئەو کوڕە لەگەڵ ئەسپ گەیشتبووە ئاستی ئەفسانە، و پێدرۆ بیری لەوە دەکردەوە کە وەختێ دەگاتە تەمەنێکی گونجاو، بیکاتە سەرپەرشتیاری هەموو ئەسپەکان کە ئەمە وەزیفەیەکی زۆر بە سەنگ بوو لە شارەکەمان، ئاخر پەروەردەکردنی ئەسپ ئەرکێکی بنەڕەتی بوو. فیلیپ ئەو هاوڕێیەی خۆی بە برینی خوێنهێنەرە سەرکییەکەی ملی کوشتبوو تا ئازار نەکێشێ، پاشان بە داسێکی مابۆچی سەری ئەسپەکەی لێ کردبووەوە. ئەو کوڕە پێشێلی قەدەغەکردنی هاتوچۆی کردبوو و تاریکی شەوی قۆستبووەوە بۆ ئەوەی سەری ئەسپەکە لە گۆڕەپانەکە بچەقێنێ و پاشان ڕابکات. ئەو جل و کەلوپەلە کەمەی کە هەشیبوو هەمووی پێچابووەوە و لە تەویلە بە خوێنەکەی بەجێ هێشتبوو. بەڕووتی بۆی دەرچووبوو و هەمان ئەو نووشتەی لە ملی شۆڕ بووبووەوە کە پێش چەند ساڵێک لە کاتی هاتنی هێنابووی. لەبەرخەیاڵی من وا بە پێخواسی لەسەر زەوی تەڕ ڕای دەکرد و پڕ بە سییەکانی هەوای بۆنداری دارستان هەڵدەمژی و لە جۆگە بەلۆرییە سازگارەکان و زۆنگاوەکانی دەدا بە مەلە لە ئاوی سەهۆڵاوی ڕووبارەکان دەپەڕییەوە و ئاسمانی بێکۆتاییش بەسەر سەرییەوە بوو. ئەو ئێستا سەربەستە، بۆچی ئەو ڕەفتارە دڕندانەیەی بەرامبەر ئەو ئاژەڵە کرد کە ئەوەندەی خۆشدەویست؟ ئەو ڕوونکردنەوە ئاڵۆزەی کاتالینا گوتی کە قەت ئەو کوڕەی خۆش نەدەویست، زۆر وردبوو: ئەدی خانمی گەورەم نابینی کە ئەو مابۆچییە چووەتەوە لای هۆزەکەی خۆی؟

وا بزانم پێدرۆ بەو ڕووداوە زۆر تووڕە بوو و سوێندی خوارد کە توندترین سزای سەرکارە هەڵبژاردەکەی بدات، بەڵام ناچاربوو ئەو سزادانە دوابخات، چونکە کێشەی هەستیارتری هەبوو. ئەو تازە پەیمانی لەگەڵ دوژمنە سەرەکییەکەی، میشیمالۆنکۆ بەستبوو و خۆی بۆ هەڵمەتێکی گەورە بۆ باشوور ئامادە دەکرد، بۆ ئەوەی مل بە هندییە مابۆچییەکان کەچ بکات. ئەو سەرکردە پیرە کە هیچ شوێنەواری پیرێتی پێوە دیارنەبوو، درکی کرد کە گونجاوترین شت ئەوەیە هاوپەیمانی لەگەڵ هوەینکا گرێ بدات، پاش ئەوەی کە نەیتوانی بەشەڕ بیانبەزێنێت. ئاخر هەڵمەتە تۆڵەستێنەکەی ئەگێری هیچ پیاوی بۆ نەهێشتبووەوە تا لە هێزەکانی خۆی ڕێکیان بخات. لە باکووریش تەنیا ژن و منداڵ مابوونەوە کە ئەوانیش نیوەیان لە دووڕەگەزەکان بوون. لە هەڵبژاردنی نێوان مردن و شەڕی مابۆچییەکان لە خوارووی وڵات بەو دواییە تووشی گیروگرفت هاتبوو، چونکە نەیتوانیبوو بەڵێنەکەی بە لە ناوبردنی ئیسپانییەکان، بگەیەنێتە جێ. میشیمالۆنکۆ هاوپەیمانی لەگەڵ ئەوانە بەست تا لانی کەم هەندێک کەرامەتی خۆی بپارێزێت و ناچار نەبێت کە پیاوەکانی بۆ کارکردن بنێرێتە کانگەکانی دەرهێنانی زێڕ بۆ ئیسپانییەکان.

منیش لەلای خۆمەوە نەمدەتوانی فیلیپی لە زەینی خۆم بسڕمەوە و کوشتنی ئەسپە سوڵتانم بە کارێکی ڕەمزی دەهاتە بەرچاو: بە هەمان ئەو جۆرە لێدانەی ماچێتی حاکمیشی کوشت و قەت لەو کارەشی پەشیمان نەبووەوە، پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئێمە بۆ هاتا هەتایە پچڕاند و ئەو زانیاریانەشی لەگەڵ خۆی برد کە لەو چەند ساڵە زیرەکانە بە دزی لە نێوماندا کۆی کردبوونەوە. یەکەم هێرشی مابۆچییەکانم بۆ سەر تازەشاری سانتیاگۆ بە بیردێتەوە لە بەهاری ساڵی ١٥٤١ و ئەو وەختە پێشبینی ئەو ڕۆڵە یەکلاکەرەوەیەم کرد کە فیلیپ لە ژیانی ئێمەدا دەیگێڕێت. لەو بۆنەیەدا هندییەکان بە پۆشاکی ڕەشەوە خۆیان پێچابوو تا لە شەوی تاریکدا پاسەوانەکانی ئێمە نەیانبینن، هەرووەک چۆن هێزەکانی مەرکیز بێسکارا لە ئەوروپا وایان کرد، ئەو وەختەی چەرچەفی سپییان لەخۆ لوولدابوو تا لەسەر

بەفر نەبینرێن. ئەو کاتانەی پێدرۆ ئەو چیرۆکەی لە زۆر بۆنەدا دەگێڕایەوە، فیلیپ گوێبیستی بووبوو و سەرۆک هۆزەکانی لەو فێڵە ئاگەدارکردبووەوە. ئەو وەختانەی خۆی بزردەکرد، ئەوە بە هەڵکەوت نەبوو، بەڵکو جێبەجێکردنی ئەرکێکی گەورەبوو کە ئەو کاتە قەت لە منداڵێکی وا چاوەڕوان نەدەکرا. ئەو منداڵە بێ ئەوەی لەگەڵ هێزەکانی دوژمن کە گەمارۆیان دابووین، تووشی هیچ گرفتێک بێت، بە ناوی ڕاوکردن لە شار دەچووە دەرێ، چونکە یەکێک بوو لەوان. چوونە ڕاوی ئەو بیانوویەک بوو تا بچێتە ناویان و لە کۆبوونەوەکان بەشداری بکات و هەواڵی باری ئێمەیان بداتێ. هەر ئەو بوو کە هەواڵی هاتنی هێزەکانی میشیمالۆنکۆی بۆ سانتیاگۆ هێنا و بە فێڵ وای کرد کە پێدرۆ بە نیوەی هێزەکەیەوە شار بەجێ بێڵێ و دوور بکەوێتەوە. دیسانەکە هەر ئەو بوو کە خەبەری گەیاندە هندییەکان کە چ ساتێک بۆ هێرشکردنە سەرمان لەبارە. لە کاتی هێرشەکەی سەر سانتیاگۆ ئەو کوڕە لە کوێ بوو؟ لەو شەڕە ترسناکەدا ئەومان لەبیر نەمابوو، لەوانە خۆی شاردبێتەوە یان یارمەتی دوژمنەکانی دابێت، یاخۆ ڕەنگە لە خۆشکردنی ئاگری خانووەکان دەستی هەبووبێت؛ من نازانم. فیلیپ بە درێژایی چەند ساڵێک بایەخی بە ئەسپ دەدا و بەخێوی دەکردن. زۆر گوێی لە چیرۆکی سەربازەکان دەگرت و فێری ستراتیجییەتی سەربازی دەبوو؛ زۆر شارەزای بەکارهێنانی چەکەکانمان بووبوو، لە شمشێرەوە بگرە تا دەگاتە تفەنگ و تۆپ. دەیزانی بەهێزی و لاوازیمان لە کوێدایە. ئێمە وامان دەزانی ڕێز لە پێدرۆ دەگرێت کە بە تایتا بانگی دەکات و لە هەموومان چاکتر لە خزمەتی دابوو، وەلێ لە ڕاستیدا جاسووسی بەسەریەوە دەکرد و لە ناخیدا چرۆی ڕق و کینە لە دژی داگیرکەرانی خاکەکەی دەڕووا. ئێمە دواتر زانیمان ئەوە کوڕی یەکێک لە سەرۆک خێڵەکان بووە و هەروەک بالدیبیا دواکەسە لە نەوەی دووورودرێژی سەرۆک هۆزەکان و شانازی بە باوانە شەڕکەرەکانی خۆی دەکات. من ئەو ڕقە ئەستوورەی فیلیپم بە خەیاڵدادێت کە دڵی پڕکردبوو. ئێستاش ئەو مابۆچییە تەمەن هەژدە ساڵییە بەهێز و لاوازەی لە چەشنی قەمیش، بە ڕووتی

و بەخێرایی بەرەو دارستانە شێدارەکانی خواروو ڕادەکا کە هۆزەکان لەوێ لە چاوەڕوانی ئەودانە.

***

ئەو کــوڕە ناوی ڕاســـتــەقــینەی "لاوتارۆ" بوو و لە ئەراوکــانیــادا بووە ناودارترین ســەرۆک هۆز و شــەیتــانترین دوژمــنی ئیــسپــانییــەکــان. لە دیدی مــابۆچییــەکانیش بــە پاڵەوان و ئەمیری داستــانەکانی جەنگ ناسرا. دەستــە و تاقــمــە لێکدابڕاوە هندییــەکــان و تیــمی پیــادە و ئەســپــســوارەکــان لــە ژێر فــەرمــاندەی ئەودا وەک چاکــترین ســوپای ئەوروپایی ڕێکخــران. بۆ ئەوەی ئەسپەکان لە شەڕەکاندا نەکوژرێن - کە وەک ئێمە گرینگییان پێ دەدان -، بۆلیادۆرایان بەکار دەهێنا کە ئەوە چەکێک بوو لە دوو گاشەبەرد پێکهاتبوو کــە هەریــەکــەیان بەســەری پەتێکەوە گــرێ درابوون و لە کــاتی شــەڕیشــدا دەیانهاوێشت تا لە قاچی ئەسپەکان بئاڵێ و بەربێتەوە سەر زەوی، یان وایان دەهاویشت کە لە ملی سوارەکە بئاڵێ تا لە سەر پشتی ئەسپەکەی بکەوێتە خوارەوە. لاوتارۆ فەرمانی بە پیاوەکانی خۆی دا کە ئەسپ بدزن و بە دروستی بەخێویان بکەن. هەر بە هەمان شێوە سەگیشیان بۆ ئەو مەبەستە بەخێو دەکرد. سوارەکانی وا ڕاهێنابوو کە بووبوونە باشترین سوارچاکی جیهان، بە جۆرێک کە سوپای مابۆچییەکان ئەوەندە بەهێز بووبوو نەدەبەزێندرا. بەرچیغە کۆن و قورسەکانی شەڕکردنیان بە تۆبز و گورزی کورت و کاریگەر گۆڕی. لە هەر شەڕێک کە دەستیان بەسەر چەکی دوژمناندا دەگرت، نموونەی هەمان چەکیان دروست دەکردەوە. سیستەمێکی هەواڵبەری زۆر ورد و کاریگەری دانا بە جۆرێک جەنگاوەرەکانی هەرە باشەوە بۆ ماوەی چەند چرکەیەک فەرمانی لە سەرکردەکەیەوە پێ دەگەیشت. دیسپلینێکی بتەوی خستە نێو ڕیزی هێزەکانی کە زۆر لە هی ئیسپانییەکان تۆکمەتر بوو و ژنەکانیشی کردە جەنگاوەری چاونەترس و ئازا، منداڵەکانیشی بۆ گواستنەوەی ئازووقە و تەقەمەنی و نامەبەری بەکار دەهێنا. زۆر چاک لە سروشتی خاکی ئەوێی دەزانی و سوپاکەی لە نێو دارستاندا حەشار دەدا، بەڵام وەختێ بە پێویستی

زانی لەو شـوێنانـەی کـە زۆر عـاسـێنە و دەسـتی کـەسـیـان ناگـاتـێ، چەند قەڵایەکی بچووکی دروست کرد. لە کاتێک کە ڕاهێنانی بە هێزەکەی دەکرد، هەواڵگرەکان هەموو زانیارییەکیان لە بارەی دوژمنەوە بۆ دەهێنا تا لە پێشدا حسێبی خۆپاراستنی خۆیان بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانانەش نەیتـوانی ئەو ڕەفـتـارە خـراپەی پیـاوەکـانی بگۆڕێت کـە لە دوای هەر سـەرکـەوتنێک ئەوەندە بە بادەی چینچا و مۆدای خۆیان سەرخۆش دەکرد تا هۆشـیـان نەدەمـا. ئەگـەر بیـتـوانیـبـایە بەسـەر ئەو عـادەتەدا زاڵ بێت، ئەوا مـابۆچییـەکان دەیانتوانی هێزەکـانی ئێمـە لە خـوارەوەدا تەفروتونا بکەن. لە دوای بەسـەرچوونی سـی سـاڵ، هەروا ڕوحـی لاوتارۆ لـە ڕیزی پێـشـەوەی هێـزەکـانی ئەواندایە و تا چـەندان سـەدەی تریش ئەو ناوە هەر دەمـینێت و هەرگیز ناتوانین هەرەسی پێ بێنین.

دوای مـاوەیەکی کـەم داسـتـانەکـەی لاوتارۆمـان بیست، ئەو کـاتەی پێـدرۆ چووبووە ئەراوکـانیـا بۆ ئەوەی شـاری تازە دروست بکات، بەڵکە بـەو خـەون و خـەیاڵەی دەسـەڵاتی خـۆی بگەینێـتـە تەنگەی مـاجـەلان. پێـدرۆ لـە بەردەم ئەنجـوومـەنی شـاردا ڕای گـەیاند: هەرچەنـدە بێـسـارۆ بە سـەد و چەند سەربازێک پێرۆی داگیر کرد و شەڕی سی و پێنج هەزار جەنگاوەریان کرد لە ئەتاوالـبـا، بۆیە زۆر شـەرمـەزارییـە کـە چەند وەحـشـییـەکی شـیلی بتـوانن ڕێگەمـان پێ بگرن و نەهێڵن سەرکەوین. دوو سـەد سـەربازی پڕ چەکی لەگەڵ خـۆی برد و چوار سـەرکـردەشی لەگەڵدابوو کـە یەکـێکیـان خـێرۆنیـمـۆ دی ئەڵدێرێتی ئازا و چاونەترس بـوو. سـەدان کـەسـیـان لە هندییـە هاریکارەکـان بردبوو تا کـەلوپەلەکانیان بۆ هەڵگرن. هـەروەها میشیـمـالۆنکۆش هاوڕێی بوو بە سـواری ئەسپـەکەیـەوە سـەرکردایەتی چەتە ئازا و بێ سـەروبەرەکانی خۆی دەکــرد. سـوارەکـان زرێـی تەواویان لـەبەر کـردبوو، وەلێ پیـادەکـان زرێی زووردیان پۆشیبوو و بەدەستیش قەڵغانیان هەڵگرتبوو، هەتا یاناکۆناکانیش خـوودەیان لەسـەرنابوو تا خـۆیان لـە گـورزە ترسناکـەکـانی مـابـۆچییـەکـان بپـارێزن. تاکـە شـتـێک کـە لـەگـەڵ خـۆبەزلزانینی سـەربازییـانە ناوازە بوو،

ئەوەبوو کە ناچاربوون پێدرۆی لەسەر دارەبازە هەڵبگرن، هەروەک ئەوەی ژنە ئەویندارێک هەڵدەگرن ئاوا، چونکە ژانی قاچە شکاوەکەی هێشتا بەرینەدابوو و تەواو چاک نەبووبووەوە، ئەمەش بووبووە هۆی ئەوەی نەتوانێت سواری ئەسپەکەی ببێت. پێش ئەوەی بەڕێکەون فرانسیسکۆ ئەگێری ناردبوو تا ئاوەدانکردنەوەی سیرینا و دروستکردنی شاری تر لە باکوور بگرێتە ئەستۆی خۆی کە بە هۆی هەڵمەتە لەناوبەرەکان و کشانەوەی بە کۆمەڵی هۆزەکەی میشیمالۆنکۆ ئاوەدانی تێدا نەمابوو. ڕۆدریگۆ دی کێرۆگای کردە نوێنەری خۆی لە سانتیاگۆ، چونکە تاکە سەرکردەیەک بوو کە هەموو خەڵکەکە ملکەچی بوون و ڕێزیان لێی دەگرت. ئیتر بەو جۆرە یەکێک لە شتە لە ناکاوەکانی ژیان کە پێشبینی نەدەکرا، ئەوەبوو دیسان بوومەوە حاکمەژن، کە ئەوە پایەیەک بوو من هەمیشە بەکردەوە پەیڕەویم لێی دەکرد، هەرچەندە پێشتریش نازناوی شەرعی من نەبوو.

***

لاوتارۆ لە تاریکترین شەوی هاویندا لە سانتیاگۆ ڕای کرد، بێ ئەوەی پاسەوانەکان هەستی پێ بکەن و بێ ئەوەی ئەو سەگانەش بورووژێنێت کە متۆی بووبوون. بەسەر لێواری ڕووباری مابۆچی غاری دەدا و لە نێو سەوزایی قەمیشەڵانەکاندا خۆی بزر دەکرد. ئەو پردە لە پەت دروستکراوەی بەکار نەهێنا کە هوەینکا دروستیان کردبوو. خۆی فڕێدایە ناو ئاوە ڕەشەکە، بە هاوارێکی بەختەوەرانەی نهێنی لە نێو سینگییەوە کەوتە مەلەکردن. ئاوی سارد دەر و ناخیان دەشۆرییەوە و لە بۆنی ئیسپانییەکان پاکی دەکردەوە. بە لێدانی بەهێزی باڵەکانی ئاوی دەبڕی و وەک کەسێک کە تازە لە دایک ببێت لەو بەری ئەولا چووە دەرێ. بە هەموو تاقەتی خۆی هاواری دەکرد: «ئێنچی لاوتارۆ! من لاتاورۆم!». بەبێ جولە لەسەر کەنارەوە چاوەڕێ بوو، لە کاتێک هەوای گەرم تەڕایی سەر جەستەیان دەکردە هەڵم. گوێی لە قیرەی چون – چون دەبوو، ئەمە ڕوحێکە لە جەستەدا باڵندەیە و لە دەموچاویشدا وەک مرۆڤە، ئەویش بە بانگێکی وەک ئەو وەڵامی دەداتەوە؛ ئەو وەختە هەست بە

هاتنی ڕێنیشاندەرەکەی، گواکۆڵدا، دەکات. دەبوو‌ایە خۆی زۆر ماندوو بکات تا کچەی ببینێت، هەرچەندە چاوەکانیشی لە تاریکی ڕاهاتبوون، ئاخر ئەو کچە بەهرەیەکی لە چەشنی بای هەبوو، نەدەبینرا و سەگیش بۆنی نەدەکرد. گواکۆڵدا پێنج ساڵ لەم گەورەتر بوو و دەستگیرانی خۆی بوو، لە منداڵییەوە شارەزایەتی و هەردووکیان دەزانن کە بۆ یەکتر خوڵقاون. هەرجارێک کە بەناوی ڕاوکردن لە شار دەردەچوو تا زانیاری بداتە هۆزەکەی، کچەی دەبینی و بە هۆی ئەوەوە زۆر خێرا هەواڵ و نامەکان دەگواسترانەوە. هەر ئەو کچەبوو کە لە تەمەنی یازدە ساڵیدا ئەمی بردە شاری غەزاکەرەکان و لە بارەی چاودێریکردن و فڕوفێڵدا، زانیاری وردی پێ دا. دیسان هەر ئەو کچە ئەمی لە نێزیکەوە بینیبوو وەختێ خۆی بەو قەشەیەوە نووساندبوو کە بەرگێکی ڕەشی لەبەردابوو. بەڵێ گواکۆڵدا لە دوایین بەیەککگەیشتنیان بە کوڕەی گوت کە دەبێت شەوی داهاتوو ڕابکات کە دنیا تاریکە و مانگەشەو نییە، چونکە ڕۆژگاری ئەو لەگەڵ دوژمن کۆتایی هاتووە. ئاخر ئێستا هەموو شتێک دەزانێت و خەڵکانی هۆزەکەی لە چاوەڕێی گەڕانەوەیدانە. ئەو شەوە کە کوڕەی بینی جلی ئیسپانیایی لەبەر نییە و ڕووتە، گواکۆڵدا سڵاوی لێی کرد – مەری، مەری –، پاشان بۆ یەکەم جار ماچێکی لە دەمی کرد و وەک ژنێک کە بە مافی خۆی بزانێت دەموچاوی لستەوە. لاوتارۆ وەڵامی دایەوە: – مەری، مەری –، زانی کە وادەی ئەم لەگەڵ خۆشەویستیی نێزیک بووەتەوە و بەم زووانە دەتوانێت گواکۆڵدای لە ماڵەکەی بدزێت و بە کۆڵی خۆیەوە بیرفێنێت. ئەمە بە کچە دەڵێت و ئەویش زەردەخەنەی دێتە سەر لێوان و پاشان بە نەرمەغارێکەوە بەرەو باشوور دەڕۆن، هەمیشە بەرەو باشوور. ئەو نووشتەیەی بە ملی لاوتارۆوەیە و قەت لێی نابێتەوە، ئەوەش هەر هی گواکۆڵدایە.

پاش چەند ڕۆژێک ئەو دوو گەنجە دەگەنە ئاواتی خۆیان. باوکی لاوتارۆ کە سەرۆکێکە هەموو ڕێزی لێ دەگرن، کوڕەکەی دەباتە بەردەم سەرۆک هۆزەکانی تر بۆ ئەوەی ئەو قسانە ببیستن کە کوڕە دەیانکات.

لاوتارۆ ڕوونی کـــردەوە و گـــوتـی: دوژمن بـەڕێوەیـە، ئـەوانە هـەمـــان ئـەو هوەینکایانەن کە لە باکوور بەسـەر براکانی ئێمەدا سـەرکەوتن. ئـەوان ئێستا لە ڕووباری پیـۆ - پیـۆی پیـرۆز نێزیک بـوونەتەوە و هـاریکارە یاناکۆناکـان و ئەسپ و سـەگیان لـەگەڵدایە. هـەروەهـا میشیمالۆنکۆی خیانـەتکاریشیان بە سوپایـە ترسنۆکـەکـەیەوە لەگەڵە تا شـەڕی براکانی بکات لە خـوارووی وڵات، مردن بۆ میشیمالۆنکۆ! مردن بۆ هوەینکا!

لاوتارۆ چەند ڕۆژێک ئەو قسانـەی دەکرد و دەیگوت: تفـەنگ هیچ نییە تەنیا گرمـە و بایە و تەنیا دەبێ زیاتـر لە شمشێر و ڕم و تەور و سـەگەکان بترسن؛ سـەرکـردەکـانی هوەینکا جۆرە زرێیـەکـیـان لەبـەردایە کـە تیـر و ڕمی دارین نایبڕێت؛ بۆیە پێویستـە لە بەرامبـەریاندا گورز بەکار بێنین تا گێژ و هوڕیان بکات و بە پەتیش لـەسـەر پشتی ئەسپـەکانیان بیانخەینە خوارەوە؛ وەختێک بکەونـە سـەر زەویش ئەوا لـەناوبردنیـان ئاسـان دەبێت، چونکە ئـەوەی لە ژێر زرێکانیاندایە تەنیا گۆشتە.

- وریابن! ئـەوانە نازانن ترس چییـە. زرێی پیـادەکـانیـان تەنیـا سـەر و سـینگیـان دەپارێزێ و تیـر کـاریان تێ دەکـات، وەلێ ئاگـەداربن ئەوانیش ناترسن. پێـویستـە تیـرەکـان ژەهراوی بکەین تا بریندارەکـانیـان نەتوانن بگەڕێنەوە شـەڕکردن. بەڵام ئەسپەکان، ئەوا زۆر پێویستن و دەبێ بە زیندوێتی دەسـتیـان بەسـەردا بگرین، بەتایبـەتی جـوانـە ئەسپ و مـاکینـەکـان تا بە پەروەردەیان بکەین. هـەروەهـا پێـویسـتـە شـەوانە منداڵ ڕەوانـەی نێـزیک سەربازگەی ئیسپانییەکان بکەین تا گۆشـتی ژەهراوی بدەنە سەگەکانیان کە بەردەوام بەسـتراونەتـەوە. دەبێ تۆڕ دروست بکەیـن و چاڵی قـووڵ هـەڵکەنین و بە گەڵا و لقی دار دای پۆشـین تا ئەسپەکانیان بکەونە ناوی و ئەو ڕمانەیان تێ بچەقێت کە لە بنی داکووتراوە. ئێمەی مـابۆچی ژمـارەمـان زۆرە و خێـراین و شارەزای دارسـتانەکانین. ئەو قسەیەش ڕاست نییە کە دەڵێن ئیسپـانییـەکان نابـەزێنرێن. ئـەوان لە مـابۆچییـەکـان پتـر دەنون و دەخـۆن و دەخـۆنـەوە تا ڕادەیەک ئەوەندە قـورس دەبن خـۆیان بۆ هـەڵناگیرێت. ئێمە بێ وەسـتان وەک

زەردەواڵە و مێشەکەرانە هەراسانیان دەکەین.

دوای ئەوە لاوتارۆ وەک فەرمانپێدانێک گوتی: لە سەرەتا ماندوویان دەکەین پاشان دەیانکوژین. هوەینکاش مرۆڤن و ئەوانیش وەک مابۆچی دەمرن، بەڵام وەک شەیتان ڕەفتار دەکەن. لە باکوور تەواوی منداڵی هۆزەکانیان بە زیندوێتی دەسووتاند. ئەوان دەیانەوێ خواکەیان بپەرستین کە بەسەری خاچەکەیانەوەیە، خوای مردن، هەروەها دەیانەوێ ملکەچی پاشاکەیان بین کە ئەویش لێرە ناژیت و نایناسین؛ دەیانەوێ خاکەکانمان داگیر بکەن و ببینە کۆیلەی ئەوان. من لەوانە دەپرسم، بۆچی؟ برایان، لەبەر هیچ شتێک نییە، ئەوان نازانن سەربەستی چییە و لە کەرامەتی مرۆڤ ناگەن، کڕنۆش دەبەن و دەچنەسەرچۆک و سەریان نەوی دەکەن، هیچ شتێک لەبارەی یەکسانی و چاکە نازانن. ئەوانە شێتن، وەلێ شێتێکی شەڕخواز. ئەی برایان، من دەڵێم ئێمە هەرگیز نابینە دیلی ئەوان و دەبێ لە کاتی جەنگدا گیانمان دەرچێت. پیاوەکان دەکوژین و ژن و منداڵەکانیشیان بە زیندوێتی دەبەین. ئەو وەختە ژنەکان دەبنە شینۆراتی ئێمە. ئەگەر ڕازیبوون منداڵەکانیان بە ئەسپ لەگەڵ دەگۆڕینەوە. ئەمە کارێکی دروستە، کڕ و خێرادەبین وەک ماسی، قەت نازانن ئێمە لە نێزیکیانەوەین؛ ئەو وەختە لە پڕێکا بەسەریاندا زاڵ دەبین. ئێمە دەبێ ڕاوکەرێکی پشوودرێژ بین، ئەو ململانێیە زۆر دەخایەنێت، جا با هەموومان بۆی ئامادەسازبین.

***

لە کاتێک لاوتارۆی سەرکردە و گەنج، ڕۆژانە پلانی ستراتیجی ڕێک دەخست و شەوانیش بە دزی لەگەڵ گواکۆلدا دەچوونە نێو جەنگەڵ و خەریکی ئەوینداری دەبوون، هۆزەکان خەریکی هەڵبژاردنی ئەو سەرکردەکانە بوون بۆ شەڕ کە دەبوونە سەردەستە و بە ڕۆڵی خۆیان ملکەچی فەرمانەکانی نیدۆلتۆکی، واتە سەرۆکی سەرکردەکان لاوتارۆ، دەبوون. لە شوێنێکی ڕووتی دارستانەکە هەوای ئێوارە گەرم بوو، بەڵام کە شەو دادەهات سەرما ئەو ناوەی دادەپۆشی. چەند حەفتەیەک بوو لە هەڵبژاردنی سەرکردەکان

بووبوونەوە یەک بە یەک دەستنیشانکران. تەنیا بەهێز و خۆڕاگرەکان، ئەوانەی دەتوانن دان بەخۆیان دابگرن و هەڵنەچن و ئیرادەیان هەیە، هەر ئەوانە بۆیان هەبوو ببنە سەرکردەی جەنگ. یەکێک کە لە هەموویان بەهێزتر و توندترە بازدەداتە سەر سەکۆیەکە و خۆی پێشکێش دەکات: ئێنچی کاوبۆلکان. ئەو کەسە ڕووتە و تەنیا بە پارچە گەڵپۆشێکی بچووک ئەندامی نێرینەی داپۆشیوە، بەڵام بە تیلمە قوماشێک تەوێڵ و بازووەکانی بەستووە. دوو گەنج لە کاریتە ئەستوورەکە نێزیک دەبنەوە کە پێشتر ئامادەکراوە و هەر یەک لە سەرێکی بە زەحمەت بەرزی دەکەنەوە تا خەڵکەکە بیبینن و گرانایییەکەی مەزەندە بکەن، پاشان بە زانایی دەیخەنە سەرپشتە بتەوەکەی کاوبۆلیکان. لەگەڵ گرانایی کاریتەکە ناوقەد و چۆکەکانی پیاوەکە دەچەمێنەوە بەجۆرێک هەموو وا دەزانن کە دەکەوێتە ژێری و جەستەی تێکدەشکێ، وەلێ لەهیکرا هەڵدەستێتەوە. ماسوولکەکانی جەستەی گرژدەبن و لەبەر ئارەقە دەبریقێنەوە، دەمارەکانی ملی پڕدەبن و کە چیوای نامێنێت بتەقن. وەختێ کاوبۆلیکان زۆر بە هێواشی هەنگاوی بچووک داوێت، و تاقەت دێنێتەوە بەرخۆی تا چەند سەعاتێک بەرگەی ئەو سەنگە بگرێت، هاوارێکی بێدەنگ لە ئامادەبووانەوە دەردەچێت. پێویستە ئەوانی تر ببەزێنێت کە لەم بێهێزتر نین. تاکە خەسڵەتی جیاکەرەوەی لەگەڵ ئەوان ئەوەیە کە بڕیاری داوە ئەگەر بشمرێت نابێت لە پێگەی یەکەمین دابەزێت. ئەو دەیەوێ لە کاتی شەڕ سەرکردایەتی پیاوەکانی بکات و هەمیشە ناوی لەسەر زاران بێت. هەروەها دەیەوێ لەگەڵ ڤریسیا، ئەو کچەی کە هەڵی بژاردووە، منداڵی ببێت و کوڕەکانی بە شانازییەوە خوێنی ئەو هەڵگرن. باری کاریتەکە لەسەر شان و مل و بازووەکانی ئاڵوگۆڕ پێ دەکات. گرێیە دڕەکانی قەدی دارەکە پێستی بریندار دەکەن و ڕێچکەی باریکی خوێن بە پشتە پانەکەیدا دێنە خوارێ. پڕ بە سییەکانی هەوای دارستانە بۆندارەکە هەڵدەمژێت، کە شنەی فێنکی بای پێ دەکەوێ ئارام دەبێتەوە. ڤریسیاش، کە ئەگەر لەو تاقیکردنەوەیە سەرکەوێت دەبێتە هاوسەری ئەم، چاوەکانی بێبەزەییانە لەسەر ئەون، وەلێ

دوو چاوی مەستی خۆشەویستی. ئەو کچە بە نیگاکانی گەرەکیەتی ئەم سەرکەوێت؛ حەزی لێ دەکات، وەلێ مێرد ناکات ئەگەر بە ئازاترینیان نەبێت. بە گوڵێکی کۆبیهۆی قژی ڕازاندووەتەوە، گوڵی دارستانی سوور کە لە هەوادا شین دەبێت، ئەو گوڵە دڵۆپێکە لە خوێنی خاکی دایک، کاوبۆلیکان خۆی گەیاندبووە سەر بەرزترین لقی ئەو درەختە تا بیچنێت و پێشکێشی کچەی کردووە.

جەنگاوەر بە شێوەیەکی بازنەیی دەڕوات و هەموو گرانایی دنیای بەسەر شانەوەیە و دەڵێت: «ئێمە خەونی زەوین و ئەو خەونمان پێوە دەبینێت. لە ئەستێرەکانیش بوونەوەری وا هەنە خەونیان پێوە ببینێت، ئەوانیش شتی سەیروسەمەرەی تایبەت بە خۆیان هەیە. ئێمە خەونی ناو خەونەکانین، ئێمە هاوسەری سروشتین و سڵاو لە خاکی پیرۆز دەکەین، دایکمان بە زمانی درەختی ئەرۆکاریا و دارچین و گێلاس و بازی کەندوور گۆرانی بۆ دەڵێت. دەبا بای گوڵدار هەڵبکا و دەنگی باوانمان لەگەڵ خۆی بێنێت تا بیناییمان بتەوتربێت. دەبا ئازایەتی سەرۆکە دێرینەکان لە خوێنماندا بسووڕێتەوە. تەمەندارەکان دەڵێن ئەوە ڕۆژگاری تەورە. باپیرانی باپیرانمان پاسەوانی لێ دەکەن و پاڵپشتی بازوومان دەکەن. ئەوە ساتەوەختی جەنگە. ئێمە دەبێ بمرین، مردن و ژیان هەردووکیان هەمان شتن...».

دەنگی پچڕ پچڕی جەنگاوەرەکە چەند سەعاتێک دێت و ناوەستێ، کاریتە ئەستوورەکەش لەسەر شانی هاوسەنگ دەبێت. ناوی ڕوحەکانی سروشت دێنێت تا بەرگری لە خاک و ئاوە مەزنەکانی و دووبارەبوونەوەی سپێدەکان بکەن. ناوی باووباپیران دێنێت تا بازووی پیاوەکان بکەنە ڕم. ناوی پڵنگی بۆمای شاخەکان دێنێت تا ئازایی و بتەوی ببەخشێتە ژنەکان. تەماشاکەران ماندوو دەبن و نەرمەبارانی شەو تەڕیان دەکات، هەندێکیان بە مەبەستی ڕووناکی ئاگر دەکەنەوە و دەنکە گەنمە شامی هاڕراو دەجوون، هەندێکیش دەنون یاخۆ دەڕۆنەوە، بەڵام دواتر دەگەڕێنەوە و سەرسامی خۆیان پیشان دەدەن. پیرە جادووگەرەکە چەپکێک لقی دارچین لە خوێنی قوربانی هەڵدێنێ و

کاوبۆلیکانی پێ دەڕشێنێ تا خۆی ڕاگرێت. ژنە هەست بە ترس دەکات، ئاخر شەوی ڕابردوو لە خەونیدا مارە – ڕێوی، نییرۆ – فیلۆ و مارە – کەڵەشێری بیویشینی بینیوە و پێیان گوتووە خوێنی جەنگ ئەوەندە زۆر دەبێت ڕووباری بیۆ – بیۆ بۆ هەتا هەتایە سوورهەڵدەگەڕێنێ. ڤریسیا دێمکە ئاوەکەی لە لێوە وشکەکانی کاوبۆلیکان نێزیک خستەوە و ئەویش دەستە گرانەکانی خۆشەویستەکەی لە سەر سینگی خۆی دەبینێت کە لە دەمارە بەردینەکانی دەخشێن، وەلێ هەستیان پێ ناکات، هەروەک چۆن هەست بە ماندوویێتی و ئازاریش ناکات. بە پچڕ پچڕ قسان دەکات و بە خەولێکەوتوویی دەڕوات. ئیتر بەوجۆرە چەندان سەعات و شەوەکەش هەمووی بەسەردەچن. بەیانێکی تازە دەدات و تیشکی خۆر لە نێو گەڵای درەختە بەرزەکان. جەنگاوەرەکە لە نێو ئەو تەمە سارده دایە کە لە زەوی جیا دەبێتەوە، یەکەم تیشکی زێڕینی خۆر بەرجەستەی ئەو دەکەوێت وەلێ ئەو بەردەوامە لە هەنگاوە سەمائامێزەکانی. پشتی لە خوێن سووربووە و گوتاریشی لە هەڵڕژاندایە: «ئێمە لە هەوالانین، وەرزی بەروبوومە پیرۆزەکان، وەختێ کە دایکی پیرۆزمان خۆراکمان پێ دەدات، وەرزی سنۆبەر و هاتنە دنیای بێچووی مالآت و ژنەکان، کوڕ و کچی نیگینیچین. بەرلەوەی وەرزی پشوودان دابێت، وەرزی سەرما و نووستنی خاکی دایک، هوەینکا – ئیسپانییەکان – دێن.

خەبەر لە شاخەکان بلاو بووەوە و جەنگاوەری هۆزەکان بەرەو ئەوێ هاتن و گۆڕەپانە ڕووتەنەکە پڕ لە خەڵک بوو. ئەو بازنەیەی کە کاوبۆلیکان تێیدا دەسووڕایەوە، وردە وردە تەسک دەبووەوە. ئەوان ئێستا دارەبازەی بۆ ساز دەکەن، ماچیی دووبارە بە خوێنێکی تازە دەیڕشێنێت. ڤریسیا و ژنانی تر بە پێستی تەڕکراوی کەروێشک دەیشۆن، ئاوی دەدەنێ و کەمێک خواردن دەخەنە دەمییەوە تا قووتی بدات و لە گوتاردانە شیعرییەکەی نەکەوێت. پێشتر شتی وایان نەبینیوە. خۆر زەوی گەرم دادێنێ و تەمەکە دەڕەوێنێتەوە و ئاسمان پڕ لە پەپوولەی باڵ تەنک دەبێت. لە ترۆپکی درەختەکان بەرزتریش، لە دواوەی ئاسمان گرکانی ترسێنەر بە دووکەڵە جاویدانییەکەیەوە بەرز دەبێتەوە.

ماچیی دەڵێت: «هەندێک ئاوی تر بدەنە جەنگاوەرەکە». کاوبۆلیکانیش ماوەیەکی کەمە جەولەکەی بردووەتەوە، لە قسەکردن و ڕۆیشتن بەردەوامە. خۆر دەگاتە تاقی ئاسمان و بەرەو لێژایی کێل دەبێتەوە تا لە نێو دارەکاندا بزر دەبێت و ئەویش ناوەستێ. لەو ماوەیەدا هەزاران مابۆچی گەیشتوونەتە ئەوێ و گۆڕەپانە ڕووتەکە و دارستانەکە پڕ لە خەڵک بووە. هەندێکی تر لە شاخەکانەوە دێن و دەنگی دەهۆڵ و نای دێت و ئەو ڕووداوە لە هەر چوار بایەکە ڕادەگەیەنن. چاوەکانی ڤریسیا لە چاوەکانی کاوبۆلیکان نابنەوە و بەردەوام هانی دەدەن و ڕێنوێنیی هەنگاوەکانی دەکەن.

دواجار کە شەو دادێت، جەنگاوەرەکە هەناسەیەک وەردەگرێ و کاریتەکە لەسەر سەری بەرز دەکاتەوە و ماوەی چەند چرکەساتێک دەیهێڵێتەوە، پاشان دوور فڕێی دەدات. ئێستا لاوتارۆ یاریدەرێکی بۆ پەیدابوو. ((ئوووووووووم! ئووووووووووم!)) ئەو هاوارە مەزنە لە هەموو دارستانەکە دەنگدەداتەوە و بە دۆڵ و ڕەوەزی شاخەکاندا دەگەڕێت و دەچێتە سەراپای ئەراوکاریا و لە دووری چەندان فەرسەخ هوەینکا گوێبیستی دەبن. ((ئوووووووووم!)).

***

بالدیبیا نێزیکەی مانگێکی پێویست بوو تا بگاتە خاکی مابۆچییەکان، لەو ماوەیەدا نەختێ چاک بووبووەوە و دەیتوانی ناوە ناوە بە زەحمەتێکی زۆرەوە سواری ئەسپ بێت. هەر ئەوەندە ئیسپانییەکان سەربازگەیان دانا یەکسەر پەلاماری ڕۆژانەی دوژمن دەستی پێ کرد. مابۆچییەکان بە مەلە لەو ڕووبارانە پەڕینەوە کە ئیسپانییەکان لەبەر قورسایی زرێ و تەقەمەنییەکانیان نەیانتوانی بێ بەلەم لێی بپەڕنەوە. مابۆچییەکان بە سینگی ڕووتەوە ڕووبەڕووی سەگەکان بوونەوە و دەیانزانی کە بە زیندوێتی دەیانخۆن، وەلێ لەسەر بەجێهێنانی ئەرکی خۆیان بەردەوامبوون. بەسەر ئیسپانییەکانیان دادەدا و دەیان کوشتاریان لێ بەجێ دەما و سووکە بریندارەکانیشیان ئەوانەی دەیانتوانی لەسەر پێ بوەستن، هەڵدەگرت و پێش ئەوەی سەربازەکان خۆیان ڕیزەکانیان ڕێک بخەنەوە و بکەونە دوایان، لە نێو دارستانەکە خۆیان

بزر دەکردەوە. بالدیبیا فەرمانی دا کە بە نۆبەت هەر شەش سەعات نیوەی سوپاکەی ئەرکی پاسەوانی بگرنە ئەستۆ و نیوەکەی تریش پشوو بدەن. لەگەڵ ئەوەی هێرشکردنیش هەبوو، بەڵام حاکم لە چوونە پێش بەردەوام بوو و هەموو کەمین و پەلامارەکانی بەزاند. وردە وردە چوونە قووڵایی خاکی ئەراوکانیا بێ ئەوەی ڕووبەڕووی هێزێکی گەورەی دانیشتووانی ئەوێ ببنەوە، بەڵکو ئەوەی هەشبوو دەستە و تاقمی پەرش و بڵاو بوون و نەختێک بە پەلامارە لە ناکاوەکانیان ماندوویان دەکردن وەلێ لە توانایان نەبوو بیانوەستێنن، چونکە سوپاکەی بالدیبیا لە ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی سەدان ئەوەندە زۆر ڕاهاتبوون. میشیمالۆنکۆ تەنیا کەسێک بوو کە هەستی بە نیگەرانی دەکرد، چونکە دەیزانی بەمزووانە ڕووبەڕووی کێ دەبنەوە.

ئەمە ئەو شتەبوو کە ڕووی دا. یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەیان سەخت لەگەڵ مابۆچییەکان لە کانوونی دووەمی ١٥٥٠ ڕووی دا، ئەوکاتەی سوپای ئیسپانییەکان گەیشتنە سەر کەناری ڕووباری پیۆ - پیۆ کە هێڵی جیاکەرەوەی خاکی مابۆچییەکان بوو و هەرگیز نەدەکرا بیبەزێنن. ئیسپانییەکان سەربازگەیان لە کەناری دەریاچەیەک دامەزراند کە شوێنێکی زۆر قایم بوو بە جۆرێک پشتیان بە ڕووبارە سەهۆڵاوەکەوە پارێزراوبوو. بەهزریاندا نەدەهات کە دوژمن لە ئاوەکەوە، وەک گورگی دەریا کڕ و خێرا بۆیان دێن. پاسەوانەکان هیچیان نەبینی و شەوەکەش کپ و هێمن بوو، تا لە کتوپڕێکا گوێیان بە هاوار و بانگ و دەنگی نای و تەپڵ و کرایەوە و زەوی لەبەر پێی ڕووتی سەدان و سەدان جەنگاوەری لاوتارۆ دەلەرزی. هێزێکی ئامادەباشی ئیسپانییەکان بۆ بەیەکگەیشتنیان دەرچوو، لێ مابۆچییەکان وەک جارانی پێشوو نەبوون کە لە بەردەمی پێشڕەوی ئەسپەکان دەترسان، بەڵکو گوێیان پێ نەدان و وەک دیوار لە بەردەمیان وەستانەوە و ڕمەکانیان بەکەمەریانەوە چەسپ کردبوو. ئەسپەکان حیلاندیان و سوارەکان بەناچاری پەرتەوازەبوون. لەو کاتەدا تفەنگچییەکان یەکەم دەستڕێژی خۆیان کرد. لاوتارۆ پیاوەکانی خۆی لەوە وریا کردبووەوە کە داگرتنەوەی فیشەکی ئەو

تفەنگانە چەند خولەکێکی پێویستە و لەو کاتەدا سەربازەکان هیچیان پێ ناکرێت؛ ئەمەش بوارێکی باشیان بۆ دەڕەخسێنێ تا هێرشی خۆیان دەست پێ بکەنەوە. بالدیبیا واقی لەوە وڕمابوو کە ئەو مابۆچییانە بۆچی ئەوجارە ناترسن و خۆیان دەگەیەننە سەربازە زرێدارەکان، سەربازەکانی لە چەند دەستەیەکی پوختە ڕێکخستەوە، وەک ئەوەی لە ئیتالیا دەیکرد ئاوا، بە قەڵغانیش خۆیان دەپاراست. ئەو تۆپەڵە سەربازە حەربە و ڕم و شمشێرەکانیان بەرز کردبووەوە و مشیمالۆنکۆ و پیاوەکانیشی لە دواوەڕا هێرشیان دەهێنا. شەڕێکی سەخت قەوما و تا شەوێ بەردەوامبوو و لەگەڵ کشانەوەی سوپاکەی لاوتارۆ کۆتایی هات، وەلێ پەرش و بڵاو نەبوونەوە بەڵکو ئەوجارە بە ڕێکی و لەسەر ڕیتمی دەهۆڵەکە گەڕانەوە دواوە.

خێرۆنیمۆ دی ئەڵدێرێتی گوتی: لە جیهانی تازەدا جەنگاوەری وەک ئەوانە نەبینراوە.

بالدیبیاش گوتی: لە ژیانی خۆم هەرگیز ڕووبەڕووی دوژمنێکی وا دڕ نەبوومەتەوە. من ئەوە سی ساڵە خزمەتی پاشا دەکەم و لە زۆر وڵاتان جەنگاوم، وەلێ کەسی وەک ئەوانە خۆڕاگرم لە جەنگ نەبینیوە.

– ئێستا دەبێ چی بکەین؟

– لێرە، لەو شوێنە شارێک دروست دەکەین. چونکە هەموو خەسڵەتێکی چاکی بۆ ژیان تێدایە: کەنارێکی پاک، ڕووبارێکی بەرین، دار، ڕاوکردنی ماسی.

ئەڵدێرێتی ئاماژەی کرد و گوتی: لەگەڵ هەزاران وەحشی لەو دەوروبەرە.

– لە سەرتادا شوێنێکی قایم دروست دەکەین. جگە لە بریندار و پاسەوانەکان هەموو دەکەوینە بڕینەوەی دار و دروستکردنی شوورە و عەنبار و سەنگەر. پاشان دەبینین داخوا ئەو وەحشییانە دەوێرن هێرشمان بکەنەسەر یان نا.

بێگومان توانیان، ئاخر ئیسپانییەکان هێشتا لە دروستکردنی شوورەکە

نەبووبوونەوە کە لاوتارۆ بە سوپایەکی زۆرەوە، کە پاسەوانە ترساوەکان بە سەد هەزار پیاو مەزەندەیان دەرکرد خۆی بۆ پەلاماردانی ئێمە ساز کردەوە. بالدیبیا گوتاری دا و سەربازەکانی هان دا: «ئەوانە لە نیوەی ئەو ژمارەیەش کەمترن و دەتوانین تێکیان بشکێنین. بە ناوی پیاوچاکی سانتیاگۆ، با ئیسپانیا یەکگرتوو بێت!». بالدیبیا لەگەڵ ئەو قسانەدا زیاتر بە ئازایی دوژمن سەرسام بووبوو نەک بە زۆری ژمارەیان. پیاوە مابۆچییەکان لە شێوەی چوار هێز بە ڕێکخستنێکی تەواوەوە دەهاتنە پێشەوە و هەر هێزێک سەرکردەیەکی جەنگ ڕابەرایەتی دەکرد. بە هەرا و دەنگە دەنگە تۆقێنەرەی کە دوژمنی خۆیان پێ دەترساند، دەنگی ئەو نایانەشیان تێکەڵی کردبوو کە لە ئێسقانی ئیسپانییە کوژراوەکانی شەڕەکانی پێشوو دروستیان کردبوو.

ئەڵدێرێتی گوتی: ئەوان ناتوانن لە خەندەق و شوورەکە بپەڕنەوە، ئێمە بە تفەنگ ڕایان دەگرین.

بالدیبیا گوتی: ئەگەر لە سەنگەری خۆمان بمێنینەوە دەتوانن گەمارۆمان بدەن و لە برسان بمانکوژن.

– گەمارۆمان دەدەن؟ باوەڕ ناکەم بیری وا بکەنەوە، ئاخر ئەوە پلانێکە وەحشییەکان درکی پێ ناکەن.

– دەترسم لە ئێمە پتری لێ بزانن، پێویستە لە دەرەوە ڕووبەڕوویان ببینەوە.

– ئاخر ئەوان گەلێک زۆرن و بەرگەیان ناگرین.

– بە پشتیوانی خوا دەتوانین – ئەمە وەڵامی بالدیبیا بوو.

خێرۆنیمۆ فەرمانی دا لەگەڵ پەنجا سواری تر بەرەنگاری یەکەم دەستەی مابۆچییەکان ببێتەوە کە بە بڕوایەکی بتەوەوە بەرەو دەروازەکە پێشڕەویان کرد، هەرچەندە لەگەڵ یەکەم دەستدرێژ چەندان کەسیان لێ بەربووەوە. ئەڵدێرێتی بە خۆی و سوارەکانی لەگەڵ ئەوەی دەیانزانی بەرەو پیلی مردن دەچن، لێ بەبێ دوودڵی ئامادەسازبوون بە دەستەملانێیەکی دڵسۆزانەوە

خواحافیزی لە بالدیبیای هاوڕێی کرد. ئەوان لە مێژبوو یەکتریان دەناسی و پێکەوە لە چەندان نەبەردی پەڕیبوونەوە.

***

گومانی تێدا نییە کە موعجیزە هەنە. لەو ڕۆژەدا موعجیزەیەک ڕووی دا، هیچ لێکدانەوەیەکی تر هەڵناگرێت و هەر ئەوەشە کە نەوەکانی ئەو ئیسپانیاییانەی کە ئەم ڕووداوەیان بینیوە، بۆ چەندان سەدە دەیڵێنەوە، هەروەها بە دڵنیاییەوە نەوەکانی مابۆچییەکانیش دەیڵێنەوە.

خێرۆنیمۆ دی ئەڵدێرێتی بە سەرکردایەتی پەنجا سوارەکەی لە ئامادەباشیدا بوون و بە هێمایەکی ئەو دەرگەکان خرانە سەرپشت. ئەو دەستە سوارە بۆ ئەوەی بەرەنگاری هاتوهاواری تۆقێنەرەکەی هندییەکان ببنەوە. لە ماوەی چەند چرکەساتێکی کەم کۆمەڵێکی زۆر لە جەنگاوەرە هندییەکان گەمارۆی سوارەکانیان دا. ئەڵدێرێتی یەکسەر زانی کە بەردەوامبوون کارێکی خۆکوژانەیە، بۆیە فەرمانی دایە سوارەکانی کە دووبارە کۆببنەوە، وەلێ گاشەبەردەکانی بۆلیادۆرا کە لاوتارۆ دای هێنابوو لە دەوری قاچی ئەسپەکان دەئالاّ و نەیدەهێشت ئەسپەکان بە کەیفی خۆیان بجولێنەوە. لەسەر شوورەکانیش تفەنگچییەکان بۆ جاری دووەم دەستڕێژیان کردەوە، لێ هەڵمەتی جەنگاوەرەکانی سووک نەکرد. بالدیبیا خۆی ئامادە کرد تا بچێتە پشتیوانی سوارەکانی، هەرچەندە ئەوە بە مانای نەمانی بەرگریکردن بوو لە قەلاّکە لە ڕووی هەرسێ هێزەکەی تری هندییەکان کە گەمارۆیان دابوو. ئاخر ئەو لێنەدەگەڕا ئەو پەنجا سوارەی لە ناو بچن بێ ئەوەی دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکات. یەکەم جاریش بوو لە ژیانی سەربازیدا لەوە بترسێت کە هەڵەیەکی تاکتیکی کردووە و ناتوانێت چاکی بکاتەوە. پاڵەوانی پێرۆ کە ئەوەندە لەمێژ نییە گەورەترین شکستی بەسەر هێزەکانی گۆنزالۆ بێسارۆ هێنا، وا ئەمڕۆکە لە بەردەم ئەو وەحشییانە سەری لێ شێواوە. هاتوهاوارێکی ترسناک بوو و فەرمانەکان نەدەبیستران، لەو پەشێوییەدا سوارێکی ئیسپانییەکان بە گوللەیەکی هەڵەی هاوڕێکانی کەوتە خوارەوە . لە هیکرا و

لەو کاتەی هێزەکەی یەکەمی هندییەکان بەسەر هەڵوێستەکەدا زاڵبوون، زۆر بەپەلە کشانەوە دواوە و هەرسێ هێزەکەی تریش بەدوای ئەوەی یەکەمدا چوون. لە ماوەی چەند خولەکێک گۆڕەپانی شەڕیان چۆل کرد و وەک کەروێشک بۆ ناو دارستانەکە هەڵاتن.

ئیسپانییەکان کە سەریان سوڕمابوو، نەیاندەزانی چی قەوماوە و لەوە دەترسان کە ئەمە تاکتیکێکی تازەی دوژمن بێت، جگە لەوە هیچ لێکدانەوەیەکیان بۆ ئەو کشانەوە کتوپڕە و وەستانی شەڕەکە نەبوو کە هێشتا بەتەواوی دەستی پێ نەکردبوو. بالدیبیا بە هۆی ئەزموونی زۆری لە شەڕ، دەستپێشخەری کارێکی تازەی کرد: فەرمانی دا بە دوایاندا بچن و ڕاویان بنێن. ئەمەی لە نامەیەکدا وەسف کردبوو کە بۆ پاشای ڕەوان کرد: «هێشتا سوارەکانی ئێمە نەگەیشتبوونە ئەوان تا لە پڕێکا هندییەکان بایاندایەوە و سێ هێزەکەی تریش بە دوایان داچوون. هەزار و پێنج سەد تا دوو هەزار هندیمان کوشت و ژمارەیەکی زۆریشمان لێیان بریندار کرد و ئێمەش چەند سەربازێکمان کوژران».

ئەوانەی لەوێ بوون دەیانگوت موعجیزەکە بە چاوی هەموو کەس دەبینرا. وێنەی فریشتەیەک بەدیارکەوت، وەک برووسک دەدرەوشایەوە و بەسەر گۆڕەپانەکەدا خواربووەوە و ئەو ناوەی بە ڕووناکییەکی یەکجار گەش ڕوون کردەوە. هەندێک باوەڕیان وابوو کە پێغەمبەری سانتیاگۆیان تێدا بینیوە کە سواری ئەسپێکی سپی بووە و ڕووبەڕووی وەحشییەکان بووەتەوە و ئامۆژگارییەکی کاریگەری کردوونە و فەرمانی پێ کردوون تا خۆیان بدەنە دەست مەسیحییەکان. هەندێکی تر وێنەی ژنە پاکیزەی بەزەییان لە شێوەی ژنێکی زۆر جوان لێی بینیوە کە زێڕ و زیوی پۆشیوە. بەڵام هندییە دیلەکان گوتیان ئێمە ئاگرێکمان بینیوە کە وێنەی کەوانەیەکی گەورەی لە تاقی ئاسمان دروست کردبوو و پاشان بە دەنگێکی گەورە تەقیوەتەوە و کلکێکی پڕ لە ئەستێرەی لە دوای خۆی بەجێ هێشت. لە ساڵانی دواتر زاناکان شتی تریان دەگێڕایەوە. دەیانگوت ئەوە نەیزەکێک بووە لە ئاسمانەوە، واتە شتێک

لە چەشنی بەردێکی یەکجار گەورە لە خۆر بەربووەتەوە و بەرەو زەوی هاتووە. من قەت یەکێک لەو نەیزەکانەم نەبینیوە و زۆریشم لەکن سەیرە ئەگەر شێوەی وەک پیاوچاکی سانتیاگۆ یا ژنە پاکیزە بێت و لە کات و شوێنێکی گونجاو بۆ ئیسپانییەکان بێتە خوارەوە. نازانم ئەگەر موعجیزە بێت یان نەیزەک، وەلێ ئەوەی رووی دا ئەوەبوو هندییەکان بە ترسەوە هەڵاتن و مەسیحییەکانیش بە سەرداری گۆڕەپانەکە مانەوە و ئاهەنگیان بۆ ئەو سەرکەوتنە گێڕا کە خۆیان بە دەستیان نەهێنابوو.

بە پێی ئەو هەواڵانەی دەگەیشتنە سانتیاگۆ، بالدیبیا نێزیکەی سێ سەد هندی بەدیل گرتبوو و فەرمانی دا سزایان لەسەر جێبەجێ بکرێت - هەرچەندە ئەو لە بەردەم پاشادا تەنیا دانی بە دوو سەد دیل نابوو -. دەستی ڕاستەیان بە لێدانی تەور دەبڕینەوە، لووتیشیان بە چەقۆ دەبڕین. وەختێک کە هەندێ لە سەربازەکان، دیلەکانیان ناچار دەکرد تا بازوویان لەسەر کۆلکەدار دابنێن تا جەللادە زنجییەکان بە ئاسانی بە دەمی تەور ببیبڕنەوە، هەندێ سەربازی تر مەچەکیان بە ڕۆنی قرچاوە داخ دەکردن، ئیتر بەو جۆرە قوربانییەکان خوێنیان لێ نەدەهات و دەیانتوانی ئەو عیبرەتە بگەیننە هۆزەکانیان. پاشان تیمێکی تر لووتی هندییە بێچارەکانیان دەبڕی. سەبەتەکان پڕ بوون لە دەست و لووتی بڕاوە و خوێن ئەو ناوەی داپۆشی. هەروەها بالدیبیا لە نامەکەیدا بۆ پاشا گوتبووی کە دوای ئەوەی دادگەری سەقامگیر کرد، هندییەکانی کۆکردووەتەوە و قسەی بۆ کردوونە کە لە نێوانیاندا هەندێک سەرکردە و سەرۆک هۆزی تێدابووە. هەروەها ڕای گەیاندبوو کە ئەم بۆیە ئەو کارەی ئەنجام داوە چونکە چەندان جار داوای ئاشتی لە هندییەکان کردووە، بەڵام ئەوان پابەندی نەبوونە. واتە پێویستە لەسەر ئەوانەی ئەشکەنجە دراون، سەرەڕای ئەوەش گوێ لە گوتاری پڕ لە حەماسەت بگرن بە زمانی ئیسپانی. ئەوانەیش کە دەتوانن بە پێوە بوەستن بە ئاراستەی دارستانەکە دوورخرانەوە تا هاوڕێکانیان ئەندامە بڕاوەکانیان ببینن. زۆر لەوانەی دەست و لووتیان بڕابوو بەردەبوونەوە و لە هۆش خۆیان

دەچوون، وەلێ دواتر هەڵدەسانەوە و بە ڕقەوە لەبەرچاوان بزر دەبوون. وەختێکیش کە جەللادەکان لە ماندوێتییان نەیاندەتوانی تەور و کێردەکانیان بوەشێنن، سەربازەکان شوێنیان دەگرتنەوە. پاشان سەبەتە پڕ لە دەست و لووتە بڕاوەکانیان دەهاوێشتە ناو ڕووبار، ئیتر سەرئاو دەکەوتن و شەپۆلە بەخوێن سووربووەکان بەرەو دەریایان دەبردن.

کاتێ بەو ڕووداوەم زانی، مەبەستی قەسابخانەکەم لە ڕۆدریگۆ پرسی کە بەڕای من ئەنجامێکی زۆر خراپی دەبوو، چونکە نابێت لە دوای ئەو ڕەفتارە چاوەڕێی بەزەیی لە مابۆچییەکان بکەین، بەڵکو بە توندترین شێوە تۆڵەمان لێ دەکەنەوە. ڕۆدریگۆ بۆی ڕوونکردمەوە کە ئەو کارانە ڕەنگە هەندێ جار پێویست بن بۆ ترساندنی دوژمنان.

ویستم بزانم داخوا ئەو چۆن هەڵسوکەوت دەکات و پرسیم: ئایا ئەگەر تۆش بووای هەر ئاوات دەکرد؟

– بڕوا ناکەم خاتوو ئینیس، بەڵام من لەوێ نەبووم و ناشتوانم حوکم لەسەر بڕیارەکانی ژەنەراڵ بدەم.

– ڕۆدریگۆی بەڕێز، من ماوەی دە ساڵ لەگەڵ پێدرۆ تاڵی و شیرینی ژیانم چەشت، ئەو کارە لەگەڵ کەسێتی ئەو پیاوە ناگونجێت کە من دەمناسی، پێدرۆ زۆری گۆڕانی بەسەردا هاتووە، حەز دەکەم بیڵێم کە من بەختەوەرم، چونکە ئەو پیاوە لە ژیانی مندا بوونی نەماوە.

– جەنگ جەنگە. لە خوا داواکارم کە زوو کۆتایی پێ بێت و بتوانین بە ئاشتەوایی ئەو وڵاتە بنیات بنێین.

– ئەگەر جەنگ هەر جەنگ بێت ئەوا پێویستە لە سەرمان پاکانە بۆ ئەو قەسابخانانە بدۆزینەوە کە فرانسیسکۆ ئەگێری کردوویەتی لە باکوور.

لە دوای ئەو تۆڵەسەندنەوە وەحشییانەیە، بالدیبیا فەرمانی دا کە هەموو خۆراک و ماڵاتانەی لە هندییەکان زەوتکرابوون بیبەنە قەڵاتەکە. چەند پەیامنێرێکی نارد تا لە ناو شاردا ڕای بگەیەن کە لە ماوەی چوار مانگدا، بە

پشتیوانی پەیامبەری سانتیاگۆ و ژنە پاکیزە دەتوانێت ئاشتەوایی لەو خاکەدا بڵاو بکاتەوە. من وام هەست دەکرد لە ڕاگەیاندنی سەرکەوتن پەلە دەکات.

***

لە ماوەی ئەو سێ ساڵەی کە لە ژیاندا مابوو زۆر کەم بالدیبیام دەبینی. من لایەن کەسانی ترەوە خەبەری ئەوم پێدەگەیشت. بەڵام من و ڕۆدریگۆ بێ ئەوەی تێبینی بکەین ڕۆژ بە ڕۆژ دەگەشاینەوە و باری ژیانمان پێش دەکەوت. چاومان دەدایە هەر کوێیەک ماڵاتەکانمان زیادیان دەکرد و دەغڵودان و باخچەکانمان بەردارتر دەبوون. بەردمان لێ دەبووە زێڕ. حاکم سەرگەرمی دروستکردنی قەڵا و شاری تازە بوو لە خوارووی وڵات. یەکەم جار بە چەقاندنی خاچ و ئاڵا دەستی پێ دەکرد. ئەگەر قەشەش هەبوایە کۆنوێژێکی دادەبەستا و پاشان داری دادوەریی یان سێدارەی دەچەقاند. پیاوەکان خەریکی بڕینی دار بوون بۆ دروستکردنی شوورە و خانوو. زەحمەتترین شت پەیداکردنی دانیشتووان بوو. بەڵام سەرباز و خێزانەکان وردە وردە دەهاتن. ئیتر بەوجۆرە شارەکانی کۆنسیپسیۆن و ئیمپریال و بیاڕیکا و هی تر دروستبوون. ئەو شارەی دوایی لە نێزیک کانگەیەکی زێڕ دامەزرا کە لەسەر یەکێ لە لقەکانی ڕووباری پیۆ - پیۆ دۆزرابووەوە. بەرهەمی ئەو کانگەیە ئەوەندە زۆربوو بە ڕادەیەک لە بازرگانیدا تەنیا مامەڵە بە زێڕ دەکرا، هەتا کڕینی نان و گۆشت و میوەجات و سەوزەوات و هەموو کاڵاکانی تریش هەر بە زێڕ دەکران؛ لەوێ تەنیا پارەی زێڕ هەبوو. بازرگان و مەیفرۆشەکان و دووکاندارەکان هەریەکە تەرازووی خۆی هەبوو بۆ کڕین و فرۆشتن. ئیتر بەوجۆرە خەونی داگیرکاران هاتە دی و کەس نەیدەوێرا بە شیلی بڵێت وڵاتی عەقڵ شاشەکان یان گۆڕستانی ئیسپانییەکان. هەروەها شاری بالدیبیاش دروست کرا. ئەم ناوە لەسەر پێداگریی سەرکردەکانی سوپا بوو نەک لەبەر لەخۆباییبوونی حاکم. دروشمەکەشی هەر ئەوەی دەردەبڕی: «ڕووبار و شارێک لە زیو». سەربازەکان دەیانگێڕایەوە کە لە نێو زنجیرە شاخەکاندا شاری بەناوبانگی قەیسەرەکان هەیە کە هەمووی لە زێڕ و بەردی گرانبەهایە

و ژنە جوانەکانی ئەمازۆنی دەیپارێزن، واتە هەمان ئەفسانەکەی ئەڵدۆرادۆ، بەڵام پێدرۆ پیاوێکی ڕاستیناس بوو کات و سەربازی لە پێناو بەدواگەڕانی ئەو شارە بە خەسار نەدا.

شیلی کۆمەکی سەربازی جۆراوجۆری لە ڕێگەی وشکایی و دەریاوە بۆ دەهات، وەلێ بەشی ئەوەی نەدەکرد ئەو هەموو زەوییە فرەوانەی پێ داگیر بکەیت لە دەم کەنارەکان و دارستان و نێو شاخەکان. بۆ ئەوەی لەکن سەربازەکانی خۆشەویست بێت، حاکم وەک بەڵێنی پێ دابوون زەوی و هندییەکی زۆری دانێ، وەلێ دیارییەکان هەر قسە و هیوای شاعیرانە بوون، ئەو زەوییانە هێشتا بەیار بوون و هندییەکانیش سەرسەخت. ئاخر تەنیا بە زەبری هێز ئەوانە ملیان دەدایە کار. پێدرۆ قاچی چاک بووبووەوە لەگەڵ ئەوەش ئازاری هەر مابوو، وەلێ دەیتوانی سواری ئەسپ ببێت. بەبێ پشوودان لەگەڵ سوپا بچووکەکەی بە بەرینایی خوارووداا دەسووڕایەوە و ناو دارستانە شێدار و تاریکەکانی دەپشکنی لە ژێر ئەو گومبەتە سەوز و بەرزەی کە لە تێکپەڕینی لقی درەختەکان دروست دەبوو و بە جوانی درەختی ئەراوکانیای ڕزابووەوە کە بەرەو ئاسمان بە ئەندازەیەکی ئاڵۆز گەردەنی هەڵکێشابوو. سمی ئەسپەکان گیای بۆنداری دەشێلا و سوارەکانیش بە شمشێرەکانیان ڕووەکی چڕی سەرخەسیان دەبڕی و ڕێگەی خۆیان دەکردەوە کە هەندێ جار نەدەکرا لێی بپەڕنەوە. لە گۆمەئاوی سەهۆڵاوییان دەدا کە چۆلەکەکانی سەر لێواری بەستبوویان. ئەوە هەمان ئەو ئاوەیە کە دایکانی مابۆچی کۆرپەڵە تازەبووەکانیان لێی هەڵدەکێشن. دەریاچەکان بە هۆی شینی ئاسمانەوە ئاوێنەیەکی بێگەرد بوون، ئەوەندە مەندیش بوون کە دەتوانی بەردی بن ئاوەکە بژمێریت. جاڵجاڵۆکەش تەونۆکەی درەشاوەیان بە نمی خوناو لە نێو داربەڕوو و ڕەیحانە و بندق دەهۆنییەوە. باڵندەی دارستانیش بە کۆمەڵ وشت و هەستیارن: کەو، بولبول، ڕەشۆڵە هەتا دارکونکەرەش کە بە ڕیتمێکی ڕێک تاق – تاق دەنگ لە قەدی دارەوە دێنێت. تێپەڕینی سوارەکان چەشنی هەور پەپوولەکان بە ئاسمان دێخن و ئاسکەکانیش وەک ئەوەی

سەلاویان بسێننەوە سەریان بەردەدەنەوە. تیشکی خۆر لە نێو لق و پۆپی دارەکان تێ دەپەڕێ و سێبەرێک لە دیمەنەکە دەنەخشێنێ. لە خاکەوە تەم هەڵدەستێ و بە هەناسە سیحراوییەکانی هەموو دنیا دادەپۆشێت. باران و دیسان باران، ڕووبار، گۆماو، تاڤگەی سپی کەفدار، جیهانێک لە شلەکان. لە قووڵایی ئاسۆدا هەمیشە شاخە سەر بە مەندیلەکان و ئەو گڕکانانەی کە دووکەڵیان لێ بەرز دەبێتەوە و هەورە کۆچبەرەکان دەبینرێن. ڕوحی بالدیبیا لە جەستەی دەردەچێت و بەو لقە بەرزانەوە بە هەڵواسراوی دەمینێتەوە کە قەوزە دای پۆشیون و چەشنی مەخمەڵێکی نایاب. ئەمە جەنەتی سەر ڕووی زەمینە، بەهەشتێکی تەواوە. ئەو هەڵمەتبەرە بە دوو چاوی ئاوساوەوە دەڕوا و ئەو وڵاتە دەدۆزێتەوە کە زەویش لەوێ کۆتایی دێت: شیلی.

ڕۆژێکیان کاتیک لەگەڵ سەربازەکانی بە نێو دارستانەکەی درەختی بندقدا دەڕۆییشت، لە بەرزایی لقە تێکپەڕیوەکان چەند پارچە زێڕێکی گەورە کەوتە خوارەوە. سەربازەکان بەو شتە سەیرەیان باوەڕ نەکرد، بەپەلە لە ئەسپەکانیان دابەزین و پەلاماری تەنە زەردەکانیان دا، بالدیبیاش کە وەک سەربازەکان واقی وڕمابوو هەوڵی دەدا فەرمان بداتە سەربازەکانی. ئەوکاتەی ئەوان لەسەر زێڕەکە دەمەدەمیان بوو، سەد تیرهاوێژی مابۆچی گەمارۆی دابوون. لاوتارۆ پێشتر جەنگاوەرەکانی فێرکردبوو کە تیرەکانیان ئاراستەی کوێی جەستەی دوژمنەکانیان بکەن کە بە زرێ دانەپۆشراوە. لە ماوەی کەمتر لە دە خولەک ئەو دارستانە پڕ لە کوژراو و بریندار بوو. بەرلەوەی زیندووەکان کاردانەوەیەکیان هەبێت، مابۆچییەکان بە هەمان کڕی و بێدەنگی لە ماوەی چەند چرکەیەکدا خۆیان بزرکردەوە. دواتر بەدیارکەوت ئەو داوە هەر بەردەکانی نێو ڕووبارەکەنە و بە چینێک ئاوی زێڕ بەرگدار کراون.

دوای چەند حەفتەیەک دەستەیەکی تری ئیسپانییەکان لەو ناوچەیەدا دەگەڕان و گوێیان لە دەنگی ژنان بوو. سەربازەکان خێرا بە ئەسپەکانیان بەرەو لای دەنگەکە چوون و ڕووەکە تێکئالاوەکانی سەر ڕێگەی خۆیان دەبڕییەوە و پاش کەمێک خۆیان لە بەرانبەر دیمەنێکی زۆر دڵڕفێن دۆزییەوە:

کۆمەڵە کچێک لە ڕووبارەکە خۆیان دەشۆن و هەریەکە چەپکە گوڵێکی بە سەرەوەیە و ڕووتوقووت تەنیا پرچە درێژ و ڕەشەکانیان جەستەیانی پۆشیوە. ئەو فریشتە ئەفسانەییانە خۆیان دەشۆری و هیچ ترس و باکیان بەو سەربازانەوە نەبوو وەختێ تانیان لە ئەسپەکانیان دەدا و بە هاواری سەرسامبوون و خۆشی ویستیان لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە. وەلێ ئەو ڕیشدارە پڕ لە ئارەزووانە زۆر نەڕۆیشتن کە ئەسپەکانیان لە نێو زەنەکی بنەوەی ڕووبارەکە تا بن تەنگەیان کەوتنە ناوییەوە و چەقین. سوارەکان دابەزین تا ئەسپەکانیان ڕاکێشنەوە سەر وشکایی، بەڵام بە هۆی زرێیە قورسەکانیان دەستەوەستان مان و ئەوانیش لە نێو زەنەکەکە گیربوون. ئا لەو کاتەدا تیرهاوێژەکانی لاوتارۆ بۆیان دەرکەوتن و تیربارانیان کردن، کچە ڕووت و جوانەکانی مابۆچیش لەوبەری ڕووبارەکە لە خۆشی ئەو کوشتارە ئاهەنگیان دەگێڕا.

بالدیبیا بۆی ئاشکرابوو کە لە بەرامبەر سەرکردەیەکدایە لێهاتوویی لەم کەمتر نییە و خاڵی لاوازی ئیسپانییەکان دەزانێت، وەلێ زۆر خۆی نیگەران نەکرد و لە سەرکەوتن دڵنیا بوو. ئاخر جەنگاوەرە مابۆچییەکان هەرچەند ڕاهێنانیان لەسەر کوشتار و فێڵەکانی شەڕ کردبێت، ناکرێ لەگەڵ توانادارى ئەفسەر و سەربازەکانی ئەم بەراورد بکرێن. دەیگوت ئەمە تەنیا مەسەلەی کاتە و هەرێمی ئەراوکانیا دەبێتە موڵکی ئەم. زۆری نەبرد ئەو ناوە فێربوو کە هەموو دەیانگوتەوە: لاوتارۆ، ئەو سەرکردەیەی کە وێرای بەرەنگاری ئیسپانییەکان ببێتەوە. قەت بە خەیاڵی نەدەهات ئەو سەرکردەیە فیلیپی کۆنە سەرکاری خۆی بێت. تا ڕۆژی مردنی ئەو شتەی بۆ ئاشکرا نەبوو. بالدیبیا لە گوندە تازەکانی ئیسپانییەکان دەوەستا و وورەی بەرز دەکردنەوە و بە گوتارە پڕ لە جۆشەکانی هانیدەدان و ئومێدی پێ دەبەخشین. خاتوو خوانا خێمێنسیشی لەگەڵدا بوو وەک چۆن پێشانەکە هاوڕێیەتیم دەکرد بۆ ئەو جۆرە شوێنانە، وەلێ لەو ئانەدا ماریا دی ئێنسیۆ لە سانتیاگۆ خەفەتی دەخوارد. حاکم نامەی بۆ پاشا ڕەوان دەکرد و دڵنیای دەکردەوە کە

وەحشییەکان ڕێزی لێ دەنێن و ئاینی مەسیحییان قبوڵ کردووە، ئەمیش دەستی بەسەر ئەو خاکە بە پیت و جوانە داگرتووە و هەر ئەوەندەی پێویستە پیاو و ئەسپی بۆ ڕەوان بکات. ناوە ناوە داوای ڕێزلێنای تازەی لێ دەکرد، وەلێ ئیمپراتۆر ئەو داخوازییانەی پشتگوێ دەخست.

باستینی کە بووبووە ڕێبەری ئەو ئۆستوڵەی کە لە دوو کەشتی کۆن پێکهاتبوو، سەر تا خوارووی لێوارەکان دەگەڕا و هەمیشە لەگەڵ ڕەوتە توندەکان و شەپۆلە ڕەشە تۆقێنەرەکانی دەریا و بایە تیژ و چارۆگدڕێنەکان لە ململانێدابوو و دەیویست لە دوای کەناڵی نێوان ئەو دوو ئۆقیانووسەدا بگەڕێت. بەڵام دەریاوانێکی تر لە ساڵی ١٥٥٤ تەنگەی ماجەلانی دۆزییەوە. بالدیبیا مرد و ئەمەی نەزانی و خەونەکەشی لە فرەوانکردنی دەسەڵاتەکەی نەهاتە دی، بەڵام باستینی لە دۆزینەوەکانی بەردەوام بوو و چەندان شوێنی خەوناوی دۆزییەوە، هەروەک خۆی کە بە زمانی ئیتاڵی وەسفی دەکردن، بێ ئەوەی خۆی لە دەراوی ئەو تاوانانە بدات کە پیاوەکانی بە ئەنجامیان دەگەیاند، بەڵام خەبەری ئەو تاوانانە پاشان زانرا. هەواڵگرەکەی باستینی دەیگێرایەوە کە دەریاوانەکان بە پێشوازییەکی گەرم لەلایەن دانیشتووانە ڕەسەنەکان بەخێرهێنران و گەلێک خواردن و دیارییان پێشکێشکردوونە، وەلێ دەریاوانەکان بە هەڵکوتانە سەر ژنەکانیان و کوشتن و دیلکردنی پیاوەکان وەڵامیان دانەوە. دواتر دیلە کۆتکراوەکانیان بردە شاری کۆنسیپسۆن و وەک گیانداری دڕندە هەڕاجیان کردن. بالدیبیا پێی وابوو کە ئەم ڕووداوەش وەک ئەوانی تر شایەنی ئەوە نییە مەرەکەب و کاغەزیان پێ خەسار بکرێت و قەت لە نامەکانیدا بۆ پاشا ئەو شتانەی نەدەنووسی.

سەرکردەکانی تر بەو دۆڵەدا بەسەر پشتی ئەسپەکانیانەوە دەهاتن و دەچوون و بە زنجیرە شاخەکان دەکەوتن و لە ناو دارستانەکان دەگەڕان و لە دەریاچەکانیان دەدا، بەم ڕەفتارانەیان لەو ناوچە جوانانەدا ئامادەیی خۆیان بۆ زەبروەشاندن بڵاو دەکردەوە. لە وردە پەلامارەکانی تاقمە پەرت و بڵاوەکانی مابۆچییەکان ڕاهاتن، بەڵام لاوتارۆ بەو پەڕی وریاییەوە لە

ئامـــادەســـازیدا بـوو لە قـــووڵایی خــاکی ئەراوکــانیــا، نـەیدەویست هێــزی ڕاستەقینەی خۆی ئاشکرا بکات. میشیمالۆنکۆش لە یەکێک لە شەڕەکانی لە دژی لاوتارۆ کـــــوژرا و هەندێک لە جـــــەنگاوەرەکــــــانی هاتنەوە ڕیزی هاونیشتمانەکانی خۆیان، وەلێ بالدیبیا توانیبووی زۆربەیان لە کنە خۆی بهێڵێتەوە. حاکم پێداگریی لەسەر بەردەوامبوون لە داگیرکردنی زێتری خـواروو دەکـرد، وەلێ هەر شـوێنێکی تازەی دەگـرت دەبووە هۆی لاوازبوونی دەســەڵاتەکـەی، چونکە دەبوو لەو شـوێنانە کـۆمـەڵێک سـەرباز بۆ پاســەوانی خەڵکەکە بجێ بێڵێ و هەندێکیش بۆ دۆزینەوە و سزادانی مـابۆچییـەکان و دزینی مـاڵات و خـۆراک بەکـار بێنێت. سـوپاکـەی بەسـەر چەند کـۆمـەڵێکی بچـووک دابەش بووبوو و نەدەکرا بۆ ماوەی چەند مـانگێک پەیوەندییـان لە نێوان بەردەوام بکات.

لە زستانی سەختدا، داگیرکارەکان ڕوویان لە شارە تازە دروستکراوەکان دەکرد، چونکە نەیاندەتوانی بەو بارەگرانەی تەقەمەنییەوە لە هەرێمە زۆنگاو و پڕ لە زەنەکـەکـان لە ژێر بارانـی نەبڕاوە و شـەختـەی سـبـەینان و ئەو بایە ساردەی زریان بسووڕێنەوە کە ئێسقانی سڕ دەکرد. ئاخر هەر لە مـانگی ئەیارەوە تا ئەیلول ئەو هەرێمە دەچێتە بارێکی وەستاو، هەموو شتێک بێدەنگ دەبێت، تەنیـــا دەنگی ورش و هـۆڕی ئاوی ڕووبار و ترپە و چرپەی باران و ڕەشەبای گەوارە و برووسک دێت کە بێدەنگی سڕبوونی زستانە دەشکێنن. لە ماوەی ئەو بێدەنگی و تاریکییە ناوەختەدا، شەیتانەکان گەمارۆی بالدیبیا دەدەن و بە ئەندێشـە و سـەرزەنشـتکردنی ویژدان ڕوحی دەخنکێ. ئاخر ئەو وەختەی بە شمشێری کەلەکەیەوە لەسـەر پشتی ئەسپەکەی نەبێت، تاریکی ڕوحی داگیر دەکات و بڕوا بەوە دێنێت کە بەدبەختی بە دواوەیەتی. ئێمە لە سانتیاگۆ گوێبیستی ئەوە دەبووین کە حاکم گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووە و زوو پیر دەبێت. پیاوەکانیشی وەک جاران کوێرانە بڕوای پێ ناکەن. بە پێی قسەکانی سیسیلیا، پێدرۆ ئەو وەختە ئەستێرەی بەرز و گەشاوەبوو کە منی ناسی، لە دوای جیابوونەوەشی لە من وردە وردە نزم بووەوە. ئەمە تیورێکی

ترسناکە، چونکە من نامەوێ بەرپرسیاریێتی سەرکەوتنەکان و گوناهی ژێرکەوتنەکانی ئەو لە ئەستۆ بگرم، ئاخر هەموو کەسێک خاوەنی چارەنووسی خۆیەتی. بالدیبیا مانگە سارد و سەرماکانی لە ماڵەوە بەڕێ کرد و خۆی لە عەبایە خورییەکەی دەئاڵاند و بە مقەرە ڕەژووە گەشاوەکەی بەردەمی خۆی گەرم دەکردەوە و نامەکانی بۆ پاشا دەنووسی. خوانا خێمێنسیش چەند پەرداخێک لەو شەرابەی دەدایێ کە لە گیایەک دروست دەکرا تامەکەی نەختێک تاڵ بوو، لێ بۆ بەرگەگرتنی ئازاری کۆنە برینەکەی یارمەتی دەدا.

لەو کاتەدا جەنگاوەرە نەبینراوەکانی لاوتارۆ، لە نێو دارستانە چڕەکان چاوەدێری ئیسپانییەکانیان دەکرد، وەک چۆن سەرۆکی سەرۆکەکان - نیدۆلتۆکی - فەرمانی پێ دابوون ئاوا.

. . . . . .

لە ساڵی ١٥٥٣ دا، بالدیبیا بۆ سانتیگۆ سەفەری کرد و نەیدەزانی ئەمە دوا سەفەریەتی، وەلێ گومانی ئەوەشی بە خەیاڵدا دەهات، چونکە خەونە ڕەشەکانی دیسان ئازاریان دەدا. ئەو وەک جاران خەونی بە کوشتارگەوە دەبینی و لە نێو ئامێزی خوانا لە خەو ڕادەجڤری، من چۆن ئەمەم دەزانی؟ چونکە بە هاڕاوەی داری - لاوتی - چارەسەری خۆی دەکرد بەڵکە ئەو کابووسانە وازی لێ بینن. لەم وڵاتە هەموو شتێک دەزانرێت. کاتێ گەیشتە شار بینی خەڵکەکە بەبۆنەی هاتنی ئاهەنگ دەگێڕن، شارێکی جوان و پێشکەوتوو و ڕێکوپێک بوو، چونکە ڕۆدریگۆ بە حیکمەتەوە شوێنی ئەوی گرتبووەوە. ماوەی دوو ساڵ بوو باری ژیانمان باشتر بووبوو. خانووەکەی ڕۆدریگۆ لە ژێر سەرپەرشتی مندا دووبارە دروستکرایەوە و بووە خانووێک کە شایەنی یاریدەری حاکم بێت.

ئیزابێل گیان، من حەزم دەکرد خانووێکی تر لە دووری چەند شەقامێک لەولاتر دروست بکەم بۆ ئەوەی لە کاتی شووکردنت پێشکێشی تۆی بکەم. لە نێو کێڵگەکانیشمان چەند خانووێکی گەورە و خۆشمان هەبوو و ساپیتەیان بەرز و ڕێڕە و باخچەی داری بەردار و ڕووەکی پزیشکی و گوڵیان تێدابوو.

حەوشی سێیەمینیشی تێدابوو بۆ مالات و پەلەوەرەکانمان تا نەدزرێن. هەولمدەدا ژووری باش بۆ خزمەتکارەکان ئامادە بکەم: چونکە من لەوە تووڕە دەبم کە دەبینم شارنشینەکان شوێنی چاکتر لە هی خزمەتکارەکان بۆ ئەسپەکانیان دروست دەکەن. هەروەها چونکە قەت ڕەچەلەکی نەدارای خۆم لە بیر نەدەکرد، زۆر بە ئاسانی لە خزمەتکارەکان دەگەیشتم کە هەمیشە بەوەفابوون لەگەلم. ئەوان لەو سالانەدا بەشێکبوون لە خانەوادەکەی من، کاتالینا کە هێشتا بە تاقەت و لەسەرخۆ بوو، ئەرکی بەڕێوەبردنی مالەوەی لە ئەستۆ گرتبوو، وەلێ هەمیشە چاوێکم لێی بوو نەبادا سووکایەتی بە کارەکەرەکان بکات. من ڕۆژانە بە هۆی سەرقالبوونم بە کاری جۆربەجۆر و دروستکردنی خانوو و یارمەتیدانی ڕۆدریگۆ لە کاروباری حوکمکردن، پێویستیم بە چەند سەعاتێکی تر هەبوو بۆ ڕاپەڕاندنیان، سەرەڕای ئەو کارە چاکەخوازییانەی کە هەمیشە تەواو نەدەبوون. ئاخر ڕیزی هندییە هەژارەکان کە ڕۆژانە خواردنم پێ دەدان، بە دەوری گۆڕەپانەکەدا دەسووڕایەوە. کاتالینا زۆر سکالای لە دەست قەرەبالغی و پیسی دەکرد، بۆیە بە ناچاری لە شەقامێکی تر چێشتخانەیەکم کردەوە. دۆنیا فلۆر لە پەنەماوە بە کەشتییەک گەیشتە شیلی، ئەوە ژنێکی زنجی سەنیگالی بوو و لە چێشتلێنان زۆر بەهرەمەند بوو، ئیتر بەرپرسیارێتی چێشتخانەکەی گرتە ئەستۆ. تۆ دەزانی لەگەل کێمە ئیزابێل، ئەو کەسە هەمان ئەو ژنەبوو کە دەتناسی. ئەو بە پێخواسی هاتە شیلی، ئەمڕۆکەش جلی حەریری لەبەردایە و لە خانووێکدا دەژی کە ناودارترین ژنانی سانتیاگۆ ئیرەیی پێ دەبەن. چیشتەکانی ئەوەندە خۆش لێ دەنا کە ئیسپانییەکان لەگەلی دەستیان بە سکالا کرد، چونکە هندییەکان خواردنی بە لەزەتتر لەوان دەخۆن؛ ئەو کاتە دۆنیا فلۆر بیری بۆ ئەوە چوو کە دەتوانین خواردنی نایاب و چێژدار بە ئیسپانییەکان بفرۆشین و بە پارەکەشی خواردن بۆ هندییە هەژارەکان دابین بکەین و پارەشمان چەنگ بکەوێت. ئیتر بەو جۆرە دەولەمەند بوو و کەوتە کامەرانترین ساتی ژیانی خۆی، بەلام کێشەکەمان چارەسەر نەبوو، چونکە هێشتا سەندووقەکانی ئەو

پڕ لە زێڕ نەبووبوون کە سوالْکەرەکان گەڕانەوە بەردەرگەی ماڵەکەم و چاوەڕێی خواردن بوون. تاکو ئێستاش ئێمە هەر لەو بارەدا دەژین.

کە زانیمان بالدیبیا لە ڕێگەی هاتنەوەیە بۆ سانتیاگۆ، هەستم کرد ڕۆدریگۆ نیگەرانە. ئاخر ئەو نەیدەزانی چۆن کاروبارەکان هەڵسووڕێنێ و کەسیشی لێ تووڕە نەبێت؛ ئەو لە نێو پایەی ڕەسمی و وەفاداریی بۆ هاوڕێکەی لە لایەک و ئارەزووکردن بۆ پاراستنی من لە لایەکی تر، تیامابوو. دوو ساڵمان بەڕێ کرد بێ ئەوەی کۆنە ئەویندارەکەی خۆم ببینم، دووری پێدرۆش بۆ ئێمە زۆر مایەی ئارامی بوو. ئاخر بە هاتنەوەی ئەو من لە حاکمی دەکەوم – حاکمە ژن –، دەشمپرسی داخوا ماریا دی ئێنسیۆ لە ئاستی ئەو بارودۆخەدایە. لە زەینی مندا قەت نەیدەتوانی شوێنی من بگرێتەوە.

بە ڕۆدریگۆم گوت: من دەزانم تۆ بیر لە چی دەکەیتەوە، دڵنیا بە کە هیچ کێشەیەک لەگەڵ پێدرۆ دروست نابێت.

– ڕەنگە وا چاک بێت لەگەڵ ئیزابێل بچنەوە لادێ...

بە پێکەنینەوە گوتم: ڕۆدریگۆ، من بیر لە ڕاکردن ناکەمەوە، ئاخر ئێرە شاری منیشە. تا ئەو لێرە بێت دەست لە کاروباری حوکم وەرنادەم، وەلێ کاروباری ژیانی خۆم وەک خۆی دەمێنێتەوە. من بڕوام بەخۆم هەیە کە ئەگەر لەگەڵ پێدرۆ بەیەکتریش بگەین، چۆکەکانم نالەرزن.

– ئەی ئێنیس، هیچ چارت نییە کە زۆر یەکتر دەبینن.

– نەک هەر ئەوە، بەڵکو لەسەر شەرەفی ئەو داوەتێکی گەورەش ساز دەکەین.

– دەڵێی داوەت؟

– بەڵێ، ئاخر ئێمە لە شیلی دەسەڵاتی دووەم پێک دێنین، بۆیە پێویستە ڕێزی لێ بگرین. ئەو و دۆستەکەی ماریا دی ئێنسیۆ بانگ دەکەین، ئەگەر حەزدەکەی ئەویتریش بانگ دەکەین. بەڵام توخوا ناوی چییە؟

ئەو بەدەم و چاوێکی پڕ لە گومانەوە کە بە هۆی هەڵوێستەکانی تووشی

بووبوو، سەیرێکی کردم، بەڵام خێرا ماچێکم لێی کرد و دڵنیام کردەوە کە هیچ جۆرە شوورەییەک لە گۆڕێدا نییە. ڕاستییەکەی من چەند ژنێکم ڕاسپارد چەرچەف و خوان ئامادە بکەن، لێ لەگەڵ دۆنیا فلۆر بۆ ئەو بۆنەیە ڕێککەوتین کە ئەو خواردنانە ساز بکات کە نایابن بە تایبەتی ئەو جۆرە حەلوایانەی کە حاکم هەمیشە ئارەزوویان دەکات. کەشتییەکان شەکر و دۆشاویان دەهێنا کە لە ئەورووپا زۆر نرخداربوون، وەلێ هێشتا لە شیلی نرخیان گرانتربوو؛ بەڵام ئێمە نەماندەتوانی بە دەستی خۆمان ئەو هەموو چەشنە حەلوایانە لەگەڵ هەنگوین ئامادە بکەین، بۆ بە ناچاری دەبوو بەهەر نرخێک بێت بیانکڕم. بۆ سەرنجڕاکێشان و سەرسامکردنی میوانەکان دەمویست جۆرە قاپ و قاچاغێک بەکار بێنم کە کەس پێشتر لە پایتەختەکەمان نەیبینیبێت. کاتالینا بە بیری هێنامەوە و گوتی: گەورەم، بۆ تۆ واچاکترە باش بیر لەو شتانە بکەیتەوە کە لە پێش میوانەکان دای دەنێیت.

فەرمانم پێی دا کە کراسە هەرە جوانە حەریرییە ڕەونەقدارە ڕەنگ مسییەکەم بۆ ئوتی بکات کە تازە لە ئیسپانیاوە بۆم هاتبوو و لەگەڵ ڕەنگی پرچم دەهات... دەباشە ئیزابێل، خۆ پێویست ناکات پێت بڵێم کە من ئەو وەختە وەک ژنانی عەرەب و قەرەجەکان پرچی خۆم لە خەنە دەنا، چونکە تۆ ئەوەیان دەزانیت. کراسەکەم نەختێک بەبەرم تەسک بوو، ئەمە ڕاستە، ئاخر ژیانی ئاسوودەیی و خۆشەویستی ڕۆدریگۆ، ڕوح و جەستەیان تەڕ و پاراوتر کردبووم، وەلێ بەهەرحاڵ لە ماریا ژنانەتر دیاربووم کە ئەو وەک سۆزانییەکان جلی دەپۆشی، یان لە کارەکەرە هۆشیارەکەی کە نەیدەتوانی لە شۆخیدا خۆی لە قەرەی من بدات. کچم پێ مەکەنە، دەزانم ئەو قسانەم سووکایەتییەکە لەلایەن منەوە، بەڵام بەڕاستی ئەو دوو ژنە ئاستییان زۆر لە خوارەوە بوو.

پێدرۆ دی بالدیبیا هاتنەوە نێو شاری خۆی بە سەرکەوتوویی، بە ژێر چەندان کەوانەدا ڕێکخست کە لە گوڵ و چڵی دار دروستکرابوون و لە نێو پێشوازی گەرمی ئەنجوومەنی شار و هەلهەلەی خەڵکەکە. ڕۆدریگۆ بە خۆی و ئەفسەر و سەربازەکانی بە زرێی بریقەدار و کڵاوی ڕێشداریانەوە لە

گۆڕەپانەکە ڕیز بووبوون. ماریا دی ئێنسیۆ لە بەردەرگەی ئەو ماڵە وەستابوو کە پێشانەکە ماڵی من بوو و چاوەڕێی گەڕانەوەی خۆشەویستەکەی بوو، بە پێکەنین و نازی پڕ لە مەکرەوە دەچەمایەوە. ئای لەو ژنە بێزەوەرە! بەڵام من خۆم دیارنەخست و لە دوورەوە لە یەکێ لە پەنجەرەکان چاوەدێری بارودۆخەکەم دەکرد. پێدرۆم واهاتە بەرچاو کە لە کتوپڕێکا تەواو بە ساڵدا چووە، جا نازانم ئەوە لەبەر لە خۆباییبوونیەتی یان لەبەر قەڵەوییە یاخۆ ماندوویێتیی ڕێگە.

ئەو شەوە حاکم لە نێو ئامێزی خۆشەویستە ئەویندارەکەی پشووی دا، ڕۆژی دواتر وەک خووی هەمیشەیی، بە حەماسەتەوە دەستی بە کارەکانی کرد، ڕاپۆرتێکی ورد و درێژی لە ڕۆدریگۆوە وەرگرت کە لە بارەی شار و دانیشتووانەکەی ئامادە کرابوو. بە حسێبی ئەمینداری گەنجینەدا چووەوە و گوێی لە داخوازییەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی گرت. یەک بە یەک وەڵامی داواکارییەکانی ئەو خەڵکەی دایەوە کە بۆ پاڕانەوە و جێبەجێکردنی دادوەری هاتبوون. پێدرۆ بووبووە پیاوێکی خۆپەرستی، بێئارامی، لووتبەرزی، زۆردار، لەگەڵ بچووکترین ڕەخنە هەڵدەچوو و هەڕەشەی دەکرد. وەک جاران گوێی لە ئامۆژگاری نەدەگرت و ڕاوێژی کەسی نەدەویست و وەک پاشایەکی ڕەها ڕەفتاری دەکرد. ئەو پیاوە کاتێکی زۆری لە جەنگ بەسەربردبوو و هێزەکانی بەبێ کێشە ملکەچی بوون. وا دیاربوو ئەویش بە هەمان شێوە هەڵسوکەت لەگەڵ ئەفسەر و سەربازەکانی دەکات، وەلێ پەیوەندی لەگەڵ ڕۆدریگۆ هاوڕێیانە بوو، چونکە دەیزانی ئەو سەرکردەیە ناتوانێ هیچ سەرزنشتییەک قبوڵ بکات. بە پێی قسەکانی سیسیلیا کە هیچ شتێکی لێ ڕەت نەدەبوو، ئەویندار و کارەکەرکانیشی زۆری لێ دەترسان، چونکە بالدیبیا خەم و ناتەواوییەکانی خۆی بەسەر ئەواندا هەڵدەڕشت هەر لە ژانکردنی ئێسقانەکانی تا دەگاتە بێدەنگی پاشا کە وەڵامی نامەکانی نەدەدایەوە.

ئەو داوەتە لەسەر شەرەفی حاکم زیاتر لە هەموو ئەو داوەتانەی کە بە درێژاییی ژیانم کردبووم، بەرچاوانەتر و دنیاییتربوو. تەنیا ئامادەکردنی

لیستی ناوی بانگهێشتکراوەکانیش ئەرکێکی زەحمەت بوو، ئاخر ئێمە لە توانامـاندا نەبوو پێنج سـەد خـانەوادەی ئیسـپـانی کـە لە پایتـەختن، جێ بکەینەوە. زۆر لـە کـەسـایەتییـەکان بیتاقـەی داوەتی نەگەیشتبـووە دەستی. سانتیاگۆ لە نێو قسـە و تانە و پلاری خەڵکدا هەڵدەچوو و هەمـوو دەیانویست ئامادەی ئەو داوەتە بن. چەندان دیاریم بۆ دەهات کە چاوەڕێی نەبووم و لەگەڵ نامـەیەکی یەکجـار زۆری دۆستایەتی لەو کـەسانەوە گـەیشتـە دەستم کـە ڕۆژی پێشتر خۆیان تێم نەدەگەیاند. ئێمە دەبوو لە سـەرکردە کۆنەکانەوە دەست بە ئامـادەکـردنی لیستـەکـە بکەین کـە لە سـاڵی ١٥٤٠ لەگـەڵ ئێمـە بۆ شـیلی هاتبـوون. هەروەها فـەرمـانبـەرەکـانی تاج و ئەنجـوومـەنی شـارەوانیش لە پێشـەوەی لیسـتـەکـە ناویان بنووسـرێت. هندییـە هاریکارەکـانمان لە نێـو کێڵگەکانەوە هێنا و جلی جوانی وەک یەکمـان کردە بەریان، وەلێ نەمـانتوانی پێڵاویان لـە پێ بکەین، چونکە فـێر نەبووبوون. بە سـەدان مۆم و چرای زەیت ئەو ناوەمـان ڕووناک کردەوە بە داگیرسـانی ڕاتینگی سنۆبەر هەواکـەمـان بۆندار کـرد. مـاڵەکەمـان زۆر جوان و سـەرنجـڕاکێش دیارکـەوت و لـە هەمـوو لایەک مـەرکانەی پڕ لە گوڵ و قـەفـەسی باڵندە بوو و چەندان مێز کە میوەی جـۆراوجـۆری ئـەو وەرزەیان لەسـەر دانرابوو. ئێمـە بادەی نایابی پێرۆیی و جۆرە بادەیەکی شیلیمـان دانابوو کە من و ڕۆدریگۆ خـەریکی دروسـتکردنی بووین. سی کەسمـان لە داوەتکراوەکان لەسەر خوانە سـەرکییەکە دانیشاند و سـەدی تریش لە هۆڵەکانی تر و لە حـەوشـەکـە. ئەو شـەوە لە جـیـاتی ئەوەی لەسـەر چیمـەنەکـە دانیـشم کـە لە ئیـسـپـانیـادا باوە، بڕیارم دا وەک ژنە فەڕەنسییەکان کە ئەوهام بیستبوو، لەگەڵ پیاوەکان لەسەر خوانەکە دانیشم. چەندان بەراز و بەرخـمـان سـەربڕیبـوو بۆ ئەوەی ژەمـێکی هەمـەچەشنە بڕازێنینەوە. سـەرەڕای ئەوەش گـۆشـتی باڵندە و مـاسـی کـە بە زیندوێتی لە دەریاوە هێنابوومـان. مـێزێکی تایبـەتمان بۆ حـەلوا و کێک و شـیرنەمـەنی و کرێم و حـەلوای شـیـر و میوە دانابوو. بایەکە بۆنی ئـەو خوانەی بۆ ناو شـار دەبرد: سیر، گۆشتی برژاو، کرامێلا. بانگکراوەکان بەوپەڕی ڕێکپۆشییەوە

هاتبـــوون، لەگـــەڵ ئەوەی ئـەوان بەدەگـــمـــەن جلـه نایابەکـــانی خـــۆیـان لە سـەندووقـەکانیـان دەردەهێنا. بێگومان سـیـسـیلیاش کە جـوانتـرین ژن بوو بە کراسـە مـەیلەو شینەکەیەوە، کەمەربەندێکی زێڕی لە ناوقەدی بەسـتبوو و وەک شازادەیەکی ئینکایی بە خشڵەکانی خۆی ڕازاندبووەوە. کوڕێکی زنجی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە لە دواوەڕا بە باوەشـینەیەکی ڕیشـدار باوەشێنی لێی دەکرد و سـەرنجی هەر هەمـووانی بۆ خـۆی ڕاکـێـشـابوو. بالدیبـیـاش مـاریا دی ئێنسیۆی لەگەڵدابوو کە ئەویش دیمەنی ناشیرین نەبوو و دەبێ منیش پێ لەو ڕاسـتییە بنێم، بەڵام دۆسـتـەکە تری نەهێنابوو، چونکە هێنانی هەردووکیان پێکەوە وەک زللەیەک بوو بە بناگوێی کۆمـەڵگە بچووکە خۆبەزلزانەکەی ئێمـە بکەوێت. دەستی منی ماچ کرد و بە قسەی گونجاو بۆ ئەو جۆرە بۆنانە، منی دواند. من واهاتە بەرچاوم کـە نیگاکـانی تێکەڵەیـەکن لـە سـوێبـوونەوە و غـیـرەکـردن، وەلێ ڕەنگە ئەو سـەرنجـە هەر لە هزری مندا بووبێت. وەخـتـێ لەسـەر خـوانەکە دانیـشـتین، بەرداخـەکـەی بەرز کـردەوە تا لە خـۆشی من و ڕۆدریگۆ نۆشی بکات کـە خـاوەنی داوەتەکـەین. پاشـان گـوتارێکی کـورت و کاریگەری پێشکێش کرد و تێیدا بەراوردی نێوان قۆناغی برسێتی سەختی سانتیاگۆی بەر لە دەساڵ لەو وەختە و هەرزانی و کرانەوەی ئێستای کرد.

– ئەی دۆنیا ئێنیس، ئەو داوەتە شاهانایە تەنیا شتێکی کەمە...

وەڵامیم دایەوە: ئەی خاوەن شکۆ، لە قسەکردن پەلە مەکە.

ئا ئیـزابێل، لەو سـاتەدابوو کـە تۆش هـاتیـیـە ژوورێ، جلی ئۆرگنزات لەبەردابوو و گـوڵ و تیلمـە قـومـاشـی ڕەنگدارت لەسـەرت بەسـتـبـوو و دەورییـەکیشت بەدەستـەوە بوو کە بە فۆتەیەکی کەتانی سپی داپۆشرابوو و کولێرەنانـەکەی ناویت بۆ حاکم هێنا. ئامادەبووان بە چەپڵەیەکی قاییمـەوە پێشـوازییان لەو بیرۆکەیە کرد و ڕۆژانی گرانییان هاتەوە بیر، ئەو وەختـەی کولێرەمان بە هەر شتێک دروست دەکرد کە لەبەردەستمان بووایە، تەنانەت بە کەپەکیش.

لە دوای عـیـشـایێ ئاهـەنگی سـەمـا سـاز کـرا، وەلێ بالدیبـیـا کـە جـاران

سەماکەرێکی قەشەنگ بوو و گوێ سووک و بار ئارامبوو، ئەوجارە بە بیانووی ئەوەی ئێسقانەکانی ئازاریان هەیە، سەمای نەکرد. هەر لە دوای ڕۆیشتنی بانگکراوەکان و دابەشکردنی خۆراکە ماوەکە بەسەر ئەو هەژارانەی کە بۆ گوێگرتنی ئاهەنگەکە هاتبوونە گۆڕەپانەکە، دەرگەی ماڵەوەم داخست و مۆمەکانم کوژاندەوە، من و ڕۆدریگۆ لە ماندوویێتییان کەوتینە نێو جێگە. وەک جاران سەرم بە سینگی کردبوو و بە درێژاییی شەش سەعاتان کەوتمە قووڵایی خەوێ، بێ ئەوەی خەونان ببینم، ئەوەش بۆ من کاتێکی نەبڕاوەیە کە بەردەوام خەوزڕاو بووم.

***

حاکم سێ مانگ لە سانتیاگۆ مایەوە، لەو ماوەیەدا بڕیارێکی دا کە پێویست بوو زۆری بیر لێ بکەمەوە: خێرۆنیمۆ دی ئەڵدێرێتی ڕەوانی ئیسپانیا کرد تا شەست هەزار پێزۆی زێڕ بداتە دەست پاشا، ئەوە ئەو پێنجیەکە بوو کە وەبەر تاجی شاهانە دەکەوت، وەلێ بڕێکی زۆر کەم بوو بە بەراورد لەگەڵ ئەو بارانەی لەو کانە لە کەشتییەکان باردەکران. چەند نامەیەکیشی پێیدا ڕەوان کرد کە چەند داواکارییەکیان تێدابوو لەوانە پێدانی نازناوی مەرکیز و مەدالیای پیاوچاکی سانتیاگۆ. بالدیبیاش لەو بارەیەوە زۆر گۆڕانی بەسەر هاتبوو، ئاخر ئەو وەک جاران بە شانازییەوە گاڵتەی بە نازناو و ڕێزلێنان نەدەکرد. جگە لەوەش ئەو کە پێشتر ڕقی لە کۆیلایەتی دەبووەوە، ئێستا داوا دەکات مۆڵەتی پێ بدەن تا دوو هەزار کۆیلەی زنجی بۆ باربکەن و لە باجیش بیبەخشن. ڕاسپاردەی دووەمیشی بە ئەڵدێریتی ئەوەبوو کە سەردانی هاوسەرەکەی – مارینا دی گایتی – بکات کە هێشتا لە ماڵە کۆن و سادەکەی لە کاستوێرا دەژیا، تا هەندێک پارەی بداتێ و داوای لێ بکات بچێتە شیلی بۆ ئەوەی لە تەک مێردەکەیدا پایەی حاکمەژن وەربگرێت کە ماوەی حەڤدە ساڵ بوو نەیدیتبوو. زۆر شەیدای ئەوەبووم بزانم کە مارینا چۆن ئەو خەبەرەی وەرگرت. هەروەها بەداخەوەم کە ئەڵدێرێتی نەیتوانی بە هەواڵێکی خۆش لەلایەن پاشا بگەڕێتەوە. وەک لە بیرم مابێت بە هۆی

دواکەوتنی گەشتی دەریا و پەلەنەکردنی پاشا بۆ ئەو بریارانە، تا سێ ساڵان نەیتوانی بگەڕێتەوە. لە کاتی گەڕانەوەی ئەڵدیریتی، ئەو وەختەی لە ملەکانی پەنەما دەپەڕییەوە، تووشی نەخۆشییەکی کوشندەبوو و گیانی بەخشی. ئەو پیاوە سەربازێکی ئازا و هاورێیەکی بەوەفابوو، هیوادارم مێژوو ئەو شوێنەی پێ ببەخشێت کە شایەنیەتی. هەر لەو ماوەیەدا پێدرۆش مرد و بێ ئەوەی بزانێت کە دواجار ئەو نازناوانەی بەدەستهێناوە کە داوای کردبوو.

ئەو کاتەی مارینا داوەتی مێردەکەی بۆ سەفەری ئەو مەملەکەتە پێگەیشت، ئەو وڵاتەی وەک ڤینیسیا دەهاتە بەرخەیاڵی، جا کێ دەزانێ هۆی ئەو وێناکردنەی چییە! هەروەها بڕی حەفت هەزار و پێنج سەد پێزۆیەکەی بەدەست گەیشتبوو بۆ خەرجییەکانی. تاجێکی زێڕینی پێکڕی و جلی شاژنانەی پەیدا کرد و کۆمەڵێک خەڵکی دەوروبەری خۆی لە خێزانەکەی کردە هاورێی خۆی. بەڵام ئەو ژنە بەدبەختە وەختێ گەیشتە شیلی دیتی بێوەژن کەوتووە؛ بۆی ئاشکرابوو کە پێدرۆ بە موفلیسی ئەوی بەجێ هێشتووە، لەوەش سەیرتر ئەوەبوو برازاکانی کە ئەم زۆر کەیفی پێیان دەهات، هەموویان پاش شەش مانگ لە شەڕی هندییەکان کوژرابوون. من بە دەستی خۆم نەبوو دڵم بەو ژنە دەسووتا.

لەو ماوەیەی کە پێدرۆ لە سەنتیاگۆ بوو تەنیا چەند جارێکی کەم لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکان یەکترمان بینی کە لە هەموو لایەک خەڵکەکە بە چاوێکی پڕ لە گومانەوە سەیریان دەکردین و دەیانویست لە حاڵەتێکی تایبەتدا بمانگرن یاخۆ بە مەزەندەی خۆیان هەوڵیان دەدا هەستبزوانی ئێمە بۆ یەکتر لێک بدەنەوە. قەت نەدەکرا لەو شارەدا هەنگاوێک بهاوێژی خەڵکان لە پەنجەرەکانیانەوە چاوەدێریت نەکەن و رەخنەت لێ نەگرن. جا بۆ وەک رابردوو قسان بکەم؟ ئێمە ئێستا لە ساڵی ١٥٨٠ داینە و خەڵکیش هەروا لەسەر بەزم و قسەوقسەڵۆکی جارانن. دوای ئەوەی سەختترین ساڵانی گەنجێتیم لەگەڵ پێدرۆ بەرێ کرد، وام لێ هاتووە لە بەرامبەریدا هەست بە کەمتەرخەمییەکی سەیر بکەم. من لەگەڵ ئەودا وام دێتە بەرچاو کە ئەو

پیاوەی بە سۆزێکی گەرمەوە خۆشم دەویست، کەسێکی تربوو. بەر لە ئاشکراکردنی گەڕانەوەی بۆ خوارووی وڵات و بیرکردنەوەی لە سەردانی شارە تازەکان و درێژەدان بە گەڕانی بۆ دۆزینەوەی تەنگەی ماجەلان، گۆنزالس دی مارمۆلیخۆ هاتە لام و پێی گوتم: کچی خۆم، دەمویست پێت بڵێم کە حاکم داوای لە پاشا کردووە تا بمکەنە مەترانی هەموو شیلی.

– باوکە، ئەو هەواڵە هەموو خەڵکی سانتیاگۆ دەیزانن. ئێستا پێم بڵێ بۆ چ مەبەستێک هاتووی بۆ سەردانم؟

قەشە بە پێکەنینەوە گوتی: ئەی ئینیس، ئای بۆ ئەو جەسارەتەی تۆ!

– دە باوکە، زووکە چیت لە دڵدایە پێمی بڵێ.

– حاکم دەیەوێ بە تەنیا قسەت لەگەڵ بکات. ناشکرێ ئەو پێکگەیشتنە لە ماڵی تۆ یان هی ئەو یاخۆ لە شوێنێکی گشتی بێت، چونکە دەبێ پارێزگاری لە باری ژیانی ئێوە بکەین. من پێشنیازم کردووە لە ماڵی ئێمە چاوتان بەیەک بکەوێ....

– ئایا ڕۆدریگۆ بەمە دەزانێت؟

– ئەی ئینیس، حاکم وای پێ چاکترە کە مێردەکەت بەو شتە بچووکانە هەراسان نەکرێت.

گومانم لە قاسید و نامەکە و نهێنییەکە پەیدا کرد، بۆیە لە هەمان ڕۆژ ڕۆدریگۆم خەبەردار کردەوە تا هیچ کێشەیەکمان لە نێوان دروست نەبێ. من هەر ئەو وەختە زانیم کە ڕۆدریگۆش خەبەری هەبووە، چونکە پێدرۆ داوای لێ کردبوو کە مۆڵەتمان بداتێ تا بە تەنیا بمبینێت. بۆچی پێدرۆ دەیەوێ من ئەو شتە لە مێردەکەم بشارمەوە؟ باشە لەبەرچی ڕۆدریگۆ لەسەر ئەو مەسەلەیە قسەی لەگەڵ نەکردم؟ من بڕوام وایە پێدرۆ ویستی من تاقی بکاتەوە، وەلێ زەینم بۆ ناچێت ڕۆدریگۆ ئەو مەبەستەی هەبێت، چونکە ئەو پشت بەو جۆرە تەڵەکانە نابەستێت.

پرسیارم لە مێردەکەم کرد: ئایا دەزانی پێدرۆ دەیەوێ لە بارەی چییەوە

قسانم لەگەڵ بکات؟

– ئەی ئێنیس، ئەو دەیەوێ بۆت ڕوون بکاتەوە کە بۆچی کاتی خۆی ئەوهای ڕەفتار لەگەڵ کردی.

– ئەوە سێ ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە! ئێستا دەیەوێ بمبینێ هۆکارەکانم بۆ ڕوون بکاتەوە؟ ئەو کارە لە کنە من زۆر سەیروسەمەرەیە.

– ئەگەر حەز ناکەیت قسانی لەگەڵ بکەیت، من ڕاستەوخۆ ئەمەی پێ دەڵێم.

– باشە تۆ پێت ناخۆش نییە بە تەنیا یەکتر ببینین؟

– ئێنیس، من بڕوای تەواوم بە تۆ هەیە و هەرگیز دڵپیسیت لێ ناکەم.

– ئەی ڕۆدریگۆ، تۆ بە خەڵکی ئیسپانیا ناچیت، دەبێ خوێنی هۆڵەندی لە دەمارەکانت بسووڕێتەوە.

ڕۆژی دواتر چوومە ماڵی گۆنزالس، کە لە دوای خانووەکەی من، گەورەترین و ڕازاوەترین خانوو بوو لە سانتیاگۆ. ئاخر گومانی تێدا نییە کە سەروەت و سامانەکەی قەشە سەرچاوەیەکی ناکارای هەیە. کە چوومە ژوورەوە کابانەکەی پێشوازی لێ کردم کە ژنێکی تێرعەقڵی هندییە کیچواییەکان بوو و سەری لە دەرمانەکانی گیا دەردەچوو و هاوڕێیەکی نێزیکی خۆم بوو. ئەو ژنە ناچار نەبوو ئەوەی بشارێتەوە کە ساڵانێکە ژیانێکی مادییانە لەگەڵ مەترانی ئایندە بەسەر دەبات. چەند هۆڵێکمان بەجێ هێشت بە دەرگەی دوودەری و نەخشێنراو لێک جیاکرابوونەوە کە دارتاشێکی دەسترەنگین لە پێرۆ دروستی کردبوون. گەیشتینە ژوورێکی بچووک کە نووسینگەکەی قەشە و بەشی زۆری کتێبەکانیشی لێ بوو. حاکم بە پۆشتەیی جبەیەکی سووری تۆخ کە لە دوولاوە تلیشی هەبوو و لەگەڵ شەرواڵێکی مەیلەو سەوز و کڵاوێکی حەریری ڕەشی ڕیشداری پۆشیبوو، هاتە پێشەوە تا تەوقەم لەگەڵ بکات. کابانەکە بە کڕ و بێدەنگی چووە دەرێ و دەرگەکەی گاڵەدا. ئەو وەختە خۆم بە تەنیا لەگەڵ پێدرۆ بینی و هەستم کرد گۆناکانم دەلەرزن و دڵم بە توندی لێ دەدات، بیرم

کردەوە کە ناتوانم خۆم لەبەر نیگای ئەو چاوە شینانە بگرم کە چەندا نجار لە شیرین خەودا بژانگەکانیم ماچ کردووە. هەرچەندە پێدرۆ گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتبوو، وەلێ لە چرکەساتێک دیتم هەمان ئەو خۆشەویستەیە کە بۆ کۆتاییی جیهان بە دوایداچووم. پێدرۆ دەستەکانی لەسەر شانم دانا و بەرەو پەنجەرەکە سووڕاندمی تا لەبەر ڕووناکی بمبینێ.

هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و گوتی: ئەی ئێنیس، تۆ گەلێک جوانی! ئەوە چۆنە ئاسەواری ڕۆژگارت پێوە دیارنییە؟

هەنگاوێک کشامە دواوە تا دەستی لە شانم ببێتەوە و گوتم: تۆ پێویستت بە چاویلکە هەیە تا چاک شتان ببینیت.

– پێم بڵێ کە تۆ بەختەوەری، بۆ من زۆر گرینگە کە تۆ بە بەختەوەری بژیت.

– جا بۆچی؟ ئایا ئەوە سەرزەنشتکردنی ویژدانە؟

من بزەیەکم هاتە سەر لێوان و ئەویش پێکەنی، هەردووکمان وەختێ شەختەبەندی نێوانمان شکا، هەناسەیەکی شادیمان هەڵمژی. بە درێژی باسی دادگاییکردنەکەی پێرۆ و حوکمەکەی لاگاسکای بۆ گێڕامەوە و گوتی: بیرۆکەی مێردکردنی تۆم ئەو کاتە بە مێشکدا هات، کە تەنیا ڕێگەیەک بوو بۆ ڕزگارکردنی تۆ لە دوورخستنەوە و هەژاری.

هەروەها پێدرۆ گوتی: بڕوا بکە ئێنیس، کاتێ ئەو ڕێگەچارەیەم خستە بەردەمی لاگاسکا، خەنجەرێکم لە سینگی خۆم داو تا ئێستاش خوێنم لێ دەچۆڕێ. من هەمیشە تۆم خۆشدەوێ و تۆ تاکە ژنێکی لە ژیانی من، بەڵام ئەوانی تر لە حسێباندا نینە. کە دەشزانم شووت بە پیاوێکی تر کردووە ئازارێکی سەختم دەدات.

– کەواتە تۆ بەردەوام ئەوەت لەدڵ بووە و نیگەران بوویت.

– ئەی ئێنیس، گاڵتەم پێ مەکە، من زۆر ئازار دەکێشم کە تۆ لە تەنیشتم نیت، وەلێ شادمانم کە دەبینم دەوڵەمەندیت و مێردت بە جوامێرترین پیاوی

ئەو شارە کردووە.

– ئەو ڕۆژە کە قەشە گۆنزالست ڕەوانی لای من کردبوو تا خەبەرەکەم بداتێ، ئەوەشی درکاند کە تۆ پیاوێکت بۆم هەڵبژاردووە تا شووی پێ بکەم، ئایا ئەو کەسە ڕۆدریگۆ بوو؟

– من ئەوەندە چاک دەتناسم بە شێوەیەک کە ناتوانم هیچ شتێکت بەسەردا بسەپێنم، بەتایبەتی هەڵبژاردنی کەسێک مێردی پێ بکەیت.

– کەواتە من دڵنیات دەکەمەوە و دەڵێم کە ئەو ڕێگەچارەیەی بە مێشکت داهات زۆر جوان بوو. منیش بەختەوەرم و ڕۆدریگۆم زۆر خۆشدەوێ.

– لە منیش زێتر؟

– ئەی پێدرۆ، من ئێستا بە شێوەی ئەویندارێ تۆم خۆشناوێ.

– جا ڕوحەکەم ئێنیس، ئایا تۆ لەوەیان دڵنیای؟

هاتەوە پێشم، دەستی خستە سەر شانەکانم و چەسپی کردم و بە دوای لێوەکانمدا دەگەڕا . هەستم بە دڕی ڕیشە زەردباوەکەی و هەناسە گەرمەکەی کرد، ڕووم وەرگێڕا و بە نەرمی لە خۆمم دوورخستەوە.

لەبەر ئەوەی هەستم کرد کە ئەوە دوا ماڵئاواییمە لەگەڵی لەو چرکەساتەدا بۆ هەتا هەتایە، بە داخێکی گرانەوە گوتم: ئەی پێدرۆ، جوانترین شتێک کە لە منت دەبینی، وەفاداری بوو.

***

پێدرۆ سەرلەنوێ سەفەری کرد تا درێژە بە کاری داگیرکاری و قایمکردنی حەوت شار و سەربازگە تازەکان بدات. چەند کانگەیەکیشی دۆزییەوە کە سامانێکی گەورەیان تێدابوو و وای لە شارنشینە تازەکان و هەندێک دانیشتووانی سانتیاگۆ کرد کە واز لە کێڵگە بە پیتەکانیان لە دۆڵی مابۆچی بێنن و بە خێزانەوە بڕۆنە دارستانە نادیارەکانی خواروو بەو ئومێدەوە شەیدا بووبوون کە زێڕ و زیو بدۆزنەوە. بیست هەزار هندی لەو کانگایانە کاریان دەکرد و بەرهەمەکەیان لە پوختەییان وەک هی پێرۆ بوو. خوان گۆمێس یەکێک

بوو لەوانەی چووبووە ئەوێ، بەڵام سیسیلیا و منداڵەکانی لەگەڵی نەچووبوون. سیسیلیا بێ ئەوەی بزانێت کە قسەکانی دەبێتە مایەی نەگبەتی، پێی گوت: من لە سانتیاگۆ دەمێنمەوە. ئەگەر تۆش دەتەوێ بچیت تا لە زۆنگاوەکان بخنکێی ئەوا کەیفی خۆتە.

وەختێ ڕۆدریگۆ دی کیرۆگا پێدرۆی هاوڕێی بەڕێ کرد، ئامۆژگاری کرد بەوەی ئەوەندە خاکە داگیر نەکات کە نەتوانێ دەسەڵاتی بەسەردا بشکێت. ئاخر هەندێ پەناگەی سەربازە تەنیا چەند سەربازێکی کەمی لێ مابوو و چەند شارێکیش بێ پاسەوانی مابوونەوە.

– ئەی ڕۆدریگۆ هیچ مەترسییەک لە گۆڕێدا نییە، هندییەکان جگە لە گرفتی بچووک، کێشەمان بۆ دروست ناکەن، هەرێمەکە هەمووی ملکەچ بوونە.

– زۆرم پێ سەیرە کە هندییە مابۆچییەکان وەک بەتەمابووین ئەوها شەڕمان ناکەن، هەرچەندە ناوبانگی سەرسەختی ئەوانمان لە پێرۆ پێگەیشت کە هێشتا هەڵمەتی شیلیمان دەست پێ نەکردبوو.

– ئاخر کە زانییان ئێمە دوژمنێکی زۆر بەهێزین، ئیتر پەرتەیان لێ کرد.

– ئەگەر کارەکە وابێت ئەوا داوای سەرکەوتنت بۆ دەکەم، بەڵام توخوا وریای خۆت بە.

بەگەرمی دەستەملانێی یەکتر بوون، بالدیبیاش کەوتەڕێ بێ ئەوەی گوێ بە ئامۆژگارییەکانی ڕۆدریگۆ بدات.

لە ماوەی مانگەکانی داهاتوودا هیچ خەبەرێکی ئەومان پێنەگەیشت، بەڵکو دەنگوباسی وا هەبوون کە گوایە ژیانێکی زۆر لووتبەرزانە دەژی و لە نێو سەرین و دۆشەک پاڵکەوتووە و لە ماڵەکەی خۆی لە شاری کۆنسیبسیۆن کە بە "کۆشکی زستانە" ناوی ناوە، هەروا قەڵەو دەبێت.

دەیانگوت خوانا خێمینس زێڕە بەرهەمهاتووەکان دەشارێتەوە و بە بەلەمی بچووک دەیگوازێتەوە تا دابەش نەکرێت و فەرمانبەرەکانی پاشای لێ ئاگەدار

نەکاتەوە. هەروەها بەبەخیلی پێبردنەوە دەیانگوت زێڕی کەڵەکەبووی ئەوەندە زۆرە و لەوەی لە کانگاکانی کیلاکۆیادا هەیە زیاترە، بالدیبیاش ئێستا لە کارلۆسی پێنجەم دەوڵەمەندترە. ئیتر خەڵکەکە بەو جۆرەنە و لە حوکمدان بەسەر ئەوانی تر پەلە دەکرد. جا ئیزابێل گیان، با بەبیرت بێنمەوە کە بالدیبیا لە دوای مردنی تاکە مەرابتییەکی بەجێ نەهێشتبوو، تەنیا ئەگەر خوان خیمێنس لە جیاتی ئەوەی ئەو سامانە بە دەستی هندییەکان بنبزر کرابێت کە وا باوە، ئەو توانیبێتی بیدزێ و لە شوێنێکدا حەشاری دابێت، ئاخر بالدیبیا لە ژیانی خۆی قەت گەنجینەی نەبوو.

تۆکابێڵ یەکێکە لە قەڵایانەی کە بە مەبەستی ماندووکردنی هندییە ڕەسەنەکانی ئەو وڵاتە و پاراستنی کانگاکانی زێڕ و زیو دروستکراوە، هەرچەندە تەنیا دە سەرباز پاسەوانیان لێ دەکرد کە ئەوانیش بەچاودێریکردنی داراستانەکە و نیگەرانی ڕۆژیان ئاوا دەکرد. سەرکردەی بەرپرسیار لە پاراستنی ئەو قەڵایە گومانی پەیدا کردبوو کە مابۆچییەکان پیلانێکیان لەبن سەریدایە، ئەگەرچی پەیوەندییەکی باشیشی لەگەڵیان هەبوو. هندییەکان حەفتەی جارێک یان دوو جار کەلوپەلیان دەبردە ئەو قەڵایە؛ هەموو جارێکیش پیاوەکان هەمان ئەو کەسانە بوون کە دەهاتن، سەربازەکان دەیانناسین و لە گۆڕینەوەی سڵاو و خۆشحاڵبوون لەگەڵیان ڕاهاتبوون. لەگەڵ ئەوەش شتێک لە ڕەفتاری هندییەکاندا هەبوو کە وای دەکرد ئەو سەرکردەیە ژمارەیەکیان لێ بگرێت و بە ئەشکەنجەدان پێیان بسەلمێنێ کە هۆزەکان بە تەمای یاخیبوونێکی گەورەن و خۆیان بۆ ئامادەساز کردووە. من دەتوانم سوێند بخۆم کە ئەوەی هندییەکان لە ژێر ئەشکەنجەدا ئاشکرایان کرد، شتێک بوو کە لاوتارۆ بە ئەتقەست دەیویست ئیسپانییەکان بیزانن، چونکە مابۆچییەکان پێشتر هەرگیز بەهۆی ئەشکەنجەدان شتیان نەدەدرکاند. سەرکردەی قەڵاکە داوای یارمەتی کرد، وەلێ پێدرۆ بایەخی بەو زانیارییانە نەدا و تەنیا پێنج سەربازی بە ئەسپەوە بۆی نارد، وەک یارمەتیدانێکی قەڵای تۆکابێڵ.

بەهاری ساڵی ١٥٥٣ لە نێو دارستانە بۆندارەکەی هەرێمی ئەراوکانیا بەسەردەچوو. هەوای گەرم و تێپەڕبوونی ئەو پێنج سەربازە، کۆمەڵی پەپوولە باڵ تەنکەکان و ڕەوەی باڵندە پڕ لە جریوەکانی هەڵدەفڕاند و تەمێکیان دروست دەکرد. لە هیکڕا کەشی هێمنی ئەو دیمەنە شوانکارەیییە بە هاوارێکی دۆزەخییانە ڕەوییەوە و ئیسپانییەکان خۆیان دیت لە هەموو لایەک بە هێرشبەرەکان گەمارۆدراون. سیانیان ڕمیان بەرکەوت و بەربوونەوە، وەلێ دووانەکەی تر توانیان ڕوویان وەرگێڕن و بەخێراترین شێوە بۆ نێزیکترین قەڵای سەربازی ڕایان هەڵاتن تا بە هانایانەوە بێن.

هەر لەو ئانەدا ئەو هندییانە بۆ قەڵاکە هاتن کە پێشتر ئازووقەیان دەهێنایە ئەوێ، بەوپەڕی ملکەچی سڵاویان لە سەربازەکان کرد، وەک ئەوەی نەیانزانیبێت کە هاوڕێکانی ئەوانە چییان بەسەر هاتبێت. سەربازەکان دەرگەی قەڵایان بۆ کردنەوە لێگەڕان بە کۆڵەپشتەوە بچنە ژوورێ. کە گەیشتنە ناو حەوشەکە، هندییە مابۆچییەکان گونییەکانیان کردەوە و چەکەکانی ناویان دەرهێنا و کەوتنە پەلاماردانی سەربازەکان. بەڵام ئەو سەربازانە توانییان زوو بەسەر سەرسامبوونی خۆیان زاڵ بن و لە دەستوبردێکدا شمشێر و زرێکانیان بگرنە دەست و بەرگری لە خۆیان بکەن. لە ماوەی چەند خولەکێدا قەسابخانەیەکیان بۆ مابۆچییەکان نایەوە و ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بە دیل گرتن. بەڵام پیلانی مابۆچییەکان سەری گرت، ئاخر لەو وەختەی ئیسپانییەکان بەو هندییانەوە سەرقاڵبوون کە چووبوونە نا قەڵاکە، هەزارانی تر گەمارۆی قەڵاکەیان دا. سەرکردەی سەربازەکان و هەشت کەسی تر بە سواری ئەسپەوە هاتنە دەرێ تا ڕووبەڕوویان ببنەوە. ئەمە بڕیارێکی ئازایانە بوو وەلێ سوودیشی نەبوو، چونکە ژمارەی هێرشبەرەکان گەلێک زۆر بوو. پاش شەڕێکی قارەمانانە ئەو سەربازانەی مابوونەوە بۆ قەڵاکە پاشەکشەیان کرد، ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ ئەو شەڕە نابەرامبەرە بەردەوام بوو تا لەگەڵ داهاتنی تاریکی هێرشبەرەکان کشانەوە. لە قەڵای تۆکابێڵ تەنیا شەش سەربازی ئیسپانی بە زیندوێتی

مـابوونەوە و ژمـارەیـەکی زۆریان لە یاناکـۆنا و هندییـە دیلەکـان لەگـەڵدا بوو. سەرکردەی سەربازەکان بۆ ترساندنی مابۆچییەکان بڕیارێکی نائومێدانەی دا کە چاوەڕێی داهاتنی سبەینەیەکی تریان دەکرد بۆ ئەوەی دیسان پەلاماریان بدەنەوە. ئەو سـەرکـردەیە گوێبیستی ئەوە بووبوو کە وەختی خۆی، من وەک ئەفسانەیەک شاری سانتیاگۆم بە تێهەڵدانی سەری سەرۆک خێڵەکان بە ئاراستەی خەڵکەکە ڕزگار کردبوو، بۆیە بڕیاری دا ئەو شتە دووبارە بکاتەوە. فـەرمـانی دا دیلەکـان سـەربڕن و پاشـان سـەرەکـانیـان تێـهـەڵدەنە ئەودیوی شـوورەکـان. ئەو ڕەفـتـارە بە دەنگێکی درێژ لە چەشـنی شـەپۆلی دەریـایەکی ترسناک دەچوو.

لە چەند سەعاتی داهاتوودا مابۆچییەکان قەڵاکەیان بە تەواوی گەمارۆدا و شەش سەربازە ئیسپانییە درکیان کرد کە تاکە ڕێگە بۆ دەربازبوونیان ئەوەیە لە تاریکایی شـەودا بـە سـواری ئەسـپەکـانیـان هێزی دوژمـن ببڕن و خـۆیان بگەیننە قـەڵای شـاری بۆرین، واتە ئەوان هندییە هاریکارەکان بەجێدێڵن، جا خۆیان و چارەنووسی خۆیان، چونکە ئەوانە ئەسپیان نەبوو وەک سەربازەکان ڕابکەن. من نازانم ئەو ئیسپانیانە چۆن بەو ئازایەتییە توانیان ئەو کـارە ئەنجام بدەن، ئـاخـر دارسـتـانەکـە پڕ لە جـەنگاوەرە مـابۆچییـەکـان بوو کە لە سـەرداوای لاوتارۆ لـە شـوێنی دوورەوە هـاتـبوون تا بەشـداری ئەو یاخـیـبوونە گەورەیە بکەن. ڕەنگە بۆ مـەبەسـتێک کە خۆیان دەیزانن، ڕێگەیان پێ دابن تا بڕۆن. بە هـەرحـاڵ لەگەڵ یەکەم ڕووناکایی بەری بەیان هندییەکان دەستیان بە پەلاماردان کـرد و چوونە ناو قـەڵا چۆلەکـەی تۆکابێل و هاوڕێکانـی خـۆیان لە حـەوشـەکەدا بـە خوێنـەوە بینی و هندییە هاریکارە بێدەسـەڵاتەکانیشیـان قڕ کرد کە لەوێ مابوونەوە.

هەواڵی هێرشـە سـەرکەوتووەکەی بە هۆی ئـەو سیـسـتـەمـە پەیوەندیکردنەی کە لاوتارۆ خـۆی ڕێکی خستبوو زوو پێی گەییشت. ئەو گەنجە کە سـەرۆکی سـەرۆک هۆزەکان بـوو تازە لەگەڵ گواکۆڵدا زەمـاوەنـدی کـردبوو، پاش ئەوەی مـارەیی تەواوی دا. خـۆی لە ئاهەنگی شـیـرینی خـواردنەوە بەشـداری نەکرد،

چونکە حەزی لە خواردنەوە نەدەکرد و سەرقاڵی ئەوەش بوو کە پلان بۆ هەنگاوی داهاتوو دانێت بۆ هەڵمەتەکەی. ئاخر ئەو مەبەستی بوو پێدرۆ دی بالدیبیا دەستگیر بکات.

***

حەفتەیەک بەرلەوە خوان گۆمێس گەیشتبووە خوارووی ئەو وڵاتە و هێشتا نەیتوانیبوو بیر لەو کانگا زێڕانە بکاتەوە کەوای لێ کردبوون دەستبەرداری ماڵ و منداڵەکەی بێت. ئا لەو کاتەدا بانگەوازی فریاکەوتنی لە قەڵای بۆرینەوە پێگەیشت کە شەش سەربازە دەربازبووەکەی قەڵای تۆکابێڵ خۆیان گەیاندووەتە ئەو یازدە سەربازەی ئەوێ. ئیتر هەروەک ڕاسپاردەیەک بۆ هندییەکان پێویست بوو لە سەری بێ دوودڵی لە کاتی داوالێکردنی دەستپێشخەری لە جەنگ بکات. گۆمێس بە سواری ئەسپەکەیەوە بە سەرکردایەتی دەستەیەکی بچووکی سەربازەکان بۆ قەڵای بۆرین دەرچوو. دوای ئەوەی لە وردەکارییەکانی قەڵای تۆکابێڵ حاڵی بوو، تێگەیشت کە ئەو کارە تەنیا بەیەکداهاتنێکی ئاسایی نییە وەک ئەوانەی پێشوو، بەڵکو یاخیبوونێکی گشتگیری هۆزەکانی باشوورە، بە چاکترین شێوە خۆی ئامادەساز بوو، بەڵام ئەوەی لە دەستی دەهات سنووردار بوون، چونکە هەر ئەوەندەی لە باردا هەبوو.

دوای چەند ڕۆژێک لەوە وەختی تاریک و ڕوونی بەیانییان، گوێیان لەو هات و هاوارە بوو کە پێشبینییان دەکرد: پاسەوانەکان لە ناو سەنگەردا دەستەیەک لە مابۆچییەکانیان بینی کە هاواریان دەکرد، بەڵام لە شوێنی خۆیان پێشڕەوییان نەدەکرد. بە مەزەندەی خوان گۆمێس ئەو هێرشبەرانە ژمارەیان لە بەرامبەر هەر یەکێک لەوان پێنج سەد جەنگاوەرە، بەڵام ئەو چەک و ئەسپ و ڕێکخستنەی ئەمان هەیانە لای ئەوان نییە. سەرەڕای ئەوەش ئەم شارەزاییەکی زۆری لە شەڕی هندییەکان هەیە و دەزانێت کە بۆ ئەوان وا باشترە کە لە شوێنێکی کراوە ڕووبەڕوویان ببنەوە، چونکە لە شوێنێکی وادا سوارچاکەکان دەتوانن هونەری خۆیان لە شەڕدا بنوێنن و تفەنگچییەکانیش

چاکتر دەتوانن ڕۆڵی خۆیان ببینن. ئیتر بڕیاری دا بەو هێزەی کە هەیەتی بەرەنگاریان بێتەوە: حەڤدە سوارچاک و چوار تفەنگچی و نێزیکەی دوو سەد کەس لە هندییە هاریکارەکان.

دەرگەکانی قەڵاکە کرانەوە و ئەو هێزە بە پێشڕەوایەتی خوان چوونەدەرێ و بە هێمای ئەو لەسەر گردەکە بە خێراییەکی گەورە شۆڕ بوونەوە خوارێ و شمشێرەکانیشیان بەدەستەوەبوو، وەلێ لە ناکاو بینیان ئەوجارە کۆمەڵی جەنگاوەری هندییەکان دڕنادەن، بەڵکو بە ڕیزبەندییەکی بتەوەوە لە چاوەڕێی ئەواندان، ئەوجارە پێخواسیش نینە و سینگ و سەریان بە زرێ و کڵاوی پارێزراوە کە لە پێستی گۆلکی دەریا دروستکراوە و وەک قەڵغانی ئیسپانییەکان هیچ شتێک نایبڕێت. هەروەها ڕمی سێ مەتر درێژیان بەرز کردووەتەوە و ئاراستەی سینگی ئەسپەکانی دەکەن و گورزی کورتتر و کاریگەرتریان پێیە کە بەکارهێنانی لە هی جاران ئاسانترە. لە شوێنی خۆیان نەدەجولان و بەرەنگاری چوونەپێشی ئەسپەکان بوونەوە کە ڕمەکان لە سینگیان چووبووە خوارێ. چەند ئەسپێک بەو ڕمانە پێکران، بەڵام سەربازەکان  خێرا کۆنترۆڵی شەڕەکەیان گرتەوە دەست. هەرچەندە ژمارەی کوژراوەکان بە دەست و چەکی ئاسنینی ئیسپانییەکان گەلێک زۆر بوون، بەڵام جەنگاوەرە مابۆچییەکان نائومێد نەدەبوون.

لە دوای بەسەرچوونی سەعاتێک لەو شەڕە دەنگی تەم - تومی دەهۆڵەکان بیسترا، ئیتر حەشامەتی هندییەکان وەستان و بەرەو دوا کشانەوە، پاشان لە ناو دارستانەکە بزربوون و ئەو گۆڕەپانەیان بەجێهێشت کە پڕبوو لە لاشەی کوژرا و و بریندار. بەڵام حەسانەوەی ئیسپانییەکان تەنیا چەند چرکەساتێک بوو، ئاخر هەزاران جەنگاوەری تر هاتن شوێنی ئەوانی پێشوویان گرتەوە، بۆیە سەربازەکان جگە لە شەڕکردن هیچ چارەیەکی تریان نەما. مابۆچییەکان هەموو سەعاتێک ئەو ئاڵوگۆڕە ستراتیجییەیان دەکرد: دەهۆڵەکە دەنگی دەهات، هێزە ماندووەکان بزر دەبوون و جەنگاوەری حەساوەیان دەهێنایە شوێنی ماندووبووەکان، بەڵام ئیسپانییەکان هێز و تاقەتیان نەدەما. خوان

گۆمێس درکی کرد کە هەرگیز ناکرێت بەوەندە سەربازە کەمە ڕووبەڕووی ئەو پلانە تۆکمەیە ببنەوە. مابۆچییەکان هێزەکەی خۆیان کردبووە چوار تیم، کە تیمێکیان دەچووە جەنگ سێ تیمەکەی تر دەحەسانەوە و چاوەڕێی نۆرەی خۆیان دەکرد. نەشیدەتوانی فەرمانی ئەوە بدات کە بگەڕێنەوە قەڵاکە ، چونکە زۆربەی سەربازەکان بریندار بووبوون و پێویستیان بە حەسانەوە و خواردنەوەی ئاو هەبوو.

لە سەعاتی دواتر هەر چۆنێک بوو بریندارەکانیان چارەسەر کرد و نەختێک خواردنیان خوارد. لەگەڵ ئاوابوونی خۆر خوان وای پێ باشبوو کە ئەمان هێرشێک بکەنە سەر مابۆچییەکان تا بواریان نەدەنێ شەوێ بحەسێنەوە. هەندێک لە پیاوەکان ڕایان گەیاند کە ئەوان مردنیان لە جەنگ پێ لە هەموو شتێک چاکترە؛ ئاخر ئەوان دەیانزانی کە مردنیان مسۆگەرە ئەگەر مابۆچییەکان بتوانن بێنە نێو قەڵاکە. خوان گۆمێس تەنیا دوازدە سوارچاک و شەش پیادەی هەبوون، وەلێ ئەوە نەیدەترساند. سەربازەکانی ئامادە کرد بە وشەی کاریگەر و بە جۆش ورەی بەرزکردنەوە، خۆشی دایە دەست خواوەند و پەیامبەری ئیسپانیا و فەرمانی دا هێرش بکەن.

بەرەنگاربوونەوەی گورز و ئاسن نیو سەعاتی خایاند و ورەی مابۆچییەکان لە ڕووخاندابوو، ئاخر ئەوان بە هەمان دڕندایەتی سبەینە شەڕیان نەدەکرد و زووتر لە وەختی ئاسایی لەگەڵ دەنگی دەهۆڵەکانیان کشانە دواوە. گۆمێس چاوەڕێی شەپۆلی دووەمی هێرشبەرە جێگرەوەکان بوو وەک ئەوەی سبەینێ، بەڵام ئەوە ڕووی نەدا . بەمەیان تووشی شڵەژان هات و فەرمانی دا بگەڕێنەوە ناو قەڵاکە. ئەوجارەیان هیچ سەربازێکی نەکوژران. لە ماوەی شەو و ڕۆژی دواتر ئیسپانییەکان نەنووستن و بە زرێ و شمشێرەکانی دەستیانەوە چاوەڕێی پەلاماری ئەوان بوون، وەلێ دوژمن بەدیارنەکەوت تا لە دواییدا باوەڕیان هات کە مابۆچییەکان هێرش ناکەنەوە، ئیتر لە حەوشەی قەڵاکەدا سوجدەیان برد و سوپاسی قەدیسی سانتیاگۆیان کرد، بۆ ئەو سەرکەوتنە سەیرەیان، ئەوانیان تێکشکاند بێ ئەوەی لە هۆکاری سەرکەوتنەکەیان بزانن.

گۆمێس بیری کردەوە کە ناکرێ هەر ئەوها لە قەڵاکە بە دابڕاوی بمێنێنەوە و چاوەڕێی ئەو هاوارە تۆقێنەرە بکەن کە نیشانەی هاتنەوەی مابۆچییەکانە. وای بە چاکزانی چاوەڕێی هاتنی شەو بکەن، چونکە هندییەکان مەگەر بە دەگمەن دەنا قەت بە شەوان لە ترسی ڕوحە شەڕانگێزەکان ناجولێنەوە. ئا بەو شێوەوە دەتوانن دوو نێردراو ڕەوانی لای پێدرۆ بکەن و مژدەی ئەو سەرکەوتنەی بدەنێ کە نازانن چۆنیان بەدەستهێناوە. هەروەها ئاگەداریشی بکەنەوە کە ئەمان ڕووبەڕووی یاخیبوونێکی گشتگیری هۆزەکان دەبنەوە، ئەگەر زوو تێکیان نەشکێنن ئەوا هەموو ئەو زەوییانە لەدەست دەدەن کە دەکەوێتە خوارووی ڕووباری پیۆ - پیۆ. ئەو دوو نێردراوە بە پەلە بە نێو تاریکی و سەوزاییە تێکچڕژاوەکان دەرچوون و دەگەیشتنە هەر سوچ و قوژبنێک دەترسان هندییەکان بەسەریاندا زاڵبن، بەڵام باشبوو هیچ شتێ ڕووی نەدا و توانیان بە بێ وەستان بڕۆن و تاریک و ڕوونی بەیانیان گەیشتنە جێ. لە ڕێگادا پێیان وابوو مابۆچییەکان لە نێو درەخت و دەوەنەکان چاوەدێرییان دەکەن، وەلێ کاتێ تووشی هیچ بەرنگاربوونەوەیەک نەبوون، ئەو بۆچوونەیان بۆ دەمارگرژی خۆیان گێڕایەوە. ئەوان نەیاندەزانی کە لاوتارۆ مەبەستیەتی پێدرۆ ئەو خەبەرەی بگاتێ، هەر لەبەر ئەوەشە کە ڕێگەیان پێ نەگرتوونە، هەروەها هەمان شتی لەگەڵ ئەو نێردراوە کرد کە وەڵامنامەکەی لە حاکمەوە بردە لای گۆمێس تێیدا نوسیبووی کە لە ڕۆژی جەژنی لەدایکبوون لە قەڵا کەلاوەکەی تۆکابێل دەیبینێت. ئیتر بەو جۆرە سەرۆکی سەرۆکەکان - نیدۆلتۆکی - لە ڕێگەی هەواڵگرە بەربڵاوەکانییەوە بە ناوەڕۆکی نامەکەی زانی بزەیەکی ڕەزامەندی هاتێ: ئا ئەمە ئەو بالدیبیایەیە کە مەبەستیەتی. فەرمانی بە یەکێک لە تیمەکانی دا کە گەمارۆی قەڵای بۆرین بدەن تا خوان گۆمێس لەوێ نەتوانێ بچێتە دەر و ئەو ڕاسپاردانەی پێ جێبەجێ نەکرێت کە پێی گەیشتوونە، لە کاتێک خۆی بۆ ئەو پیلانە تۆکمە دەکرد کە بۆ بالدیبیای ئامادە کردبوو لە تۆکابێل.

***

بالدیبیا مانگەکانی تەمبەڵی و بێتاقەتی زستانێی لە شاری کۆنسیبسیۆن لە ژێر چاوەدێری خوانا خێمێنس، بە سەیرکردنی باران و یاری کاغەزێن بەسەربرد. تەمەنی گەیشتبووە پەنجا و سێ ساڵ، بەڵام شەلەیی و قەڵەوییەکەی وایان لێی کرد زوو پیر ببێت. لە یاری کاغەزێندا زۆر شارەزابوو و بەختیش یاوەری بوو، بۆیە بەردەوام دەیبردەوە. ئەوانەی ئیرەییان پێی دەبرد دەیانگوت ئەو پارەیەی لە قومار دەیباتەوە دەیخاتە سەر ئەو زێڕەی لە کانگاکان دەستی دەکەوێ و هەمووی دەچێتەوە ناو سەندووقە نهێنی و شاراوەکەی خوانا کە تاکو ئێستاش کەسێک نەیبینیوە. بەهاری ئەو ساڵە بە چرۆکردنی درەختەکان و جریوەی چۆلەکەکان مەست بووبوو ئەو وەختەی هەندێ هەواڵی تەمومژاوی لە بارەی یاخیبوونی مابۆچییەکان گەیشتن کە پێدەچوو زۆریان بەسەرەوەنرابێت. پێدرۆ تەنیا لە پێناو بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی سەرشانی، نەک بەهۆی بڕواپێبوونی، پەنجا سەربازی بەگەڵ خۆیدا بێ ئەوەی ئارەزووی لێ بێت، ڕۆیشت تا چاوی بە خوان گۆمێس بکەوێت لە تۆکابێڵ و وەک جارانی پێشوو مابۆچییە سەرەڕۆکانیش تەمبێ بکات.

بۆ ئەو گەشتە پازدە فەرسەخییە، بە خۆی و پەنجا سوار و هەزار و پێنج سەد یاناکۆنا لەسەرەخۆ کەوتنە ڕێ، چونکە دەبووایە بە پێی بارهەڵگرەکان برۆن. هەرکە بەڕێکەوتن خاوخلیسکی کاروانەکە ترساندی، ئاخر غەریزەی سەربازێتی لە ناخیدا بۆ مەترسییە لە ناکاوەکان وریای دەکردەوە. هەستی دەکرد کە ئەوان لە نێو دارستانە چڕەکانەوە لە ژێر چاوەدێریدانە. ئەوە ماوەی ساڵێک بوو بیری لە مردنی خۆی دەکردەوە و خەیاڵیشی بۆ ئەوە دەچوو کە ڕەنگە بەم زووانە ئەمە ڕوو بدات، بەڵام نەیویست پیاوەکانی تووشی دڵەڕاوکێ بکات بە گومانی ئەوەی کە ئەوان لە ژێر چاوەدێری دوژمنانن. هەر بۆ ئامادەباشی، فەرمانی دا پێنج سەرباز لە پێش ئەواندا برۆن و ڕێگەکە بەسەر بکەنەوە، ئەمانیش بە هەمان ڕیتمی هێواشەوە لە ڕۆیشتن بەردەوام بوون لە کاتێکدا بالدیبیا هەوڵی دەدا بارگرژی دەروونی بە شنەبای فێنک و بۆنی

خـۆشـی سنۆبـەر هێـور بکاتـەوە. لە دوای بەسـەرچوونی دوو سـەعـات لە ڕۆیشـتنی ئەو پێنج کـەسـە و نەگـەڕانەوەیان، زیاتر لە جـاران نیگەرانی دای گرت. لە دوای بڕینی فەرسەخێکی تر، یەکێ لە سوارەکان بە هاوارێکی پڕ لە ترسـەوە هێمـای بۆ شـتێک کرد کـە بە لقی دارێکەوە شۆڕ بووبووەوە، ئـەمـە لاباڵی مرۆڤ بوو کە هێشتا لە نێو قۆڵی چاکەتەکەیەتی. بالدیبیا فـەرمانی دا کە وریابن و دەسـتیان لـەسەر چەکەکانیان بێت. دوای بڕینی مـاوەیەکی کورت قاچێکیان بینی کە بە پۆستاڵەکەیەوە بە دارێک هەڵواسرابوو، پاشـان لاشـەی تریشـیـان دیت، قـاچ و قـۆڵ و سـەر و وەک بەرهـەمـێکی خـوێناوی بـە درەخـتی دارسـتـانەکەوەن. هـاوار لـە سـەربازە تووڕەکـان و هـەڵمـەتبـەرەکـان بەرزبووەوە: دەبا تۆڵەیان لێ بکەینەوە!

بەڵام بالدیـبـیـا ناچاری کـردن سـارد ببنەوە، ئاخـر خـراپـتـرین شت ئەوەبوو پەرت و بـڵاو ببنەوە، دووبـارەی کـردەوە کـە تا دەگـەنە قـەڵای تۆکـابێـڵ دەبێ پێکەوە بن.

سـەنگەرەکـە لەسـەر گـردێکی ڕووتەن بوو، چونکە ئیـسـپـانییـەکـان بۆ دروستکردنی، دارەکانی دەوروبەریان بڕیبـووەوە، بەڵام خوارەوەی سەنگەرەکە هەمـووی دارودرەخـت بوو. لەسـەر سـەنگەرەکەوە ڕووبارێکی گـەورە دیار بوو. سـوارەکان سـەرکەوتن و یەکەم جار گەیشـتنە کاولە وێرانبـووەکەی قەڵا کـە دووکەڵی لێ هـەڵدەسـتا، پاشان کۆمەڵی بارهەڵگرەکانی یاناکۆناش وردە وردە گـەیشـتنە ئەوان کـە تەقـەمـەنی و کـەلوپەلی پێـویسـتـیـان هەڵگرتبـوو. جـەنگاوەرەکـانی مـابۆچی چاوەڕێبـوون تـا دوا کـەسی هێـزەکـەی بالدیـبـیـا سەرکەوتن، ئەوساکە بە دەنگێک خۆیان ئاشکرا کرد کە مووچڕکی بە گیاندا دەهێنا و لەو نایانەیان دەردەچوو کە لە ئێسقانی مرۆڤ دروستیان کردبوون، بە پێی ئەو بەرنامەیەی کە لاوتارۆ بۆی دانابوون.

حـاکم هێـشـتـا بۆی ڕێکنەکـەوتبـوو بە پیـادەیی بڕوات، لە نێـو دارەسووتاوەکانی شوورەکەی ڕوانی و دیتی جەنگاوەرەکان لە دەستەی تۆکمە ڕیزبوونە و زرێیان لەبەردایە و ڕمەکانیشیان لە زەوی گیر کردووە. سەرکردە

سەربازییەکان لە پێشەوەی ئەو ڕیزانەن و باشترین پاسەوان پارێزگارییان لێ دەکەن. بە سەرسامییەوە بیری لەوە کردەوە کە بەربەرییەکان هەر بەغەریزە شێوازی سوپای ڕۆمانییە کۆنەکانیان بۆ جەنگ دۆزیوەتەوە، کە سوپای ئیسپانیش هەمان شێواز بەکار دێنن. ڕەنگە سەرکردەکەشیان هەر ئەو کەسە بێت کە لە وەرزی زستانێ زۆری لە بارەیەوە گوێبیست بووبوو: لاوتارۆ. لەگەڵ دەربڕینی ئەو ناوە شەپۆلێک تووڕەیی گیانی تەنی و تێبینی کرد جەستەی لە ئارەقان تەڕبووە. هاواری کرد: ئەگەر نەمرم ئەو لەعنەتییەی بە ناشیرینترین شێوە دەکوژم!

ناشیرینترین شێوەی مردن. لەو مەملەکەتەی ئێمە زۆر جۆری مردن هەیە کە بۆ هەتا هەتایە گرانایی دەخەنە سەر ویژدانمان. پێویستە لێرە کەمێ بوەستم و ڕوونی بکەمەوە کە بالدیبیا نەیتوانی ئەو هەڕەشەیەی لە دژی لاوتارۆ جێبەجێ بکات، کە پاش چەند ساڵێک لەوە لە تەک گواکۆڵدای هاوسەری لە کاتی شەڕدا کوژرا. لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ئەو سەرکردە بلیمەتە توانی ترس و تۆقین لە شارە ئیسپانییەکان بخاتەوە لە باشووری وڵات و ناچاری کردن کە چۆلیان بکەن. بە هێزەکەیەوە توانی بگاتە نێزیک شاری سانتیاگۆ. لەو ماوەیەدا مابۆچییەکان لە برسان و بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی هیلاک بووبوون، وەلێ لاوتارۆ بە سوپا بچووک و ئازاکەیەوە کە ژن و منداڵیشی لەخۆگرتبوو، لە شەڕکردن بەردەوام بوو. ماوەی چەند ساڵێکی کەم بلیمەتانە و چاونەترسانە کاروباری شەڕی هەڵدەسووڕاند، بەڵام بەسبوو بۆ ئەوەی ڕوحی یاخیبوون لە نێو مابۆچییەکان بچەسپێنێ کە هێشتاکە تا ئەمڕۆکەش هەر درێژەی هەیە. بە گوێرەی ئەو قسانەی کە ڕۆدریگۆ بۆمی دەکرد، ژمارەیەکی یەکجار کەم لە سەرکردە سەربازییەکان لە مێژووی جیهانیدا دەتوانرێ بەو گەنجە بەراورد بکرێن کە چەند هۆزێکی ڕووتوقووتی کردە سەرسەخترین سوپا لە ئەمریکا. لە دوای مردنی لاوتارۆ، تۆکی کاوبۆلیکان شوێنێ گرتەوە کە لەو کەمتر ئازانەبوو، وەلێ فێڵ و ژیرییەکەی نەدەگەیشتە ئاستی لاوتارۆ، بۆیە بە دیل گیرا، پاشان حوکمی مردنیان بە

هەڵواسینی بە نووکی ڕم دا. حیکایەتبێژەکان وا دەگێڕنەوە کە ڤریسیای هاوسەری وەختی دیتی مێردەکەی بە کۆت و زنجیرەوە بە پێش خۆیان داوە، کۆڕپەکەی کە تەمەنی چەند مانگێک بوو، فڕێدایە بەرپێی و هاواری کرد کە ئەم نایەوێ نەوەی پیاوێکی دۆڕاو و تێکشکا و شیربدات. بەڵام لەوە دەچێت ئەوەشیان هەر یەکێک بێ لە ئەفسانەکانی جەنگ، وەک ئەو ئەفسانەیەی پاکیزە کە لە کاتی یەکێ لە شەڕەکان لە ئاسمان بەدیارکەوتبوو. کاوبۆلیکان لەسەر نووکی ڕمەکە بێ ئەوەی لەبەر ئەو ئێشە ترسناکە تەنیا ناڵەیەک بکات، هێدی هێدی لە هەناوی دەچووە خوارێ، ئەمە سۆریتا دەیگێڕایەوە، یان سۆنیگا؟ بەخوا وام لێ هاتووە ناوەکانم لەبیر دەچنەوە، جا کێ ناڵێ چەندان هەڵە لەو ڕۆمانەدا هەیە. من بەخت یاوەرم بوو کە لە کاتی ئەشکەنجەدانی کاوبۆلیکان لەوێ نەبووم، هەروەها لە هەموو ئەو سزادانانەش ئامادە نەبووم کە بە ناوی نیزامی گشتییەوە ئەنجام دەدران، کە بە لێدانی تەورێک نیوەی پای ڕاستەی هندییە یاخیبووەکانیان لێ دەکردەوە، وەلێ ئەوە نەدەبووە هۆی ورە بەردانیان و بە پای شەلەوە لە شەڕ بەردەوام دەبوون. وەختێ هەردوو دەستی سەرکردەیەکی تری مابۆچییان بڕی کە ناوی گالفارینۆ بوو، تفەنگەکەیان بە پەتێک لە بازووی قایم کرد تا بگەڕێتەوە کۆڕی جەنگ. لە دوای ئەو هەموو نەهامەتیانەش نابێت چاوەڕێی بەزەیی بین لە هندییەکان، چونکە توندوتیژی لە سوورێکی هەمیشەییدا هەر توندوتیژی بەرهەم دێنێتەوە.

بالدیبیا پیاوەکانی کردە چەند کۆمەڵێک و هەر یەک لەو کۆمەڵانەش سوارچاکێک پێشڕەوایەتی دەکردن، یاناکۆناکانیش بە دوایانەوە دەڕۆیشتن، ئیتر بەو شێوەیە فەرمانی دانێ لە سەرنگەرەکەی سەر گردەکە بێنە خوارەوە. نەیتوانی سوارەکان بە غاردان بنێرێتە پێشەوە، چونکە دەیزانی ڕمی مابۆچییەکان لە سینگی ئەسپەکانیان دەچەقن، ئاخر وادیاربوو مابۆچییەکان فێری تاکتیکەکانی شەڕی ئەوروپایی بووبوون. دەبووایە یەکەم جار ڕمهاوێژەکان چەک بکات. لە یەکەم بەیەکگەیشتندا ئیسپانی و یاناکۆناکان سەرکەوتنیان بە دەستهێنا و لە دوای شەڕێکی کورت و سەخت و خوێناوی

جەنگاوەرەکانی مابۆچی ڕووەو ڕووبارەکە گەڕانەوە و دەنگ و هاواری سەرکەوتن بە بۆنەی کشانەوەیان بەرزبووەوە، و بالدیبیا فەرمانی پێ دان بگەڕێنەوە قەلاکە. سەربازەکان لەو سەرکەوتنەیان دڵنیابوون، بەلام پێدرۆ هەستی بە نیگەرانییەکی زۆر دەکرد، چونکە مابۆچییەکان بەڕێکوپێکی و بە پێی لێدانەوەیەکی ورد کشابوونە دواوە. لە ناو سەنگەرەوە ئەوانی دەبینی کە لە ڕووبارەکە ئاو دەخۆنەوە و برینداره‌کانیان دەشۆن کە ئەمەش شێوازێکی حەسانەوەیە بۆ جەنگاوەرەکان. لەو ساتەدا دەنگی هاوارێکی بەرز دەبیسترا، لە ناو دارستانەکەوە هێزێکی تازەی هندییەکان بەدیارکەوتن، ئەو هێزە حەساوە و ڕیزبەند بوون وەک ئەوجارەی شەڕەکەی بۆرین کە لە دژی پیاوەکانی خوان گۆمێس کردیان، لێ بالدیبیا بەمەی نەدەزانی. هەروەها سەرکردەی گشتی یەکەم جاری بوو درکی بە مەترسی بارودۆخەکە کرد پاش ئەوەی وای دەزانی کە خۆی گەورەی بێ ڕکابەری هەرێمی ئەراوکانیایە.

ئەو ڕۆژە بە هەمان شێوەی پێشوو تا ئێوارێ شەڕ بەردەوام بوو، بریندار و تێنوە هیلاکەکانی ئیسپانیایی لە هەر دەورەیەکی شەڕەکەدا ڕووبەڕووی هێزێکی حەساوە و تێری مابۆچییەکان دەبوونەوە، لە کاتێک هێزە گەڕاوەکە دەچوونە ڕووبارەکە خۆیان فێنک دەکردەوە. چەندان سەعات بەسەرچوون و ئیسپانی و یاناکۆناش هەڵدەوەرین و کۆمەکەکانی خوان گۆمێسیش نەدەگەیشتن، کە بە شەیداییەوە لە چاوەڕێی دابوون.

***

کەسێک نییە لە شیلی کە ڕووداوە پڕ لە تراژیدییەکانی جەژنی لەدایکبوون ساڵی ١٥٥٣ نەزانێت، وەلێ هەر یەکێ بە جۆرێک دەیگێڕنەوە. منیش وەک چۆن لە زاری سیسیلیام گوێ لێ بووە ئاوای دەگێڕمەوە. لەو کاتەی کە بالدیبیا و هێزە بچووکەکەی لە تۆکابێڵ بە زەحمەت بەرگرییان لە خۆیان دەکرد، گۆمێسیش لە بۆرین گەمارۆ درابوو بە جۆرێک مابۆچییەکان تا ڕۆژی سێیەم ئاوایان هێشتنەوە بێ ئەوەی خۆیان نیشانی ئەوان بدەن. دانی سبەینە بەسەرچوو و بووە پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ وەختێ خوان گۆمێس چی

تر خۆی پێ ناگیرێ و لەگەڵ چەند سوارێک بۆ پشکنینی دارستانەکە دەچنە دەرێ. هیچیان نەبینی. لە حوکمی چاودا کەسێک دیارنابێ، ئەو وەختە گومانی بۆ پەیدا دەبێ کە گەمارۆدانی ئەوان بۆ ئەو ستراتیجەیە تا نەتوانن بگەنە بالدیبیا، وەک چۆن فەرمانی پێکردبوون. ئیتر بەوجۆرە وەختێ ئەوان لە بۆرین مابوونەوە حاکمیش لە تۆکابێل چاوەڕێی کردبوون، جا ئەگەر لەو ماوەیە هێرشیان کرابێتەسەر وەک پێشبینی دەکرێت، ڕەنگە لە بارێکی زۆر خراپدابن. بێ هیچ دوودڵییەک خوان گۆمێس فەرمانی دەداتە ئەو چواردە پیاوەی کە لەگەڵیدا بوون کە سواری باشترین ئەسپ بن و بە زووترین کات خۆیان بگەیننە تۆکابێل.

بە درێژاییی ئەوە شەوە هەر بەسەرپشتی ئەسپەکانیانەوە بوون، سبەینەی ڕۆژی دواتر خۆیان لە نێزیک قەڵاکە بینییەوە. لە دوورەوە سەنگەرەکەیان لێ دیاربوو کە دووکەڵی لێ بەرز دەبووەوە و کۆمەڵی مابۆچییەکانیش لە دەوروبەری دیارن، سەرخۆشی جەنگ و بادەنە و سەرک و پەلی مرۆڤیان بەدەستەوەیە؛ ئەمانە پاشماوەی ئەو ئیسپانی یاناکۆنانەن کە ڕۆژی پێشتر بەزێنراون. ئەو چواردە پیاوە ترس دای گرتن و درکیان کرد کە ئەوانیش گەمارۆ دراون و هەمان چارەنووسی پیاوەکانی بالدیبیایان لە پێش دایە، بەڵام جەنگاوەرە هندییەکان کە بە بادە هۆشیان لە دەستدابوو، ئاهەنگی سەرکەوتنیان دەگێڕا و بەرەنگاریان نەبوونەوە. ئەو سوارانە بە ئەسپە ماندووەکانیان بە سەر گردەکەدا هەڵگەڕان و بە شمشێر ڕێگەی خۆیان لە نێو ئەو چەند سەرخۆشە کەمە کردەوە کە هاتنە سەر ڕێیان. قەڵاکە بووبووە کۆمەڵێک داری دووکەڵاوی. لە نێو تەرمی کوژراو و لاشە هەڵدڕاوەکاندا بە دوای بالدیبیادا کەوتنە گەڕان، وەلێ نەیاندۆزییەوە. گۆزە ئاوێکی پیسیان دیتەوە و تێنوێتی خۆیان و ئەسپەکانیشیان پێ شکاند، بەڵام ئەو کاتەیان نەبوو بە دوای هیچی تردا بگەڕێن، چونکە لەو ساتەدا هەزاران هندی سەرکەوتن کە لەو سەرخۆشانە نەبوون پێشتر تووشیان بووبوون، بەڵکو لە نێو دارستانەکەوە بە ڕێکی و نیزامەوە بەرەو ڕوویان هاتن. ئیسپانییەکان کە

نەیاندەتوانی لەو قەڵا ڕووخاوەوە بەرگری لە خۆیان بکەن، بە سواری ئەسپە ماندووەکانیانەوە بەرەو خوارێ کێل بوونەوە و ئامادەبوون بە نێو هێزی دوژمناندا ڕێگەی خۆیان بکەنەوە. ئەوندەی پێنەچوو کە خۆیان دیت گەمارۆدراون و ئیتر شەڕێک بەرپابوو کە تا ئێوارێی خایاند. زۆر زەحمەتە باوەڕ بکەیت کە ئەو پیاو و ئەسپانەی بە درێژاییی ئەو شەوە لە بۆرینەوە هاتبوون، ئەوها سات لە دوای سات خۆیان ڕابگرن. بەڵام من بینیومە کە ئیسپانییەکان چۆن دەجەنگن و بەشداریشم کردوونە و دەزانم ئێمە چەند پشوودرێژ و خۆڕاگرین. دواجار سوارەکانی گۆمێس توانییان پێکەوە بۆی دەرچن و هێزەکانی لاوتارۆش بە دوایانەوە بوون. دارستانەکە پڕ لە کۆسپ و تەگەرەی درەختە بڕاوەکان بوو بە جۆرێک ئەسپەکان نەیاندەتوانی غار بدەن، بەڵام ڕێگە بەو هندییانە ناگرن کە بەدوای سوارەکانەوە ڕادەکەن و بەرەنگاریان دەبنەوە.

ئا لەوکاتەدا ئەو چواردە سوارە ئازا و چاپووکە بڕیاریان دا کە یەک بە دوای یەک گیانی خۆیان بەخت بکەن پێشڕەوەی دوژمنان بوەستێنن، هاوڕێکانیشیان هەوڵیان دەدا لێیان نێزیک ببنەوە. هیچ گفتوگۆیەکیان لەو بارەیەوە نەکرد و تیر و پشکیان هەڵنەدا کە کامەیان یەکەم جار هێرش ببات و کەسیش فەرمانی ئەوەی پێ نەدان. یەکەم کەسیان هاواری لێ هەستا وماڵئاوایی کرد و خۆی خستە سەر پشتی ئەسپەکەیە و ڕووی وەرگێڕا تا بەرەو ڕووی دوژمن بێتەوە. بە نیازی شەڕکردن تا مردن شمشێرەکەی هەڵکێشا، چونکە بەدیلگیرانی هەزاران جار لە کوشتنی خراپتر بوو. لە ماوەی چەند خولەکێکی کەمدا سەدان دەست لەسەر پشتی ئەسپەکەی هێنایانە خوارێ و بەو شمشێر و خەنجەرانەوە کوشتیان کە لە ئیسپانییە بەزێنراوەکانی هاوڕێی بالدیبیا دەستیان کەوتبوو. ئەو چەند خولەکەی کە ئەو پاڵەوانە بۆ هاوڕێکانی ڕەخساند، بواری ئەوەی پێدان کە نەختێک بچنە پێشەوە، وەلێ ئەوەندەی پێنەچوو کە مابۆچییەکان تووشیان بوونەوە. سەربازێکی تر ئەو جارە بڕیاری دا گیانی خۆی بەخت بکات، ئەویش بە

هاوارەوە ماڵئاوایی لە هاوڕێکانی کرد لە بەردەم هێرشی ئەو هندییانە وەستا کە تێنووی خوێن بوون. پاشان هی سێیەمیش بەو شێوەیە چووە پێشێ، ئیتر هەتا شەش کەسیان بەو جۆرە کوژران. بەڵام هەشتەکەی تر کە هەندێکیان برینەکانیان سەخت بوو، نائومێدانە درێژەیان بە چوونە پێشەوە دا تا گەیشتنە ڕێڕەوێکی بەرتەسک. ئەوجارە دەبووایە دواین کەسیان گیانی خۆی بەخت بکات تا ئەوانی تر بتوانن بڕۆن. لە ماوەی چەند خولەکێکدا ئەویشیان کوشت. لەو کاتەدا ئەسپەکەی خوان گۆمێس لە ماندوێتییان و لەبەر خوێن بەربوونی بە هۆی ئەو ڕمەوە کە بەر کەلەکەی کەوتبوو، بەربووەوە سەر زەوی. لەو وەختەدا دنیا تاریک داهات و پێشڕەویکردن لە ناو ئەو دارستانەدا بووە کارێکی مەحاڵ.

یەکێک لە سەربازەکان گوتی: ئەی سەرکردە، سواری ئەسپەکەی من بە.

گۆمێس کە دەیزانی ئەو سەربازە بریندارە و ئەسپەکەشی ناتوانێ دوو کەسان هەڵگرێت، فەرمانی پێدان و گوتی: نەخێر! بۆ پێشەوە بڕۆن و بە هۆی منەوە دوامەکەون.

پیاوەکان ناچاربوون فەرمانی سەرکردەکەیان جێبەجێ بکەن و بۆ پێشەوە هەنگاویان دەنا و لەو تاریکییەدا ڕێگەی خۆیان دەدۆزییەوە بێ ئەوەی شارەزاییان هەبێت، گۆمێسیش چووە قووڵایی دارستانەکە و دوای چەند سەعاتێکی درێژ و ترسناک ئەو شەش سوارە توانییان خۆیان بگەیننە قەڵای بۆرین، بەر لەوەی لە بێتاقەتییان بەربینەوە، خەبەرداری هاوڕێکانیان کردەوە. لەوێ ئەوەندە چاوەڕێیان نەکرد کە خوێنی بریندارەکانیش بوەستێ و ئەسپەکانیان نەختێ بحەسێنەوە، ئەوجارە بە ئاراستەی ئیمپریاڵ ڕۆیشتن کە ئەو وەختە گوندێکی بچووک بوو. یاناکۆناکان ئەو بریندارانەیان هەڵگرتبوو کە ئومێدی ژیانیان هەبوو، بەڵام ئەوانەی لە سەرەمەرگدا بوون زوو تەواویان کردن تا جەنگاوەرەکانی مابۆچی بە زیندوێتی نەیان بینن.

لەو کاتەدا پێیەکانی خوان گۆمێس قوڕ و لیتەیان دەشێلا، ئاخر بارانی زستانە کە تازە تەواو بووبوو، ئەو ناوچەیەی کربووە زۆنگاوێکی چڕ.

هەرچەندە ئەو سەرکردەیە خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیشتبوو بە هۆی ئەو تیرانەی کە بەری کەوتبوون و گەلێکیش هیلاک و تێنوو بووبوو و چەند ڕۆژێک بوو هیچی نەخواردبوو، بەڵام چۆکی بۆ مردن دانەدا و بەو زەحمەتییەوە دەڕۆیشت و لە نێو دارو دەوەندا ڕێگەی دەکردەوە. نەدەبوو چاوەڕێی داهاتنی سبەینە بکات، چونکە شەو تاکە پاڵپشتی ئەو بوو. زۆر بە چاکی گوێبیستی ئەو هاوار و دەنگە دەنگانەی سەرکەوتن دەبوو کە مابۆچییەکان بە هۆی دۆزینەوەی ئەسپەکەی ئەم لێیان بەرز دەبووەوە وەختێ بینیان لەسەر زەوی کەوتووە. بە خۆزگەوە لە خوا پاڕاباوە کە ئەو ئاژەڵەی لە زۆر شەڕاندا هاوڕێی بووە گیانی دەرچووبێت. ئاخر هندییەکان عادەتیانە لە تۆڵەی خاوەنەکەی ئەشکەنجەی ئەسپە بریندارەکەی دەدەن. بە بۆنی دووکەڵەوە زانی کە ئەوانەی بە دوایدا دەگەڕێن چرایان داگیرساندووە و نێو سەوزاییەکە دەپشکنن و لێیان مسۆگەرە کە ئەم لەوێ دوور نەکەوتووەتەوە. زرێ و جلەکانی داکەنی و لە نێو لێتاوەکە شاردییەوە، پاشان بە ڕووتی بە نێو زۆنگاوەکەدا ڕۆیشت. جەنگاوەرە مابۆچییەکان زۆر لێی نێزیک کەوتبوونەوە بە جۆرێک گوێی لە دەنگیان دەبوو و ڕووناکایی چراکانیشی دەبینی.

لەو خاڵەی چیرۆکەکەدا سیسیلیا خووی ڕاستەقینەی دەردەکەوت کە بە گاڵتەکردنەکانی بە کەشی مردن وەک ئیسپانییەک وابوو و لەگەڵ گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ئەو شەوە ترسناکە لە پێکەنینان خۆی دووقەد دەکردەوە و پاشان گوتی :" مێردەکەم لە زۆنگاوەکە خنکا، دەق وەک ئەوەی پێم گوتبوو".

خوان گۆمێس قاسکی قەمیشێکی بڕی و خۆی هاویشتە ناو لیتاوە بۆگەنەکە و نقووم بووبوو. نەیدەزانی چەند دەبێت بەڕووتی و برینی کراوەوە خۆی خستووەتە نا ئەو لیتاوە، ڕوحی خۆی بە خوا بەخشی و هزریشی هەر لە لای منداڵەکانی و سیسیلیا بوو، ئەو ژنە جوانەی کە کۆشکی بە جێهێشت و تا بۆ کۆتاییی جیهان بە دوای ئەودا بچێت. جەنگاوەرەکان چەند جارێک بە تەنیشتیدا ڕۆیشتن و چیوای نەمابوو بیدۆزنەوە، وەلێ ئەو پیاوەی بە دوایدا دەگەڕان لە لیتاوەکە خۆی نقووم کردووە و شمشێرەکەشی بە دەستەوەیە و

زۆر بە زەحمەت بە هۆی قەمیشەکەوە هەناسە دەدات.

ڕۆژی دواتر کە بەیانیدا، ئەو پیاوانەی کە دەچوونە ئیمپریال، بوونەوەرێکی لە شێوەی کابووسیان بینی، هەموو جەستەی لێتاو و خوێنە، بە نێو دەوەنەکاندا دەخشێ، بە شمشێرەکەی دەستی زانیان کە ئەوە خوان گۆمێسە، سەرکردەی ئەو چواردە سوارچاکە بە ناوبانگە.

***

لەو ڕۆژەی ڕۆدریگۆ مردووە تا ئەوڕۆکە، ئەوە یەکەم جارمە لە شەوی ڕابردوو کە توانیم چەند سەعاتێک ئیستراحەت بکەم. وەختێ لە نێو جۆلانەکەمدا خەریکبوو دەبۆرژام هەستم بە گرانایییەک کرد لەسەر سینەم کە وەختبوو دڵم بتەقێنێ و هەناسەم بوەستێنێ، وەلێ هەستم بە خەفەت نەدەکرد، بەڵکو زۆر ئاسوودەبووم، چونکە دەمزانی ئەوە دەستی ڕۆدریگۆیە لەسەر سینەم و هاتووە لە تەنیشتم بنوێ وەکو ڕۆژگارە هەرە خۆشەکانی جارانمان. لە شوێنی خۆم نەبزووام و چاوەکانم نەکردەوە. حەزم دەکرد لە مێردەکەم بپرسم کە داخوا بۆ ئەوە هاتووەتەوە کە منیش لەگەڵ خۆی ببات، هەروەها پێشی بڵێم لە ماوەی ئەو سی ساڵە لەگەڵ ئەودا زۆر بەختەوەر بووم و قەت لە کاتی دوورکەوتنەوە لێی، بە هۆی چوونە جەنگییەوە، حەسرەتم هەڵنەدەکێشا، بەڵام لەوە دەترسام ئەگەر قسانی لەگەڵ بکەم خۆی لێم بزر بکات؛ ئاخر لە نێو مانگەکانی بە تەنیابوونم ئەوساکە زانیم ڕوحی مردوو چەند ترسێنەرە. لەگەڵ یەکەم گەزەنگی خۆرەتاو لە نێو پەنجەرە بچووکەکانەوە ڕۆدریگۆ لە تەنیشتم نەما و شوێنی بازووی بەسەر من و بۆنیشی بەسەر سەرینەکەمدا بەجێ هێشت. وەختێ کارەکەرەکان هاتنە ژوورێ هیچ ئاسەوارێکی ئەو لە ژوورەکەدا نەمابوو.

لەگەڵ ئەوەی کە ئەو شەوە چاوەڕوانەکراوەی خۆشەویستی زۆر شادی پێ بەخشیم، وەلێ وام دەزانی بە ڕوویەکی نادروستەوە واگاهاتبووم، چونکە ئیزابێل گیان، ژنە کارکەرەکان بە دوای تۆدا هاتن. من نەخۆش نیمە کچەکەم، هیچ شوێنێکی جەستەشم ئازاری نییە و وا هەست دەکەم ئێستا تەندروستیم

لە هەمــوو وەختــێک باشــترە، بۆیـە پێویسـت ناکـات بەو شـێوە تازیەبارانەوە سەیرم بکەیت؛ بەڵام تەنیا کەمێک دەمێنمەوە، چونکە هەست دەکەم سەرمامە. ئەگـەر پێـشت ناخـۆش نەبێت من حـەز دەکـەم ئـەو هەلە بقـۆزمــەوە و ئەوەی دەمەوێ پێتی بنووسم.

وەک دەزانیت خـوان گـۆمـێس لـەو کـارەســاتەش بە زیندوێتـی دەرچوو، هەرچەندە چاکـبوونەوەی برینە هەوکـردووەکانی چەند مـانگێکی گەرەک بوو. بیرۆکەی بە دواگەڕانی زێڕی لە مێشکی خۆی دەرکرد و گەڕایەوە سانتیاگۆ کە ئێسـتـاش وا لەگەڵ ژنـە قـەشـەنگەکـەیدا دەژیت کە ڕەنگە ئەویش تەمـەنی گەیشبێتە حەفتا سـاڵ، وەلێ لە سی سـاڵی چۆن بوو هەر ئاوایە، ڕوخسـاری لۆچی تێدا نییـە و داوە موویەکیش چییە لە سـەری سـپی نەبووە، جا نازانم ئەوە موعجیزەیە یان بە هۆی سیحرەوەیە. ئەو مـانگی کانوونی یەکەمـە تاقەت پڕووکێنە سـەرەتای دەسـتپێکردنی شۆڕشـی مابۆچییەکان بوو، ئەو شـەڕەی تەڕ و وشکی تێدا دەسووتا و ئەوە ماوەی چل ساڵە درێژەی هەیە و ناشزانرێ کەی تەواو دەبێت؛ ئاخر مـادام تـاکە هندییـەک و تاکە ئیسـپـانییـەک بمێنن، خوێن ڕشتنیش بەردەوام دەبێت. ئێزابێل گیان، پێویستە لەسـەرم ڕقم لێیان ببێـتـەوە، بەڵام ناتوانم وابم. ئـەوانە دوژمنی منن، وەلێ من ڕێزیـان لێ دەگرم؛ ئاخر ئەگەر منیش لە شوێنی ئەوان بوومایە تا مردن شـەڕم دەکرد وەک ئەوان بەرگریم لە خاکی خۆم دەکرد.

ئەوە چەند ڕۆژێکە من خــۆم لـەوە دووردەگـرم کـە چارەنووسی بـالدیبــیـا دواجـار چۆن کـۆتایی هات. بە درێژاییی بیست و حەوت ســاڵان من هەوڵم دا بیر لـەوە نەکەمـەوە، بەڵام وا دەزانم ئـێسـتـا کاتی ئەوەیە باسی ئـەو بابەتەش بکەم. دەمـەوێ بـە کامـە گێـڕانەوە دڵڕەقی لە هەمووان کـەمـتر تێـدایە بەویان باوەڕ بکەم کـە پێـدرۆ هـەر لەشـەڕدا بـووە تا ئەو کـاتەی گـورزێک بەســەری کەوتووە و بەریداوەتەوە، بەڵام سیسیلیا بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان یارمەتی دام. لە کــارەســـاتی تۆکــابێڵ تەنیـــا یـەک هندی قـــووتـار بووبوو تا ئـەو بەســەرهاتەی ڕۆژی جـەژنی لە دایکـبوونمان بۆ بـگێڕێتـەوە، وەلێ ئـەو کـەســە

نەیدەزانی چارەنووسی حاکم بە چی گەیشتووە. لە دوای دوو مانگ سیسیلیا هاتە سەردانم و گوتی کچێکی مابۆچی تازە هاتووەتە ئەراوکانیا لە ماڵەکەی ئەم بووەتە کارەکەر. هەروەها سیسیلیا گوتی ئەو کچە کە وشەیەک لە زمانی قشتاڵی نازانێت، لە نێزیک تۆکابێل دۆزراوەتەوە. ئیتر من جارێکی تریش سوودم لە زمانی مابۆدۆنگۆ وەرگرت کە لە فیلیپ فێری بووبووم – ئێستا ناوی بووەتە لاوتارۆ –. سیسیلیا ئەو کچەی هێنایە ماڵەکەم و قسانم لەگەڵی کرد. ئەو کچە تەمەنی هەژدە ساڵان بوو، ئاکارێکی نەرم و جەستەیەکی بتەوی هەبوو، لەبەرئەوەی زمانی ئێمەی نەدەزانی کچێکی گێل دیاربوو، وەلێ وەختێ بە زمانی مابۆدۆنگۆ قسەم لەگەڵی کرد بۆم دەرکەوت زۆر ژیرە. ئیتر ئەوەی کە لەو یاناکۆنا ڕزگاربووەی قەڵای تۆکابێل بیستم و لەگەڵ ئەمەی ئەو کچە مابۆچییە بۆی گێڕامەوە کە لە کاتی لە سێدارەدانی بالدیبیا لەوێ بووە، بەم جۆرە:

حاکم لە ناو کاولە سووتاوەکانی قەڵاکە بووە و لەگەڵ چەند سەربازێکی ئازا نائومێدانە لە دژی هەزاران مابۆچی جەنگاوە کە بە نۆبەت هەرجارەی دەستەیەکی حەساوە بەسەریان داداون، لە کاتێک ئەوان نەیاندەتوانی بازوو و شمشێرەکانیان بحەسێننەوە. ئەو ڕۆژە تا ئێواری جەنگابوون. وەختێ خۆرئاوابوون پێدرۆ لە هاتنی خوان گۆمێس بە چەک و تەقەمەنییەوە نائومێد دەبێ. پیاوەکانیشی تاقەتیان لەبەردەبڕێ و ئەسپەکانیش خوێنیان لێ دەچۆڕێ، سەرەڕای ئەوەش دەستەی تری مابۆچییەکان لە شاخەکان بۆیان دێنە خوارێ.

بالدیبیا لەو نۆ کەسەی پرسی کە تا ئەو وەختە لەگەڵی دەجەنگان و گوتی: بەڕێزان، ئێستا ئێمە چیمان لەسەرە بیکەین؟

یەکێک لە سەربازەکان وەڵامی دایەوە: بەڕێزتان جگە لە شەڕکردن چی ترت لێمان دەوێ؟

– دەبا بە شەرەفەوە بیکەین بەڕێزان!

ئەو دە ئیسپانییە خۆڕاگرە پێشڕەوییان کرد و ئەو یاناکۆنایانەی کە مابوونەوە بە دوایانەوە بوون تا شەڕ بکەن و گیانیان بەخت بکەن، شمشێرەکانیان بەرز ڕاگرتبوو و ناوی پەیامبەری سانتیاگۆشیان بەسەر زارەوە بوو. لە ماوەی چەند خولەکێک هەشت لە سوارەکان بە پەت و بۆلیادۆرا لەسەر پشتی ئەسپەکانیان کەوتنە خوارەوە و بەسەر زەویدا ڕایان کێشان و بە دەستی سەدان مابۆچی کوژران. تەنیا پێدرۆ و قەشە و هندییەکی هاریکار توانیبوویان گەمارۆکە بشکێنن و لەو ڕێڕەوە تەنگەبەرە ڕزگاربن کە لە بەردەمیان بوو. بەڵام ڕێگەکانی تر هەمووی دوژمن گرتبووی. لە قەڵاکەش هندییەکی هاریکاری تر هەبوو و لە ژێر کۆمەڵێک دار و پەردوو بەرگەی دووکەڵی ئاگرەکەی گرتبوو و لە دوای دوو ڕۆژان توانیبووی بە زیندوێتی ڕابکات لەو وەختەی جەنگاوەرەکانی مابۆچی کشابوونەوە. بەڵام ئەو ڕێگەیەی کە لە پێش بالدیبیا کرابووەوە، ئەوە لاوتارۆ بە زیرەکی خۆی هەڵی بژاردبوو، چونکە لەو سەری بە نێو دارستانە تاریکەکەدا بە زۆنگاو کۆتایی دەهات و لەوێ ئەسپەکان قاچیان لە زەنەکەکە چەقی بوو، وەک چۆن لاوتارۆ نەخشەی بۆ دانابوو ئاوا. بۆیان نەبوو بگەڕێنەوە دواوە، چونکە دوژمن بە دوایانەوە بوون. لەبەر ڕووناکی ئێوارەدا دیتیان سەدان مابۆچی لە نێو جەنگەڵەکانەوە دێنە دەرێ، لە کاتێک ئەوان وردە وردە لە زەنەکە بۆگەنە دەچوونە خوارێ کە بۆنی دۆزەخییانەی کبریتی لێ دەهات. بەرلەوەی زەنەکەکە قووتیان بدات، جەنگاوەرەکانی مابۆچی دەریان هێنان، ئاخر ئەمە ئەو ڕێگەیە نەبوو کە ئەوان نەخشەیان بۆ کێشابوو تا بەهۆیەوە لەناویان بەرن.

بالدیبیا کاتێ زانی لە ناودەچێت و هیچ چارەی نەماوە، ویستی لەسەر سەربەستی خۆی گفتوگۆ لەگەڵ دوژمن بکات، و پەیمانی دانێ کە ئەو شارانە چۆل بکات کە لە خوارووی وڵات دروستیان کردووە و لە هەرێمی ئەراوکانیاش بۆ هەتایە ئیسپانییەکان لەوێ دەربکات و سەرەڕای ئەوەش مۆڵک و ماڵاتێکی زۆریان بداتێ. دەبووایە یاناکۆناکە هەموو ئەو قسانە بکاتەوە زمانی مابۆچی، بەڵام هێشتا لێ نەبووبووەوە وەختێ هندییەکان هێرشیان کردە

سەری و کوشتیان. ئەوان دەیانزانی هوەینکا چەند بێ بەڵێن. بەڵام قەشەکە خاچێکی لە دوو دار دروست کردبوو، ویستی دوا نیشانە بۆ هندییەکە بکێشێ وەک چۆن پێشتر بۆ حاکمیشی کێشابوو، وەلێ بە تۆبزێک کەللەی سەریان هاڕی. ئیتر لەو کاتەوە ئەشکەنجەکانی پێدرۆ دی بالدیبیا دەستیان پێ کرد، ئەو دوژمنە سەرسەختە کە هەموو ئەو ئازار و خراپەکارییانەی لەخۆ بەرجەستە کردووە کە بەسەر گەلی مابۆچیدا هاتوونە. پێویستبوو لەسەریان ئەو هەزاران کوژراوە و ئەو پیاوانەی سووتێنران و ئەو ژنانەی کە بە زۆر لاقەیان کرابوو و ئەو منداڵانەی پارچە پارچە کران و سەدان دەستی بڕاوە کە هاوێشترانە ناو ڕووبارەکە و قاچ و لووتە بڕاوەکان و قامچی و کۆت و زنجیر و سەگەکان لە بیر نەکەن.

حاکمی ئەسیریان ناچار کرد کە ئەشکەنجەدانی هندییە هاریکارەکان ببینێت کە لە تۆکابێڵ بە زیندوێتی گیرابوون. هەروەها لە بەرچاوی ئەو بێحورمەتییان بە لاشەی ئیسپانییەکان دەکرد. بەڕووتی بە دوای ئەسپێک بۆ ئەو سەربازگەیە ڕایان کێشا کە لاوتارۆ چاوەڕێی دەکردن. لە ڕێگەدا دار و بەرد و پەردوو پێستیان لەبەری داماڵی و وەختێک کە خستیانە بەرپێی سەرۆکی سەرۆکەکان – نیدۆلتۆکی – بووبووە کەچە جلێک کە خوێن و لیتاو دایان پۆشیبوو. لاوتارۆ فەرمانی دا ئاوی بدەنێ تا بێتەوە هۆش خۆی، پاشان بە ئەستووندەیەکیانەوە پێچا. وەک هێمایەکی گاڵتەئامێز، شمشێرەکەی بالدیبیا کرایە دوو پارچە و لە بەرپێی ئەسیرەکە چەقاندیان. وەختێ کە بای ئەوە هۆشی هاتەوە بەر بۆ ئەوەی بتوانێ چاوەکانی بکاتەوە و بزانێت لە کوێیە، خۆی لە بەرامبەر خزمەتکارە کۆنەکەی دۆزییەوە.

– فیلیپ! – بە هیواوە هاواری کرد، ئاخر ئەوە لانی کەم دەموچاوێکی ناسراوە و دەتوانێت بە زمانی قشتاڵی قسانی لەگەڵ بکات.

لاوتارۆ بە گاڵتەیەکی بێ سنوورەوە چاوی تێبڕی.

– ئەی فیلیپ، نامناسیتەوە؟ من تایتام – ئەمەی بە پەرێشانییەوە گوت.

لاوتارۆ تفێکی لە دەموچاوی کرد، ئاخر ئەوە بیست و دوو ساڵە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیە. بە فەرمانی لاوتارۆ جەنگاوەرە توورەکان یەک بە دوای یەک بە پێش پێدرۆدا دەڕۆیشتن و سەدەفی تیژکراوی گوێچکە ماسییان بە دەستەوە بوو و پارچە گۆشتیان پێ لە جەستەی دەکردەوە. ئاگرێکیان داگیرساند، بەو سەدەفانە هەموو گۆشتی ڕان و قۆڵ و بەلەکیان لێ کردەوە، پاشان برژاندیان و لە بەرچاوی ئەم خواردیان. ئەو ئاهەنگە دۆزەخییە سێ شەو و دوو ڕۆژی برد بێ ئەوەی کەسێک لەو دیلە بەدبەختە بپێچێتەوە. دواجار سبەینەی ڕۆژی سێیەم، ئەو کاتەی لاوتارۆ دیتی وا پێدرۆ خەریکە گیانی دەردەچێت، زێڕی تواوەی لە دەمی کرد تا بەو کانزایە بخنکێ کە هەمیشە خۆشی دەویست و لە کانگاکانیش بووبووە مایەی دەردەسەریی هندییەکان.

ئای لەو ئازارە، ئای لەو ئازارە! ئەو بیرەوەرییانە وەک لێدانی ڕمە لێرە، لە ناوەڕاستی سینەم. کچەکەم ئێستا سەعات چەندە؟ بۆ ڕووناکی نەما؟ سەعاتەکان بەرەو دوا گەڕاونەتەوە، دەبێ سەرلەنوێ بەیانی بداتەوە. وا زەندەبەم بۆ هەتا هەتایە هەر بەیانی دەبێت...

قەت کەسێک تەرمی بالدیبیای نەبینیوە. دەڵێن مابۆچییەکان لە کەشێکی سەرپێییدا جەستەکەیان خواردووە و لە ئێسقانەکانیشی نایان دروست کردووە و کەللە سەریشی ئێستاش لە جیاتی جام، سەرۆکەکان شەرابی مۆدای پێ دەخۆنەوە. کچەکەم تۆ لێم دەپرسیت کە بۆچی پشت بەو چیرۆکە ترسناکە دەبەستم کە سیسیلیا بۆی گێڕاومەتەوە، نەک بەوانەی زیاتر بەزەییان تێدایە کە دەڵێن بالدیبیا گورزێکیان لە سەری دا و کوشتیان، وەک چۆن شاعیرەکان نووسیویانە و عادەتی هندییەکانی باشووریشە. پاشان پێت دەڵێم کچەکەم. لەو سێ ڕۆژە شوومەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٥٥٣ دا، من زۆر نەخۆش بووم. وا دیاربوو وەک بڵێی ئەوەی ڕوحم دەیزانێت هێشتا ئەو وەختە عەقڵم نەیدەزانی. دیمەنێکی ترسێنەر بەبەرچاومدا هات، وەک ئەو کابووسەی کە ناتوانم لێی بەئاگابێم. وام هاتە بەرچاو کە من لە ماڵەکەمدا سەبەتەکان پڕ لە دەست و لووتی بڕاوەنە و لە حەوشەکەشماندا هندییەکان بە

کۆت و زنجیرەوە دەبینم و ئەوانەشم لێ دیارە کە بەنووکی ڕمەوە کراون. هەواکە بۆنی گۆشتی سووتاوی مرۆڤی لێ دێت و سرووەی شەوانیش دەنگی زرچەی قامچییەکانم بۆ دێنێت. ئەو کاری داگیرکارییە ئێش و ئازارێکی زۆری لەگەڵ خۆی هێنا... کەس ناتوانێ لەو هەموو دڵڕەقییە ببورێت، بە تایبەتی لە بەرامبەر هندییە مابۆچییەکان کە هەرگیز خراپەکاری لە بیر ناکەن وەک چۆن چاکەشیان لە بیر ناچێت. ئەو یادەوەرییانە ئازاریان دەدام، منیش وەک ئەو کەسەم لێ هاتبوو کە شەیتان دەچێتە بن باڵی. کچەکەم ئیزابێل تۆ دەزانیت کە من لە سایەی خوا هەمیشە سەلامەتم، تەنیا هەندێ جار نەختێک لێدانی دڵم نارێکە؛ لەبەر ئەوە هیچ لێکدانەوەی ترم بۆ نەخۆشییەکەی ئەو چەند ڕۆژەم نییە. لەوکاتەی پێدرۆ تووشی ئەو چارەنووسە ترسناکە بووبوو، لە دوورەوە ڕوحم هاوڕێی بوو، بۆی دەگریا، بۆ هەموو قوربانییەکانی ئەو چەند ساڵەش دەگریا. لاواز بووبووم و دەرشامەوە، تایەکی زۆر گەرمم لێ بوو، هەموو دەترسان نەبادا بمرم. لەگەڵ وڕێنەکردنمدا بە چاکی گوێم لە هاواری پێدرۆ دەبوو کە بۆ دواجار ماڵئاوایی لێ دەکردم و دەیگوت: «خواحافیز ئەی ئێنیس، ئەی خۆشەویستی ڕوحەکەم...»

کۆتایی

هەولێر – گەڕەکی بەختیاری
نەورۆزی ساڵی ٢٠٠٩